# ذم الكلام وأهله

نووسینی

أبي إسماعيل عبدالله

بن محمد بن علي الأنصاري الهروي الصوفي

(٣٩٦-٤٨١هـ)

وەرگێڕان و پوختەکردنی

زكريا الأثري

﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ ﴾

**(النمل : ١٩)**

## بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

ســتايش و حەمد و شــوكر بۆ الله تعالى، داواى يارمەتى و هيدايەت و لێخۆشــبوونى لێ ئەكەين، پەناى پێ ئەگرين لە نەفس و كاروكردەوەى خراپمان، هەركەســێك خۆى هيدايەتى بدات ئەوە هيدايەتدراوە و كەس ناتوانێت گومڕاى بكات، وە هەركەســێك خۆى گومڕاى بكات ئەوە گومڕايە و كەس ناتوانێت هيدايەتى بدات، شايەتى ئەدەم بەوەى كە تەنها الله عز وجل شايەنى پەرستنە و هاوەڵى نييە، وە شايەتى ئەدەم بەوەى محمد ﷺ بەندە و پەيامبەريەتى .

أما بعد :

وەكو لەلاى ئاشنايان و شوێنكەوتە ڕاستەقينەكانى سەلەف رحمهم الله ديارە مەنهەجى سەلەف و ئەهلى سوننە لە پاش ئەوان لە بابەتى ئەسماء و سيفەتەكانى الله عز وجل؛ تەسليمبوون بۆ و جێگيركردنى ئەوەيە خۆى فەرموويەتى، وە ئەوەى لەڕێگەى پێغەمبەرەكەيەوە ﷺ هەواڵى پێ داوين .

وە لەبەر ئەوەى بابەتێكى ناديار و غەيبيە مرۆڤ ناتوانێت بە بۆچوونى خۆى قسە بكات دەربارەى الله عز وجل، واتە بە عەقڵ و قياس قسەناكرێت دەربارەى الله عز وجل، بەڵكو بە قورئان و ئەثەر قسەى دەربارە ئەكرێت .

ســەلەف رحمهم الله لەبەر باشــتێگەيشــتنيان لە ئيســلام و ســوننەت، وە شــوێنكەوتنى تەواوى ئەوەى تيايدا هاتووە؛ الله عز وجل ــيان بەڕاســتخســتەوە لەوەى فەرموويەتى دەربارەى خۆى، چونكە خۆى لە هەموو كەســێك زياتر خۆى ئەناسێت، وە تەواوى فەرمايشتەكانى پێغەمبەريان ﷺ بەڕاستخستەوە؛ چونكە بێگومان لە مرۆڤەكانيشدا پێغەمبەر ﷺ شارەزاترينە بە الله عز وجل .

هەربۆیە جێگیریان کرد الله عز وجل لەسەر عەرشە بە ذاتـــی خۆی، وە چاوی حەقیقی هەیە، وە دەســتی حەقیقی هەیە، وە بە حەقیقی لە کۆتا سـێیەکی شەودا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دنیا، وە هەموو سیفەتەکانی تر .

ئەم سـیفەتانەیان جێگیرکرد لەسـەر ئەو ڕووکەشـەی لەسـەری هاتوون، وە وتیان خوێندنەوەکەی تەفسیرەکەیەتی، وە وتیان چۆنیەتی بۆ ئەو سیفەتانە دیاری ناکەین، وە بە هەمان شـێوە نمونەی بۆ ناهێنینەوە و نایچوێنین بە سـیفەتی دروستکراوەکان، وە لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەک لێکی نادەینەوە نەفی حەقیقەتی سیفەتەکە بکەین .

ئەمە عەقیدەیان بوو بەهۆی شـوێنکەوتنی تەواوەتی و خۆتەسلیمکردنیان بۆ فەرمایشـــتی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە بەمهۆیەوە لەلای زەندیق و کافران بە فەرمایشـــتی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ ناونران موشـــەبیهە و حەشەوییە .

پاشان کۆمەڵەیەک دروست بوون کە کاریگەربوون بە شتێکی تر لە دەرەوەی قورئان و سوننەت، وە هیدایەتیان لەو شتەدا ئەبینیەوە و لە قورئان و فەرموودەدا نەیان ئەبینیەوە، وە پێیان وابوو ئەو شـــتە وەڵامی پرســـیارەکانیان ئەداتەوە و بەرچاویان ڕۆشن ئەکات و وایان لێ ئەکات بەشێوەیەکی ڕاست بیر بکەنەوە لە الله عز وجل، ئەو شتەش عیلمی الکلام ـە .

عیلمی الکلام زانســـتێکە پەیوەندی بە الله عز وجـل و پێغەمبەرەوە ﷺ نییە، وە پەیوەنـدی بە هـاوەڵانیشـــەوە نییە، واتە الله عز وجـل فەرمـانی پێ نەکردووین لەڕێگەی الکلام ـەوە بیناسین، وە رسول الله ش ﷺ هەرگیز الله عز وجل ـــی لەڕێگەی الکلام ـــەوە نەناسـاندووە بە هاوەڵان، وە ئەوانیش بە پاش خۆیان، بەڵکو پەیوەست بوون بەوەی لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە .

جا کە بارودۆخی الکلام بەمجۆرە بوو، وە زانرا جگە لە بیدعەیەک هیچی تر نییە; بیدعەیەک کە ئەهلی الکلام ـــــی تووشـــی ئیلحاد و زەندەقە و گومان و جەهمیەت و بەدرۆخستنەوەی قورئان و سوننەت کردووە; زانایانی سەلەف رحمهم

الله زۆر دژی وەســـتانەوە و ئاگاداریان دەربارەیان دا و لە ئیســـلام دەریانکردن، چونکە ئەیانزانی یان ئەبێت شوێن فەرمایشتی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەون، یاخود ئەو دووانە فڕێ بدەن و شوێن بەناو زانستی الکلام بکەون .

ســـەرەڕای ئەو هەموو لادان و کوفرەی الکلام لەخۆیی گرتبوو، ئەهلی کەلام کە پێـک دێن لە موعتەزیلە و جەهمی و ئەشـــعەری و مـاتوردیەکـان و چەنـد کۆمەڵەیەکی دیکەش; کردیان بە بناغەی عەقیدەی خۆیان، کردیان بە ئەســـڵ و بنچینەی دین; وە کردیان بەو ڕێگەڕاســـتەی کە بەهۆیەوە ئەتوانیت الله عز وجل بناسیت; ئەمە لەکاتێکدا خۆشیان ئەزانن رسول الله ﷺ الکلام ــی نەزانیوە، وە خودی الکلام لە وتەی فەیلەسوفەکانی هیند و فارس و یۆنانەوە وەرگیراوە .

هەربـۆیە ئەو کـۆمەڵانە بە چەنـدیـن شـــێـوە زادەی عەقـڵـی پـووچـی فەیلەسـوفەکانیان پێشـخسـت بەسـەر فەرمایشـتی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ ; وە ئیمانیان بە الکلام هێنا بە ئیمانێکی ڕاســتەقینە، وە لە پێناویدا چەندین یاسـایان دانا بۆ سـەرخسـتنی بەسـەر فەرمایشـتی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ ، لەوانە :

- وەرنەگرتنی فەرموودەی آحاد لە عەقیدەدا .

- پێشخستنی عەقڵ بەسەر نەقڵ (واتە قورئان و فەرموودە) دا .

- بە واجب دانانی فێربوونی عیلمی الکلام .

- وەسفکردنی مانای ڕووکەشی قورئان و سوننەت بە تەشبیهـــو کوفر، وە بە کافر دانانی شوێنکەوتە ڕاستەقینەکانی رسول الله ﷺ .

- گونجاندنی قورئان و ســـوننەت و ماناکردنی بەشـــێوەیەک تێک نەگیرێت لەگەڵ الکلام دا .

لەبەر ئەم کوفرانە و چەنـدینی دیکەش ئەهلی الکلام هەر لە ســـەرەتـای دەرکەوتنیانەوە بە دەرچوو لە ئیسلام وەسفکران و بەو پێیە مامەڵەیان لەگەڵدا کرا .

ئەوانەی ســــەرەتایان وەکو موعتەزیلە و جەهمیەکان بە ئاشــکرا زۆرێک لە وتەکانیان دەرئەبڕی، ســــەلەف زۆر بە توندی دژی ئەم کۆمەڵەیانە وەســـتانەوە و مامەڵەی دەرچوو لە ئیسلامیان لەگەڵدا کردن .

دواتر ئەشــعەری و ماتوریدیەکان زانیان ئەگەر بە ئاشــکرا هەمان قســەی موعتەزیلە و جەهمیەکـان دووبارە بکەنەوە هەمـان مـامەڵەی ئەوانیـان بەرامبەر ئەکرێت، هەربۆیە هەســتان فێڵیان کرد، لە ڕووکەشــدا هەمان وتەی ســەلەفیان وت، دواتر مانایان کرد و لێکیان دایەوە بە وتەی جەهمی و موعتەزیلەکان .

زانایان لەو ســەردەمە و دواتریش زۆر لەســـەریان توند بوون; بە مێینەی موعتەزیلە و جەهمیەکـانیـان دانـان، چونکە ئەوان بە ئاشــکرا عەقیدەی خۆیان بەیان ئەکرد بەڵام ئەشــعەریەکان و ماتوریدیەکان فێڵیان ئەکرد و نەیانئەوێرا، هەربۆیە زانـایـان بە خراپتر و زیـانبەخشـــتریان زانین بۆ ســـەر موســـوڵمـانـان لە باوانەکانیان لە جەهمی و موعتەزیلەکان .

لەبەر ئەوەی بەشێک لە دەسەڵاتداران پشتی ئەشعەری و ماتوردیەکانیان گرت و بوون بە سـەرخەریان; ئەوانیش هەسـتان بە تەفسـیرکردنی قورئان و کتێبە فەرموودەییەکان لەســەر مەزهەبی جهم بن صـفوان و بشـر المريسـي، ژەهرەکانی خۆیان بە شــاراوەترین شــێوە ڕژاندە کتێبە فەرموودەییەکانەوە تا هەم خۆیان بە باشتر دەربخەن و هەم خەڵکی زیاتریش لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ دۆزەخ .

ئەم کتێبەی بەردەســـتمان (ذم الكلام وأهله) باشـــترین کتێبە لەو بوارەی خۆیدا نووســـرابێت، نووســـەری کتێب دێت هەر لە ســـەرەتاوە بە وردی ڕوونی ئەکاتەوە موســـوڵمان و ئیمانداری ڕاســـتەقینە کێیە و ئەبێت مامەڵەی چۆن بێت لەگەڵ فەرمایشتی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ .

هەر لە ســەرەتاوە ڕەگی عەقیدەی کوفریی ئەهلی الكلام هەڵئەکێشـێت و بە خوێنەر ئەڵێت ئەهلی الكلام بەم شێوەیە نەبوون بۆیە لایاندا لە دین .

هەربۆیە ئەم کتێبە زۆر بەســوودە بإذن الله بۆ ئەو کەســانەی لە ســەرەتاندان و ئەیانەوێت بزانن ئەبێت چۆن ڕەفتار بکەن بەرامبەر قورئان و سوننەت .

وه بۆ ئەو کەســـانەش ئەیانەوێت ئاشــنابن بە وتەی زانایان هەتا کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچی دەربارەی أبو الحسن الأشعري و هاوەڵانی .

وه بە منەتی الله عز وجل دەربارەی ئەثەرەکان ئەوەندە ڕوونکردنەوەمان داوە خوێنەر تێبگات لە ئەثەرەکان و مەبەستی نووسەر .

پاکی و دووربوون لە هەڵە تەنها بۆ الله عز وجل ــــە، داواکارین لە الله عز وجل تەنها و تەنها لەپێناو ڕەزامەندی خۆی و لەســـەر ســـوننەتی پێغەمبەرەکەی و بەپێی تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت بووبێت .

وه داواکارین وەک چۆن مووەفەقی کردین بۆ کارەکە بەهەمان شـێوە لێمان قبووڵ بفەرمووێت و بیکات بە مایەی چاوگەشـــی دنیا و قیامەت بۆ نووســـەر و پوختەکەر و خوێنەر و تەواوی شوێنکەوتووانی مەنهەجی سەلەف بە ڕاستی .

وه بیکات بە بەڵگە بۆمان لە قیامەت نەوەک بەڵگە لەسەرمان .

وه ســـەرەڕای کەموکورتی زۆرمان لە دنیا و قیامەتدا لە ئەهلی حەدیث هەژمارمان بکات و لەگەڵیان بە ڕەحمەتی خۆی حەشرمان بکات، وه مووەفەقمان بکات بۆ کاری زیاتر تەنها لەپێناوی خۆی، آمین یا رب العالمین .

# أبو إسماعيل عبدالله بن محمد بن علي الأنصاري

- له نێوان ساڵانی (٣٩٦ - ٤٨١ هـ) ژیاوه .

- له نەوەکانی هاوەڵی بەڕێز أبو أيوب الأنصاري ـ رضي الله عنه .

- سـماعِ ــــی هەیه له : (أبو منصـور محمد بن محمد الأزدي و، الحافظ أبو الفضـل محمد بن أحمد الجارودي و، أحمد بن علي بن مَنجويه الأصـبهاني الحافظ و، أبو سعيد محمد بن موسى الصَّيرَفي و، أبو منصور أحمد بن أبي العلاء و، يحيى بن عمار السِّجستاني و، علي بن محمد بن محند الطِّرازي و أبي يعقوب القراب)، وه چەندین زانای دیکه) .

- لێیەوه گێڕاویانەتەوه : (المؤتَمن السـاجي و، إبن طاهر المَقدسـي و، عبدالله بن أحمد بن السَّـمَرقَندي و، عبدالصـبور بن عبدالسـلام الهَرَوي و، عبدالملك الكَروخي و، أبو الفتح محمد بن إسـماعيل الفامي و أبو الوقت عبدالأول بن عيسى السِّجزي ) وه جگه لەوان ) .

- چەنـد نووسـراوێکی هەیه لەوانه : (ذم الكلام وأهلـه، تكفير الجهمية، الأربعين في دلائل التوحيد، الفاروق في الصفات، منازل السائرين، مناقب الإمام أحمد بن حنبل)، وه چەند نووسراوێکی دیکه .

شـمشـێرێکی هەڵکێشـراو بووه لەسـەر بیدعیەچییەکان بەتایبەتی ئەهلی الکلام.

- إبن طاهـر ئەڵێت : (گوێبیسـتی بووم له هراة وتی : (پێنج جار خرامه بەر شمشێر، پێم نەئەوترا : واز له بۆچوون و مەزهەبەکەت بهێنه .

به‌ڵكو پێم ئه‌وترا : بێده‌نگ به به‌رامبه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی موخالەفه‌ت ئه‌كات .

منيش ئه‌موت : (بێده‌نگ نابم)) .

وه ئه‌ڵێت : (گوێبیستی بووم وتی : (دوازده هه‌زار فه‌رمووده‌م له‌به‌ره به‌سه‌ر يه‌كه‌وه ئه‌یانڵێم) .

وه ئه‌ڵێت : (گوێبیستی بووم وتی : كاتێك باسی ته‌فسیر بكه‌م ئه‌وه باسی ئه‌كه‌م له سه‌د و حه‌فتا ته‌فسیره‌وه) .

وه ئه‌ڵێت : (هاوه‌ڵانم بۆیان گێڕامه‌وه كه سوڵتان ألب أرسلان هات بۆ هراة و نظام الملك ـــــ وه‌زیری له‌گه‌ڵدا بوو، سه‌رگه‌وره‌ی هه‌ردوولایه‌نی حه‌نه‌في و شافیعیه‌كان كۆبوونه‌وه له‌لای بۆ شكاتكردن له الأنصاري، وه بۆ داواكردنی موناقه‌شه لێی .

جا وه‌زیر بانگی كرد، كاتێك ئاماده بوو پێی وت : ئه‌وانه كۆبوونه‌ته‌وه بۆ موناقه‌شه‌كردن له‌گه‌ڵ تۆ، ئه‌گه‌ر حه‌ق له‌لای تۆ بێت ئه‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ مه‌زهه‌به‌كه‌ت، وه ئه‌گه‌ر حه‌ق له‌لای ئه‌وان بێت یان ئه‌گه‌ڕێیته‌وه یان بێده‌نگ ئه‌بیت .

الأنصاري هه‌ستایه‌وه وتی : (من موناقه‌شه ئه‌كه‌م به ئه‌وه‌ی له باخه‌ڵمدایه) .

وتی : چی له باخه‌ڵه‌كانتدایه .

وتی : (كتێبی الله) ئاماژه‌ی كرد بۆ گیرفانی ڕاستی، (وه سوننه‌تی رسول الله ﷺ) وه ئاماژه‌ی كرد بۆ لای چه‌پی، الصحيحين ی تیایدا بوو .

پاشان وه‌زیر ته‌ماشای كردن به پرسیاركردن لێیانه‌وه، جا هیچ كه‌سێكیان نه‌بوو موناقه‌شه‌ی له‌گه‌ڵدا بكه‌ن به ئه‌و ڕێگه‌یه) .

- وه ئه‌ڵێت : (گوێم له أحمد بن أميرجه القلانسي خزمه‌تكاری الأنصاري بوو ئه‌یوت : ئاماده‌بووم له‌گه‌ڵ شێخ بۆ سه‌لام كردن له وه‌زیر أبي علي الطوسي، هاوه‌ڵه‌كانی ئه‌ویش ڕایانسپارد بچێته ده‌ره‌وه بۆ لای، ئه‌مه‌ش دوای میحنه‌ت وه

گەڕانەوەی لە بەلخ بوو، کاتێک چووە لای ڕێزی گرت و بە گەورە ڕایگرت، وە لەو ڕۆژەدا لە سەرگەورەی دوو کۆمەڵە هەبوون، یەکیانگرت لەسەرئەوەی پرسیاری لێبکەن لەو مەسەلەیە لەبەردەم وەزیردا، ئەگەر وەڵامی دایەوە بە وەڵامدانەوەی هەرات لەبەرچاوی وەزیر ئەکەوێت، ئەگەر وەڵامیشی نەداوە لەبەرچاوی هاوەڵەکان و ئەهلی مەزهەبەکەی ئەکەوێت.

کاتێک چووە ژوورەوەو دانیشت، پیاوێکی لە هاوەڵانی الإمام الشافعي بۆ دیاریکرابوو، ئەناسرا بە العلوي الدّبوسي، وتی: ڕێگەم ئەدەیت ئەی شێخی پێشەوا پرسیاری بابەتێکت لێبکەم؟

وتی : (بپرسە) .

وتی : بۆچی أبا الحسن الأشعري بەلەعنەت ئەکەیت؟

بێدەنگ بوو، کاتێک چەند ساتێک تێپەڕی، وەزیر پێی وت : وەڵامی بدەرەوە.

وتی: (من الأشعري ناناسم! بەڵکو لەعنەتم کردووە لە کەسێک کە باوەڕی بەوە نەبووە الله جل جلاله لە ئاسمان بێت، وە قورئان لە موصحەفدا بێت، وە پێغەمبەر ئەمڕۆ پێغەمبەر بێت) .

دواتر هەستاو ئەوێی بەجێهێشت، یەک کەسیش نەیتوانی قسە بکات بە وشەیەکیش لە هەیبەت و توندی و زاڵێتی ئەو .

وەزیر وتی بە پرسیارکەر و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون : ئەمەتان ئەویست؟ ئێمە بیستبوومان کە ئەمەی وتووە لە هەرات، وازتان نەهێنا تا گوێمان لێ بوو بە گوێیەکانمان، چی لێ بکەم؟!) .

- أبو سعد السمعاني دەربارەی ئەڵێت : (دەرخەری سوننەت بوو، بانگخواز و هاندەر بوو بۆی، وە هیچی لە زاڵمەکان وەرنەئەگرت **- واتە دەسەڵاتداران -**، وە زیاتر لە ئەوەی نەئەوت کە لە ڕووکەشی قورئان و سوننەتدا هاتووە، باوەڕی بەوەیان هەبوو کە صحیح ە) .

- أبو النَّضر الفامي دەربارەی فەزڵەکانی ئەڵێت : (سەرخستنی دین و سوننەت بەبێ تەنازولکردن) .

- أبو طاهر السِّلَفِي ئەڵێت : پرسیارم کرد لە المؤتَمن دەربارەی أبي إسماعيل الأنصاري ؟

وتی : (لە سوڵتانی زانایانە) .

وە ئەڵێت : (ئەڕۆیشتە لای دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندان و حسابی بۆ نەئەکردن، وە کەسێکی ڕێبوار و نامۆی ئەبینی لە فەرموودەوانان زۆر ڕێزی لێ ئەگرت) .

- إبن تيمية دەربارەی ئەڵێت : (ئیمامە لە فەرموودە و، تەصوف و، تەفسیردا، وە لە فیقهدا لەسەر مەزهەبی ئەهلی حەدیثە، پێگەی الشافعي و أحمد بەرز ڕائەگرێت، وە پێکەوە ئەیانهێنێت و بەراورد لە نێوانیاندا ئەکات، وە لە وەڵامەکانیدا جاری وا هەیە موافقەی وتەی الشافعي ئەکات، وە جاری واش هەیە موافقەی وتەی أحمد ئەکات، وە ئەوەی بەسەریدا زاڵە شوێنکەوتنی فەرموودەیە لەسەر ڕێچکەی إبن المبارك و نزیک لە ئەو) .

- إبن رجب دەربارەی ئەڵێت : (فەقیهـو، تەفسیرکار و، حافظ و، سۆفی و، الواعظ .

زۆر توند و بەهێز بوو لە سەرخستنی سوننەت و بەرگریکردن لێی و سەرکوتکردنی ئەو کەسەی موخالەفەی ئەکات، وە بەهۆی ئەوەوە تووشی چەند تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو، وە زۆر سەرخەر و بەگەوڕاگری مەزهەبی ئیمام أحمد بوو) .

وە ئەڵێت : (ئایەت و نیشانەیەک بوو لە تەفسیر و حفظ و شارەزایی لە فەرموودە و زانیاری لە زمان و ئەدەب دا) .

- عبدالقادر الرهاوي دەربارەی ئەڵێت : (ناسرابوو لە ئاسۆکاندا بە حەنبەلیەت و تووندی لەسەر سوننەت) .

- إبن طاهر ئەڵێت : (وە گوێبیستی هاوەڵانمان بووم لە هراة ئەیانوت : جارێک لەو جارانەی سوڵتان ألب أرسلان هات بۆ هَرَاة، شێخ و گەورەکانی شار کۆبوونەوە و چوونە لای أبو إسماعیل بۆ ماڵەوە و سەلامیان لێکرد و وتیان : (سوڵتان هاتووە ئێمەش ئەمانەوێت دەرچین و سەلامی لێبکەین، جا حەزمان کرد بە سەلامکردن لە تۆ دەست پێبکەین) .

وە لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون بتێکی بچووکی لە مس دروستکراو لەگەڵ خۆیاندا هەڵبگرن، جا لە شوێنی نوێژی شێخدا - واتە الهروي - خستیانە ژێر بەرماڵەکەی و دەرچوون .

جا شێخ هەستا و چوون بۆ لای سوڵتان، لەوێ داوای یارمەتی و بەهاناوەچوونیان کرد بەدەست الأنصاري ـەوە و وتیان کە : (موجەسیمەیە، وە لە میحرابەکەی بتێکی هەیە ئەڵێت الله لەسەر شێوەی ئەو بتەیە، وە سوڵتان ئەگەر ئێستا بەدوایدا بنێرێت ئەیدۆزێتەوە) .

ئەوە قورس بوو لەسەر سوڵتان، وە مێردمنداڵێکی نارد لەگەڵ کۆمەڵەیەکدا، چوونە ژوورەوە و بەرێکەوتن بۆ میحرابەکە و بتەکەیان هێنا، مێردمنداڵەکە بە بتەکەوە گەڕایەوە، سوڵتانیش ناردی بەدوای ئەو کەسانەدا کە ئەهاتن بۆ لای الأنصاري تا بتەکە و زانایان ببینن .

سوڵتان زۆر تووڕە بوو و وتی : (چیە ئەوە ؟!) .

الهروي وتی : (بتێکە دروستکراوە لە مس، وەکو یاری وایە) .

سوڵتان وتی : دەربارەی ئەوە پرسیارت لێ ناکەم .

الهروي وتی : (ئەی سوڵتان دەربارەی چی پرسیار ئەکات ؟) .

سوڵتان وتی : ئەوانە ئەڵێن تۆ ئەمە ئەپەرستیت و ئەڵێیت الله لەسەر شێوەیەتی .

الأنصـاري ـــش بە هێز و بە دەنگی بەرز وتی : (سـبحانك!! ئەوە بوهتانێکی گەورەیە ) .

جـا کەوتە دڵی ســـوڵتانەوە کە درۆیان کردووە بەدەمیەوە، فەرمانی کرد و الأنصــاري بەڕێکرایەوە بۆ ماڵەکەی بە ڕێزەوە، وە هەڕەشــەی لەوانەی دیکە کرد و وتی : (ڕاستم پێ بڵێن ) .

ئەوانیش وتیان : ئێمە بەدەست ئەم کەسەوە تووشی بەڵا و نەهامەتی بووین و بە خەڵکی ئاسایی بەسەرماندا زاڵ بووە، جا ویستمان شەڕەکەی لەسەر خۆمان نەهێڵین .

سـوڵتانیش بڕیاری دەربارەی یەک بە یەکیان دەرکرد و سـزای دان و ئیهانەی پێ کردن ) .

- دراوەتە پاڵ عەقیدەی ئیتیحادیەکان و شـــتێک لە جەبر، إبن تيمية و إبن القيم بەرگریان لێکردووە ڕوونیان کردووەتەوە کە بە هیچ جۆرێک لەســـەر عەقیدە ئیتیحادیەکان نەبووە .

## ناساندنی بەناوزانستی الكلام و دروستبوون و گەشەكردنی

بەناوزانستی الكلام لەلایەن موتەكەلیمەكانەوە بەكاردێت بۆ ناسین و تەوحیدی الله عز وجل، وە بۆ ڕەددانەوەی گروپە گومڕاكان بە بەڵگە كەلامیەكان .

بەناوزانستی الكلام هاتەبوون لە ئەنجامی وەرگێڕانی كتێبە فەلسەفی و مەنطیق یەكان .

لەلای سەلەف و ئەهلی سوننە و جەماعە عەقیدە دائەمەزرێت لەسەر قورئان و بەڵگەی صحیح لە سوننەت و ئاثاری هاوەڵان، وە ئەو بەڵگە عەقڵیانەی كە تیایاندایە.

بەڵام بەناوزانستی الكلام پشتی كردووتە قورئان و فەرمووده و ئاثار، بەڵكو پشت ئەبەستێت بە بەڵگە عەقڵیە مەنطیق ـیەكان كە بریتین لە كۆمەڵێك یاسای فەلسەفی .

ئەتوانین بڵێین ئەهلی الكلام زیاتر لەوەی كاریگەر بن بە قورئان و سوننەت؛ كاریگەرن بە كۆمەڵە شتێكی تر لە دەرەوەی قورئان و سوننەت، وە لە كاتی ئیختیلافی ئەم دووانەدا پشت لە قورئان و سوننەت ئەكەن بە ئاشكرا؛ یاخود بەزۆر ماناكانیان ئەگۆڕن بۆ گونجاندنیان لەگەڵ بەناو بەڵگە الكلام یەكاندا .

ئەو ڕێچكەیەی كە سەلەف و ئەهلی سوننە لەسەرینی هەتا قیامەت؛ ڕێچكەیەكی داهێنراو و دروستكراو نییە، بەڵكو سەرچاوەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ كەلامی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ، بەڵام ڕێچكەی ئەهلی الكلام ڕێچكەیەكی داهێنراوە، رسول الله ﷺ نەیزانیوە، وە هاوەڵان و تابیعیەكان؛ وە پاش ئەوانیش لە پێشەوا بەڕێزەكان كاتێك ئەم بەناوزانستە لە سەردەمیاندا

داهێنراوە خویـان نەداوەتێ و بەکـاریـان نەهێنـاوە؛ بەڵکو ئەو لارێیـانەی کە لەو سەردەمەدا خوویان داوەتێ بە زەندیق ناویان بردوون .

ئەو زانسـتەی سـەلەف لەسـەریبوون دەربڕین و لفظ ـــی داهێنراوی تیادا نەبووە بەڵکو هەر دەربڕیانە بووە کە لە قورئان و فەرموودەدا خۆیان یان ماناکانیان هاتوون، بەڵام بەناوزانســـتی الكلام زۆرێک لە دەربڕینە داهێنراو و بیدعیەکان و، ڕەئـــو دەسـتەواژە فەلسـەفی مەنطیق ـــەکانی تێدایە، وە لەژێر ئەو دەسـتەواژە کەلامیانەدا کوفر و زەندەقە داپۆشراون .

ئەهلی الكلام لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە کەلامی الله عز وجل و فەرموودەی پێغەمبەرەکەی ﷺ دڵنیایی نابەخشـن، بەڵکو تەنها ئەگەر و ظَنّ ئەبەخشـن، وە بۆیە ظَنّ یش پشتی پێ نابەسترێت لە عەقیدەدا .

هەربۆیە لەلای ئەوان نەقڵ و عەقڵ لەگەڵ یەکدا ناگونجێن، هەربۆیە هاتن عەقڵی پووچی خۆیان پێشـــخســـت بەســـەر وتەی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە چەنـدین دەســـتەواژەی بیـدعی موجمەلی کوفرلەخۆگرتوویـان وەکو (التحييز و، التركيـب و، الجوهر و، العرض و، الإفتقـار و، الكلام النفســي و، الكســـب و جســـم و . . . ) کە نە الله عز وجل لە قورئاندا باســـی کردووە، وە نە پێغەمبەرەکەی ﷺ و هاوەڵان و پاش ئەوانیش زانیویانە .

دواتر هـاتن فەرمـایشـــتی الله عز وجـل و پێغەمبەرەکەیـان دا لە قـاڵبی ئەو دەستەواژە بیدعیانەی کە دایانهێناوە، وە قورئان و فەرموودەیان لێکدایەوە پێیان، ئەوەی لەگەڵیان گونجا قبووڵیان کرد لەبەر گونجانیان لەگەڵ بەناوبەڵگە الكلام ــــەکاندا، وە ئەوەشـــی لەگەڵیان نەگونجا کافربوون پێیان و واتاکانیان گۆڕی تا لەگەڵ بەناوبەڵگە کەلامیەکاندا بگونجێن .

لە عەقیدەی سـەلەفدا قسـەکردن لە عەقیدە و بابەتە نادیارەکاندا (غەیبیات) وەســـتاوە لەســـەر بەڵگەی قورئان و ســـوننەت، بە هیچ جۆرێک بواری بۆچوون و قیاساتی عەقڵی تیایدا نییە .

ئەمە ئەسڵ و بنچینەیەکە کە موسوڵمانان هەر لە سەردەمی رسول الله ـــوە ﷺ لەسەریبوون و هەتا قیامەتیش لەسەری ئەبن بإذن الله .

دواتر پاش ئەوەی کتێبە یۆنانی و فارسـی و فەلسـەفیەکان وەرگێڕدران بۆ عەرەبی کە تەوەری باسـەکانیان لە قسـەکردن دەربارەی دروسـتکەر و نادیارەکان خۆیان ئەبینیەوە؛ بەڵا و نەهامەتیەکی گەورە ڕوویکردە موسـوڵمانان بەهۆی ئەم کتێبانەوە، وای لێهات کۆمەڵێک کە ڕۆئەچوون لە باسـکردنی بابەتەکانی ذات و سـیفاتەکانی الله عز وجل و نادیارەکان و قەدەر تەنها بە عەقڵ و بۆچوونی خۆیان، کۆمەڵە دەسـتەواژەیەکی لێکچووی کوفرلەخۆگرتوویـان بەکـارئەهێنـا تـا دینی موسوڵمانانی پێ تێکبدەن، وە دەستەواژەکانی خۆیانیان ئەڕازاندەوە بەناو کارکردن بە عەقڵ و ڕۆشنبیری و ئەم جۆرە قسە بەتاڵانە .

- هەربۆیە ئیمام أحمد دەربارەی ئەهلی الكلام ئەڵێت : (ئەوان ڕاجیاوان لە قورئاندا، موخالەفەی قورئانیان کردووە، کۆکن لەسەر موخالەفەکردنی قورئان، بە وتەیانێکی لێکچوو و موتەشابیهـ قسە ئەکەن، وە سەر لە خەڵکی تێکئەدەن بەو وتە موتەشابیهانەی ئەیڵێن) .

الرد على الزنادقة والجهمية

ئەو دەسـتەواژەیـانەی بەکـاری ئەهێنن ئەیڕازێننەوە، دواتر هەر بەو دەستەواژانە مەبەستە کوفریەکانی خۆیان دەرئەبڕن .

- وە الشـافعي دەربارەیان ئەڵێت : (حوکمی من دەربارەی ئەهلی الكلام ئەوەیە بە پەلی دارخورما لێیان بدرێت بخرێنە سـەر حوشـتر و بەنـاو هۆز و قەبیلەکاندا بگەڕێنرێن و بە دەنگی بەرز دەربارەیان بوترێت : ئەمە سـزای ئەو کەسەیە کە وازی کە قورئان و سوننەت هێناوە و ڕووی کردووەتە الكلام) .

ذم الكلام وأهله

- وە نصر المقدسي دەربارەیان ئەڵێت : (یاسای هاوەڵانی الكلام و بنچینە و پایەی دینەکەیان بریتیە لە : جەدەل و دەمەدەمێکردن لەو شـتانە و بەو شـتانەی

کە لە شــەرع ـــــدا نەهاتووە، وە هیچیەکێک لە زانایانی دین پێشــیان نەکەوتوون تیایدا، هەربۆیە پووچێتی و خراپێتیەکەی زانراوە).

**مختصر الحجة على تارك المحجة**

- إبن تيمية دەربارەی مەبەست لە (بەناوزانستی الكلام) ئەڵێت : (ڕاستیەکی عورفیە لەو کەسانەدا کە قسە ئەکەن لە دین ـدا بە جگە لە ڕێگەی پێغەمبەران).

**مجموع الفتاوى**

وە ئەڵێت : (أحمد تانەی داوە لە ئەو الكلام ـە داهێنراوەی کە زانایانی دیکە تانەیان لێداوە، وە ئەو الكلام ـەیە کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، وە قسەکردن لە الله و دینەکەیدا بەبێ زانست).

**درء التعارض بين العقل والنقل**

وە ئەڵێت : (ئەو الكلام ـــەی کە سـەلەفی ئوممەت و پێشـەواکانی کۆکبوون دەربـارەی زەمکردن و تـانەدان لێی، وە زەمکردن و تـانەدان لە هـاوەڵانی، وە نەهێکردن لێی و بە جـاهیـل دانـانی خـاوەنـانی، وە بە بیـدعەچی دانـان و گومڕادانانیان; ئەم ڕێگە بەتاڵانەیە کە نەفیکردنی سـیفاتەکانی الله ـــیان لەســەر بنیاتنا، وە نەفی سیفەتی بڵندێتی و بەرزبوونەوە لەسەر عەرش ـیان لەسەر بنیاتنا، وە هەر لە ڕێگەی ئەمانەوە قورئانیان کرد بە مخلوق، وە هەر بەمانە نەفی بینینی الله یان کرد لە بەهەشتدا.

ئەوان - **واتە ئەهلی الكلام** - لەو بابەتانەدا شوێنی چەند ڕێگەیەکی لار و پووچ کەوتن، وە بەڵگەیان هێنایەوە بە چەند شتێک کە درۆ و بەتاڵێتی لەخۆی گرتووە، جا بەهۆیەوە تووشـــی چەند بابەتێک بوون کە لەڕێگەیەوە پێچەوانەی قورئان و سوننەتیان کرد و عەقڵی ڕاشکاویان کرد، وە درۆزن و نەزان و زاڵم بوون لە زۆربەی بابەت و نامەکانیاندا.

وتەی سەلەف و پێشەوایان دەربارەی ئەوە ناسراو و بەناوبانگە.

وە لە زانایـان لەو بوارەدا كتێبی تـایبەتیـان دەربـارە نووسیــی، وەكو: أبو عبدالرحمن الســلمي، وە وەكو شـیخ الإســلام عبدالله بن محمد الأنصــاري، وە كتێبەكەی ناونا (ذم الكلام وأهله)).

الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة

لەلای موتەكەلیمە جەهمیەكان بەناوزانســتی الكلام ناوئەبرێت بە (زانســتی تەوحید) یان (بنچینەكانی دین)، بەڵام ئەمانە چ بنچینەیەكن لەكاتێكدا رســول الله ﷺ و هاوەڵان رضي الله عنهم و سـەلەفی ئوممەت پێی جاهیل بوون! وە بگرە بە هۆكاری كوفر و زەندەقەیان ناوبردووە!

وەک چۆن الشــاطبي ئەڵێت: (وە بە هەمان شـێوە (بنچینەكانی دین) كە بریتیە لە علم الكلام).

الإعتصام (١/٤٨)

وە النووي ئەڵێـت: (مەبەســـت لە الكلام بریتیە بنچینەكـانی دین، وە مەبەست كە المتكلمین بریتیە لە هاوەڵانی ئەم زانستە).

تهذيب الأسماء واللغات: (٤/١١٩)

لەكاتێكدا بەناوزانستی الكلام پڕە لە فەلسـەفە و تەحریف، وە ئیلحاد و شتی پووچ، وە كافر بوون و لادان لە ئایەتەكانی قورئان و فەرموودەكانی رسول الله ﷺ لەسەر ڕووكەشەكەی و حەقیقەتەكەی بە زبڵخانەی بۆچوونی فەیلەسووفەكان.

بێگومان ئەسڵی بەناوزانستی الكلام سەرچاوەی نەگرتووە لە موسوڵمانانەوە، بەڵكو وەكو وتمـان لە ئەنجامی وەرگێڕانی كتێبە یۆنـانی و فـارســیەكانەوە بوو بۆ عەرەبی كە دەربارەی ئیلاهیات نووســرابوو، هەربۆیە بەشـێک لەو بەناو زانایانەی زۆر خویان داوەتێ و پێی گەیشتوون بە ئەوپەڕی ئیلحاد فارس بوون، وەكو الفارابي و إبن ســینا و الجویني و فخر الرازي و أبو إســحاق الشــیرازي و الغزالي و الإیجي و الأمدي.

ئەشـــعەریەکـان وا خـۆیـان دەرئەخەن کە دژی موعتەزیـلە و پەکخەری سیفاتەکانن، بەڵام لەڕاستیدا هەمان بنچینە و پێشەکی; وە هەمان ئەنجامیان هەیە و لە بابەتە لاوەکیەکاندا جیاوازیان تێدایە، وە ئەشـــعەریەکان زۆر ســـوودیان لە موعتەزیلەکان بینیوە بۆ برەودان بە زەندەقەکەیان، بەشێوەیەک نابینی ئەشعەریە جەهمیەکان بەڵگەیەکی الكلام ـ بێننەوە بۆ بابەتێکی الكلام ـ ئیللا بنچینەکەی لەلای موعتەزیلەکان هەیە .

بۆ نمونە هەریەک لە بابەتی (الحدوث) و، (الحركة والســـكون) و (الجوهر الفرد) ــیان لە أبو هذيل العلاف المعتزلي وەرگرتووە کە ئیمامی اللالكائي لە بابەتی فەرمووده الصادق المصدوق ـدا دەربارەی ئەڵێت : (أبو هذيل ى کافری ڕەتکەرەوە درۆی کرد، لەعنەتی الله ى لێبێت) .

شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة : ٩٧٨

ئەهلی الكلام هێنـدە بێچـاووڕوون دێن زەنـدەقەکەی خـۆیـان لەلای خەڵکی جوان ئەکەن و بە (عیلمی کەلامی ئیسـلامی) یاخود (فەلســەفەی ئیسـلامی) ناوی ئەهێنن، ئەمە لەکاتێکدا سەرچاوەی ئەم بەناوزانستە نە ئیسلامە وە نە داهێنراوی موسـوڵمانانە، لەڕاسـتیدا ئەوانە بەتەواوی لایانداوە لە قورئان و سـوننەت، چونکە هیچ پێویســـتیان بە قورئان و ســـوننەت نییە لە دانانی ئەســـڵەکانیاندا ئەگەرچی پێچەوانەکەشی بدەن بە گوێی خەڵکیدا .

ســـەیر لەوەدایە بەنـاوزانســـتی الكلام بە (بنچینەکـانی دین) نـاوئەهێنن لەکاتێکدا قورئان و سوننەت بەریە لەو دین و بنچینەیانە .

القاضي عبدالجبار المعتزلي و أبو منصـور البغدادي الأشـعري هەر یەکێکیان کتێبیان نووسیوە دەربارەی الكلام و ناویان ناوە (أصول الدين) .

وە الجويني بەناوی (الشامل في أصول الدين) .

وە فخر الرازي بەناوی (الأربعين في أصــول الدين) کە لە ڕاسـتیدا بنچینەی ئەو دینەیە کە خۆیان لەسەرینی نەوەک دینی ئیسلام .

الشهرستاني الأشعري له كتێبی (الملل والنحل) ـــدا باسی ئه‌وه ئه‌كات كه پێشـــه‌وا گومڕاكه‌ره‌كانی موعته‌زیله كاریگه‌ر بوون به فه‌یله‌ســوفه یۆنانیه‌كان، له‌كاتێكدا ئیمامه‌كه‌ی خۆشی أبو الحسن الأشعري ته‌له‌به‌ی جبائي المعتزلي بووه و چل دانه ساڵ عه‌قیده‌ی ئه‌وانی وه‌رگرتووه و له‌ســه‌ر ده‌ستی ئه‌وان گه‌وره بووه و الكلام له‌وانه‌وه فێر بووه، پاشان مه‌زهه‌بی ئه‌شعه‌ریه‌تی له‌سه‌ر هه‌مان مه‌نهه‌جی الكلام ـــــی دروســـت كردووه و له بابه‌ته‌كاندا هه‌مان ڕێچكه‌ی موعته‌زیله‌كانی گرتووه‌ته‌به‌ر له به‌ڵگه‌هێنانه‌وه بۆ بابه‌ته‌كان .

جا ئه‌گه‌ر بوترێت جه‌همی و موعته‌زیله‌كان نه‌وه‌ی فه‌یله‌ســووفه‌كانن، ئه‌وكات ئه‌ولاتره بوترێت ئه‌شـــعه‌ری و ماتوریدیه‌كانیش نه‌وه‌ی جه‌همی و موعته‌زیله‌كانن، وه بگره له‌چاو جه‌همی و موعته‌زیله‌كاندا په‌كخســـتن و فێڵ و ته‌ڵه‌كه‌بازی زیاتریان هه‌یه .

## بەناوزانستی الكلام لە زانستە موعتەبەر و خاوەن سەنگەكانی دین نییە، وە ئەهلەكەی لە زانایانی دین نین

ئەهلی سوننە لە كۆن و نوێدا كۆڕابوون لەسەر زەمكردن و تانەدان و ئاگاداری دان لە بەناو زانستی الكلام و ئەهلەكەی .

- عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : چوومەماڵەوە بۆ لای مالک بن أنس و پیاوێک لەلای بوو پرسیاری لێ ئەكرد دەربارەی قورئان .

ئەویش وتی : (لەوانەیە تۆ لە هاوەڵانی عمرو بن عبيد بیت، لەعنەتی الله لە عمرو، ئەو ئەم بیدعە كەلامیەی داهێنا، خۆ ئەگەر الكلام زانســـت بوویایە ئەوە هاوەڵان و تابیعیەكان قســەیان تیادا ئەكرد وەک چۆن قســەیان كردووە لە حوكم و فەرز و حەڵاڵ و حەرامەكاندا، بەڵام باتڵێكە كە بەرەوڕووی باتڵێكت ئەبات) .

- الشافعي ئەڵێت : (ئەگەر پیاوێک وەسیەت بكات بە كتێبە زانستیەكانی وە كتێبی كەلامیشــی تێدا بێت ئەوە ناچنە ناو وەســیەتەكەوە، چونكە الكلام زانســت نییە) .

- أحمد بن الوزير القاضي ئەڵێت : وتم بە أبو عمر الضرير : پیاو شتێک لە الكلام فێر ببێت ڕەددی نەزانەكانی پێ بداتەوە ؟

وتی : (الكلام هەمووی نەزانیە، وە تۆ هەتا زیاتر زانا بیت بە نەزانی؛ ئەوە نەزانتری بە زانست) .

ذم الكلام وأهله

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت : وترا بە هشـــام بن عبيدالله كاتێک برا بۆ لای المأمون پێی وت : قسه بکه لەگەڵ بشر المريسي دا .

هشام وتی : (الله خەليفه باش بکات، من له الكلام ـەکەی ئەودا باش نيم، وە زانا بە الكلام ـەکەی ئەو لەلای ئێمە جاهيلە) .

الإبانة الكبرى

- أبو عمر إبن عبـدالبر ئەڵێـت : (ئەهلی ئەثەر و فەقیهەکـان لە هەموو شـــارەکان کۆڕان لەســـەر ئەوەی ئەهلی الكلام ئەهلی بيدعه و لادانن، وە لەلای هەمووان له ڕیزی فەقیهەکان حسابیان بۆ ناکرێت، بەڵکو زانایان بریتین لە ئەهلی ئاثارەکان و تێگەیشتن تیایاندا) .

جامع بيان العلم وفضله

- قوام السـنـة الأصـبهاني باب ـــێکی داناوە بەناوی : (ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتانەی پیاو پێی ئەبێت بە پێشەوا لە دیندا، وە ئەهلی الكلام لە زانایان نین) .

الحجة في بيان المحجة

- أبو المظفر الســـمعاني ئەڵێت : (بزانە کە پێشـــەوا تێپەڕیوەکان و خاوەن زانستەکان لە پێشینان ئەم جۆرە لە الكلام و تێگەیشتنە ـــیان فەرامۆش نەکردووە لەبەر ئەوەی توانایان بەسەردا نەشکابێت، یاخود بەدەستیان نەگەیشتبێت، وە خـاوەن ژیریەکی فراوان و تێگەشـــتنێکی قووڵ و جێگیر بوون، لەکـاتێکـدا ئەم فیتنەیانە لە سەردەمی ئەواندا ڕوویدا و دەرکەوت، بەڵکو وازیان هێناوە لەم ڕێگەیە و لێیـان لادا لەبەر ترســی فیتنەکەی، وە ئەوەی کە ئەینـازانی دەربـارەی خراپی چارەنووسەکەی، وە بێزراوی ئەوەی کە دایشاردووە لە ناواخندا .

بەڕاستی لە دینەکەیاندا بەرچاوڕۆشن بوون، بەهۆی ئەوەی الله عز وجل بە ڕووناکی خۆی ڕێنمونی کردبوون، وە سـنگی فراوان کردبوون بە ڕۆشـنايی ناسـينی خۆی، جا بينيان لەوەی کە لەلايانە لە زانســتی قورئان و وەســتانی ســـوننەت و

ڕوونکردنەوەکەیدا بێپێویستی تێدایە لە شتەکانی دیکە، وە بەڵگە جێگیر و تەواو بووە بە قورئان و سوننەت، وە گومانەکان پێیان لاچوون .

پاش ئەوەی کات تێپەڕی و، عەزیمەتیان پوکایەوە بۆ بەدەستهێنانی زانستە ڕاستیەکانی قورئان و سوننەت; وە گرنگیپێدانیان کەمی کردەوە، وە مولحیدەکان بە گومانەکانیان تەنگیان پێهەڵچنیبوون، وایان دانا ئەگەر بەم جۆرە لە الكلام و بەڵگە عەقڵیانە لە خۆیان دووریان نەخەنەوە ناتوانن بەسەریاندا سەربکەون، وە بە بەڵگە ناتوانن بەسەریاندا زاڵبن، ئەمەش بریتیبوو لە بۆچوونێکی گومڕایانە و هەڵخەڵەتاندنێک لەلایەن شەیتانەوە .

وە زانیمان کە پێغەمبەر ﷺ بانگی نەکردوون لەم بابەتانەدا بۆ بەڵگە هێنانەوە بە (الأعراض) و (الجواهر)، وە هیچ کەسێک لە خەڵکی ناتوانێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ یان لە یەکێک لە هاوەڵانیەوە رضـي الله عنهم یەک پیت یان زیاتر بگێڕێتەوە نە بە شێوەیەکی تواتر وە نە بە آحاد، هەربۆیە زانیمان ئەوانە - واتە ئەهلی الكلام - پێچەوانەی ڕێچکەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان رضـي الله عنهم ڕێیان کرد، وە ڕێگەیەکی جیاواز لە ڕێگەی ئەوانیان گرتەبەر، وە ئەم ڕێگە تازە داهێنراوە نە رسول الله ﷺ و نە هاوەڵانی رضي الله عنهم لەسەر نەبووە، وە بگرە گرتنەبەری ئەم ڕێگەیە ئەبێت بە مایەی تانەلێدان و عەیبدارکردنیان، وە دانەپاڵیان بۆ لای نەزانی و کەمی زانست لە دین) .

## الإنتصار لأصحاب الحديث

- قوام السنة الأصبهاني لە (الحجة في بيان المحجة) ـدا ئەڵێت : (سەلەف ئینکاریان کرد لە قسەکردن لە (الجواهر) و (الأعراض) ـدا، وە وتیان نە لە سەردەمی تابیعیەکاندا هەبووە نە لە سەردەمی هاوەڵاندا، الله عز وجل لە هاوەڵان ڕازی بێت، وە ڕەحم بکات بە تابیعیەکان، یان ئەوەتا قسەیان تیادا نەکردووە و زانابوون دەربارەی، جا ئێمەش قسەنەکردن تیادا بەسمانە لەوەی کە ئەوان قسەیان تیایدا نەکردووە، یاخود لێی بێدەنگ بوون و زانا نەبوون دەربارەی، جا ئێمەش بەسمانە ئەوە نەزانین کە ئەوان نایزانن) .

## ئیجماع دەربارەی حەرامێتی فێربوون و فێرکردنی بەناوزانستی الكلام

وتەی زانایان زۆرە دەربارەی هەبوونی ئیجماع لە کۆن و نوێدا سەبارەت بەحەرامدانانی بەناوزانستی الكلام، وە دەربارەی ئەوەی کە زانستێکی داهێنراوە و سەرئەکێشێت بۆ زەندەقە و گومان بۆ دروست بوون لە دیندا .

- أحمد بن حنبل دەربارەی ئەڵێت : (گەیشتین بە زانایان و نەیانئەزانی ئەمە چییە، وە خۆیان بەدوور ئەگرت لە ئەهلی الكلام، وە چارەنووسی الكلام بەرەو باشی ناڕوات، الله ئێمە و ئیوەش بپارێزێت لە هەموو فیتنەیەک، وە ئێمە و ئێوەش سەلامەت بکات لە هەموو بەهیلاکچوونێک) .

وە ئەڵێت : (ئەوەی ئێمە بیستوومانە، گەیشتوون بەوەی کە گەیشتوون پێی لە زانایان : ڕقیان بووە لە الكلام و دانیشتن لەگەڵ ئەهلی زەیغ و گوماندا، بەڵکو دین بریتیە لە تەسلیمبوون و بەسبوونی ئەوەی کە لە کتێبی الله عز وجل و سوننەتی رسول الله دا ﷺ هەیە) .

**الإبانة الكبرى**

وە ئەڵێت : (هەمیشە الكلام لەلای ئەهلی خەیر تانەلێدراو و زەمکراو بووە) .

وە ئەڵێت : (پەیوەست بن بە سوننەتەکانەوە، وە ئەوەی کە زانایانی پێش ئێوە لەسەری بوون، چونکە ئەوان ڕقیان لە الكلام و ڕۆچوون بوو لەگەڵ بیدعەچییەکاندا) .

**تاريخ الإسلام**

- البخاري ئەڵێت : (ئەوەی کە زانراوە لە أحمد و زانایانەوە ئەوەیە کە ڕقیان لە گەڕان و بەدواداچوون بووە بۆ شـــتە نارِوونەکان، وە خۆیان بەدوور گرتووە لە ئەهلی الکلام) .

### خلق أفعال العباد

- علي بن خشـــــــرم ئەڵێت : بشـر بن الحارث بە نووسـین بۆی ناردم : (موخالەفەی پێشەواکان مەکە، چونکە هەرگیز هاوەڵی الکلام سەرفراز نەبووە) .

### ذم الكلام وأهله

- أبو القاسم الزنجاني ئەڵێت : (بەردەوام زانایان لە ســـەرەتای ئیســـلامەوە هەتا ئێســتا ئینکاریان لەم زانســتە کردووە کە پێی ئەوترێت (الکلام)، وە جەهل و نەزانیەکی ڕوونە، وە دەرچوونە لە دین، کۆڕان لەسـەر زەمکردنی، وە حاشـاکردن لە ئەهلەکەی و هەجرکردنی ئەو کەسـەی پێی وایە دین و هۆکاری نزیکبوونەوەیە لە الله عز وجل) .

وە ئەڵێـت : (بەڕاســتی فەرموودەیـانێـک هـاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی زەمکردنی الکلام و ئەهلەکەی، وە لە ســـەلەفەوە هاتووە لە هاوەڵان و تـابیعین و پاش ئەوان لە زانایانی دین لە کۆبوونەوەی وتە لەســـەر تـانەلێدان و ڕەتکردنەوەی، وە خۆبەریکردن لە لێی و لە ئەهلەکەی) .

### شرح منظومة أبو القاسم الزنجاني

- أبو منصـــور معمر بن أحمد لەو عەقیدەدا کە ئیجماعی ئەو زانایانە نقڵ ئەکات پێیان گەیشـــتووە ئەڵێت : (لە ســـوننەتە وازهێنان لە بۆچوون و قیاس لە دینـدا، وە وازهێنـان لە دەمەدەمێ و جیـدال، وە وازهێنـان لە کردنەوەی بـابەت لەگەڵ قەدەریەکان، وە وازهێنان لە هاوەڵانی الکلام و تەماشـــاکردنی کتێبەکانی الکلام، وە کتێبی ئەســتێرەکان، ئەمە ئەو ســوننەتەیە کە پێشــەواکان لەســەری کۆکبوون) .

### الحجة في بيان المحجة

- البغوي ئەڵێت : (زانایانی سەلەف لە ئەهلی سوننە کۆڕان لەسەر نەهیکردن لە دەمەدەمێ و جیدال لە سیفاتدا، وە ڕێگریکردن لە ڕۆچوون کە زانستی الکلام و فێربوونی ) .

شرح السنة

- السمعاني ئەڵێت : (وە قسەکردن دەربارەی بابەتەکانی دین و ئەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ عەقیدە لە ڕێگەی عەقڵەوە; نەگواستراوەتەوە لە هیچ یەکێکیانەوە بەڵکو هەژماریان کردووە لە بیدعەکان، وە ڕێگریان لێ کردووە بە ئەوپەڕی ڕێگری و نەهیان لێ کردووە ) .

وە ئەڵێت : (هەربۆیە یەکێک لە زانایانی سەلەف وتوویەتی ئەهلی الکلام دوژمنانی دینن، لەبەر ئەوەی پشتیان بەستووە بە هەست و گومانەکانی خۆیان، وە بە ئەوەی کە بۆچوونی خۆیان ئەگات پێی، پاشان فەرموودەکان بەراورد ئەکەن پێی، جا ئەوەی لەگەڵی گونجا ئەوە قبووڵی ئەکەن، وە ئەوەی موخالەفەی کرد ئەوە ڕەتی ئەکەنەوە ) .

الإنتصار لأهل الحديث

- إبن قدامة المقدسي ئەڵێت : (ڕوونمان کردەوە خراپی زانستی الکلام لە بنچینەوە، وە زەمکردنی پێشەواکانمان بۆی، وە کۆڕابوونی زانایان لەسەری کە هاوەڵانی الکلام بیدعەچی و گومڕان، وە هەژمارنەکراون لە زانایان، وە هەرکەسێک خووی بداتێ تووشی زەندەقە ئەبێت و سەرفراز نابێت ) .

تحريم النظر في كتب الكلام

- إبن تيمية ئەڵێت : (سەلەف و هەموو پێشەوایان زەمی الکلام ی داهێنراو و ئەهلەکەی ـــیان کردووە، وە هەواڵیان داوە ئەوان بە نەزانی قسە ئەکەن، وە موخالەفەی قورئان و سوننەت و ئیجماعی سەلەف ئەکەن; لەگەڵ ئەوەی کە وتەکەیان نەزانی و گومڕاییە و پێچەوانەی عەقڵە وەک چۆن پێشەوانەی شەرعە ) .

درء التعارض بين العقل والنقل

وە ئەڵێت : (سەلەف و پێشەوایان زەمی ئەهلی الكلام ــە بیدعەچییەكانیان كردووە ئەوانەی كە موخالەفەی قورئان و ســوننەتیان كردووە، وە هەركەســێک موخالەفەی قورئان و ســوننەت بكات وتەكەی هیچ نییە جگە لە باتڵێک، جا ئەو الكلام ـــەی سەلەف زەمی كردووە زەم ئەكرێت و تانەی لێ ئەدرێت لەبەر ئەوەی باتڵە، وە لەبەر ئەوەی موخالەفەی شەرع ئەكات ) .

**النبوات**

- إبن رجب ئەڵێت : (لەگەڵ ئەوەدا چوونەناو وتەی موتەكەلیم و فەیلەسووفەكان شەڕ و خراپەیەكی تەواو و بێخەوشە .

وە كەم كەس هەیە چووبێتە ناو شتێک لێیەوە ئیللا تێوەگیلاوە بە هەندێک زەرەریان، وەک چۆن أحمد وتوویەتی : (ئەوەی تەماشـــای الكلام بكات بەتاڵ نابێت لە جەهمیەت ) .

ئەو و جگە لە ئەو لە پێشــەوایانی ســەلەف ئاگاداریان داوە دەربارەی ئەهلی الكلام ئەگەرچی بەرگریش لە سوننەت بكەن ) .

**بيان فضل علم السلف على علم الخلف**

وە لە باســی ژیاننامەی إبن تيمية ـــــدا ئەڵێت : (وە چەندین كۆمەڵە لە پێشەوایانی ئەهلی حەدیث و حافظ و فەقیهەكانیان شێخیان خۆشئەویست و بە گەورەیان دائەنا، وە حەزیان لەو ڕۆچوونەی نەبوو لەگەڵ ئەهلی الكلام و فەیلەســوفەكاندا، وەک چۆن ئەوەش ڕێچكەی پێشــەوایانی ئەهلی حەدیثە پێشینەكان بووە وەكو الشافعي و أحمد و إسحاق و أبو عبيد و هاوشێوەكانیان ) .

**ذيل طبقات الحنابلة**

- السمعاني ئەڵێت : (بزانە ئەوەی ئێمە و بیدعەچیەكان لەیەک جیا ئەكاتەوە بابەتی عەقڵ ـــــە، ئەوان دینەكەیان بنیادناوە لەســەر ئەوەی كە عەقڵ پێی گەیشتووە، وە شوێنكەوتن و ئەوەی جێماوە كردوویانە شوێنكەوتەی ئەوەی بە عەقڵ پێی ئەگەیرێت .

الإنتصار لأهل الحديث

بەڵام ئەهلی سوننە وتیان : ئەسڵ لە دیندا شوێنکەوتنە، وە عەقڵەکانیش شوێنکەوتەن ) .

- إبن تيمية ئەڵێت : (ئەسڵ و بنچینە لە زەمی سەلەف بۆ الكلام بریتیە لە لەخۆگرتنی بابەتانێکی درۆ و کۆمەڵە پێشەکیەکی خراپ کە بوختان و بەجەهل قسەکردنی لەخۆ گرتووە دەربارەی الله تعالى و کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی ﷺ و دینەکەی .

وە سەلەف و پێشەوایان زەمی الكلام ـیان نەکردووە و تانەیان لێ نەداوە تەنها لەبەر ئەو دەستەواژە داهێنراوانەی وەکو (الجوهر و العرض و الجسم) و جگە لەوانە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو مانایانەی کە دەریئەبڕن بەم دەستەواژانە تیایدایەتی لە باتڵی تانەلێدراو لە بەڵگە و حوکمەکاندا کە واجبە نەهی لێکردنی، بەهۆی لەخۆگرتنی ئەم دەربڕینانە بە مانایانێکی گشتگیر لە نەفیکردن و جێگیرکردن ) .

وە ئەڵێت : (وە أحمد رضي الله عنه ڕەددی جەهمیەکان و جگە لەوانی دایەوە بە بەڵگە بیستراو و عەقڵیەکان، وە بەشێوەک باسی قسە و بەڵگەکانیانی کردووە کە جگە لە ئەو بەوشێوەیە باسیان نەکردووە، بەڵکو باسی ڕێباز و بەڵگەکانی کردووە بە تەواوترین باسکردن، پاشان ڕەددی داوەتەوە و هەڵیوەشاندووەتەوە بە شەرع و عەقڵ ) .

وە ئەڵێت : (وە لە پێشەواکانی تر خاوەنی وتەیانێکی بەناوبانگتر و زۆرترە لە بنچینەکانی دیندا بە بەڵگە بنبڕکەر و عەقڵیەکانی، چونکە تاقیکرایەوە لەلایەن پێچەوانیکارەکانی سوننەتەوە، هەربۆیە پێویستی بەوە بوو، وە ئەوەی هەیە لە وتەکانیدا لە بەڵگەهێنانەوە بە بەڵگە عەقڵیەکان بەشێوەیەک لەگەڵ سوننەتدا ئەگونجێت هاوشێوەی نییە لە وتەی پێشەوایانی تردا ) .

درء التعارض بين العقل والنقل

## بەناوزانستی الكلام سەرئەكێشێت بۆ كوفر و زەندەقە، وە هاوەڵانی زەندیقن و سەرفراز نابن

- الأوزاعي ئەڵێت : (دوور بكەوەرەوە لە زانستێك كاتێك گەیشتیتە كۆتاییەكەی بتدەنە پاڵ زەندیقبوون، بەڵكو دەست بگرە بە شوێنكەوتن و لاساییكردنەوە) .

- الشافعي ئەڵێت : (هیچ كەسێك خووی نەداوەتە الكلام و سەرفراز بووبێت) .

- المزني ئەڵێت : پرسیارم كرد لە الشافعي دەربارەی بابەتێك لە الكلام، وتی : (پرسیارم لێبكە دەربارەی شتێك كاتێك هەڵەم كرد تیایدا بڵێت هەڵەت كرد .

وە پرسیارم لێ مەكە دەربارەی شتێك كاتێك هەڵەم كرد تیایدا بڵێیت كافر بوویت) .

ذم الكلام وأهله

- عبدالله بن المبارك ئەڵێت : (هەركەسێك خووبداتە الكلام ئەبێت بە زەندیق) .

الإبانة الصغرى

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هەرگیز هاوەڵی الكلام سەرفراز نابێت، نابینی یەكێك تەماشای الكلام بكات ئیللا لە دڵیدا خراپەیەك هەیە) .

جامع بيان العلم وفضله

وە ئەڵێت : (هەركەسێک خووبداتە الكلام سەرفراز نابێت، وە هەركەسێک خووبداتە الكلام خاڵی نابێت لەوەی ببێت بە جەهمی).

**الإبانة الكبرى**

- إبراهيم الخواص ئەڵێت : (زەندیقبوون و كوفر و بیدعە و بوێری لە دیندا نەبووە ئیللا لە لایەنی الكلام و دەمەدەمە و جیدالەوە نەبێت).

**أحاديث في ذم الكلام وأهله**

- سهل بن محمد الصعلوكي ئەڵێت : (كەمترین شت لە الكلام ـــدا هەبێت لە خەسارەتمەندی : كەوتنی گەورەیی و شكۆی الله یە لە دڵدا).

**ذم الكلام وأهله**

- إبن تيمية ئەڵێت : (ئەبینیت ئەو كەسەی ڕاهاتبێت لەسەر بەرپەرچدانەوەی شەرع بە بۆچوون؛ ئیمان لە دڵیدا جێگیر نابێت، بەڵكو بەوشێوەیە ئەبێت كە پێشەوایان وتوویانە : (زانایانی الكلام زەندیقن)، وە وتوویانە : (كەم كەس هەیە تەماشای الكلام ـــی كردبێت ئیللا لە دڵیدا كینەیەک هەیە بەرامبەر موسوڵمانان)، وە مەبەستیان بە ئەهلی الكلام ئەوەیە دەربارەی الله قسە بكات بەوەی موخالەفەی قورئان و سوننەت ئەكات).

**درء التعارض بين العقل والنقل**

وە دەربارەی بەناوزانستی الكلام ئەڵێت : (وە ئەگەر بەردەوام تەماشای بكات و لێی بكۆڵێتەوە بۆی دەرئەكەوێت هەتا زیاتر باوەڕی بە ئەم الكلام ـــە هەبێت مونافیقتر و ڕەتكەرەوەترە بۆ ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، وە هەتا زیاتر شارەزا بێت دەربارەی ڕووی ڕاستی و خراپیەتی ئەم الكلام ـە ئیمان و زانستی زیاد ئەكات بە حەقیقەتی ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، وە لەبەر ئەمەشە لە پێشەواكان وتوویانە : (زانایانی الكلام زەندیقن).

وە هەر لەبەر ئەمەشـە وتراوە : حەقیقەتی ئەوەی ئەوانە نووسیویانە لە كتێبەكانیاندا لە الكلام ـی باتڵ و داهێنراوی موخالیفی شەرع و عەقڵ بریتیە لە :

(ڕیزکردنی بنچینەکان بۆ بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر ، وە موخالەفەکردنی ڕاشکاوی مێشک و صحیح یێکی گواستراوە یە ) .

**درء التعارض بين العقل والنقل**

# ئاگاداریدان لە دەمەدەمێکردن لەگەڵیان و ڕەددانەوەیان بە الکلام بۆ ڕوونکردنەوەی گومڕایەتیەکەیان

- رستم ئەڵێت : وترا بە عبدالرحمن بن مهدي : فڵانە کەس کتێبێکی نووسیوە تیایدا بەرگری ئەکات لە سوننەت وەکو ڕەددانەوە لە دژی فڵانە کەس .

عبدالرحمن وتی : (ڕەددێک بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ؟) .

وترا : بە الکلام .

وتی : (ڕەددی باتڵێکی داوەتەوە بە باتڵێک) .

الحلية

- حنبل وتی : گوێبیستی أبو عبدالله بووم وتی : (هەرکەسێک کەیفی بە الکلام بێت سەرفراز نابێت، کۆتایی قسە و دینەکەیان باش نابێت) .

وە گوێبیستی بووم وتی : (پەیوەست بن بە سوننەت و فەرموودە، وە ئاگاداری دەمەدەمێکردن و ڕۆچوون بن، چونکە ئەوەی حەزی لە الکلام بێت سەرفراز نابێت) .

وە پێی وتم : (لەگەڵیان دامەنیشە و قسە لەگەڵ هیچکامێکیان مەکە، گەیشتین بە خەڵکی نەیانئەزانی ئەمە چییە، وە خۆیان لە هاوەڵانی الکلام بەدوور ئەگرت، چارەنووسی الکلام بەرەو خێر و باشە نییە) .

وە گوێبیستی بووم وتی : (هیچ کەسێکم نەبینیوە بەدوای الکلامەوە بووبێت و حەزی پێ کردبێت و سەرفراز بووبێت، چونکە ئەیگەیەنێت بە قسەیەکی

گەورە، لەم ڕۆژانەدا بە کۆمەڵە قسـەیانێکیان کرد و بەڵگەیان بە شـتێک هێنایەوە دڵم هێندە بەهێز نییە و زمانیشم ناتوانێت بیگێڕێتەوە).

- أحمد بن أصرم المزني ئەڵێت: ئامادە بووم لەلای أحمد بن حنبل کە الهمداني پێی وت: من جار جار وەڵامیان ئەدەمەوە.

أحمد وتی: (دەمەدەمێ و جیدال پێویست نییە).

أحمد چوویە مزگەوتەوە و نوێژی کرد، کاتێک نوێژی سـوننەتی کرد وتی: (تۆ عباس یت؟).

وتی: بەڵێ.

أحمد وتی: (لە الله بترسـە، پێویسـت ناکات خۆت تەرخان بکەیت و بەناوبانگ بیت بە الکلام، وە بە نووسینی کتێب، ئەگەر ئەمانە باش بووبانە ئەوە هاوەڵان رضـي الله عنهم پێشـمان ئەکەوتن بۆی، هیچ شـتێکم نەبینیوە ئا لەم کتێبانە - واتە هی الکلام -، ئەمانە هەمووی بیدعەیە).

وتی: لێت قبووڵکراوە ئەی أبو عبدالله، داوای لێخۆشـبوون لە الله ئەکەم و ئەگەڕێمەوە بۆ لای، من بەدوایانەوە نیم و تەقە نادەم لە دەرگاکانیان، بەڵکو ئەبینم قسـە ئەکەن بە الکلام و کەس وەڵامیان ناداتەوە، منیش خەفەت ئەخۆم و ئارام ناگرم ڕەددیان نەدەمەوە.

أحمد چەند جارێک پێی وت: (ئەگەر کەسـێک بە نیەتی ڕێنمونی هات ڕێنمونی بکە).

- أبو الحارث ئەڵێت: پرسـیارم کرد لە أبو عبدالله وتم: لێرە کەسـانێکی لێیە موناقەشـە ئەکەن لەگەڵ جەهمیەکاندا و ئەچنە ناو وردەکاری بابەتەکانەوە لەگەڵیاندا، بۆچوونت چییە؟

وتی : (قسەکردنم پێ باش نییە لە هیچ یەکێک لەم هەوا و ئارەزووویانەدا، وە پێم باش نییە هیچ کەسێک دەمەدەمێیان موناقەشەیان لەگەڵدا بکات، ئایا معاویة بن قرة ناڵێت : (دەمەدەمێکردن کاروکردەوە پووچەڵ ئەکاتەوە ؟) .

الکلام خراپ و پیسە، سەرناکێشێت بۆ شتێکی باش، خۆتان بەدوور بگرن لە ئەهلی جیدال و الکلام، وە دەست بگرن بە سوننەت و ئەوەی زانایانی پێش خۆتان لەسەری بوون، ئەوان ڕقیان لە الکلام و ڕۆچوون لەگەڵ بیدعەچیەکاندا بوو، بەڕاستی سەلامەتی لە وازهێنانیدایە، فەرمانمان پێ نەکراوە بە دەمە دەمە و جیدال، ئەگەر کەسێکتان بینی حەزی لە الکلام بوو ئاگاداری بن) .

السنة لـ الخلال

- حنبل ئەڵێت : پیاوێک نامەیەکی نووسی بۆ أبو عبدالله رحمه الله داوای مۆڵەتی لێ ئەکرد تا کتێبێک دابنێت تیایدا ڕەددی بیدعەچیەکان بداتەوە، وە لەگەڵ ئەهلی الکلام دا موناقەشە بکات و بەڵگە لەدژیان بهێنێتەوە .

أبو عبدالله بۆی نووسی : (بسم الله الرحمن الرحيم، الله عاقیبەتت بەخێر بگێڕێت، وە هەموو ناخۆشی و خراپەیەکت لێ دووربخاتەوە .

ئەوەی کە ئێمە بیستوومانە و گەیشتووین پێی لە زانایان بریتیە لەوەی ئەوان ڕقیان لە الکلام و، دانیشتن لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا بوو، وە بابەتەکە بریتیە لە تەسلیمبوون و گەڕانەوە بۆ ئەوەی لەناو کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەردا هەیە; نەوەک لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی بیدەع و گومان و ڕەددانەوەیان، چونکە ئەوان سەرت لێ تێک ئەدەن و خۆشیان ناگەڕێنەوە .

جا سەلامەت بوون إن شاء الله لە دانەنیشتن لەگەڵیان و موناقەشەنەکردنە لەگەڵیان لە بیدعە و گومڕایەتیەکەیاندا) .

- أحمد بن حنبل باسی یەکێک لەو جەهمیانە ئەکات کە لەکاتی میحنەکەدا ویستوویەتی موناقەشەی لەگەڵدا بکات : (ئەمە کوفرە بە الله،

نەمئەزانی ئەم کۆمەڵەیە **- واتە ئەهلی الکلام -** بەمجۆرەن، ئەو ڕۆژە برغوث ئەیوت : (جسم و ئەوە)، وە قسەیەک کە لێی تێ نەئەگەیشتم .

منیش وتم : نازانم ئەمە چییە، تەنها ئەوە نەبێت ئەزانم کە الله تاک و تەنها و بێپێویستە، هیچ هاوشێوە و هاوتایەکی نییە، وە ئەو بەو شێوەیەیە کە وەسفی خۆیی کردووە) .

**الإبانة الكبرى**

ئەشعەریە جەهمیەکانیش بە خودی سەلەف و شوێنکەوتووەکانیان ئەڵێن موجەسیمە، وە هەمان وتە و موناقەشە و فیکرەی برغوث و بشر المريسي جەهمی بەکارئەهێنن دژی شوێنکەوتووەکانی رسول الله ﷺ .

- السمعاني ئەڵێت : (ڕەددی بیدعە ئەدرێتەوە بە ئەثەر نەوەک بە بیدعەیەکی وەکو خۆی .

جا ئەوانە پێشەوایانێکن کە گەڕانەوە لە دین و ڕوونکردنەوەی شەرع هەر بۆ لای ئەوانە، وە هەرکەسێک لە پاش ئەوان ڕێگەی ئیسلامی گرتەبەر ئەوە شوێن ئەوان ئەکەوێت، وە شوێنپێی ئەوان هەڵئەگرێت، وە هەوڵ ئەدات موافەقەی ئەوان بکات، هەربۆیە ڕێگەپێدراو نییە موسوڵمان گومانی خراپیان پێ ببات، وە گومانی ئەوەیان پێ ببات کە ئەو قسانەیان بە جەهل و کەمی زانست و تەجرووبە لە دیندا کردووە) .

**الإنتصار لأصحاب الحديث**

- إبن بطة ئەڵێت : (گەر کەسێک بڵێت : ئاگادارت کردینەوە لە مشتومڕ و دەمەقاڵێ و جدال و مونازەکردن، وە زانیمان ئەوەی باست کرد حەقە و ڕێبازی زانایان و ڕێگای هاوەڵان و عاقڵانە لە ئیمانداران و زانایە بەرچاو ڕۆشنەکان، گەر کەسێک هاتە لام پرسیاری لێکردم دەربارەی شتێک لەم بیدعانەی کە دەرکەوتوون، وە ئەو مەزهەبە ناشرینانەی کە بڵاو بوونەتەوە، وە قسەم لەگەڵ

ئەكات بە شتانێک چاوەڕێ ئەكات وەڵامی دەستكەوێ لێم، وە من لەو كەسانەی كە الله زانستی ئەم شتانەی پێ بەخشیوم، وە بەرچاو ڕۆشنی باشم هەیە بۆ ئاشكرا كردن و ڕوون كردنەوەی ئەم شتانە، ئایا وازی لێ بهێنم چۆنی ئەوێت قسە بكات وەڵامی نەدەمەوە، خۆیی و هەوا و بیدعەكەی واز لێ بهێنم، وەڵامی ووتە ناشرینەكەی نەدەمەوە ؟) .

من بەو كەسە ئەڵێم : (بزانە براكەم الله رەحمت پێ بكات، ئەو كەسەی كە لەم جۆرەیە توشی ئەبیت لەوە دەرناچێت كە كەسێک بێت لەم سێ كەسە :

یان كەسێكە ئەزانی ڕێبازێكی چاک و مەزهەبێكی جوانی هەیە، وە حەزی لە سەلامەتیە لە بیدعە، وە مەبەستی ڕێگای ئیستیقامەیە، بەڵام گوێی لە ووتەی ئەو كەسانە گرتووە كە شەیتانەكان لە دڵیاندا نیشتەجێ بوونە، جا بە جۆرەها كوفر لەسەر زمانی ئەوان دێتە گۆ، وە ئەم كەسە نازانێت چۆن دەرچێت لەو شتەی كە توشی بووە، جا پرسیار كردنی پرسیاری كەسێكە كە بەدوای ڕێنموونی ئەگەڕێ ئەیەوێ دەرباز بێت لەوەی كە توشی بووە، تینووە بۆ زانستەكەت، پێویستی ئەو بە تۆ وەک پێویستی كەسێكی زۆر تینووە بۆ ئاوی سازگار، وە تۆ هەستت بەوە كردووە كە ئەم كەسە گوێڕایەڵیت ئەكات و ئەمینی لەوەی كە موخالەفەت ناكات، جا ئەم جۆرە كەسە فەرزە لەسەرت كە ڕێنموونی بكەیت و شوبهە لەسەر دڵی لابەریت، وە لابردنی ئەو گومانەی كە تێكەڵی بووە تاكو دەربازی دەكەیت لە تۆڕی مولحیدەكان و فێڵ و تەڵەكەی شەیتانەكان، وە ئەو شتەی كە ڕێنموونی پێ ئەكەیت با قوڕئان و سوننەت و ئاثارە سەحیحەكانی زانایانی ئوممەت بێت لە هاوەڵان و تابعین، وە هەموو ئەمانەش بە حیكمەت و ئامۆژگاری جوان ئەكرێت.

وە خۆت بپارێزە لە زۆرلەخۆكردن لە شتێک كە نایزانیت و گەڕان بەدوای ڕەئی و ڕۆچوون لە بابەتی وورد، ئەم كارەت بیدعەیە ئەگەرچی مەبەستیشت سوننەت بێت، ویستت بۆ حەق بە غەیری ڕێگای حەق باطلە، وە قسە كردنت لەسەر سوننەت بە غەیری سوننەت بیدعەیە، بەدوای شیفا مەگەڕێ بۆ هاوەڵەكەت بە نەخۆش كەوتنی خۆت، بەدوای ئیصلاحی ئەو مەبە بە فەساد كردنی خۆت،

ئەو کەسەی فێڵ لەخۆی بکات دڵسۆز نیە بۆ خەڵک، وە کەسێک خێری نەبێت بۆ نەفسی خۆی ئەوا خێری نابێت بۆ غەیری خۆی، هەر کەسێک ویستی بۆ الله بێت الله تەوفیقی دەدات و دەپێکێت، وە هەر کەسێک تەقوای الله بکات یارمەتی ئەدات و سەری ئەخات).

ئینجا ابن بطة لە ابن عون ڕیوایەت ئەکات کە ئەڵێت: (بیستم ابن سیرین نەهی ئەکرد لە جدال کردن ئیللا مەگەر کەسێک قسەی بۆ بکەیت کە هیوات هەبێت بە گەڕانەوەی).

وە ابن بطة لە محمد بن النضر الحارثي ڕیوایەت ئەکات کە ئەڵێت:

(وتم بە الأوزاعي ئایا فرمان بکەم بە چاکە؟

وتی: کێ لێتی قبوڵ ئەکات؟).

ابن بطـة ئەڵێت: (الأوزاعي ڕاستی کرد رحمه الله، بە هەمان شێوە علي بن أبي طالب عليه السلام وتوویەتی: ئەو کەسەی کە گوێڕایەڵی ناکرێ بۆی نیە فرمان بکات).

وە ئەڵێت: (جا ئەگەر کەسی پرسیارکەر ئەمە وەسفەکانی بوو، وە وەڵامی تۆ بۆی بەو جۆرە بوو کە بۆتم شەرح کرد، ئەوا خۆتی پێوە خەریک بکە و کەمتەرخەمی مەکە، ئەمە ڕێبازی زانایان و ئیمانداران و عاقڵانە، وە مەزهەبی پێشەوایانی ڕابردووە ئەوانەی کە الله کردوونی بە ڕێ نیشاندەر لەم دینە، ئەمە کەسێک بوو لە سێ کەسەکە).

دووەمیان کەسێکی تر ئامادەی مەجلیسێک ئەبێت کە تۆش لەوێدا ئامادەی، ئەمینی لە نەفسی خۆت، لە مەجلیسەکەدا سەرخەر و یارمەتیدەرت زۆرن، جا کەسەکە قسەیەک ئەکات کە فیتنە و بەڵای تێدایە بۆ سەر دڵی گوێگرەکانی بۆ ئەوەی گومان بخاتە دڵیانەوە، چونکە ئەو خۆی زەیغ لە دڵیدا هەیە شوێنی بەڵگەی متشابە ئەکەوێت بە مەبەستی فیتنە و بیدعە، وە برایانت و ئەهلی مەزهەبەکەت لەگەڵت ئامادەن لە مەجلیسەکەدا گوێ بیستی ووتەکەی ئەبن،

بەڵام ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان لەلا نیە دەربارەی ووتەکەی، وە زانســـتیان نیە بە ووتە خراپەکەی ئەو، جا گەر بێدەنگ بیت لێی ئەوا ئەمین نابیت لە فیتنەکەی کە دڵی گوێگرەکان تێک بدات و گومان بخاتە دڵی ئەوانەی بەرچاو ڕۆشنن .

ئەم جۆرە کەسە وەڵامی بیدعەکە و ووتە پیسەکەی ئەدەیتەوە، وە ئەو عیلم و حیکمەتەی کە الله فێری کردووی بڵاوی ئەکەیتەوە، وە مەبەستت لە قسە کردن مشتومڕ کردن و مونازەرە کردن نەبێت لەگەڵی، مەبەستت لە قسە کردنت دەرباز کردنی براکانت بێت لە تۆڕی ئەو، چونکە مولحیدە پیســـەکان تۆڕی شـــەیتان هەڵئەدەن بۆ ئەوەی ئیمانداران پێ ڕاو بکەن، وە بـا ڕووی قســـەکانـت و بڵاو کردنەوەی عیلم و حیکمەتت و ڕوو خۆشـــیت و زمان پاراویت لە برایانت و ئەو کەسانە بێت کە لەگەڵتن، ڕووت لەو نەبێت، تاکو وابکەی ڕووی ئەو خەڵکانە لەو دابـبڕیت، ببیت ڕێگر لە بەردەم گوێگرتنی ئەوان لە قســـەکانی ئەو، بەڵکو گەر توانیت قســـەکانی ببڕیت بە جۆرێک لە عیلم بۆ ئەوەی ڕووی خەڵکی لەســـەر ئەو لابەریت ئەوا وابکە .

إبن بطة لە مثنى بن جامع ڕیوایەت ئەکات کە ئەڵێت :

(بیســـتم پرســـیار لە بشـــر بن الحارث کرا دەربارەی  کەسێک لەگەڵ ئەهلی ئەهوا لە شـــوێنی جەنازە ئەبێت یان لە گۆڕســـتان ئەبێت، جا ئەهلی ئەهوا قســـە ئەکەن، ئایا وای ئەبینیت کە وەڵامیان بدەینەوە ؟

بشر بن الحارث وتی : گەر کەسانێکت لەگەڵە کە عیلمیان نیە، ئەوا وەڵامی بدەنەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی عیلمیان نیە وانەزانن کە قسەی ئەوان حەقە، وە ئەگەر تەنها خۆتان و ئەوانن - واتا کەســـانی بێ عیلمتان لەگەڵ نیە - قســـەیان لەگەڵ مەکەن و وەڵامیان مەدەنەوە).

إبن بطـة ئەڵێت : (ئەم دوو جۆرە کەســـە باســـی حاڵیانم بۆ کردیت، وە بۆم کورت کردیتەوە کە چۆن قسەیان لەگەڵ ئەکەیت .

سێیەمیان کەسێکی شومە، دڵی گومڕا بووە، وە پێی لەسەر ڕێگای ڕاست هەڵخلیسکاوە، بەرچاو ڕۆشنی کز و لاواز بووە و سەرخستنی بۆ بیدعە بەهێز بووە، تێکۆشانی بۆ ئەوەیە گومانت بۆ دروست بکات لە یەقین و دینی دروستت لێ تێک بدات .

هەموو ئەو ڕیوایەتانەی هێنامان لەم بابەدا لە پێناوی ئەم جۆرە کەســە و بەهۆی ئەم جۆرە کەسەیە، هیچ شتێک لە دژایەتیکردنی ئەم کەسە وەک ئەوە نیە کە وەڵامی نەدەیتەوە و پشــت هەڵبکەیت لە قســە کردن لەگەڵی، چونکە ئامانجی ئەو لە مونازەرە کردنی تۆ ئەوەیە توشــی فیتنەت بکات و بە هیلاک بچیت، یان لێت بێ هیوا بووە داخی دڵی بەوە دەرئەکات کە شــتانێک بڵێ لە دیندا کە تۆ حەز بە بیســتنی ناکەیت، جا ســوکی بکە بە قســە نەکردن لەگەڵی و زەلیلی بکە بە خۆدابڕاندن لێی .

ئایا وتەی الحسن ـم پێ ڕانەگەیاندنی کاتێک کە کەسێک پێی ئەڵێت: باوکی سعید وەرە با مشتومڕت لەگەڵ بکەم لە دیندا

الحسن پێی وت : (من بەرچاو ڕۆشنم بە دینەکەم، گەر تۆش دینەکەت وون کردووە ئەوا بڕۆ بیدۆزەوە) .

وە ووتەی مالك ــــم پێ ڕاگەیاندی کاتێک هەندێک لە ئەهلی ئەهوا چوونە لای، مالك پێی وت : (من لەسەر بەڵگە و بەرچاو ڕوونیم، بەڵام تۆ گومانت هەیە، بڕۆ بۆ لای کەسێک وەک خۆت گومانی هەبێت مشتومڕی لەگەڵ بکە) .

ئایا لە وەڵامدانەوەی کەســی مخالف لە هەموو بەڵگەکان هیچ بەڵگەیەک دێت کە خەفەتی پێبدات فرمێسک لەچاوی بهێنێت و داخ بکاتە دڵیەوە وەک ئەم وەڵامە ؟!) .

إبن بطة لە أیوب السختیاني ڕیوایەت ئەکات کە کەسێکی مبتدع پێی ئەڵێت : یەک قسەت لەگەڵ ئەکەم .

أیوب بە ئاماژە پێی ئەڵێت : (نیو قسەشم لەگەڵ ناکەیت) .

وە لە الأعمش ڕیوایەت ئەکات کە ئەڵێت : (بێدەنگ بوون وەڵامە) .

وە لە شـبیب بن شـیبة ڕیوایەت ئەکات کە ئەڵێت : (هەر کەسـێک ئارام بگرێت لەسـەر ووتەیەک کە ئەیبیسـتێ ئەوا ووتەکە ئەپچڕێنیت، وە هەر کەسێک وەڵامی ووتەکە بداتەوە ئەوا ووتەکە زیاد ئەکات **- واتا بە بێدەنگ بوون ووتەکە کپ ئەکەیتەوە و لەنـاوی ئەبەیـت، بە وەڵامـدانەوە بـرەو بە ووتەکە ئەدەیـت و بـڵاوی ئەکەیتەوە -** ) .

جا تۆ گەر لەو کەسانەی کە ئیسـتیقامە و ڕێگای سـەلامەتیت ئەوێت، ئەوا ئەمە ڕێگای زانایان و ڕێبازی عاقڵانە، وە ئەوەی بە تۆ گەیشتووە لە عیلم و کرداری ئەوان بۆ تۆ بەسە و هیدایەتی تێدایە) .

**الإبانة الكبرى**

## ئاگاداریدان دەربارەی کتێبەکانی ئەهلی الکلام و ڕەئی

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (دانانی کتێب لەناوی بردن، وازیان لە فەرموودەی رسول الله هێنا و ڕوویانکردە الکلام) .

الإبانة الكبرى

- مهنا ئەڵێت : پرسیارم کرد لە أحمد دەربارەی پیاوێک مردووە و کۆمەڵە کتێبێکی زۆری ڕەئی بەجێهێشتووە، وە قەرزی بەسەرەوە جێماوە، ئایا پێت وایە کتێبەکانی بفرۆشرێن ؟

وتی : (نەخێر) .

وتم : ئاخر قەرزی لەسەرە .

وتی : (ئەگەرچی قەرزیشی لەسەر بێت) .

پێم وت : ئەی چی بکرێت لە کتێبەکان ؟

وتی : (بخرێنە ژێر خۆڵەوە) .

طبقات الحنابلة

- عبدالرحمن بن أبي حاتم ئەڵێت : (باوکم و أبو زرعة نەهیان ئەکرد لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی الکلام و تەماشاکردنی کتێبی ئەهلی الکلام، وە ئەیانوت : (هەرگیز هاوەڵی الکلام سەرفراز نابێت)، وە ئەهلی گومان و بیدعەیان هەجر ئەکرد، وە توووند بوون دەربارەی بە توونديەکی زۆر، وە ڕێگریان ئەکرد لە دانانی کتێب بە ڕەئی بەبێ ئاثار، وە فەرمانیان ئەکرد بە هەجر کردنیان) .

- الهروي ئەڵێت : (سالم هات تۆبە بكات، يحيى بن عمار بە پاسەوانەكەی وت : پێی بڵێ با كتێبەكانی الكلام ـــــمان بۆ بهێنێت ئەيســـوتێنين بە ئاگر)، وە مۆڵەتی نەدا) .

ذم الكلام وأهله

- مالک بن أنس ئەڵێت : (ڕێگەپێدراو نییە بازرگانی كردن بە شـــتێک لە كتێبەكانی ئەهلی هەوا و ئارەزووەكان و بيدعەچی و ئەستێرەناسەكان ) .

كتاب الإجارات لابن خواز منداد

- الســـجزي لە نـامەكەيـدا بۆ ئەهلی زبيـد بـاب ـــــێكی دانـاوە بەنـاوی (ئاگاداربوون لە نزيكبوونەوە لە هەموو كەسێک، وە وەرگرتن لە هەموو كتێبێكەوە; چونكە درۆ و ســـەرلێتێكـدان زۆر بووە و درۆكردن دەربـارەی مەزهەبەكـان بڵاو بووەتەوە ) .

- إبن تيمية ئەڵێت : (لە كتێبەكانی ئەهلی الكلام ـــــدا شـــتانێكی تێدايە كە نيشـانەيە بۆ ئەوپەڕی نەزانی دەربارەی ئەوەی رسـول الله و هاوەڵان و پێشـەوايانی ئيسـلام وتوويانە، بەشێوەيەک وا ئەكات بوترێت : وەک بڵێيت لە شـوێنێكی ديكە جگە لە وڵاتی موسوڵمانان لەدايک بوون ) .

بيان تلبيس الجهمية

- محمد بن عتيق ئەڵێت : (ئەوەی بەشـــوێن حەقەوەيە با ئاگاداری كتێبی ئەهلی بيدە ع بێت وەكو ئەشعەريەكان و موعتەزيلەكان و هاوشێوەكانيان، چونكە بەشـێوەيەک گوماندروسـتكردن و موخالەفەی دەقەكانی قورئان و سـوننەتی تێدايە كە زۆر كەسی لاداوە لە ڕێگە ڕاستەكە ) .

الدرر السنية

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

- **الهَرَوي** ئەڵێت : (سوپاس و ستایش بۆ ئەو الله یەی کە دینەکەی بۆ کامل کردین، وە نیعمەتەکەی لەسەر تەواو کردین، وە ڕازی بوو بە ئیسلام وەکو دینێک بۆمان .

**١ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەگەر یەکێک لە ئێوە ویستی دوعا بکات و داوا لە الله بکات، ئەوە با :

- دەست پێ بکات بە پیاهەڵدان و مەدحکردنی الله بەوەی کە شایەنیەتی .
- پاشان سەڵاوات بدات لەسەر رسول الله ﷺ .
- پاشان دوعا بکات بەوەی کە ئەیەوێت ) .

پاشان شایەتی ئەدەم بەوەی کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێکی حەق نییە تەنها الله نەبێت و هاوبەشی نییە، ئەهلی ستایشکردن و پیاهەڵدانە .

**٢ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (**هەر وتارێک شـایەتومانی تیادا نەبێت وەکو دەستێکی بڕدراوە وایە**) .

- **الهَرَوي** ئەڵێت : (أما بعد :

ئەم ئوممەتە ئەوەندەی لە زۆرلەخۆکردن و دەمەدەمێ ـوە شتی تووش بووە، لە هیچ شـتێکی ترەوە ئەوەندە شـتی تووش نەبووە، وە ئەو دووانە دوو دەردەکەی ئوممەتەکانی پێشـوو بوون، وە هەرگیز خێرێکیـان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە، وە کتێبی الله لە هەموو شـتێک زیاتر ڕێگری لێ کردوون، وە الرسول المصطفی ﷺ

لە هەموو کەسـێک زیاتر ڕقی لێیان بووە، وە الله عز وجل پێغەمبەرەکەی ﷺ نەبردەوە بۆلای خۆی هەتا زاڵی کرد بەسەریاندا و بێپێویستی کرد لێیان و دینەکەی و نیعمەتەکەی بۆ تەواو کرد، جـا ئوممەتەکەی بەجێهێڵا لەسـەر ڕوونیەک کە شـەوەکەی وەکو ڕۆژەکەیەتی، وە هیچ باڵندەیەک نییە بە دوو باڵی بفڕێت ئیللا لەلایەن پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ شـتێکی لەبارەوە هاتووە، مەگەر ئەوە نەبێت کەسێک بە ئەنقەست ڕێ لە خۆی ون بکات .

وە لە کۆتاییترینی ئەوەی الله عز وجل دایبەزاند لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەمە بوو ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ﴾ (المَائِدَة : ٣) .

---

- إبن بطـة لە **(الإبانة الصـغرى)** ـــدا ئەڵێت : **(وە دامەنیشـە لەگەڵ ئەوانەی خەریکی دەمەدەمەن، چونکە ئەوانە ڕۆئەچن لە ئایەتەکانی الله دا .**

**وە ئاگاداری دەمەقاڵێ و دەمەدەکردن و جیدالکردن بە لە دیندا، چونکە ئەبێتە هۆکاری ڕق و کینە، وە خاوەنەکەی ئەگەر سـوننی ــــیش بێت دەریئەکات بۆ بیدعە، چونکە هەر لە سەرەتای دانیشتن لەگەڵ بیدعەچی و موناقەشەکردن لەگەڵیدا نەقص لە دینی سوننی دا ڕووئەدات کاتێک دەمەدەمە ئەکات لەگەڵ بیدعەچیدا .**

**وە پاشـان ئەمین نابێت لەوەی وتەیەکی ورد و پیس نەکاتە ناو دڵیەوە تووشـی فیتنەی بکات .**

**یان ئەگەر تووشی فیتنەشی نەکات پێویستی بەوە ئەبێت زۆر لە خۆی بکات بە بۆچوونی خۆی وەڵامی وتەکەی بداتەوە بە شـتێک کە بنچینەیەکی نییە لە لێکدانەوە، وە ڕوونکردنەوەیەک لەبـارەیەوە نییە لە قورئانـدا، وە جێمـاو و شـوێنەوارێـک نییە دەربارەی لە هەواڵەکانی رسول الله دا ﷺ) .**

**٣ - طارق بن شهاب** رضي الله عنه ئەڵێت : (یەهودیەک بە عمر بن الخطاب رضـي الله عنه ـــی وت : ئەی پێشـەوای ئیمانداران ئەگەر ئەم ئایەتە لەسـەر ئێمە

دابیەزیایە | ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ | (المَائِـــدَة : ٣) ئەوە ئەورۆژەمان ئەكرد بە جەژن.

عمر رضـــي الله عنه فەرمووی : (ئەزانم كام ڕۆژە ئەم ئایەتەی تێدا دابەزی، ڕۆژی عەرەفە بوو، وە جومعە بوو)).

- الهَرَوي ئەڵێت : (گوێبیستی أحمد بن الحسن بن محمد البزاز ـــی فەقیهی الحنبلي الرازي بووم لە ماڵەكەی خۆی لە الرَّي وتی : (هەموو ئەوەی داهێنراوە پاش دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە زیادە و بیدعەیە)).

٤ - أسماء بنت يزيد رضي الله عنهما ئەفەرموویێت : (سورەتی المائدة دابەزی و منیش جڵەوی حوشترەكەی رسول الله ـــم ﷺ بەدەستەوە بوو، خەریک بوو قۆڵی بشكێت) - مەبەستی : قۆڵی حوشترەكەیە -

٥ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویێت : (زانســـت ســێ شـــتە، بێجگە لەوانە زیادەیە : ئایەتێكی موحكەم، یان سوننەتێكی جێگیر، یان الفريضة العادلة).

عبدالله بن عروة ئەڵێت : (فريضــة عادلة واتە ئەوەی موسـوڵمانان لەسـەری كۆدەنگ بوون).

٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویێت : (هەر كەسێک شتێكی لە دینەكەی ئێمە داهێنا كە تێیدا نەبوو ئەوە ڕەتكراوەیە).

أبو مروان وتی : (واتە بیدعەكان).

٧ - يحيى بن معين ئەڵێت : (سـەنەد نییە صحيح ـــتر بێت لە (القاسـم لە عائشة ـەوە) رضي الله عنها).

: له (تهذيب الكمال) دا هاتووه كه يحيى بن معين دەربارەی سەنەدی (عبيدالله بن عمر له القاسم له عائشة رضي الله عنها) ئەڵێت : (تێكەڵەيەكە لە زێڕ) .

القاسم مەبەست پێی القاسم بن محمد بن أبي بكر بن الصديق ە (١٠٨ ھ) .

٨ - أبو عبيد ئەڵێت : (پێغەمبەر ﷺ هەموو بابەتی قیامەتی لە یەک ڕستەدا کۆکردەوە : (هەر کەسێک شتێکی لە دینەکەی ئێمە داهێنا کە تێیدا نییە ئەوە ڕەتکراوەیە) .

وە هەموو بابەتی دنیاش لە یەک ڕستەدا : (کار و کردەوەکان بەگوێرەی نیەتەکانە)، لە ئەچنە ناو هەموو بابەتێکەوە) .

٩ - عبدالله بن عدي الصابوني ئەڵێت : (قورئان و سوننەت و ئیجماع، یان الزُّنّار و العَسَلِي و جیزیە) .

---

: (الزُّنّار) ئەو پارچە قوماشەیە نەسڕانیەکان ئەیبەستن لە ناوقەدیان وەکو پشتوێن وایە .

(العَسَلِي) پارچە جلێکە ڕەنگی هەنگوینیە نەسڕانیەکان ئەیانکردە بەریان .

واتە وەکو موسوڵمانێک تۆ ئەبێت قورئان و سوننەت و ئیجماع قبووڵ بکەیت، ئەگەر قبووڵی نەکەیت لە ئەهلی کیتاب ئەچیت لە قبووڵکردنی بەشێک لە دین و ڕەتکردنەوەی بەشێکی دیکەی .

## دەروازەی : (١)

# ڕوونکردنەوە دەربارەی ئەوەی ئوممەتەکانی پێشوو لەسەر ڕێگەی ڕاست بەردەوام بوون هەتا ئەو کاتەی دەستیان گرتبوو بە تەسلیمبوون و شوێنکەوتنەوە، وە کاتێك زۆریان لەخۆیان کرد و دەمەدەمێیان کرد گومڕابوون و لەناوچوون

١٠ - رسـول الله ﷺ ئەفەرمووێـت : (وازم لێ بهێنن لەوەدا کە وازم لێ هێنـاون، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بە پرســیـارکردنیـان و موخـالەفەکردنی پێغەمبەرەکانیان لەناوچوون، کاتێک ڕێگریم لێ کردن لە شــتێک لێی دوور بکەونەوە، وە کاتێک فەرمانم پێ کردن بە شــتێک ئەنجامی بدەن ئەوەندەی کە ئەتوانن) .

---

: واتە کاتێک قسەیەکم کرد ئەوەندەی وتوومە وەریبگرن و پرسیاری زیاتر مەکەن دەربارەی و وردی مەکەنەوە با شـتێکتان لەسـەر فەرز نەکرێت وە ڕێگریتان لێ نەکرێت لە شتێک بەهۆی ئەم پرسیارانەتانەوە دواتر تووشی فیتنە و موخالەفەکردنم بن .

- إبن بطـة لە (الإبانة الكبرى) ــدا دەروازەیەکی داناوە نزیک دەروازەی نووسەر و ئەڵێت : (دەروازەی وازهێنان لە پرســیارکردن لەبارەی شــتێکەوە کە پەیوەندی پێوە نییە، وە گەڕان و لێکۆڵینەوەی ورد لەبـارەی شــتێکەوە کە نەزانبوون پێی زیـانی لێ نـادات، وە ئاگـاداریـدان لەبـارەی کـۆمەڵەیەک کە ڕۆئەچـن و قـووڵ ئەبـنەوە لە پرسیارەکاندا، وە مەبەستیانە شک و گومان بخەنە ناو موسوڵمانانەوە) .

وە لە پێشەکی دەروازەکەدا ئەڵێت : (بزانن براکانم من بیرم کردەوە لەو هۆکارەی کە کۆمەڵانێکی لە سوننەت و جەماعەت دەرکرد، وە بەزۆر بردنی بەرەو بیدعە و خراپێتی، وە دەرگای بەڵا و ئافاتی کردەوە لەسەر دڵەکانیان، وە چاویانی داپۆشت لە ڕووناکی و نووری حەق، جا بینیمەوە لە دوو شێوەدا :

یەکەم : گەڕان و بەدواداچوونی ورد، وە زۆرپرسیارکردن دەربارەی شتێک پەیوەندی پێوە نییە و، کەسێ عاقڵ زیانمەند نابێت بە نەزانبوون پێی، وە تێگەیشتن لێی سوود بە ئیماندار ناگەیەنێت .

دووەم : دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ئەمین نابیت لە فیتنە و بەڵاکەی، وە هاوەڵایەتیکردنی دڵەکان خراپ ئەکات) .

- إبن رجب لە کتێبی (جامع العلوم والحكم) ـدا ئەڵێت : (ئەوە نیشانەیە بۆ بێزراوێتی پرسیارکردن و تانەدان لێی، بەڵام هەندێک کەس وا گومان ئەبەن ئەمە تایبەتە بە سەردەمی رسول الله ﷺ بەهۆی ئەوەی ترس هەبوو ئەوکات شتێک حەرام بکرێت لەوانەی کە حەرام نەکراون، وە شتێک واجب ببێت کە ئەنجامدانی ببێتە مایەی نارەحەتی، وە ئەمەش ترس لەبارەیەوە نەماوە لە پاش وەفاتی ﷺ .

وە ئەمەش ئەوەیە کە إبن عباس ئاماژەی بۆ کردووە بە وتەی : (بەڵکو چاوەڕێ بکەن تا قورئان دائەبەزێت، چونکە پرسیار دەربارەی هیچ شتێک ناکەن ئیللا ڕوونکردنەوەکەی ئەبیننەوە) .

واتای ئەمەش بریتیە لەوەی : (هەموو ئەوەی موسوڵمانان پێویستیان پێیەتی لە دینەکەیاندا ئەبێت الله ڕوونی بکاتەوە کتێبە العزیز ـەکەیدا، وە رسول الله ﷺ لێیەوە بیگەیەنێت، وە دواتر کەس پێویستی بە پرسیارکردن نییە .

هەربۆیە ئەوەی لەسەر موسوڵمانە بریتیە لە گرنگیدان بەوەی کە لە رسول الله ـەوە ﷺ هاتووە، پاشان هەوڵ بدات لێی تێبگات و ماناکانی بزانێت، پاشان خۆی سەرقاڵ بکات بە بەڕاستخستنەوەی و ئەگەر لە بابەتە عیلمیەکان - واتە غەیبی و عەقیدەییەکان - بوو، خۆ ئەگەر لە بابەتە عەمەلیەکان بوو - واتە فیقهـ - ئەوە بەسیەتی ئەوەندەی ئەتوانێت فەرمانەکان بەجێ بگەیەنێت، وە دوور بکەوێتەوە لەوەی کە نەهی لێ کراوە، وە هەموو خەم و خولیای بۆ ئەوە تەرخان بکات نەوەک شتی دیکە .

**حاڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی کە بەباشی شوێنیان کەوتن ئاوابوو لە هەوڵی بەدەستهێنانی زانستی بەسوود لە قورئان و سوننەت) .**

**١١ - محمد بن إسماعيل البخاري** وتی : (أبو الزناد لە الأعرج لە أبي هريرة رضي الله عنه; لە ئاڵتووندروستکراوێکی پاشاییە) .

**: واتە جلێکی زۆر گرانبەها، مەبەستی لەوەیە سەنەدەکە زۆر بەهێزە .**

**١٢ - أبو هريرة** رضـــي الله عنە وتی : رســـول الله ﷺ وتاری دا فەرمووی : (ئەی خەڵکینە، الله حەجی لەسەر فەرز کردوون) .

پیاوێک هەستایەوە وتی : ئەی رسول الله، هەموو ساڵێک ؟

بێدەنگ بوو، دووبارە وتیەوە، رســـول الله ﷺ وەڵامی نەدایەوە، پاشـــان سێبارەی کردەوە .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (خۆ ئەگەر بموتایە بەڵێ ئەوە واجب ئەبوو، وە ئەگەر واجب بوویایە ئەنجامتان نەئەدا، وازم لێ بهێنن لە زۆری پرســـیارکردن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە لەناوچوون بەهۆی پرســـیارکردن لە پێغەمبەرەکانیان و موخالەفەکردنیان، کاتێک فەرمانم پێکردن بە شـــتێک ئەنجامی بدەن ئەوەندەی ئەتوانن، وە کاتێک رێگریم لێ کردن لە شتێک ئەوە دوور بکەونەوە لێی) .

**١٣ - أبو أمامة** رضـــي الله عنە ئەگێرێتەوە لە رســـول الله ﷺ فەرموویەتی : (هیچ قەومێک گومڕا نەبوون لەپاش هیدایەتێک لەســەری بوون ئیللا دەمەدەمێ و جیدالیان پێدراوە) .

پاشان رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًاۢ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ | (الزُّخرُف : ٥٨) .

١٤ - عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما ئەڵێت : (مەجلیسێک دانەنیشتن لە سەردەمی رسول الله ـــدا ﷺ پێمان خۆشتر بێت لە مەجلیسێک هاتین پیاوانێک لەلای ژووری عائشة رضي الله عنها موناقەشەیان ئەکرد دەربارەی قەدەر، وە رسول الله ـش ﷺ لە پشتەوەی ژوورەکەی بوو گوێی لە وتەکانیان ئەگرت، جا بە تووڕەییەکەوە هات بۆلامان کە لە دەموچاویدا ئەبیندرا، فەرمووی : (ئەی خەڵکی، بە ئەم شتە ئوممەتەکانی پێش ئێوە گومڕابوون؛ بە موخالەفەکردنی پێغەمبەرەکانیان، وە بە بەگژدادانی بەشێکی کتێبی الله بە بەشێکی دیکەیدا، وە قورئان دانەبەزیوە بۆ ئەوەی بەشێکی بدەیت بەگژ ئەویدیکەیدا، بەڵکو قورئان دابەزیوە بەشێکی ئەوی دیکەی بەڕاست ئەخاتەوە، ئەوەی کە لێتان زانی کاری پێ بکەن، وە ئەوەی بەباشی لێی تێنەگەیشتن ئیمانی پێ بهێنن) .

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرمووێت : (ئایا فەرمانتان بەمە پێکراوە ؟ بەشێکی کتێبەکەی الله بکەن بەگژ بەشێکی تریدا !

تەماشا بکەن ئەوەی فەرمانتان پێکرابوو دەربارەی شوێنی بکەون، وە ئەوەی ڕێگریتان لێکرابوو دەربارەی وازی لێ بهێنن) .

١٥ - محمد بن إسماعيل البخاري ئەڵێت : (بینیم أحمد بن حنبل و، علي بن عبدالله و، الحميدي و، إسحاق بن إبراهيم بەڵگەیان ئەهێنایەوە بە فەرموودەی : عمرو بن شعيب لە باوکیەوە لە باپیریەوە) .

١٦ - زكريا بن يحيى زکار وتی : وترا بە أحمد بن صالح - سەنەدی - (عمرو بن شعيب لە باوکیەوە لە باپیریەوە) صحيح ە ؟

وتی : (بەڵێ، ئەگەر ئەوەی پاش عمرو ثقة بێت، چونکە هەندێکی گوێبیستی بووە، وە هەندێکی تری کتێبە، وە آل ی عبدالله کۆڕان لەسەر ئەوەی کە کتێبی عبدالله یە رضي الله عنهما).

---

: واتە عمرو گوێبیستی نەبووە بەڵکو الوِجادة یە .

مەبەستی لە عبدالله; عبدالله بن عمرو بن العاص ە رضي الله عنهما .

١٧ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویـت : (ئەی خەڵکینە، واز لە دەمەدەمە و موناقەشـــەکردن بهێنن لە قورئاندا، چونکە ئوممەتەکانی پێش ئێوە بە نەعلەت نەکران هەتا جیاوازیان تێکەوت، وە دەمەدەمێ لە قورئاندا کوفرە).

١٨ - زید بن رفیع ئەڵێت : (الله نوح ـــی علیه السلام نارد و شـەریعەتی بۆ دانا، خەڵکی لەســەر شــەریعەتی نوح بوون، جا هیچ شــتێک ئەو شــەریعەتەی بەتاڵنەکردەوە جگە لە زەندەقە نەبێت، پاشـان الله موسی ـــی علیه السلام نارد و شـەریعەتی بۆ دانا، خەڵکی لەسـەر شـەریعەتی موسی بوون، جا هیچ شـتێک ئەو شـەریعەتەی بەتاڵنەکردەوە جگە لە زەندەقە نەبێت، پاشـان الله عیسی ـــی علیه السلام نارد و شەریعەتی بۆ دانا، خەڵکی لەسەر شەریعەتی عیسی بوون، جا هیچ شتێک ئەو شەریعەتەی بەتاڵنەکردەوە جگە لە زەندەقە نەبێت).

١٩ - الشعبي لە تەفسیری | فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ | (آلِ عِمرَان : ١٨٧) ئەڵێت : (کار ناکەن بەوەی کە تیایدایە).

٢٠ - جبیر بن نُفَیر ئەڵێت : عوف بن مالک رضـــي الله عنه بۆی گێڕامەوە وتی : (رسول الله ﷺ ڕۆژێکیان تەماشای ئاسمانی کرد و وتی : (ئەمە کاتی ئەوەیە زانست بەرز بکرێتەوە).

پیاوێک لە پشتیوانان پێی وت : ئەی رسول الله ، ئەم زانستە بەرز ئەکرێتەوە لەکاتێکدا جێگیر بووە ، وە دڵەکان لێی تێگەیشتوون ؟!

رسـول الله ﷺ پێی فەرموو : (من لە فەقیهترین و تێگەیشـتووترین خەڵکی مەدینە هەژمارم ئەکردیت) .

پاشـان باسـی گومڕایی یەهودی و نەسـڕانیەکانی کرد سـەرەڕای ئەوەی کتێبی الله یان لەبەردەستدا بوو .

منیش گەیشـتم بە شـداد بن أوس رضـي الله عنه ، فەرموودەکەی عوف بن مالک م بۆ گێڕایەوە .

وتی : عوف ڕاستی وت ، ئایا پێت بڵێم یەکەم شت کە هەڵئەگیرێتەوە ؟

وتم : (بەڵێ) .

وتی : (خشوع ، تا وای لێدێت کەسی خاوەن خشوع نابینیتەوە) .

**٢١ - رسـول الله** ﷺ ئەفەرموویـت : (تووشـــی دەردی ئوممەتەکانی پێش خۆتان بوون : ئیرەیی و ڕقوکینە ، ڕقوکینە داماڵەرە ، ناڵێم قژ دائەماڵێت ، بەڵکو دین دائەماڵێت) .

## دەروازەی : (٢)

## باسکردنی توندێتی ئەوەی رسول الله ﷺ ئەترسا لەسەر ئەم ئوممەتە لە پێشەوا گومڕاکان، وە دەمەدەمێکارەکان لە دین، وە وتاربێژە دووڕووەکان

٢٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەو شتەی زۆر لێی ئەترسم لەدوای خۆم لەسەر ئوممەتەکەم بریتیە لە پێشەوا گومڕاکان) .

٢٣ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (سێ شت ئیسلام لەناو ئەبەن : هەڵەی زانا، موناقەشە و دەمەدەمێ کردنی مونافیق بە قورئان، وە پێشەوا گومڕاکان) .

٢٤ - جابر بن عبدالله رضي الله عنهما ئەڵێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ترسناکترین شت لێی بترسم لەسەر ئوممەتەکەم لە کردەوەکان سێ دانەیە) .

وترا : ئەی رسول الله، ئەوانە چین ؟

فەرمووی : (هەڵەی زانا و، دەسەڵاتدارێکی زاڵم و، هەوا و ئارەزوویەکی شوێنپێ هەڵگیردراو) .

٢٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ترسناکترین شت لێی بترسم لەسەر ئەم ئوممەتە هەموو دووڕوویەکی زمانزانە) .

له ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرمووێت : (هەموو دووڕوویەکی لێزان، بە حیکمەت و لێزانینەوە قسە ئەکات، وە کاروکردەوەی خراپ ئەکات) .

٢٦ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ترسناکترین شت لێی بترسم لەسەر ئەم ئوممەتە ئەوانەن کە قورئان لێک ئەدەنەوە بە جگە لە لێکدانەوەکەی خۆی) .

٢٧ - أبو وائل ئەڵێت : حذيفة بن اليمان رضي الله عنه فەرمووی : (مونافیقەکانی ئەمڕۆ خراپترن لەو مونافیقانەی لە سەردەمی رسول الله دا ﷺ بوون) .

وترا : (چۆن ؟) .

فەرمووی : (لە سەردەمی رسول الله دا ﷺ نیفاقەکەیان ئەشاردەوە بەڵام ئێستا ئاشکرای دەکەن) .

٢٨ - صالح بن سلمان وتی : (لە بەسرە دەرچووم لە سەردەمی عبیدالله بن زیاد دا گوێبیستی شێخە کۆنەکان بووم پەنایان ئەگرت بە الله لە کەسێکی فاجری شارەزا بە سوننەت) .

---

: عبیدالله بن زیاد ساڵی (٥٥ هـ) بووە بە والی بەسرە و ساڵی (٦٧ هـ) کوژراوە .

مەبەست ئەوەیە کەسێک ئەگەر خراپ بێت و بە ئاشکرا تاوان ئەنجام بدات ئومێد هەیە پاش ئەوەی سوننەتی ناسی باش بێت، بەڵام ئەگەر شارەزا بێت بە سوننەت و هێشتا بە ئاشکرا تاوان بکات ئومێدت پێی نامێنێت باش ببێتەوە و ئەبێت بە فیتنەیەکی گەورە بۆ جگە لە خۆی، الله عز وجل پەنامان بدات لەوەی ببین بە یەکێک لەوانە .

**٢٩ - عثمان بن أبي شيبة** ئەڵێت : (فاسقەکانی هاوەڵانی فەرمووده **- ئەهلی سوننه -** باشترن لە عیبادەتکارەکانی جگە لە خۆیان) .

**- الطبراني وتی : عبدالله بن أحمد بن حنبل بۆی گێڕاینەوە وتی : باوکم بۆی گێڕاینەوە وتی : (گۆڕەکانی ئەهلی سوننە لە ئەهلی تاوانە گەورەکان باخ ـن، وە گۆڕەکانی بیدعەچییەکان لە دنیانەویستەکان چاڵێکە - واتە لە ئاگر -، تاوانبارەکانی ئەهلی سوننە خۆشەویستی الله ـن، وە بیدعەچیە دنیانەویستەکانیش دوژمنی الله ـن) .**

**طبقات الحنابلة**

**: چونکە لە کۆتاییدا عەقیدە لە هەموو شـــتێک گرنگترە، وە ئەو عیبادەتەی کە لەسەر سوننەت ئەنجام نادرێت سوودی نییە بۆ خاوەنەکەی .**

## دەروازەی : (٣)

## بێزراوێتی ئامادەکردن و ڕازاندنەوەی وتە و باسکردنی پرسیارە قورسەکان

٣٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئێوە ئەمڕۆ لە سەردەمێکدان زاناکانی زۆرە و، وتاربێژانی کەمە، هەرکەسێک واز لە یەکلەسەردە ـــی ئەوە بهێنێت کە ئەیزانێت ئەوە لایداوە .

وە دواتر سەردەمێک دێت وتاربێژانی زۆرە و زانایانی کەمە، ئەوەی دەست بگرێت بە یەکلەسەردە ی ئەوەی ئەیزانێت ئەوە ڕزگاری بووە ) .

٣١ - عائشة رضي الله عنها ئەفەرمووێت : (رسول الله ﷺ وەکو ئێوە بەسەریەکەوە قسەی نەئەکرد، بەڵکو کاتێک قسەی ئەکرد نێوانی ئەدا بە قسەکانی هەتا ئەوەی گوێی لێ ئەبێت هەموو قسەکەی لەبەر بکات ) .

٣٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (شەرم و کەمدویی دوو بەشی ئیمانن، دەمپیسی و لێزانی لە ڕوونکردنەوەدا دوو بەشی نیفاقن ) .

---

: واتە لێزان و زمانپاراو بێت بزانێت چۆن قسە ئەکات و بابەتەکان بشکێنێتەوە بەلای خۆیدا .

**٣٣ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (قسەی باش بکەن پێی ئەناسرێن، وە کاری پێ بکەن ئەبن بە ئەهلەکەی، وە بەپەلە مەبن لە بڵاوکردنەوەدا).

**٣٤ - الضحاك بن مزاحم** ئەڵێت : (ئەوانە خۆیان فێری وەرع ئەکەن، بەڵام سەردەمێک دێت تیایدا خۆیان فێری و قسەکردن ئەکەن).

---

**: واتە بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیاندا ڕابکێشن .**

**٣٥ - الأوزاعي** ئەڵێت : (پەیوەستبە بە شوێنەواری ئەوەی تێپەڕیوە، وە ئاگاداری بۆچوونی پیاوەکان بە ئەگەرچی بۆچوونەکانیان ڕازاندەوە بە قسە) .

---

**: ئەم وتەیە جگە لەوەی سوودێکی عەقیدەیی هەیە ئەتوانین بڵێین سوودی بۆ بواری فەرموودەش هەیە بەوەی ئێمە لە فەرمووده و زانستەکانیدا لەسەر مەنهەجی سەلەف بین و لا نەکەینەوە بۆ ئەو موتەئەخیر و سەردەمیە خراپانەی کە زۆر فویان تێکراوە و بە ناحەق بەرگی فەرموودەوانیان کراوە بە بەردا، وە بۆچوونەکانیان پێش وتەی سەلەف ئەخرێت .**

**بەڵکو ئەبێت وەک چۆن دەروێشەکانیان وەلاء و بەراء لەسەر شێخە بەناو فەرموودەوانە گومڕاکانیان دائەمەزرێنن ئێمەش ئەبێت لەوان زیاتر غیرەتمان هەبێت بۆ سەلەف و دژیان بووەستینەوە .**

## دەروازەی : (٤)

## تانەدان و زەمکردنی دەمەدەمێ و جیدالکردن، وە توندێتی لەسەری، وە باسکردنی خراپیەکەی

٣٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (بێزراوترینی پیاو بەلای الله ـەوە الألدُّ الخصم ـە) .

---

(الألدُّ الخصم) : واتە کەسێک هەمیشە دەمە دەمێ و موناقەشە بکات و دژی بەرامبەر بووەستێتەوە و حەق و ڕاستی قبووڵ نەکات .

٣٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک هاریکاری دەمەدەمەیەک بدات بە باتڵ ئەوە غەزەبی الله ئەیگرێتەوە هەتا وازی لێ ئەهێنێت) .

٣٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (دەمەقاڵێ لەگەڵ براکەتدا مەکە، وە سوعبەتی لەگەڵدا مەکە، وە پەیمانی مەوعیدێکی پێ مەدە پاشان نەیگەیەنیتەجێ).

٣٩ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (لە زیاد بن أیوب ـەوە بنووسنەوە، چونکە شعبة ی بچووکە) .

---

: زیاد بن أیوب دلویه (١٦٦ - ٢٥٢ هـ) .

- الدارقطني دەربارەی ئەڵێت : (ثقة مأمون) .

٤٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک زانست بەدەست بهێنێت بۆ خۆبەگەورەزانین و پۆزلێدان بەســەر زانایاندا، یان بۆ ئەوەی دەمەدەمەی پێ بکات لەگەڵ کەمعەقڵەکاندا، یاخود ڕووی خەڵکی بۆلای خۆی ڕابکێشــێت؛ ئەوە لە ئاگردایە) .

---

- إبن رجب لە (مجموع الرسائل) ــدا باسی هەوڵدان بۆ زانست بە مەبەستی بەدەســتهێنانی دنیا ئەکات و ئەڵێت : (ئەوەیە کە بە کردەوە و زانســت و زوهد هەوڵی بەدەستهێنانی گەورەیی و پێشــەنگی لەلای خەڵکی و، خۆ بەگەورەڕاگرتن بەســەریاندا بدات، وە خەڵکی شوێنی بکەون و ملکەچی ببن و ڕووی تێبکەن .

وە زۆری زانستەکەی پیشان بدات بەسەر زانایاندا بۆ ئەوەی خۆی بەرزتر بکاتەوە بەســەریاندا و شــتی لەو جۆرە، جا ئەمە چارەنووســەکەی ئاگرە، چونکە مەبەســتی خۆبەگەورەزانین بەسەر دروستکراوەکاندا خۆی لە خۆیدا حەرامە، جا ئەگەر ئامرازێک کە قیامەتی بەدەست دێت تیایدا بەکاربهێندرێت ئەوە ناشرینتر و پیسترە لەچاو ئەوەی ئامرازێکی دنیایی وەکو پارە و دەسەڵاتی تیادا بەکاربێت) .

## دەروازەی : (٥)

## گەورەیی وازهێنان لە دەمەدەمە و موناقەشە ئەگەرچی ئەو کەسەی موناقەشەکە ئەکات لەسەر حەق ـیش بێت

٤١ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویت : (ئەو کەســەی واز لە درۆ بهێنێت کە باتڵە، ئەوە بۆی بنیات ئەنرێت لە چواردەوری بەهەشــت، وە ئەو کەســەی واز لە دەمەدەمە و موناقەشــە بهێبێت ئەگەرچی لەســەر حەق ـــیش بێت ئەوە لە ناوەڕاســتەکەیدا بۆی بنیاد ئەنرێت، وە ئەو کەســەی خورەوشــتی باش بکات لە بەرزترینی بۆی بنیات ئەنرێت).

٤٢ - رسـول الله ﷺ ئەفەرمووێـت : (ئەو کەســەی نەفەقەی دوو ژنی بکێشێت خاوەن گەنجینەکانی بەهەشت بەپیریەوە دێن.

وە ئەو کەسەی سێ لە منداڵەکانی بمرن الله بەهۆی گەورەیی ڕەحمی - **باوک یان دایکەکە** - بۆ منداڵەکانی ئەیخاتە بەهەشت.

وە شەش تایبەتمەندی هەیە ئەو کەسەی کاریان پێ بکات شایەنی حەقیقەتی ئیمانە :

- دان لە دوژمنەکانی الله بە شمشێر.
- وە ڕۆژوو.
- وە زوو ئەنجامدانی نوێژ لە ڕۆژێکی هەوراوی.
- وە دەستنوێژگرتنێکی باش لە کاتە سەختەکان.

- وه ئارامى و خۆڕاگرى لەكاتى موسيبەتەكان .

- وه وازهێنان له موناقەشــە و دەمەدەمە ئەگەر كەســەكە لەســەر حەقيش بێت ).

## دەروازەی : (٦)

## تووندی رسول الله ﷺ لە دەمەدەمێ و موناقەشەکردن لە قورئان و، ڕێگری کردن لێی و، ئاگادارکردنەوەی ئەهلی قورئان لێی

٤٣ - عائشة رضي الله عنها وتی : رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿هُوَ ٱلَّذِیٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِی قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ﴾ (آلِ عِمْرَان : ٧).

پاشان فەرمووی : (کاتێک ئەوانەتان بینی ئەچن بەدوای لێکچووەکانیدا ئەوە ئەوانەن کە الله ناوی هێناون ئاگاداریان بن).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرمووێت : (کاتێک ئەوانەتان بینی موجادەلە و دەمەدەمە ئەکەن کە قورئاندا ئەوانە خۆیانن، جا ئاگاداریان بن).

٤٤ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه لە تەفسیری فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِی قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ﴾.

ئەڵێت : (ئەوانە دەمەدەمێکار و جیدالکەرەکانن لە دینی الله عز وجل دا).

٤٥ - أبي بن كعب رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەوەی کە بۆت ڕوونبووەیەوە و لێی تێگەیشتیت کاری پێ بکە و سوودی لێ ببینە، وە ئەوەی لێی تێنەگەیشتیت ئیمانی پێ بهێنە و بیسپێرە بەوەی کە ئەیزانێت).

٤٦ - عبدالله بن عباس رضـــي الله عنهما ئەفەرموویت : (پەیوەســـتبە بە بەردەوامبوون لەسەر ڕێگەی ڕاست و، شوێنکەوتنی ئەثەر، وە ئاگاداری بیدعەکان بە).

٤٧ - میمون بن مهران ئەڵێت : (لەوانەی کە شوێنی ئەم زانستە ئەکەوێت هەیانە بەکاری ئەهێنێت مەبەســتی پێی دنیایە، وە هەیانە ئەیەوێت ئاماژەی بۆ بکرێت - واتە بەناوبانگ بێت -، وە هەیانە دەمەدەمە و موناقەشەی پێ ئەکات، وە باشترینیان ئەوەیە فێری ئەبێت بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی الله عز وجل ی پێ بکات).

---

**: وە لە (تهذيب الكمال) دا ئەڵێت : (ئەی هاوەڵانی قورئان، قورئان بەکارمەهێنن وەکو ئامرازێک بۆ بەدەستهێنانی دنیا، دنیا بەدەستبهێنن بە دنیا، وە قیامەت بەدەست بهێنن بە قیامەت).**

**مەبەســتی ئەوەیە بە کاروباری دنیایی دنیا بەدەســت بهێنن و کاروباری قیامەتی تایبەت بکەن بۆ بەدەستهێنانی قیامەت .**

٤٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرموێت : (دەمەدەمەکردن لە قورئاندا کوفرە).

---

**- إبن عبدالبر لە (جامع بيان العلم وفضله) ـــدا ئەڵێت : (ماناکەی ئەوەیە دوو کەس دەربارەی ئایەتێک موناقەشـــە بکەن دانەیەکیان ڕەتی بکاتەوە و بەرەو شـــک و گومان بڕوات دەربارەی، ئەمە ئەو دەمەدەمێیەیە کە کوفرە .**

**بەڵام هەرچی ســـەبارەت بە موناقەشـــەکردن دەربارەی حوکمەکانی قورئان و ماناکانیەتی; ئەوە هاوەڵانی رسول الله ﷺ موناقەشەیان کردووە لە زۆربەیاندا، ئەمەش بۆت ڕوون ئەکاتەوە ئەو دەمەدەمێیەی کە کوفرە بریتیە لە ڕەتکردنەوە و گومان، وەک چۆن فەرموویەتی : ﴿وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُ﴾ (الحَجّ : ٥٥).**

**وە دەمەدەمێکردن و بەربەرەکانێ لە هیچ شـتێکیدا دروسـت نییە، وە سـەلەف رضي الله عنهم ڕێگریان کردووە لە موناقەشـەکردن دەربارەی الله جل ثناؤە و سیفەت و ناوەکانی.**

**بەڵام دەربارەی فیقهـ ـکۆڕان لەسـەر مونازەرە و موناقەشـەکردن تیایدا، چونکە ئەوە زانستێکە کە ئەبێت تیایدا فەرعەکان بگەڕێندرێنەوە بۆ ئەسڵەکان لەبەر پێویستی، بەڵام بابەتە عەقیدەییەکان بەو شـێوەیە نییە؛ چونکە الله عز وجل لەلای ئەهلی سـوننە و جەماعەت وەسـف ناکرێت تەنها بەوە نەبێت کە وەسـفی خۆیی پێ کردووە یان پێغەمبەرەکەی وەسـفی پێ کردووە، یاخود پێشـەوایان کۆک بوون لەسـەری، وە هیچ شتێک وەکو الله نییە تا بە قیاسکردنێک پێی بگەین یاخود بە بیرلێکردنەوە) .**

٤٩ - عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴾ (الحِجْر : ٩١) .

ئەڵێت : (ئیمانیان هێنا بە هەندێکی، وە کافر بوون بە هەندێکی) .

وە سعيد بن جبير دەربارەی ئەڵێت : (ئەوانە ئەهلی کیتاب بوون، کردیان بە چەند بەشێکەوە، ئیمانیان هێنا بە هەندێکی، وە کافر بوون بە هەندێکی) .

٥٠ - عبيد بن سعد ئەڵێت : (إبن عباس رضي الله عنهما چووە لای دوو پیاو دەمە دەمێیان ئەکرد لە ئایەتێکدا .

فەرمووی : (هیچ کاتێک نەبووە دوو کەس دەمە دەمێ بکەن لە ئایەتێکدا ئیللا یەکێکیان ئایەتەکەی ڕەتکردووەتەوە)) .

٥١ - عبدالله بن مسـعود رضـي الله عنه دەربارەی قورئان ئەفەرمووێت : (ئەوەی یەک ئایەتی لێ ڕەت بکاتەوە ئەوە هەمووی ڕەت کردووەتەوە) .

**٥٢ - إبراهيم النخعي** ئەڵێت : (هەر کەســێک کافر بێت بە یەک ئایەتی قورئان ئەوە کافر بووە بە هەمووی) .

**٥٣ - علي بن أبي طالب** رضــي الله عنـه ئەفەرموویـت : (ئەگەر لە ژیانـدا بمێنیتەوە ئەوە ئەبینیت خەڵکی بۆ ســێ مەبەســت مامەڵە بە قورئانەوە ئەکەن : بەشێکیان بۆ الله، وە بەشێکیان بۆ دنیا، وە بەشێکیان بۆ دەمەدەمێ و جیدال) .

**٥٤ - رسول الله ﷺ** فەرمووی : (یەکەم شت لە خەڵکی ئەڕوات زانستە) .

وتیان : ئەی رسول الله ئایا قورئان ئەڕوات ؟

فەرمووی : (ئەوانەی کە قورئان ئەزانن ئەڕۆن، وە کۆمەڵەیەک ئەمێننەوە کە قورئان نازانن، جا لێکی ئەدەنەوە بەپێی هەوا و ئارەزووی خۆیان) .

---

**: ئەوانەی کە قورئانیـان زانیوە هـاوەڵان بوون، پـاش ئەوانیش تـابیعیەکـان، هەربۆیە ئەبێـت بۆ زانینی تەفســیری ڕاســتی قورئان بگەڕێینەوە بۆ وتەکـانی ئەوان دەربارەی .**

**٥٥ - عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (کۆمەڵەیەک دێن دەمە دەمێتان لەگەڵ ئەکەن بە موتەشــابیهی قورئان، ئێوە بیانگرن بە ســوننەتەکان، چونکە هاوەڵی سوننەتەکان شارەزاترن بە کتێبی الله) .

---

**: چونکە گومڕاکان دێن بە ڕەئـو بۆچوونی خۆیان قورئان تەفسیر ئەکەن و لێکی ئەدەنەوە، وە ســوننەتیش ڕوونکەرەوەی قورئانە بۆیە هیچیان لەگەڵ ســوننەتدا پێ ناکرێت. ئەمە لە سەرەتادا وابوو؛ بەڵام دواتر گومڕاکان چەندین بیانووی تریان دۆزیەوە بۆ ڕەتکردنەوەی فەرموودە بەنـاوی فەرموودەی ئاحـاد و موتەواتیر. بگرە هەیـانە**

**گه‌يشـــتووه به‌وه‌ى قورئان و فه‌رمووده‌ى ڕه‌تكردووه‌ته‌وه به ته‌واوى و ئه‌ڵێـت ئه‌وه‌ى قورئان و فه‌رمووده هه‌واڵيان داوه ده‌رباره‌ى ظني ـن نه‌وه‌ک قطعي .**

**وه له‌به‌ر ئه‌وه‌ى سـوننه‌ت ڕوونكه‌ره‌وه‌ى قورئانه، به‌وهۆيه‌وه هاوه‌ڵانى سـوننه‌ت زياتر شاره‌زان به قورئان له جگه له خۆيان .**

**- له (الطبقات لابن سعد) ــدا هاتووه له إبن عباس ــه‌وه رضي الله عنهما كه علي بن أبي طالب رضـــي الله عنه ناردوويه‌تى بۆلاى خه‌واريجه‌كان و پێى فه‌رمووه : (بڕۆن موناقه‌شه‌يان له‌گه‌ڵدا بكه، به قورئان موناقه‌شه‌يان له‌گه‌ڵدا مه‌كه چونكه خاوه‌ن چه‌ند ڕوويه‌كه، به‌ڵكو به سوننه‌ت موناقه‌شه‌يان له‌گه‌ڵدا بكه) .**

**وه له ڕيوايه‌تێكى تردا هاتووه إبن عباس ـه‌وه رضي الله عنهما ئه‌فه‌رمووێت : (ئه‌ى پێشـــه‌واى ئيمـانداران ئێمه زانـاترين به كتێبى الله له ئه‌وان، له مـاڵه‌كـانى خۆمـانـدا دابه‌زى).**

**علي رضي الله عنه فه‌رمووى : (ڕاسـت ئه‌كه‌يت به‌ڵام قورئان ئه‌كرێت بخرێته‌سـه‌ر چه‌ند ڕوويه‌ک، تۆ شـتێک ئه‌ڵێيت و ئه‌وانيش شـتێكى تر، به‌ڵكو موناقه‌شـه‌يان له‌گه‌ڵ بكه به سوننه‌ت، چونكه هيچ چاره‌يه‌كيان نامێنێت) .**

**جا إبن عباس ـــه‌وه رضي الله عنهما ده‌رچوو و به سوننه‌ت موناقه‌شه‌ى له‌گه‌ڵدا كردن، ئيتر هيچ به‌ڵگه‌يه‌كيان به‌ده‌سته‌وه نه‌ما .**

**٥٦** - **أبو العالية** ئه‌ڵێت : (دوو ئايه‌ت هه‌ن زۆر توندن له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سانه‌ى ده‌مه‌ده‌مێ ئه‌كه‌ن له قورئاندا : ﴿مَا يُجَـٰدِلُ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ (غافر : ٤) .

﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ (البَقَرَة : ١٧٦) .

**٥٧** - **طاوس** ئه‌ڵێت : (له‌لاى إبن عباس ـــدا رضي الله عنه باسى خه‌واريج و باشى و زۆرى خوێندنه‌وه‌يان بۆ قورئان كرا .

فەرمووی : (بـاوەڕ بە موحکەمەکەی ئەهێنن، وە لە موتەشـــابیهەکەیـدا تیائەچن).

**٥٨ - معاوية بن قرة** رضـــي الله عنه ئەفەرمووێت : (دەمەدەمێ کردن لە قورئاندا کاروکردەوە پووچەڵ ئەکاتەوە).

**٥٩ - مسـروق** ئەڵێت : (هیچ ئەهلی هەوا و ئارەزوویەک نییە ئیللا قورئان ڕەددیان ئەداتەوە، بەڵام ئێمە نایدۆزینەوە).

---

**- لە (فضـائل القرآن لأبي عبيد) ـــــدا هاتووە مسـروق بن الأجدع ئەڵێت : (پرسـیارمان نەکردووە لە هاوەڵانی محمد ﷺ دەربارەی هیچ شـتێک ئیللا وەڵامەکەی هەبووە لە قورئاندا، بەڵام زانستی ئێمە کەم بووە پێی).**

**ئەمە فەزلی هاوەڵان و شـــارەزاییان بە قورئان دەرئەخات، سـەرنجی وتەکە بدە ئەبینیت تەنانەت زانایانیش بێ پێویست نەبوون لە تەفسیری ئەوان، سەرەڕای هەبوونی زانســت، بەڵام زانســتەکەیان نەگەیشــتووەتە ئەو ئاستـەی بەبێ تەفسـیری ئەوان لە ئایەتەکان تێبگەن.**

**- لە (الحجة على تارک المحجة) ـــــدا ئیمامی علي رضـي الله عنه ئەفەرمووێت : (هیچ شـتێک نییە ئیللا زانســتەکەی لە قورئاندایە بەڵام بۆچوون و بیری پیاوان ناگات پێی).**

**- إبن تیمیة لە (درء التعارض بين العقل والنقل) ـــــدا ئەڵێت : (قورئان ئاماژەی داوە بە هەموو ئەو واتایانەی کە خەڵکی تیایدا تووشــی دووبەرەکی بوون بە مانا دیار و وردەکانیەوە وەکو چۆن الشعبي وتوویەتی : (هیچ کەسێک بیدعەیەکی دانەهێناوە ئیللا لە قورئاندا ڕوونکەرەوەکەی تێدایە)).**

٦٠ - **يزيد بن الأصم** وتی : پیاوێک هات بۆ لای عمر رضـــي الله عنـه، پرسیاری لێکرد دەربارەی خەڵکی .

ئەویش وتی : ئەی پێشـــەوای ئیمانداران ئەوەندە و ئەوەندەیان قورئانیان لەبەرکردووە .

إبن عباس رضـــي الله عنهما فەرمووی : (واللە حەز ناکەم بە ئەم شـــێوەیە لەمرۆدا ئاوا پەلەپەل و پێشبڕکێیە بکەن لە قورئاندا) .

- **دواتر هەر إبن عباس رضـي الله عنهما ئەگێڕێتەوە** - جا عمر بن الخطاب رضـي الله عنە دانەیەکی لێدام، منیش بە خەمباری بەرێکەوتم بۆ ماڵەوە، وە وتم : لەلای ئەو پیاوەدا کەوتمە پێگەیەکەوە لەبەرچاوی کەوتم .

منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و پاڵکەوتم لەســـەر ڕاخەرەکەم هەتا ئافرەتانی ماڵەوەمان ســـەردانیان کردم و هیچ ئازارێکم نەبوو، وە ئەوەی هەمبوو بەهۆی ئەوەوە بوو کە عمر رضي الله عنه بەرامبەرم کردبووی .

کاتێک من بەو جۆرە بووم پیاوێک هات و وتی : وەڵامی پێشـەوای ئیمانداران بدەرەوە و بەدەمیەوە بچۆ .

منیش دەرچووم و ئەویش لەلای دەرگاکەدا چاوەڕێی ئەکردم، دەســتی گرتم و بردمیە شـــوێنێکی چۆڵەوە، وتی : (چ شـــتێکت پێ ناخۆش بوو ئەوەی ئەو پیاوە پێش ئێستە وتی ؟) .

وتم : ئەی پێشـــەوای ئیمـانـداران، ئەگەر خراپم کردبێـت ئەوە داوای لێخۆشـبوون لە الله عز وجل ئەکەم و ئەگەڕێمەوە بۆ لای، وە بەوشـێوەیە ئەبم کە ئەتەوێت .

وتی : (بۆم باس ئەکەیت کە چیت پێ ناخۆش بووە لەوەی ئەو پیاوە وتی) .

وتم : ئەی پێشەوای ئیمانداران، کەی بەم شێوەیە پێشبڕکێیان کرد تووشی جیاوازی ئەبن، وە کەی جیاوازبوون دوژمنایەتی ئەکەن، وە کەی دوژمنایەتیان کرد شەڕ ئەکەن لەگەڵ یەکتردا ).

: واتە هەوڵی زۆریان بۆ لەبەرکردنی قورئانە و پێشبڕکێی تیایدا ئەکەن بەبێ ئەوەی لێی تێبگەن و بەرچاوڕۆشن بن دەربارەی، پاشان لێکی ئەدەنەوە بە خیلافی لێکدانەوەی ڕاست، هەربۆیە بە هەلاکەت ئەچن .

وە لە (السنة لـ الخلال) دا هاتووە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : پیاوێک هات بۆ لای عمر بن الخطاب رضي الله عنه، عمر بن الخطاب پرسیاری لێ کرد.

ئەویش وتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەوەندە و ئەوەندەیان قورئانیان لەبەرە و خوێندوویانەتەوە .

منیش وتم : (سوێند بە الله پێم خۆش نییە لەمڕۆدا بەو شێوەیە پەلەپەل بکەن لە قورئاندا ) .

جا عمر دانەیەکی پیاداکێشام و وتی : (ئەوە چیتە!) .

منیش ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە بە دڵتەنگی و خەمباری، کاتێک بەو شێوەیە بووم پیاوێک هات و وتی : وەڵامی پێشەوای ئیمانداران بدەرەوە .

منیش چوومە دەرەوە و ئەویش لەبەردەرگا چاوەڕێی ئەکردم، دەستی گرتم و بردمیە پەنایەکەوە و وتی : (چ شتێکت پێ ناخۆش بوو لەوەی ئەو پیاوە وتی ؟).

منیش وتم : (ئەی پێشەوای ئیمانداران، هەرکاتێک بەم خێراییە قورئان بخوێننەوە هەرکامێکیان وا ئەزانن حەق لەلای ئەویانە، وە هەرکاتێک وایانزانی حەق لەلای خۆیانە دەست ئەکەن بە دوژمنکاری، وە کاتێک دوژمنکاریان کرد ئیتر ڕاجیاواز ئەبن، وە کاتێک ڕاجیاوازبوون یەکتری ئەکوژن ) .

وتی : (ڕەحمەت لە باوکت، من ئەوەم لە خەڵکی ئەشاردەوە هەتا تۆ وتت ) .

## دەروازەی : (٧)

## جێگیرکردنی بەڵگەکان لەسەر بەتاڵێتی و هیچێتی وتەی ئەوەی وتوویەتی بە قورئان بەسە و بێپێویستە لە سوننەت

٦١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (وا خەریکە یەکێک لە ئێوە وتەیەک لە وتەکانی منی پێ بگات و لەســەر ڕاخەرەکەی پاڵی دابێتەوە و بڵێت : شــوێن ئەوە ئەکەوین کە لە قورئاندا هاتووە) .

٦٢ - رســول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (وا خەریکە کەســێکی تێر کە پاڵی داوەتەوە لەســەر ڕاخەرەکەی فەرموودەی لە منەوە پێ بگات؛ بڵێت : (ئەمە کتێبی الله ــیە، هەر شتێکی تێدا بێت حەلاڵ بێت حەلاڵی ئەکەین، وە هەر شتێکی تێدا بێت حەرام بێت حەرامی ئەکەین).

هەرکەســێـک فەرموودەیەکی لە منەوە پێبگـات و بەدرۆی بخـاتەوە ئەوە بەڕاســتی ســێ دانەی بەدرۆ خســتووەتەوە : کتێبی الله و، پێغەمبەرەکەی و ئەو کەسەی کە هێناویەتی -واتە ئەوەی گێڕاویەتەوە- ) .

---

: ئەمە یەکێکە لە هەواڵدانەکانی رســول الله ﷺ دەربارەی ئەوەی پاش خۆی چی ئەگوزەرێت، بەدەســتهێنانی فەرموودە و ســەفەرکردن لەپێناوی و لەبەرکردن و نووسینەوەی کارێکی قورس بووە، وە رسول الله ﷺ ئاماژە ئەکات بەوەی ئەو کەسانەی فەرموودە قبووڵ ناکەن تەمبەڵ و هیچلەباردا نەبوون لەڕووی زانستەوە بە فەرمایشتی (کەسێکی تێر کە پاڵی داوەتەوە لەسەر ڕاخەرەکەی) .

تاقەتیان نەبوو بەدوای زانســـتدا بگەڕێن هەربۆیە وتیان ئەوە قبووڵ ئەکەین کە لە قورئاندا هەیە .

وە ئەو کەســـانەی ئێســـتاش کە فەرموودەی رســـول الله ﷺ قبووڵ ناکەن و سوننەت ڕەت ئەکەنەوە ئەیانبینیت هیچ پەیوەست بوون و ئیلتیزاماتێکی دینیان نییە، وە ئەگەر هەشـــیـان بێت زۆر کەمە، هەربۆیە ئەو فەرمایشـــتەی رســـول الله ﷺ : (کەســێکی تێر کە پاڵی داوەتەوە لەســـەر ڕاخەرەکەی) ئەیانگرێتەوە چونکە لە ئاســـت جێبەجێکردنی ئەوەی لە دیندا هاتووە تەمبەڵن .

- الآجری لە کتێبی (الشـــریعة) ـــــدا باب ــــێکی داناوە بە ناوی : (دەروازەی ئاگاداربوون لەو کۆمەڵەیانەی کە سوننەتی رسول الله ﷺ ئەکەن بە گژی کتێبەکەی الله تعالی ـدا، وە بەرپەرچدانەوەیەکی توند بۆ ئەم کۆمەڵەیە) .

ئەڵێت : (پێویستە لەسەر ئەهلی زانست و ژیری هەر کە بیستیان وتەیەکی رسول الله ﷺ کە جێگیر بووە لای زانایان کەسێکی نەزان دژی ئەوەستێتەوە و ئەڵێت : من تەنها ئەوەم قبووڵە کە لە قورئاندا هەیە.

بڵێن : تۆ کەســێکی خراپیت، وە تۆ ئەو کەســـەی کە پێغەمبەر ﷺ ئێمەی لێت ئاگادارکردەوە، وە زانایان ئاگادارکردنەوەیان لەبارەی تۆ داوە.

وە بڵێن : ئەی نەزان، الله تعـالی فەرزەکـانی بەشـــێوەیەکی گشـــتی ناردووەتە خوارەوە، وە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە کە ئەوەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە بۆیان دابەزیوە، الله عز وجل ئەفەرمووێت : ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل : ٤٤) .

: ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارەوە بۆت هەتا بۆ ئەو خەڵکەی ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە و بەڵکو بیر بکەنەوە.

الله تعـالی پێگەی ڕوونکردنەوەی دا بە پێغەمبەرەکەی، وە فەرمـانی کرد بە دروســـتکراوەکان گوێڕایەڵی ببن و نەهی لێکردن لە ســـەرپێچی کردنی، وە فەرمانی پێ کردن بە گەڕانەوە بۆلای، الله تعالی ئەفەرمووێت : ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ (الحشر : ٧) .

: وە هەرشـــتێـک پێغەمبەر پێیـدان وەری بگرن واتە : بەچی فەرمانی پێکردن بیکەن، وە ڕێی لە هەر شتێک لێگرتن ئێوەش دەستی لێهەڵگرن.

پاشان ئاگاداری کردنەوە لەوەی سەرپێچی فەرمانی رسول الله ﷺ بکەن و الله تعالی فەرمووی : | فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِـــيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِـــيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ | (النور : ٦٣) .

: ئەوانەی ســەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ئەکەن با بترســن لەوەی تووشــی بەڵا و نەهامەتی، یان تووشی سزایەکی بەئێش ببن.

الله عز وجل ئەفەرموویت : | فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَـــجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا | (النساء : ٦٥)

: ســوێند بێت بە پەروەردگارت - ئەی پێغەمبەر ﷺ - باوەڕ ناهێنن هەتا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ نەکەن بە داوەر، وە پاشان بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە بە هیچ شێوەیەک دڵ تەنگ نەبن و بە چاکیش تەسلیم و ملکەچ ببن.

وە لە قـورئانەکەیـدا **٣٥** جـار گـوێـڕایەڵـی پـێـغەمـبەرەکەی ﷺ لەســەر دروستکراوەکانی فەرز کردووە.

وە بە ئەم دژ ـــەی سـوننەتی رسـول الله ﷺ ئەوترێت : هەی نەزان الله تعالی ئەفەرموویت : | وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ | (البقرة : ٤٣) .

: وە نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن.

جا لە کوێی قورئانـدا ئەیدۆزیتەوە کە نوێژی بەیانی دوو ڕکاتە ؟ وە نوێژی نیوەڕۆ چوار و، نوێژی عەســـر چوار و، نوێژی مەغریب ســێ و نوێژی عیشــا چوارە ؟ لە کوێی قورئانـدا حوکم و کـاتەکـان و ئەوەی جێگیری ئەکـات و ئەوەی هەڵی ئەوەشــێنێتەوە ئەدۆزیتەوە تەنها لە سوننەتی رسول الله ﷺ دا نەبێت ؟!

وە بە هەمان شێوە زەکات، لە کوێی قورئاندا ئەیدۆزیتەوە کە لە سەد درهەم پێنج درهەم زەکات ئەدرێت ؟ وە لە بیســـت دینار نیو دینار و، لە چل مەڕ مەڕێک و هەموو حوکمەکانی زەکات لە کوێی قورئاندا ئەدۆزیتەوە ؟!

وە بە هەمان شـــێوە تەواوی فەرزەکان دیکە، ئەوەی الله تعالی فەرزی کردووە ناتوانرێت حوکمەکەی بزانرێت تەنها بە ســوننەتی رســول الله ﷺ نەبێت، ئەمە وتەی زانایانی موســوڵمانانە، هەر کەســێک شــتێکی تر غەیری ئەمە بڵێت ئەوە لە میللەتی ئیســلام دەرچووە و چووەتە ناو میللەتی مولحیدەکان، داوا پاراســتن لە الله ئەکەین لە گومڕایی دوای هیدایەت.

وە لە پـێغەمبەر ﷺ و هـاوەڵانیەوە بە هەمـان شــێوەی ئەوەی مـن بـۆم ڕوونکردوویتەتەوە هاتووە، جا ئەوە بزانە) .

- إبن بطـة باب ــێکی داناوە لە (الإبانة الكبرى) ــدا بەناوی (باسکردنی ئەوەی سوننەت پێی هاتووە لە گوێڕایەڵی رسول الله ﷺ، وە ئاگاداریدان لە کۆمەڵەیانێک کە دژی سوننەتی رسول الله ﷺ ئەوەستنەوە بە قورئان) .

وە ئەڵێـت : (وە ئیمـانـداران لە ئەهلی ژیری و زانســـت بزانن کە کۆمەڵەیەک ویســتیان بریتیە لە بەتاڵکردنەوەی شــەریعەت و نەهێشــتنی شــوێنەواری زانســت و سوننەت، جا سەر لەوە ئەشێوێنن کە زانستی کەمە و دڵی لاوازە بەوەی ئەوان بانگەواز ئەکەن بۆ کتێبی الله، وە تەسلیمی ئەبن و بەڵگەی پێ ئەهێننەوە .

بەڵام لەڕاستیدا ئەوان لە کتێبی الله هەڵدێن و پشتیان تێ کردووە و موخالەفەی ئەکەن .

لەبەر ئەوەی ئەوان کاتێک گوێبیستی سوننەتێک ئەبن لە رسول الله ــەوە ﷺ کە گەورەکـان لە ســەروخۆیـانەوە ڕیوایەتیـان کردووە و ئەهلی عەدالەت و متمـانە گێڕاویانەتەوە و پێشــەوایانی ئیســلام کۆکن لەســەر صـحیح ـــبوونی و فەقیهەکانیان حوکمیان پێ داوە; دژی ئەو سـوننەتە وەسـتانەوە بە پێچەوانەکردنی و ڕەدیان دایەوە و وتیان بەوانەی ڕیوایەتیان کردووە : ئایا ئەمە ئەبینیتەوە لە کتێبی الله ـــــدا ؟ وە ئایا لە قورئاندا دابەزیوە ؟ وە ئایەتێکم بۆ بهێنن تا باوەڕی پێ بکەم) .

٦٣ - أيوب السختياني ئەڵێت : (ئەگەر باســی ســوننەتت بۆ پیاوێک کرد و وتی : (سەرقاڵمان مەکە بەوە، قورئانمان بەسە) .

ئەوە بزانە گومڕایە) .

٦٤ - أيوب السختياني ئەڵێت : (کاتێک بیستت یەکێکیان ئەڵێت : (تەنها قورئانمان ئەوێت)، ئەوە ئەوکات وازی لە قورئان هێناوە) .

---

**: چونکە لە چەندین ئایەتی قورئاندا هاتووە الله عز وجل فەرمانی پێکردووین بە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەگەر کەسێک فەرمودە و سوننەت قبووڵ نەکات ئەوە وازی لە فەرمانی الله عز وجل هێناوە .**

**- البربهاري لە (شرح السنة) دا ئەڵێت : (ئەگەر فەرموودە و ئەثەرت هێنا بۆ کەسێک و نەیویست و قورئانی ویست، ئەوە گومانت نەبێت لەوەی ئەو کەسە زەندەقەی تیادایە، لەلای هەستە و وازی لێ بهێنە) .**

**- لە کتێبی (الحجة في بيان المحجة) دا أبو هريرة رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە سەردەمێک دێت بەسەر خەڵکیدا فەرموودەکانی رسول الله ﷺ ئەگێڕنەوە یەکێکیان هەڵئەستێت جلەکانی ئەتەکێنێت و ئەڵێت : (نەخێر تەنها قورئان نەبێت)، وە یەک پیتیش کار بە قورئان ناکات) .**

٦٥ - قتادة دەربارەی : ﴿مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ﴾ (طه : ١١٤) .

ئەڵێت : (پێش ئەوەی ڕوونکردنەوەکەیت پێ بوترێت) .

٦٦ - حسان بن عطية ئەڵێت : (جبريل عليه السلام قورئان و سوننەتی ئەهێنایە خوارەوە، وە سوننەتی فێر ئەکرد وەک چۆن فێری قورئانی ئەکرد) .

---

**: کەواتە سوننەتی رسول الله ﷺ وەحیەکە لە غەیری قورئان لەلایەن الله عز وجل ەوە .**

- أبو الفتح المقدسي له كتێبی (مختصر الحجة في بيان المحجة) ـــدا باب ـــێكی داناوە بەناوی (ڕوونكردنەوەی واتای فەرمایشتی | وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ * إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ | (النَّجْم : ٣ - ٤)، وە هەموو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردووە یان نەهی لێ كردووە بە وەحی الله عز وجل ـە).

- وە لە (الحجة في بيان المحجة) ـــدا مخلد بن الحسين ئەڵێت : الأوزاعي پێی وتم : (ئەی أبو محمد، ئەگەر لە رسول الله ـەوە ﷺ فەرموودەیەكت پێ گەیشت ئەوە بیر لە شتی دیكە مەكەرەوە، چونكە محمد ﷺ گەیەنەر بووە لە پەروەردگاریەوە).

٦٧ - إسماعيل بن عبيدالله ئەڵێت : (پێویســتە لەســەرمان ئەوە بپارێزین كە لە رسول الله ـەوە ﷺ هاتووە، چونكە پێگەی وەكو پێگەی قورئانە).

---

- إبن القيم لە كتێبی (إعلام الموقعين عن رب العالمين) دا ئەڵێت : (سوننەت لەگەڵ قورئاندا لە سێ ڕووەوەیە :

یەكەمیان : سوننەت موافەقەی قورئان بێت لە هەموو ڕوویەكەوە، ئەمەش بریتیە لە ڕێككەوتنی قورئان و ســوننەت لەســەر یەک حوكم لە دەروازەی ڕێككەوتن و لەگەڵیەكگونجانی بەڵگەكان.

دووەم : سوننەت ڕوونكردنەوەی مەبەستی قورئان و تەفسیرێک بێت بۆی.

ســێیەم : ســوننەت واجبكاری حوكمێک بێــت كە قورئان بێدەنگ بووە لە بەواجبدانانی، وە حەرامكەری ئەوەبێت قورئان لەبەحەرامكردنی بێدەنگ بووبێت.

پەیوەندی نێوان قورئان و سوننەت لەم سێ جۆرە دەرناچێت.

هەربۆیە سوننەت هیچ پێچەوانەیی و دژایەتیەكی نییە لەگەڵ قورئاندا.

هەر شــتێک لە ســوننەت هاتبێت و لە قورئاندا نەهاتبێت ئەوە تەشــریعێكە لە رســول الله ـــــەوە ﷺ كە گوێڕایەڵیكردنی تیایدا واجبە، وە ســەرپێچیكردنی تیایدا ڕێگەپێدراو نییە، ئەمە بریتی نییە لە پێشخستنی قورئان بەسەر سوننەتدا، بەڵكو بریتیە

له جێبەجێکردنی ئەوەی الله عز وجل فەرمانی پێکردووە لە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ، خۆ ئەگەر رسـول الله ﷺ لەم بەشـەدا گوێڕایەڵی نەکرایە ئەوە هیچ مانایەک لە گوێڕایەڵێتیکردنیدا نەئەبوو، وە ئەو گوێڕایەڵیەی تایبەتە بە خۆی ئەکەوت و نەئەما .

وە ئەگەر گوێڕایەڵی رســول الله ﷺ واجب نەبوویایە تەنها لەوەدا نەبێت کە موافەقەی قورئانی کردووە نەک لە هێنانی شـــتێکی زیادە کە لە قورئاندا نییە; ئەوە هیچ گوێڕایەڵیەتیەکی تایبەت بە خۆیی نەئەبوو، وە الله عز وجل ـــــیش فەرموویەتی : | مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ | (النِّسَاء : ٨٠) .

٦٨ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (ســوننەت قورئان لێئەکەداتەوە و ڕوونی ئەکاتەوە) .

٦٩ - مکحول ئەڵێت : (قورئان زیاتر پێویستی بە سوننەتە لەوەی سوننەتی پێویستی بە قورئان بێت) .

---

: چونکە ســوننەت ڕوونکەرەوەی قورئانە نەک قورئان ڕوونکەرەوەی ســوننەت بێت .

٧٠ - يحيى بن أبي كثير ئەڵێت : (ســوننەت بڕیاردەرە بەســەر قورئاندا، وە قورئان بڕیاردەر نییە بەسەر سوننەتدا) .

---

- لە کتێبی (الحجة في بيان المحجة) ـــدا الدارمي دەربارەی وتەکەی يحيى بن أبي كثير ئەڵێت : (واتە : ســوننەت قورئان ڕوون ئەکاتەوە، وە قورئان بنچینە جێگیرە مجمل ـــەکانن کە ســوننەت ڕوون ناکەنەوە، بەڵکو ســوننەت ڕوونی ئەکاتەوە و سنوورەکانی دیاری ئەکات و شێوازی ئەنجامدانی لەلایەن خەڵکیەوە ڕوون ئەکاتەوە) .

- لە کتێبی (الكفاية في معرفة أصول علم الرواية) ــدا عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (پیاو زیاتر لە خواردن و خواردنەوە پێویســتی بە فەرموودە هەیە، وە فەرموودە قورئان ڕوون ئەکاتەوە) .

- لە (مسـائل أبو داود) ـــدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (سـوننەت قورئان ڕوون ئەکاتەوە، وە قورئان نەسخ ناکرێتەوە تەنها بە قورئان نەبێت) .

- لە (مسـائل عبدالله بن أحمد) ـــدا عبدالله ئەڵێت : پرسـیارم کرد لە باوکم وتم : چی ئەڵێیت دەربارەی وتەی (سوننەت بڕیار ئەدات لەسەر قورئان)؟

وتی : (کۆمەڵەیەک لێیان ئەو وتەیەی وتووە، تیایاندایە مکحول و الزهري) .

وتم : ئەی تۆ ئەڵێیت چی ؟

وتی : (ئەڵێم سوننەت واتا و ماناکانی قورئان ڕوون ئەکاتەوە و پیشانیان ئەدات).

٧١ - إسماعيل بن أبي أويس ئەڵێت : (مالک ی خاڵم فەرموودەی رسول الله ی ﷺ نەئەگێڕایەوە مەگەر بە دەستنوێژەوە نەبێت) .

---

- لە کتێبی (المحدث الفاصـل بين الراوي والواعي) ـــدا أبو سـلمة منصـور الخزاعي ئەڵێت : (مالک بن أنس کاتێک بیویســتایە دەربچێت فەرموودە بگێڕێتەوە دەسـتنوێژی ئەگرت و باشـترین جلی لەبەر ئەکرد و کڵاوەکەی لەسـەر ئەکرد، وە ڕیشـی شانە ئەکرد .

دەربارەی ئەوە قسەی لەگەڵ کرا .

وتی : (فەرموودەی رسول الله ﷺ بەرز و گەورە ڕائەگرم) .

- لە کتێبی (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السـامع) ـــدا أبو الزناد : (سـعيد بن المســيب کاتێک نەخۆش بوو ئەیوت : دامبنیشــێنن، ئەوە بە قورس و گەورە ئەزانم فەرموودەی رسول الله ﷺ بخوێنمەوە و پاڵکەوتبم) .

٧٢ - **قتادة** ئەڵێت : (خۆشـــویســـتراو بوو فەرموودەکانی رســـول الله ﷺ نەخوێندرێتەوە مەگەر بە دەستنوێژەوە نەبێت) .

٧٣ - **مجاهد** دەربارەی فەرمایشـــتی جل ثناؤە : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ (النِّسَاء : ٥٩) .

ئەڵێت : ( - **بیگەڕێننەوە بۆ** - کتێبی الله، وە ســـوننەتی رســـول الله ﷺ، وە ﴿ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾ بریتین لە زانایان و فەقیهەکان) .

٧٤ - **میمون بن مهران** دەربارەی فەرمایشـتی جل ثناؤە : ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ (النِّسَاء : ٥٩) .

ئەڵێت : ( - **بیگەڕێننەوە** - بۆ کتێبی الله، وە گەڕاندنەوە بۆ رســـول الله ﷺ پاش ئەوەی وەفاتی کرد; بریتیە لە گەڕاندنەوە بۆ سوننەتەکەی) .

- **وکیع بن الجراح** ئەڵێت : (**وە - بیگەڕێننەوە** - بۆ رســـول الله ﷺ هەتا لەژیاندا بێت، جا کاتێک وەفاتی کرد ئەوکات بۆ سوننەتەکەی) .

---

- إبن القیم لە (الرســـالة التبوكية) ـــــدا ئەڵێت : (ڕیوایەتەکان جیاواز لە ئیمام أحمد ـەوە دەربارەی ﴿ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾ .

دوو ڕیوایەت هەیە لێیەوە :

یەکەمیان : زاناکانن .

دووەمیان : دەسەڵاتدارەکانن .

وه هەردوو وتەكە جێگیر بوون لە هـاوەڵانەوە رضـي الله عنهم لە تەفسـيرى ئايەتەكەدا.

وه ڕاستەكە ئەوەيە كە هەردوو پۆلەكە ئەگرێتەوە، چونكە زانايان و دەسەڵاتداران خاوەنى دەسەڵاتى ئەوەن كە الله عز وجل پێغەمبەرەكەيى پێ ناردووە .

زانايان وەلى ئەمرن لەڕووى پاراسـتن و ڕوونكردنەوە و گەياندن و بەرگرى لێ كردن، وه ڕەددانەوەى ئەو كەسەى كە لايداوە لێى، وه الله ئەوەى پێ ڕاسپاردوون .

وه دەسەڵاتدارەكانيش وەلى ئەمرن لەڕووى جێبەجێكردن و پارێزگاريكردن لێى و هەوڵدان بۆى و پەيوەستكردنى خەڵكى پێوەى و دەستگرتنى ئەوەى كە لێى دەرئەچێت.

وه لە (مفتاح دار السعادة ومنشور ولاية أهل العلم والإرادة) ـدا ئەڵێت : (لەبەر ئەوەى هەموو جيهادكردنێک بە شمشێر و بەڵگە پێى ئەوترێت (في سبيل الله)، هاوەڵان فەرمايشتى ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ ـيان تەفسير كردووە بە دەسـەڵاتداران و زانايان، چونكە ئەوانە كۆشـش ئەكەن لەپێناو الله ـــدا، ئەوانە بە دەستەكانيان، وه ئەوانى ديكە بە زمانيان، جا هەوڵدان بۆ فێربوونى زانست و فێركردنى لە گەورەترينەكانە لەپێناو الله عز وجل) .

**٧٥ - أبو موسى محمد بن المثنى** ئەڵێت : گوێبيسـتى المعتمر بن سـليمان بووم ئەيوت : گوێبيستى باوكم بووم وتى : (فەرموودەكانى رسول الله ﷺ لەلامان وەكو قورئانە).

أبو موسـى وتى : (واتە لە بەكـارهێنـانـدا، سـوننەتى رسـول الله ﷺ بەكارئەهێنێت وەک چۆن كەلامى الله عز وجل بەكارئەهێنێت) .

---

- لە (المدخل إلى السـنن) ـــدا حماد بن زيد ئەڵێت : (حورمەت و ڕێزى فەرموودەكانى رسول الله ﷺ وەكو حورمەتى كتێبى الله تعالى يە) .

٧٦ - محمد بن عبدالوهاب الفراء ئەڵێت : وتم بە علي بن عثام : پیاوێک ئەڵێت فەرموودەی رسول الله ﷺ فیقهی تێدا نییە .

وتی : (ئەوە فاجر و خراپەکارە، بۆ فیقهـــــو چاکە لە کوێدایە جگە لەوێدا نەبێت ؟!).

---

- وكيع بن الجراح ئەڵێت : (أبو حەنیفە منی بینی، وتی : واز لە نوسینی فەرمووده بهێنە، خۆت فێری فیقه بکە .

منیش وتم : فەرموودە هەموو فیقه کۆ ئەکاتەوە .

وتی : ئافرەتێك بڵێت سکم هەیە، مێردەکەشی ئینکاری لێ بکات و بڵێت منداڵی من نیە، چی ئەڵێیت دەربارەی ؟

منیش پێم وت : عباد بۆی گێڕامەوە لە عکرمة لە ابن عباس وتی : (رســـول الله ﷺ داوای مولاعەنەی کردووە دەربارەی سکپڕی) .

وکیع دەڵێت : (أبو حەنیفە وازی لێ هێنام، دوای ئەمە هەر جارێک منی دیبوایە لە ڕێگایەك ڕێگایەکی تری ئەگرتەبەر) .

نصيحة أهل الحديث

: مولاعەنە واتە ئافرەتەکە لەعنەت لەخۆی ئەکات گەر زینای کردبێت، پیاوەکەش لەعنەت لەخۆی ئەکات گەر بوهتانی هەڵبەستبێت بۆ ژنەکەی .

ئەهلی حەدیـث هەمیشــە هەوڵیـان داوە حوکمە شـــەرعیەکـان لە قورئان و فەرموودەی رســـول الله ﷺ و ئاثـاری هـاوەڵان دەربکەن، ئەگەر حوکمەکە لەوانەدا نەبووبێت ئینجا ڕوویان کردووەتەوە قیاس، پاشـــان قســـەکردن تیایدا بە بۆچوون، وە هەتا فەرموودەی رســـول الله ﷺ وەســـتابێت لایان نەداوە بۆ شـــتی دیکە و حوکمە شـــەرعیەکەیان لێ دەرکردووە، وەک چۆن لە ڕەفتاری خاوەنانی کتێبی الســنن بەڕوونی دەرئەکەوێت .

٧٧ - أبو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري ئەڵێت : گوێبیستی أحمد بن إسحاق بن أيوب الصبغي ــى فەقیهــبووم موناقەشەی ئەکرد لەگەڵ پیاوێکدا.

وتی : (فڵان بۆی گێڕاینەوە) .

پیاوەکە وتی : سەرقاڵمان مەکە بە بۆی گێڕاینەوە هەتا کەی بۆی گێڕاینەوە ؟

شێخ وتی : (هەستە ئەی کافر، ئیتر بۆت نییە بێیتە ناو ماڵەکەمەوە) .

---

**: هیچ شتێک لەوە ناخۆشتر نییە بەلای زەندیقەکانەوە کە بگەڕێیتەوە بۆ سەر ئەوەی سەلەف لەسەریبوون، لە هەر بابەتێکدا شتێک هاتە پێشەوە تۆ بە وتەی ئەوان وەڵام بدەیتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو زەندیقانە ئەیانەوێت وەکو خۆیان واز لە تێگەیشتن و شوێنکەوتنی سەلەف بهێنیت و بە بۆچوونی خۆت قسە لە شتەکاندا بکەیت .**

٧٨ - الحميدي ئەڵێت : (سوێند بە الله ئەگەر بجەنگێم لەگەڵ ئەوانەی کە فەرموودەی رسول الله ﷺ ڕەت ئەکەنەوە پێم خۆشترە لەوەی کە بجەنگێم لەگەڵ هەمان ژمارەیاندا لە تورکەکان) .

٧٩ - أحمد بن سنان القطان ئەڵێت : (لە دنیادا هیچ بیدعەچییەک نییە ئیللا ڕقی لە ئەهلی حەدیثــە، وە کاتێک بەندە بیدعەیەکی ئەنجامدا شیرینی فەرمووده لە دڵی دائەماڵدرێت) .

---

**- لە (شرف أصحاب الحديث) ــدا بقية بن الوليد ئەڵێت : الأوزاعي پێی وتم : (ئەی أبو یحمد، چی ئەڵێیت دەربارەی کۆمەڵەیەک کە ڕقیان لە فەرموودە پێغەمبەرەکەیانە ؟) .**

وتم : کۆمەڵەیەکی خراپن .

وتی : (هیچ خاوەن بیدعەیەک نییە لە رسـول الله ـــەوە ﷺ فەرموودەیەکی بۆ بگێڕێتەوە کە پێچەوانەی بیدعەکەیەتی ئیللا ڕقی لە فەرموودە ئەبێتەوە) .

٨٠ - حمدان بن سـهل ئەڵێت : (ئەگەر قازی بوومایە دوو کۆمەڵەم زیندانی ئەکرد : پیاوێک فەرموودە بەدەســت ئەهێنێت و فیقهـــبەدەســت ناهێنێت، وە پیاوێک فیقه بەدەست ئەهێنێت و فەرموودە بەدەست ناهێنێت) .

---

: بەدەســتهێنانی فەرموودە و گرنگی نەدان بە فیقهـــواتە کەســەکە فەرموودە کۆبکاتەوە و بینووســێت و بیانگێڕێتەوە بەڵام هەوڵی ئەوە نەدات لە فەرموودەکان تێبگات و حوکمە شەرعیەکانیان لێ دەربکات .

بەدەستهێنانی فیقهـــو گرنگی نەدان بە فەرموودە ـــش بەشێوەیەکە کەسێک خۆی فێری حوکمە فیقهیەکان لە بابەتەکاندا بکات، بۆ نمونە بابەتی دادوەری، لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەو فەرموودەیانە فێر نەبێت کە حوکمە فیقهیەکانی ئەو بابەتەی لێوە دەرهێنراوە .

٨١ - أبو نصر بن سلام البخاري ـــی فەقیهـــئەڵێت : (هیچ شتێک قورستر نییە لەســەر ئەهلی ئیلحاد وە بوغزێنراوتر نییە بۆیان لە گوێبیســت بوونی فەرموودە و ڕیوایەتکردنی بە سەنەدەکەی) .

٨٢ - الحســين بن حرب وتی : الحســـن بن بشـــر الأدمي پێی وتم : (ئەی حسین، ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَـٰبِ وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ ﴾ .

ئەوەی پاش قورئان کامەیە ؟) .

وتم : (سوننەت) .

وتی : (ڕاســتت کرد، جبریل ئەهات بۆ لای رســول الله ﷺ بە ســوننەت وەک چۆن ئەهات بۆ لای بە قورئان) .

**: واتە سـوننەتیش وەحیە و لەلایەن الله عز وجل ـــەوە هاتووە، هەربۆیە کاتێک گوێڕایەڵی رسـول الله ﷺ ئەکەین و سـوننەتەکەی جێبەجێ ئەکەین ئەوە ڕاسـتەوخۆ گوێڕایەڵی الله تبارک وتعالی مان کردووە .**

٨٣ - أبو إسماعيل محمد بن إسماعيل الترمذي ئەڵێت : (من و أحمد بن الحسن الترمذي لەلای أحمد بن حنبل بووین، أحمد بن الحسن پێی وت : ئەی أبو عبدالله، لە مەککە باســی هاوەڵانی فەرموودەیان کردووە بۆ أبو قتیلة، ئەویش وتوویەتی : کۆمەڵەیەکی خراپن .

أبو عبدالله أحمد ـــــیش هەســـتایەوە بەدەم تەکاندنی جلەکانیەوە، وتی : (زندیقە، زندیقە، زندیقە) .

وە چوویە ماڵەکەیەوە) .

**: تاکە ڕێگەیەک بۆ گەیشـتن بە ڕێگای ڕاســت و عەقیدەی دروســت ئەوەیە کە ئەهلی حەدیث گرتوویانەتەبەر، جا تانەدان لەم ڕێگایە نیشــانەی پیســی و خراپیەکی زیاترە لە ناخی کەسەکەدا لەوەندەی پیشانی ئەدات .**

٨٤ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (کاتێک فەرموودەیەکتان بۆ گێڕدرایەوە لە رســول الله ـــــەوە ﷺ; ئەوە دڵنیابن لەوەی رســول الله ﷺ پاکترین و ڕێنمونیکراوترین و خۆپارێزەرترینە) .

: واتە بە قیاس و بۆچوون و یان بە بیانووی نەگونجان سوننەتی رسول الله ﷺ ڕەت مەکەرەوە، چونکە رســول الله ﷺ لەلایەن الله عز وجل ـــــەوە ڕێنمونی کراوە و ئەزانێت باشترینەکان چین بۆ ئوممەتەکەی .

٨٥ - سعيد بن جبير ئەڵێت : (کەم فەرمووده هەیە لە رسول الله ـەوە ﷺ پێم گەیشتبێت ئیللا لە کتێبی الله عز وجل دا بەڕاستخەرەوەکەیم بینیوەتەوە) .

---

: سبحان الله ئەوەی بە تێگەیشتنەوە قورئان و فەرمووده بخوێنێتەوە کەم تا زۆر هەست بە ڕاستی قسەی سعيد بن جبير ئەکات .

نموونە زۆرە تەنها یەک دانە ئەهێنینەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ (الرَّعد : ١٨) .

- أنس رضـــي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ڕۆژی قیامەت بە پیاو ئەوترێت لە ئەهلی ئاگر پێت وایە ئەگەر هەرچی لەســەر زەویدا بوو هی تۆ بوایە ئایا ئەتبەخشی بۆ ئەوەی رزگارت بێت ؟

ئەویش ئەڵێت : بەڵێ .

الله عز وجل ـــیش ئەفەرمووێت : درۆت کرد زۆر لەوە کەمتر و ئاسانترم لێ داواکردیت، من پەیمانم لێ وەرگرتیت لە پشتی ئادام ـدا کە هاوتا و شەریکم بۆ بڕیار نەدەیت کەچی تۆ هەر سوور بوویت لەسەر ئەوەی کە شەریکم بۆ بڕیار بدەیت) .

- لە (الرد على الجهمية لابن أبي حاتم) ـــــدا ســـلام بن أبي مطيع باســـی بیـدعەچییەکـانی کرد و وتی : (وەیـل بۆ ئەوان، چ شـــتێکی ئەم فەرموودەیـانە ڕەت ئەکەنەوە ؟! والله لە فەرموودەدا هیچ شـــتێک نییە ئیللا لە قورئانیشـــدا هەمان شـــت هەیە) .

: بۆ نمونە وەکو ئایەت و فەرموودەکانی سیفات .

**٨٦ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئه‌فه‌رموویّت : (ئه‌ی خه‌ڵكینه، الله عز وجل محمد ــی ﷺ به حه‌ق و ڕاستی نارد، وه الفرقان ــی له‌سه‌ر دابه‌زاند، وه فه‌رزه‌كانی له‌ســـه‌ر فه‌رز كرد، وه فه‌رمانی پیّ كرد فیّری ئوممه‌ته‌كه‌یی بكات، جا په‌یامه‌كه‌ی گه‌یاند، وه ئامۆژگاری ئوممه‌ته‌كه‌ی كرد و دڵســۆزبوو بۆیان، وه ئه‌وه‌ی فیّركردن كه نه‌یانئه‌زانی، وه ئه‌وه‌ی بۆ ڕوونكردنه‌وه كه جاهیل بوون پیّی، هه‌ربۆیه شویّنی بكه‌ون و شتی نویّ دامه‌هیّنن، ئه‌وه‌ی هه‌یه به‌ستانه، هه‌موو شتیّكی تازه بیدعه‌یه، وه هه‌موو بیدعه‌یه‌ک گومڕاییه) .

**٨٧ - الأوزاعي** و **أرطاة بن المنذر** ئه‌ڵێن : (ئه‌وه‌ی رســـول الله ﷺ فه‌رمووبیّتی (ئه‌وه و ئه‌وه ئه‌نجام مه‌ده‌ن)، ئه‌وه حه‌رامه، وه ئه‌وه نه‌هیه) .

---

**: واته نه‌هیكردنی رســول الله ﷺ له شــتیّک به حه‌رامدانانی ئه‌و شــته‌یه ته‌نها له‌كاتیّكدا نه‌بیّت به‌ڵگه‌یه‌كی ده‌ره‌كی به‌حه‌رامدانانه‌كه لاببات بۆ مه‌كروهبوون .**

**٨٨ - أبو نضـرة المنذر بن مالک** ئه‌ڵیّت: له‌لای عمران بن حصــین بووین رضـي الله عنه، فه‌رمووده‌ی بۆ گیّڕاینه‌وه، پیاویّک وتی : له كتیّبی الله ـــوه بۆمان بگیّڕه‌ره‌وه - **واته باسی فه‌رمووده مه‌كه باسی قورئان بكه** - .

عمران رضي الله عنه تووڕه بوو و فه‌رمووی : (تۆ گه‌مژه‌یت! الله له كتیّبه‌كه‌یدا باسی زه‌كاتی كردووه، جا كوا له دووسه‌د درهه‌م پیّنج زه‌كات ئه‌دریّت ؟!

الله له كتیّبه‌كه‌یدا باسی نویّژی كردووه، كوا نیوه‌ڕۆ و عه‌سر چوار ڕكعاته ؟!

الله له كتیّبه‌كه‌یدا باســی ته‌وافی كردووه، كوا به‌ده‌وری كه‌عبه‌دا حه‌وته، وه له ســـه‌فا و مه‌روا حه‌وته ؟! ئه‌وه‌ی كه له‌ویّدایه جیّگیر ئه‌كریّت - **واته ئه‌وه‌ی له قورئاندایه** - ، وه سوننه‌ت ڕوونی ئه‌كاته‌وه) .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی : (قورئان ئەوەی جێگیر کردووە، وە سوننەت ڕوونی ئەکاتەوە) .

**٨٩ - جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : (قورئان دائەبەزی بۆ سەر رسول الله ﷺ و ڕوونی ئەکردەوە[١] بۆمان وەک چۆن الله فەرمانی پێ کردبوو.

الله عز وجل ئەفەرموویت : ﴿فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ * ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ﴾ (القِيامَةِ : ١٨ - ١٩) .

وە ئەفەرموویت : ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النَّحل : ٤٤) .

---

: (١) ڕوونە کە هاوەڵان رضي الله عنهم ئەو وتە و ڕەفتار و دانپێدانانەی رسول الله ـــیان ﷺ بۆ ئێمە پاراســتووە کە لە ڕوونکردنەوەی قورئاندا فەرمووني و ئەنجامی داون، ئەوەش پێی ئەوترێت سوننەت .

**٩٠ - أيوب السختياني** وتی : پیاوێک وتی بە مُطَرِّف بن عبدالله بن الشِّخِّير : ئێمە قورئانمان ئەوێت .

مطرف وتی : (ئێمە جێگرەوەیەکمان ناوێت بۆ قورئان، بەڵکو کەســێکمان ئەوێت کە شارەزاتر بێت پێی لە ئێمە) .

---

: **خودی رســول الله ﷺ گەیەنەر و ڕوونکەرەوەی قورئانە، وە بـاشــترین ڕوونکەرەوەیە، پاش ئەو هاوەڵان رضـي الله عنهم لەگەڵیدا بوون و ئەو ڕوونکردنەوایان لێ وەرگرتووە، دواتر تـابیعیەکان ـــیش لە ئەوان هەتا ســەلەف لە کتێبەکانیاندا**

**نووسیویانەتەوە و ئێمەش شوێن ئەوان ئەکەوین وەک چۆن ئەوانیش شوێن سەلەفی خۆیان کەوتوون لە هاوەڵان و تابیعیەکان .**

**ئێمە دڵنیاین کە سەلەف پێش ئێمە قورئان و فەرموودەیان خوێندووەتەوە، وە دڵنیاین لێی تێ گەیشتووین، کەواتە تێگەیشتنی ئەوان لەپێش تێگەیشتنی هەموو کەسێکی دیکەوەیە .**

**٩١ - الربیع** وتی : پرسیار لە الشافعي کرا : بە چ شتێک هەواڵ جێگیر ئەبێت[١] ؟

وتی : (کاتێک کەسێکی ثقة لە ثقة ـیەک بگێڕێتەوە هەتا ئەگات بە رسول الله ﷺ .

وە هەرگیز واز لە فەرموودەیەکی ناهێندرێت تەنها فەرموودەیەک نەبێت کە فەرموودەیەکی تر پێچەوانەیەتی، جا لەوکاتەدا جێگیرترینی دوو ڕیوایەتەکە هەڵئەبژێردرێت، یان دانەیەکیان منسوخ ـە و کار ئەکرێت بە ناسخ ـەکە .

خۆ ئەگەر لە یەک ئاستدا بوون[٢] ئەوەیان هەڵئەبژێرێت کە لێکچووترە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ لە جگە لە خۆیاندا .

وە فەرموودەی رسول الله ﷺ بەتەنها خۆی بێپێویستە[٣] .

وە ئەگەر وتەیەک گێڕدرایەوە لە کەسێکەوە لە خواروو ئەوەوە **-واتە پێغەمبەر ﷺ-** موخالەفەی ئەکرد؛ ئەوە لا ناکرێتەوە بۆی، وە فەرموودەی رسول الله ﷺ لەپێشترە .

وە ئەو کەسەی پێچەوانەی سوننەتی رسول الله ﷺ ـی لێوە گێڕدراوەتەوە بیزانیایە ئەوە إن شاء الله شوێنی ئەکەوت) .

: (١) واتە صحيح ئەبێت و ئەتوانیت وەکو بەڵگە بەکاری بهێنیت .

(٢) واتە کاتێک بەراورد کران .

(٣) واتە فەرموودەی رسـول الله ﷺ وەکو قورئان سـەرچاوەیەکی سـەربەخۆی تەشـریعە و حوکمی لێ وەرئەگیرێت و وەکو بەڵگە ئەهێندرێتەوە بەبێ ئەوەی پێویسـتی بەوە بێت پاڵپشتی بکرێت بە شتی دیکە، بۆ نمونە وەکو قیاس کە ئەبێت لەسەر قورئان و سوننەت بکرێت .

٩٢ - أحمد بن محمد بن سـلامة دەربارەی فەرمایشـتی پێغەمبەر ﷺ : (بڕیارتان لە نێواندا ئەدەم بە کتێبی الله : مەڕ و خزمەتکارەکەت ئەگەڕێندرێتەوە بۆت ) .

وتی : (مەبەستی لە (بە کتێبی الله ) والله أعلم حوکم ـی الله ـیە ئەگەرچی بە دەق ـیش نەهاتبێت لە کتێبی الله ـدا، چونکە ئێمە حوکمی رسول الله ـمان ﷺ بە کتێبی الله وەرگرتووە، چونکە الله تعالی تیایدا پێمان ئەفەرمووێت : ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴾ (الحَشر : ٧) .

جا مادەم بە کتێبی الله واجب بوو حوکمەکەی ﷺ وەربگرین; ئەوە هەموو حوکمێک کە دابێتی ئەوە بە کتێبی الله ـــیە ئەگەرچی ئەو حوکمە بە دەق ـــیش نەهاتبێت لە کتێبی الله دا ) .

٩٣ - الشـافعي ئەڵێت : (پرسـیارم لێ بکەن دەربارەی ئەوەی ئەتانەوێت بۆتان ئەگێڕمەوە لە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ) .

پیاوێک وتی : ئەی أبو عبدالله چی ئەڵێیت دەربارەی کەسـێک لە حەجە و زەردەواڵەیەکی کوشتووە ؟

وتی : ( ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ ﴾ .

إبن عيينة بۆی گێڕاینەوە لە عبدالملک بن عمير لە ربعي لە حذيفة رضي الله عنه وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (پاش من شوێن ئەو دووانە بکەون : أبو بكر و عمر ) .

وە سفيان بۆی گێڕاینەوە لە مسعر لە قيس بن مسلم لە طارق بن شهاب لە عمر رضي الله عنە کە فەرمانی کردووە بە کوشتنی زەردەواڵە ) .

**: ئیمامی الشافعي ئەڵێت پرسیارم لێ بکەن بە قورئان و سوننەت جوابتان ئەدەمەوە، کاتێک پرسیاری لێ ئەکرێت و دەقی وەڵامی پرسیارەکەی لە قورئاندا نییە دێت وەڵام ئەداتەوە بەوەی الله عز وجل فەرمانی پێ کردووین شوێن رسول الله ﷺ بکەوین، وە رسول الله ﷺ فەرمانی پێ کردووین شوێن ئیمامی عمر رضي الله عنه بکەوین، دواتر وەڵامی پرسیارەکە ئەداتەوە بە وەڵامی ئیمامی عمر رضي الله عنه، بەم شێوەیە سەلماندی وەڵامدانەوەی بە فتوای ئیمامی عمر شوێنکەوتنی قورئان و سوننەتە.**

## دەروازەی : (٨)

## توندبوون لە ڕووبەڕووبوونەوەی سوننەت بە بۆچوون

**٩٤ - الحسن البصري** ئەڵێت : کاتێک أبو بکر رضي الله عنه کرا بە خەلیفە والله قسەیەکی کرد هیچ کەسێک پێش ئەو قسەی وای نەکردووە .

فەرمووی : (ئەی خەڵکینە، ئێوە ئەوە ئەرکەتان خستووەتەسەر شانی من کار بکەم لەناوتاندا بە کردەوەی رسول الله ﷺ، وە الله عز وجل پێغەمبەرەکەتانی ﷺ ئەپاراست بە وەحی، والله هیواخوازم ئێوە بەس بن بۆم، جا پەیمانم پێ بدەن ئەگەر کەوتم و لامدا ئەوە هەڵمبستێننەوە، وە ئەگەر بەردەوام بووم لەسەر ڕێگەی ڕاست ئەوە شوێنم بکەون، وە من شەیتانێکم هەیە کاریگەری هەیە لەسەرم، جا هەر کە کاریگەری هەبوو لەسەرم لێم دوور بکەونەوە) .

**٩٥ - مسروق** ئەڵێت : عمر رضي الله عنه بڕیارێکی دەرکرد .

نووسیم : (ئەمە ئەوەیە الله عز وجل پیشانی عمر ی داوە) .

عمر رضي الله عنه فەرمووی : (بیسڕەرەوە و بنووسە (بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە بۆچوونی عمر ـە، ئەگەر ڕاست بوو ئەوە لە الله ـوەیە، وە ئەگەر هەڵە بوو ئەوە لە عمر ـەوەیە) .

**٩٦ - سعيد بن المسيب** ئەڵێت : عمر بن الخطاب رضي الله عنه لەناو خەڵکیدا هەستا فەرمووی : (ئەی خەڵکینە بەڕاستی خاوەن بۆچوونەکان دوژمنانی سوننەتن، لەسەریان قورس بوو فەرموودەکان لەبەر بکەن، وە تێگەیشتن لێی

لەدەستیان دەرچووو، وە شەرمیان کرد کاتێک خەڵکی پرسیاریان لێ کردن بڵێن : نازانین، هەربۆیە دوژمنایەتی سوننەتیان کرد بە بۆچوونیان ) .

---

**- لە کتێبی (مختصر الحجة) ـدا نصر المقرسي ئەڵێت : (ئەمە عمر رضي الله عنە فەرمووی و وتاری پێدا بۆ گەورەکانی کۆچبەران و پشـــتیوانان، جا هیچ کەســێکیان ئینکاریان لەوە لێ نەکرد، ئەمەش نیشـانەیە بۆ واجبێتی گەڕانەوە بۆ ســوننەت و ئاثارە صحیح ـەکان، وە وازهێنان و فڕێدانی ئەوەی موخالەفەی کردووە لە بۆچوونە خراپەکان و گومڕاییە ڕوونەکان .**

**وە لەوەشــدا بیرخەرەوە هەیە بۆ ئەو کەســەی الله عز وجل خێری بۆی ئەوێت و بەرچاوڕۆشــنی پێداوە لە دینەکەی و خۆپاراســتنی نەفســی، وە پێداوە لە شــوێنکەوتنی ڕێچکەی هاوەڵان رضي الله عنهم و تابیعیەکان و پێشەوا موجتەهیدەکان، ئەوانە رسول الله ﷺ شـــایەتی بۆ داون دەربـارەی کۆکبوون لەســـەر ڕاســتی و صــواب و; لە موخالەفەکردن و دەرچوون لە ڕێگەکەشیاندا خراپی و گومڕایی .**

**هەربۆیە داوای ڕێمونی لە الله ئەکەین، هەر بەو بەسمانە و باشترین وەکیل ـە) .**

**٩٧ - عمر بن الخطاب** رضـــي الله عنە ئەفەرموویت : (ئەگەر ببیســـتم لە ســـووچێکی مزگەوتدا ئاگر کەوتووەتەوە پێم خۆشـــترە لەوەی ببیســـتم بیدعەیەکی تێدایە و کەس نییە بیگۆڕێت ) .

**٩٨ -** لە **إبن عبد خیر** لە باوکیەوە وتی : علي بن أبي طالب م بینی رضي الله عنە مەســحی لەســەر بەشــی ســەرەوەی پێیەکانی ئەکرد، فەرمووی : (لەبەر ئەوە نەبێت رسول الله ــم ﷺ بینی بەشی سەرەوەی پێی مەسح ئەکات وام ئەزانی ژێر پێ ئەولاترە ) .

**٩٩ - عمر بن الخطاب** رضـــي الله عنه ئه‌ڵێت : ئه‌ی خه‌ڵكینه‌، ڕا و بۆچوون له‌ ديندا تاوانبار بكه‌ن، چونكه‌ به‌ڕاستی ئه‌تبينيم ڕه‌ددی فه‌رمانی رسول الله ـــم ﷺ ئه‌دايه‌وه‌ له‌ بۆچوونی خۆم به‌ ئيجتيهـاد، والله كه‌مته‌رخه‌ميم نه‌كرد له‌ حه‌قدا، ئه‌وه‌ش له‌ ڕۆژی أبو جندل ـــدا بوو - **واته‌ سـوڵحی حوده‌يبيه‌** -، وه‌ نامه‌كه‌ له‌به‌رده‌م رسول الله ﷺ و ئه‌هلی مه‌ككه‌دا بوو .

رسول الله فه‌رمووی : (**بنووسن : بسم الله الرحمن الرحيم**) .

سهيل بن عمرو وتی : جا ئه‌گه‌ر وابێت ئه‌وه‌ به‌ڕاستمانخستوويته‌ته‌وه‌ له‌وه‌دا كه‌ ئه‌يڵێيت، به‌ڵكو به‌و شێوه‌يه‌ ئه‌نووسين كه‌ خۆمان ئه‌نووسين (به‌ناوی تۆ ئه‌ی الله) .

جا رســـول الله ﷺ ڕازی بوو و منيش ڕه‌تم كرده‌وه‌ هه‌تا رســـول الله ﷺ فه‌رمووی : (**ئه‌مبينيت ڕازيم و كه‌چی تۆ قبووڵی ناكه‌يت ؟!**) .

ئينجا منيش ڕازی بووم) .

---

**- له‌ (الأوسط) ـــدا إبن المنذر ئه‌ڵێت : (رسول الله ﷺ زاناترينيان بوو به‌ الله، وه‌ له‌هه‌موويان زياتر ترســـی هه‌بوو لێی، وه‌ له‌ هه‌موويان زياتر فه‌رمانه‌كانی به‌ گه‌وره‌ ڕائه‌گرت و دينه‌كه‌ی به‌رز ئه‌كرده‌وه‌; له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شـــدا به‌ده‌م ئه‌و شـــته‌وه‌ نه‌چوو ئيللا دوای ئه‌وه‌ نه‌بێت بينی ئه‌وه‌ باشـــتر و چاكتره‌ بۆ موســـوڵمانان، وه‌ له‌وانه‌شـــه‌ ئه‌و كرده‌وه‌يه‌ی به‌ فه‌رمانی په‌روه‌ردگاری بووبێت، به‌ڵكو هيچ گومانێكی تيايدا نييه‌ به‌هۆی ئه‌و وته‌يه‌ی كه‌ به‌ عمر ئه‌فه‌رمووێت : (من رسول ـی الله ـم و سه‌رپێچی ناكه‌م)، وه‌ له‌ هيچ شتێك له‌وانه‌دا سه‌رپێچی الله ی تيايدا نييه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و واتايه‌ی له‌ (به‌ناوی تۆ ئه‌ی الله) ـــدا هه‌يه‌ وه‌كو ئه‌و واتايه‌يه‌ كه‌ له‌ (بسم الله الرحمن الرحيم) ـــدا هه‌يه‌، چونكه‌ هه‌ردووكيان قســـه‌كردنه‌ له‌گه‌ڵ په‌روه‌ردگارێكدا كه‌ تاكه‌ و هاوبه‌شـــی نييه‌، هيچ شتێكی تيايدا نييه‌ درابێته‌ پاڵ جگه‌ له‌ الله عز وجل .**

وە هەروەها فەرمایشتی : (**ئەمە ئەوەیە محمد ـی کوڕی عبدالله بڕیاری لەبارەیەوە داوە**) لەگەڵ باسـنەکردنی رسـول الله ﷺ مـانـای پێغەمبەرایەتی نـاگۆڕێـت، وە خۆدانەپاڵی باوکی ڕاست و حەقە).

**١٠٠ - إبن عباس** رضي الله عنهما دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى ﴿لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (الحُجُرَات : ١).

فەرمووی : (بە خیلافی قورئان و سوننەتەوە مەڵێن).

**١٠١ - إبن عباس** رضي الله عنهما فەرمووی : (ئاگاداری بۆچوون بن چونکە الله ڕەددی فریشتەکانی دایەوە لەسەر بۆچوون : ﴿قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (البَقَرَةِ : ٣٠).

وە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموو : ﴿لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ (النِّسَاءِ: ١٠٥)، نەیفەرموو بە بۆچوونی خۆت).

---

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (البَقَرَة : ٣٠).

**١٠٢ - عطاء بن أبي رباح** ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای إبن عباس رضـي الله عنهما پێی وت : (بۆچوونت چۆنە الله چاکت بۆ بکات ؟

إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : ئەترسم لەوەی بە بۆچوونی خۆم قسە بکەم و پێم بخلیسکێت پاش جێگیربوونی).

**- له (جامع بيان العلم وفضله) ـــدا إبن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :**
**(بە کتێبی الله عز وجل و سـوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، جا ئەو کەسـەی پاش ئەوە شتێک بڵێت بە بۆچوونی نازانم دواتر لە چاکەکانی ئەبینێتەوە یاخود خراپەکانی ؟!) .**

**١٠٣ - جابر بن زيد** ئەڵێت کە : (إبن عمر رضـــي الله عنهما لە تەواف پێی گەیشـــتووە و پێی فەرمووە : ئەی أبا شـــعثاء، تۆ لە فەقیهەکانی بەسـرەیت، جا بە قورئان و سـوننەتێکی پێشـوو نەبێت فتوا مەدە، ئەگەر وا بکەیت ئەوە خۆت لەناو ئەچیت وە **- خەڵکیش -** لەناو ئەبەیت) .

**١٠٤ - عبدالله بن مسعود** رضـي الله عنه ئەفەرمووێت : (هەر کەسـێک فتوا بۆ خەڵکی بدات لە هەموو ئەو شتانەی کە پرسیاری لەبارەوە لێ ئەکەن ئەوە شێتە).

**١٠٥ - رسـول الله** ﷺ ئەفەرمووێـت : (هەمـوو بیـدعەیەک گـومڕاییە، ئەگەرچی خەڵک واش ببینن کە باشە) .

**١٠٦ - عبدالله بن مســعود** رضـــي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئاگاداری (پێم وابێـت پێم وابێـت) بن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بە پێم وابێـت پێم وابێـت لەناوچوون، وە هیچ شتێک قیاس مەکەنە سەر شتێکی تر بەهۆیەوە پێتان بخزێت پاش جێگیربوونی، ئەگەر پرســیار لە یەکێکتان کرا دەربارەی شـــتێک کە نازانێت ئەوە با بڵێت نازانم، چونکە ئەوە سێ یەکی زانستە) .

**١٠٧ - عطاء** ئەڵێت : (پێغەمبەر ﷺ کاتێک چووە ســەر مینبەر بە خەڵکی فەرموو : (دابنیشن) .

وە إبن مسعود رضي الله عنه لە دەرەوە بوو، کاتێک گوێی لێبوو دانیشت .

رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (وەرە عبدالله ) .

---

: واتە یەکسەر فەرمانەکەی رسول الله ی ﷺ جێبەجێ کردووە رضي الله عنه .

١٠٨ - **عبدالله بن مسعود** رضـي الله عنه ئەفەرمووێت : (هیچ سـاڵێک نییە ئیللا ئەوەی پاشـتری خراپترە لێی ، وە سـاڵەکە خۆی باشـتر نییە لە سـاڵێکی تر ، وە کەســەکـان بـاشــتر نین لە کەســانی دیکە ، بەڵکو ئەوە بەهۆی ڕۆیشــتنی باشترینەکانتان و زاناکانتانەوەیە ، پاشان خەڵکانێک داهێنان ئەکەن و بە بۆچوونی خۆیان بابەتەکان قیاس ئەکەن ، جا بەوهۆیەوە ئیسلام ئەڕووخێت و بەش ئەبێت).

١٠٩ - **مروان الأصفر** ئەڵێت : (لەلای سعید بن جبیر دانیشتبووم ، پیاوێک پرسیاری دەربارەی ئایەتێکی قورئان لێکرد .

وتی : (الله أعلم) .

پیاوەکە وتی : الله چاکت بۆ بکات ، بە بۆچوونی خۆت قسەیەکی تێدا بکە .

وتی : (لە قورئاندا بە بۆچوونی خۆم قســە بکەم ! ) دوو ســێ جار دووبارەی کردەوە ، وە هیچی وەڵام نەدایەوە ) .

١١٠ - **ربیع بن خثیم** ئەڵێـت : (بترســـن لەوەی الله بەدرۆتـان بخـاتەوە ، بەوەی بڵێـت : الله ئاوا و ئاوای فەرموو ، جـا پێی بفەرمووێـت : درۆت کرد ، وام نەوت .

یان بڵێت : الله ئاوا و ئاوای نەفەرمووە ، جا پێی بفەرمووێت : درۆت کرد ، وام وت ) .

١١١ - **مسروق** ئەڵێت : (ئەترسم قیاس بکەم و پێم بخزێت ) .

**١١٢ - عبدة بن أبي لبابة** ئەڵێت : (ڕازی بووم بەوەی ئەو خەڵکەی لەگەڵی ئەژیم نە پرسیارم لێ بکەن وە نە پرسیاریان لێ بکەم .

چونکە وتەی هەریەکێکیان بریتیە لە : پێت وایە پێت وایە!) .

---

**: واتە یان ئەوەتا داوای لێ ئەکەن بە بۆچوونی خۆی فتوایان بۆ بدات، یاخود پرسیاری زۆر ئەکەن کاتێک فەرمووده و ئاثاریان بۆ باس ئەکرێت ئەیکەن بە بیانوویەک بۆ کارنەکردن بە فەرمووده و ئاثارەکە، واتە ئەڵێن ئەی ئەگەر ئاوا بوو؟ ئەی ئەگەر ئاوا نەبوو؟**

**١١٣ - عبدالرحمن** وتی : عبیدالله بن عبدالله بن عمر بۆی گێڕاینەوە وتی : گوێبیستی عبدالله بن عمر بووم رضي الله عنهما ئەیوت : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر ژنی یەکێکتان داوای مۆڵەتی کرد بۆ چوون بۆ مزگەوت با ڕێگری لێ نەکات).

منیش وتم : (والله ڕێگریان لێ ئەکەین) .

عبدالرحمن وتی : (جا بەشێوەیەک قسەی ناشرینی پێ وت نەمبیستبوو ئاوا قسەی ناشرینی پێ بڵێت .

وتی : (گوێبیستی من بوویت وتم رسول الله ﷺ، تۆش وتت والله ڕێگریان لێ ئەکەین ؟!) .

**١١٤ - طارق بن شهاب** رضـــي الله عنه ئەڵێت : (یەکەم کەس وتاری جەژنی خســـتەپێش نوێژی جەژنەوە مروان بن الحكم بوو، پیاوێک هەســـتایەوە بۆی پێی وت : (ئەی مروان موخالەفەی سوننەتت کرد) .

مروان وتی : ئەی پیاوەکە، ئەوەی لەوێدابوو بەجێی هێڵا!

أبو سـعيد الخدري وتى : گوێبيسـتى رسـول الله ﷺ بووم فەرمووى : ((هەر يەكێكتـان شـتێكى خراپى بينى ئەگەر توانى بە دەسـتى بيگۆڕێـت، ئەوە بـا بيگۆڕێـت، ئەگەر نەيتوانى، بە زمـانى، ئەگەر هەر نەيتوانى، بە دڵى، ئەوەش لاوازترينى ئيمانە)).

---

**: لە ئەسڵدا نوێژى جەژن ئەنجام ئەدرێت و دواتر وتار ئەدرێت، وە لەبەر ئەوەى كەسـێكى كەم ماوەتەوە بۆ گوێبيسـت بوونى وتارەكە مروان وتارەكەى كردووەتە پێش نوێژەكەوە بۆ ئەوەى خەڵكى گوێى بگرن ئينجا نوێژەكە بكەن .**

**١١٥ - رسول الله** ﷺ ئەفەرموويێت : (ترس و سامى هيچ كەسێك يەكێكتان نەگێڕێتەوە لە وتنى حەق كاتێك بينى يان بيستى) .

**١١٦ - عبدالله بن مسـعود** رضـي الله عنه ئەفەرموويێت : (كۆمەڵ بابەت و فيتنەيانێك ئەبن ئەوەى پێى ڕازى بێت وەكو ئەوە كەســە وايە ئامادەى بووە، وە ئەو كەسەى پێى ناخۆش بێت وەكو ئەو كەسە وايە ئامادەى نەبووە) .

---

**: واتە ئەگەر زوڵمێك ئەنجام بدرێت لەو شـوێنەى ئەودا و پێى ڕازى نەبێت لە دڵەوە وەكو ئەوە وايە لەوێ نەبووبێت، وە ئەگەر زوڵمكرا لە شـوێنێك و خۆى لەوێ ئامادە نەبووبێت و پێى خۆش بێت ئەو زوڵمە ئەكرێت وەكو ئەوە وايە ئەويش ئامادەى ئەو زوڵمە بووبێت; وەک چۆن كۆمەڵ كەسـانێكى زۆر كافرى بەناو موسـوڵمان پێيان خۆشە ئەو زوڵمە ئەكرێت لە موسوڵمانانى غەززە .**

**- لە (البدع والنهي عنها لابن وضـاح) ـــدا عَترِس بن عوف بە عبدالله بن مسعود ئەڵێت : (لەناوچووم ئەگەر فەرمان نەكەم بە چاكە و ڕێگرى نەكەم لە خراپە) .**

**عبدالله رضـي الله عنه پێى فەرموو : (لەناوچوويت ئەگەر دڵت باشـەى بە باش نەزانى، وە خراپەى بە خراپە نەزانى) .**

- إبن القيم لە (إعلام الموقعين) دا دەربارەی فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپە ئەڵێت : (وە بەڕاستی ئیبلیس زۆربەی خەڵکی گومڕاکردووە بەوەی لەلای باش کردوون ئەنجامدانی جۆرێک لە ذیکر و خوێندنەوەی قورئان و نوێژ و ڕۆژوو و دنیانەویستی، وە وازیان لەم عیبادەتانە هێناوە - واتە ئەو بیدعەیە ئەکەن کە شەیتان لەلای جوان کردوون و وازیان لە ئەنجامدانی سوننەت و فەرمانکردن بە ئەنجامدانی هێناوە -، جا ئەمانە لەلای میراتگری پێغەمبەران لەو کەسانەن کە خاوەنی کەمترین دین و ئیمانن، چونکە دین بریتیە ئەنجامدانی ئەوەی الله عز وجل فەمانی پێ کردووە بۆ الله عز وجل، جا ئەوەی واز لە فەرمانەکانی الله عز وجل بهێنێت کە لەسەری واجبە حاڵی خراپترە لەلای الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ﷺ لەو کەسەی سەرپێچی ئەنجام ئەدات، چونکە وازهێنان لە جێبەجێکردنی فەرمان گەورەترە لە ئەنجامدانی سەرپێچی لە سێ ڕووەوە إبن تيمية باسی کردووە لە یەکێک لە کتێبەکانیدا، وە ئەو کەسەی زانیاری هەبێت دەربارەی ئەوەی الله عز وجل پێغەمبەرەکەیی ﷺ پێ ناردووە، وە بەوەی خۆی و هاوەڵانی لەسەر بووە ئەزانێت زۆربەی ئەوانەی ئاماژەیان بۆ ئەکرێت بە دین و ئیمان خاوەن کەمترینی دین و ئیمانی ناو خەڵکین والله المستعان .

بۆ چ دین و ئیمان و باشەیەک هەیە لە کەسێکدا ئەبینێت حەرامەکانی الله عز وجل ئەنجام ئەدرێن و، سنوورەکانی تێئەپەڕێندرێن و، دینەکەی وازی لێ ئەهێندرێن و، سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ وازی لێ ئەهێنێت و ئەویش بە دڵ پێی ناخۆش نییە و بە زمان بێدەنگە ؟! ئایا شەیتانێکی لاڵە ؟ وەک چۆن ئەو کەسەی قسەیەکی باتڵ ئەکات شەیتانێکی قسەکەرە .

بۆ هەر بەڵایەک بەرۆکی دینی گرتووە بەهۆی ئەو کەسانەوە نەبووە کە ئەگەر خۆراک و سەرگەورەیەتیەکەی بۆ بمێنێتەوە گوێ نادات بەوەی کە بەسەر دیندا دێت ؟!

خۆ ئەگەر بەربەرەکانێ بکرێت لە شتێک لەوەی کە زیان ئەدات لە پێگە و سامانەکەی ئەوە کۆشش ئەکات و هەوڵێکی زۆر ئەدات لەپێناویدا، وە هەر سێ پلەکەی ئینکاریکردن - دەست و زمان و دڵ - بەکارئەهێنێت ئەوەندەی بتوانێت .

وە ئەمانە لەگەڵ ئەوەی لەبەرچاوی الله عز وجل کەوتوون و تووڕەیە لێیان; تووشی گەورەترین بەڵای دنیا بوون خۆشیان پێی نازانن، بەڵایەکەش بریتیە لە مردنی

**دڵەکان، چونکە دڵەکان هەتا ژیانەکەی تەواوتر بێت ئەوە تووڕەبوونی لەپێناو الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ بەهێزترە، وە سەرخستنی بۆ دین تەواوترە .**

**ئیمام أحمد و جگە لەو ئەوریکیان گێڕاوەتەوە : (الله سبحانە وتعالی وەحی کردووە بۆ فریشتەیەک لە فریشتەکانی فلانە شوێن ببات بە ناخی زەویدا .**

**فریشتەکەش ئەڵێت : ئەی پەروەردگار چۆن لەکاتێکدا فلانە کەسی خواپەرستیان تێدایە ؟!**

**الله عز وجل فەرمووی : (بە ئەو دەست پێ بکە، هیچ ڕۆژێک دەموچاوی لەپێناو من گرژ نەکردووە) .**

**١١٧ - أم سلمة** رضي الله عنها ئەفەرمووێت : (الزبير كەسێكی هێنا بۆلای رسول الله ﷺ بۆ دادوەری کردن لە نێوانیان، رسول الله ﷺ حەقەکەی بە الزبير دا، پیاوەکە وتی : ئەوە بۆیە حەقەکەی بە ئەو دا چونکە کوڕە پووریەتی، جا الله عز وجل ئەمەی دابەزاند : ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ (النِّسَاء : ٦٥).

---

**- محمد بن نصر المروزي لە (تعظيم قدر الصلاة) ـدا ئەڵێت : (وتیان : ئەوەی وا گومانی برد پێغەمبەر ﷺ مەیلی بەلای الزبير ـدا رضي الله عنه هەیە بەهۆی خزمایەتیەکەیەوە، بەوە لە ئیمانەکەی دەرچوو، هەربۆیە الله عز وجل دەربارەی قورئانی دابەزاند .**

**جا چۆن ئەو کەسە ئیمانی هێناوە بە پێغەمبەر ﷺ سوننەتێکی جێگیری ناسراوی ڕەت ئەکاتەوە بە بۆچوونی، یان بە بۆچوونی کەسێکی پاش خۆی بە ئەنقەست یاخود گومانی هەبێت دەربارەی سوننەتەکە، یاخود ئینکاری بکات کاتێک لەگەڵ هەوا و ئارەزوویدا ناگونجێت ؟!**

لەپاش ئەوەش وا ئەزانێت لەلای الله ئیمانداره به ئیمانێكی تەواو!) .

- إبن طاهر المقدسي له (شـرحه لقصـيدته) ـــدا ئەڵێت : (الله عز وجل لەم ئایەتەدا داینا كه مەرجی ئیمان و دروستبوونی ملكەچبوونه بۆ بڕیاری رسول الله ﷺ، وه ئەوەی نیشـاندا ئەو كەسـەی موخالەفەی رسـول الله ﷺ ئەكات ملكەچی حەق نەبووه، وه لەسەر ئیسلام جێگیر نەبووه) .

- إبن القيم له (الرسـالة التبوكية) ـــدا ئەڵێت : (هەربۆیه الله عز وجل سـوێنی خوارد به بەڕێزترین شت سوێندی پێ ئەخورێت، ئەویش خۆیەتی عز وجل; كه ئیمانیان جێگیر نابێت و له ئەهلەكەی نابن هەتا رسـول الله ﷺ نەكەن به دادوەر له هەموو ڕاجیاوازیەك له هەموو بابەته دینیەكاندا .

وه بەمەوه نەوەستا هەتا (وەرگرتنی حوكمەكەی به سنگێكی فراوانەوه) ی بۆ زیاد كرد، بەشێوەیەك له نەفسیاندا تەنگی و پێناخۆشبوون نەبیننەوه بەرامبەر حوكمەكەی، بەڵكو حوكمەكه قبووڵ بكەن به سنگفراوانیەوه، وه بەرەوڕووی بڕۆن به تەسلیمبوونەوه نەوەك بەنـابەدڵی قبووڵی بكەن، چونكه ئەوه نەفیكەری ئیمـانه، هەربۆیه ئەبێـت وەرگرتنی به قبووڵكردن و ڕازیبوون و سنگفراوانیەوه بێت .

جا هەركەسـێك ویسـتی ئەمه بزانێت با تەماشـای بارودۆخی خۆی بكات، وه چاودێری دڵی بكات كاتێك حوكمێكی پێ ئەگات كه پێچەوانەی ئارەزوو و مەبەستیەتی، یان پێچەوانەی ئەوەیه كه لاسایی ئەوانەی پێش خۆی كردووەتەوه له بابەته گەورەكان.

جا سـبحان الله چەنده دڵتەنگی و جاڕسـی هەیه له نەفسـی زۆر كەسـدا بەرامبەر زۆرێك له دەقەكانی قورئان و فەرمووده و هیوا ئەخوازن هەر نەهاتنایه! وه چەنده داخ له دڵ و چەنده خەم و ئازار له قوڕگیاندایه دەربارەی دەقەكه و ئەو شـوێنەی لێوەی هاتووه!) .

١١٨ - **أمية** وتی : پرسیارم كرد له إبن عمر رضي الله عنهما وتم : ئەی أبو عبدالرحمن، ئێمه نوێژی نیشتەجێی له قورئاندا ئەبینینەوه، وه نوێژی ترسیش، جا هەواڵم پێ بده دەربارەی نوێژی سەفەر، ئێمه نایبینینەوه له قورئاندا .

إبن عمر رضي الله عنهما فەرمووی : (ئەی کوڕی برام، الله عز وجل محمد ی ﷺ نارد و هیچمان نەئەزانی، ئێمە کار ئەکەین وەک چۆن محمد ﷺ مان بینی کار ئەکات).

**١١٩ - سعيد بن جبير** وتی : لە عبدالله بن مغفل ـەوە رضي الله عنه دانیشتبوو وە برازایەکی لە تەنیشتی بوو بەردی هەڵدا، ئەویش ڕێگری لێ کرد.

وتی : رسول الله ﷺ ڕێگری لێ کردووە و فەرموویەتی : (**ئەوە ڕاوی نێچیرێک ناکات، دوژمنێک بریندار ناکات، وە ددان ئەشکێنێت و ئەچێت بە چاودا**).

برازاکەی دووبارە بەردی هەڵدایەوە.

فەرمووی : لە رسول الله ـەوە ﷺ بۆم گێڕایتەوە نەهی لێ کردووە و تۆش هەر ئەنجامی ئەدەیت؟! ئیتر قسەت لەگەڵدا ناکەم).

---

**: لە (مسند الدارمي) ـدا خراش بن جبير ئەڵێت : لە مزگەوت کوڕێکم بینی بەردی هەڵئەدا، پیاوێکی گەورە پێی وت : (بەرد هەڵمەدە، چونکە من گوێبیستی رسول الله ﷺ بووم نەهی لە بەرد هەڵدان کردووە.**

**کوڕەکە خۆی لە خەت دا و بەردێکی هەڵدا وایزانی پیاوە بەتەمەنەکە پێی نازانێت.**

**پیاوە بەتەمەنەکە پێی وت : (بۆت ئەگێڕمەوە کە من گوێبیستی رسول الله ﷺ بووم ڕێگری لە بەرد هەڵدان ئەکات کەچی تۆ هەر بەرد هەڵئەدەیت؟! والله لە هیچ جەنازەیەکەت ئامادە نابم، وە سەردانیت ناکەم بۆ هیچ نەخۆشیەکت، وە هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەمەوە).**

**١٢٠ - يحيى بن حكيم** ئەڵێت : لە سعيد بن جبير ـەوە کە فەرموودەیەکی گێڕایەوە، پیاوێکی کوفی پێی وت : الله لە کتێبەکەیدا ئاوا و ئاوا ئەفەرمووێت.

سعيد تووڕە بوو، وتی: (ئەتبینم کەللەڕەقی ئەکەیت لە فەرموودەی رسول الله دا ﷺ؟! رسول الله ﷺ شارەزاتر بوو بە قورئان لە تۆ).

١٢١ - الأوزاعي ئەڵێت: (دەســـت بگرە بە ئاثاری ئەوەی کە تێپەڕیوە، وە ئاگاداری ڕەئ و بۆچوونی خەڵکی بە، ئەگەرچی بۆشت برازێننەوە بە قسە).

١٢٢ - الصقر بن رستم الدمشقي ئەڵێت: (گوێم لە بلال بن سعد بوو وتی: (سێ شت هەن کە کار و کردەوەیان لەگەڵدا قبووڵ ناکرێت: شیرک، وە کوفر، وە ڕەئ و بۆچوون.

وتم ئەی باوکی عمرو ڕەئ و بۆچوون چییە؟

وتی: واز لە قورئان و ســـوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بهێنێت و بە ڕەئـــــو بۆچوون قسە بکەیت).

١٢٣ - أبي العالية دەربارەی ئایەتی ﴿ثُمَّ ٱسۡتَقَـٰمُواْ﴾ (فُصِّلَت: ٣٠).

ئەڵێت: (دین و کار و کردەوە و بانگەوازیان تایبەتمەند کرد بۆ الله).

١٢٤ - سـفيان الثوري دەربارەی ئایەتی: ﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾: ئەوانەی پێچەوانەی فەرمانی رسـول الله ﷺ ئەکەن، لەوە بترسن کە مەینەتی و بەڵا و خراپەیەکیان بەسەردا بێت (النُّور: ٦٣).

ئەڵێت: (مۆر بدرێت لەسەر دڵیان).

١٢٥ - لە الضحاک ـــەوە لە جابر بن زيد ـــەوە کە إبن عمر رضي الله عنه لە کاتی تەوافکردندا پێی گەیشتووە فەرموویەتی: (ئەی أبا الشعثاء، تۆ لە فەقیهەکانی بەسرەیت، جا لەبەر ئەوە فتوا مەدە ئیللا بە قورئان، یان بە سـوننەتێکی تێپەڕیوو

نەبێت، ئەگەر بێجگە لەوە بكەیت ئەوە خۆت لەناو ئەچیت، وە - خەڵكیش - لەناو ئەبەیت).

**١٢٦ - محمد بن إسحاق بن خزيمة** وتی : وتم بە أحمد بن نصر - وە فەرموودەیەكی گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ - : ئایا وەری ئەگریت ؟

وتی : (ئایا ئەمبینی زُنّار م لە ناوقەدم بەستبێت ؟! بەرامبەر فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ مەڵێ : ئایا وەری ئەگریت ؟

بەڵكو بڵێ : ئایا صحیح ە ؟

كاتێک فەرموودە جێگیر ببێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە منیش ئەیڵێم).

---

**- لە (مناقب الشافعي) ـــدا الربيع بن سـليمان ئەڵێت : گوێبیستی الشافعي بووم كەسێک پرسیاری لێكرد دەربارەی بابەتێک، وتی : (لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت كراوە ئاوا و ئاوا ئەفەرمووێت).**

**پرسیارکەرەكە پێی وت : ئەی أبو عبدالله تۆش وا ئەڵێیت ؟**

**الشافعي ڕاچڵەكی و ڕەنگ زەرد بوو وتی : (ویحک، چ زەویەک ئەمگرێتە خۆی و چ ئاسـمانێک لەژێر خۆیدا جێگەم ئەكاتەوە ئەگەر شـتێک لە رسـول الله ـــــەوە ﷺ بگێڕمەوە و خۆم هەمان قسە نەكەم ؟! بەڵێ بەسەر سەر و بەسەر چاوان، بەسەر سەر و بەسەر چاوان).**

**- إبن هانئ لە (مسائله) دا ئەڵێت : وتم : ئەگەر خەواریجەكان زاڵ بوون بەسەر كۆمەڵەیەكدا و زەكاتی سامانەكەیان بردن ئایا لەبریان ئەكەوێت ؟**

**وتی - واتە ئیمام أحمد - : (ئەگێڕدرێتەوە لە إبن عمر رضي الله عنهما فەرموویەتی : لەبریان ئەكەوێت).**

**وتم : ئەوە هەڵئەبژێریت ؟**

وتی : (من پێت ئەڵێم دەربارەی لە إبن عمر ــەوە رضي الله عنهما تۆش ئەڵێیت : ئەوە هەڵهەبژێریت ؟!) .

- لە (الإحكام في أصــول الأحكام) ـــــدا إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (هەر کەسێک لە رسـول الله ـــەوە ﷺ هەواڵێکی پێ بگات دان بنێت بە صحیح بوونیدا پاشان ڕەتی بکاتەوە بەبێ تَقيَّة ئەوە کافرە) .

- لە (الحجة في بيان المحجة) ـــدا إبن سماک بن الفضل الشهابي ئەڵێت : إبن أبي ذئب فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە لە رسـول الله ـــەوە ﷺ، پێم وت : ئەی أبا الحارث، ئایا کار بەم فەرموودەیە ئەکەیت ؟

جا دای بەسـەر سـنگمدا، وە هاوارێکی زۆری بەسـەردا کردم و لێیدام، وە وتی : (من فەرموودەت بۆ ئەگێڕمەوە لە رسـول الله ـــــــەوە ﷺ تۆش ئەڵێیت کاری پێ ئەکەیت ؟

بەڵێ کـاری پـێ ئەکەم، وە ئەوەش فەرزە لەسـەر من و ئەوەشـی گوێی لە فەرموودەکە بووە، الله تبارك و تعالى محمد ـــی ﷺ هەڵبژارد لە خەڵکی و بەهۆیەوە لەسـەر دەسـتی هیدایەتی دان، وە ئەوەی بۆ هەڵبژاردن کە لەسـەر زمانی ئەو بۆی هەڵبژاردن، جا لەسـەر هەموو دروسـتکراوەکان واجبە شـوێنی بکەون پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆش بێت) .

إبن سـماک ئەڵێت : بێندەگ نەبوو هەر قسـەی کرد هەتا هیوام ئەخواسـت بێدەنگ بووایە) .

**١٢٧ - عصام بن يوسف** ئەڵێت : (دەست بگرن بە ئاثارەکانەوە، وە خۆتان بپارێزن لە ڕەئـو بۆچوون، چونکە هاوەڵانی ڕەئـو بۆچوون دوژمنی سوننەتن، لەسـەریان قورس بوو فەرموودەکان لەبەر بکەن، وە بۆچوونم وایە و بەڕای من زانست و عیلم نییە) .

- لە (الرسالة الواضحة) ـــدا محمد بن عبدالعزيز ئەڵێت : (هاوەڵانی بۆچوون و قیاس لە دین بیدعەچیی گومڕان، دەرچوون لە ئوممەت، چونکە هاوەڵانی بۆچوون و قیاس لە دیندا بەوە مەبەســتیان پەکخســتنی قورئان و ســوننەت و، بەتاڵکردنەوەی زانست و ئاثارەکانە) .

- حرب بن إسـماعيل الكرمانيِ لە (كتاب السنة) ـــدا باسی ئەوە ئەکات کە پێی گەیشتووە زانایان لەسەریبوون دەربارەی ئەهلی ڕەئی : (هاوەڵانی ڕەئی بیدعەچیەکی گومڕان، دوژمنـانی ســوننەت و ئەثەرەکـانن، وای ئەبینن دین بۆچوون و قیـاس و بەباشــزانین بێت، وە ئەوان موخالەفەی ئاثارەکان ئەکەن و فەرموودە بەتاڵ ئەکەنەوە و ڕەددی رسول الله ﷺ ئەدەنەوە و ئەبو حەنیفە و ئەوەی هەمان قسەی ئەبو حەنیفە بکات ئەکەن بە ئیمام و بە دینی ئەوان دینداریێتی ئەکەن، وە قســەکانی ئەوان دووبارە ئەکەنەوە، جا چ گومڕاییەک ڕوونترە ئەوەی ئەمە بۆچوونی بێت یان لەســەر شــتێکی ئەمجۆرە بێت ؟!

واز لە وتەی رســول الله ﷺ و هاوەڵەکانی رضــي الله عنهم بهێنێت و شــوێن بۆچوونی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی بکەوێت ؟!

ئەمە بەسە بۆ سەرسامبوون بە خۆ و لە سنوور دەرچوون و ڕەتکردنەوە) .

١٤٧ - شريک بن عبدالله النخعي ئەڵێت : (ئاثارێک شتێک لە لاوازی تێدا بێت بەلامەوە باشترە لە بۆچوونیان) .

١٤٩ - عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەڵێـت : وتم بە بـاوکم : پیـاوێـک پرسـیارێکی هەیە، وە لە شـارەکەیدا کەسـێکی ئەهلی فەرموودە هەیە کە لاوازە، وە فەقیهێکی ئەهلی ڕەئی یشی لێیە، پرسیار لە کامەیان ئەکات ؟

وتی : (پرسـیار ناکات لە ئەهلی ڕەئی، کەسـێک لە فەرمووددا لاوازە باشـترە لە کەسێک بۆچوون و ڕەئی بەهێز بێت) .

- عبدالله بن أحمد بن حنبل له (مسائله) ـــدا ئه‌ڵێت : پرسیارم کرد له باوکم ده‌رباره‌ی پیاوێک ئه‌یه‌وێت پرســیار بکات ده‌رباره‌ی شــتێکی دینه‌که‌ی له‌وه‌ی پێی تاقیکراوه‌ته‌وه له سـوێندخواردن و ته‌ڵاق و جگه له‌وه، وه له شـوێنه‌که‌شـدا ئه‌هلی ڕه‌ئی لێیه، وه ئه‌هلی حه‌دیث که فه‌رمووده‌یان له‌به‌ر نییه و فه‌رمووده‌ی لاواز نازانن کامه‌یه و شـاره‌زاییان نییه ده‌رباره‌ی سـه‌نه‌دی به‌هێز، جا ئایا پرسیار ئه‌کات له ئه‌هلی ڕه‌ئی یان هاوه‌ڵانی فه‌رمووده سه‌ره‌ڕای ئه‌و زانسته که‌مه‌ی ئه‌یزانن ؟

وتی : (پرســیار ئه‌کات له هاوه‌ڵی فه‌رمووده‌که، وه پرســیار ناکات له ئه‌هلی ڕه‌ئیه‌که، که‌سێک له فه‌رمووده‌دا لاواز بێت باشتره له بۆچوونی ئه‌بو حه‌نیفه) .

## ١٣٠ - سفيان الثوري ئه‌ڵێت : (به‌ڕاستی دین ئاثاره‌کانه) .

: سـه‌له‌ف که به گشـتی ئه‌ڵێن (الآثار : ئاثاره‌کان) ئه‌وه مه‌به‌سـتیان فه‌رمووده‌ی رسول الله ﷺ، وه قه‌ولی هاوه‌ڵان و تابيعين و پاش ئه‌وانه رضي الله عنهم ورحمهم الله تعالى .

- حرب الكرماني له (كتاب السـنة) ـــدا ئه‌ڵێت : (دین بریتیه له کتێبی الله و، ئاثار و سوننه‌ته‌کان، وه ڕیوایه‌ته صحيح ـــه‌کان له ثقة ـــکانه‌وه به هه‌واڵانێکی ڕاستی به‌هێزی ناسراوی به‌ناوبانگ .

که‌ســی متمانه‌پێکراوی ناســراوی یه‌که‌م ئه‌یگێڕێته‌وه له دووه‌م متمانه‌پێکراوی ناســراو، هه‌ریه‌کێکیان ئه‌وی دیکه‌یان به‌ڕاســت ئه‌خه‌نه‌وه هه‌تا ئه‌گات به پێغه‌مبه‌ر ﷺ، یـان هـاوه‌ڵانی رضـي الله عنهم، یـاخود تـابيعين یان تـابيعی تـابيعين، یـاخود که‌سێک له پاش ئه‌وان له پێشـه‌وا ناسراوه شـوێنپێهه‌ڵگیراوه‌کان، ئه‌وانه‌ی ده‌ستیان به ســوننه‌ته‌وه گرتووه و په‌یوه‌ســتن به ئاثاره‌کانه‌وه، ئه‌وانه‌ی که نه‌ناســراون به بیدعه و تانه‌یان لێ نادرێت به درۆزنی و نادرێنه پاڵ خیلاف) .

١٣١ - سـفيان الثوري ئەڵێت : (پێویســـتە پیاو ســـەری نەخورێنێت ئیللا بە ئەثەرێک نەبێت ) .

**: واتە هەموو کـار و کردەوە و بیرکردنەوە و وتەکـانی بەپێی ئاثـار و بەگوێرەی مەنهەجی سەلەف بێت .**

١٣٢ - النضر بن شميل ئەڵێت : (ســوننەت پارێزەرە ، وە ڕەئـــو بۆچوون ئەبێت بپارێزرێت ) .

**: واتە ســـوننەت خودی خۆی پێویســـتی بە هیچ شـــتێک نییە تا بیپارێزیت و بەڵگەیە ، بەڵام ڕەئـــو بۆچوون ئەبێت بە ئایەتێک یان بە فەرموودەیەک پشـــتگیری بکەیت و بیپارێزیت ، ئەگینا شاز و خراپ دەرئەچێت .**

١٣٣ - المسيب ئەڵێت : (ئێمە شـوێن ئەکەوین و داناهێنین ، وە شـوێنپێ هەڵئەگرین و لە خۆمانەوە شـــت دروســـتناکەین ، وە گومڕا نابین و ون نابین هەتا دەستمان گرتبێت بە ئاثارەکانەوە ) .

**- لە (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي) ـــدا هاتووە الأوزاعي ئەڵێت : (شوێن سوننەت ئەکەوین ڕووبکاتە هەرکوێ ) .**

١٣٤ - محمد بن سيرين ئەڵێت : (ئەیانوت : هەتا لەســـەر ئەثەر بێت ئەوە لەسەر ڕێگە ڕاستەکەیە ) .

١٣٥ - الزعفراني وتی : (لەسەر ڕووی زەوی کۆمەڵەیەک نییە باشتر بێت خاوەنی ئەم المحابر ـرانە، بەدوای شوێنەوارەکانی رسول الله ـوەن ﷺ و ئەیاننووسنەوە بۆ ئەوەی نەفەوتێن) .

---

: المحابر کۆکراوەی مِحبَرة ـە، واتە ئەو شتەی حیبری تیایدا هەڵئەگیرێت، وە مەبەست پێی هاوەڵانی فەرموودەیە کە سوونەتی رسول الله ﷺ ئەپارێزن، وە بچووکترین پاداشتیان ئەوەیە ئێمە کاتێک باسمان کردن ڕەحمەتیان بۆ بنێرین و باسی باشیەکانیان بکەین

- لە (شرف أصحاب الحديث) ـدا أبو داود السجستاني دەربارەی هاوەڵانی فەرموودە ئەڵێت : (ئەگەر ئەم کۆمەڵەیە نەبوونایە ئیسلام ئەڕۆیشت و نەئەمایەوە) .

١٣٦ - الأعمش ئەڵێت : (هەرگیز نەمبینیوە إبراهيم النخعي بە ڕەئـی و بۆچوونی خۆی لە بابەتێکدا قسە بکات) .

١٣٧ - عثمان بن حاضر الأزدي ئەڵێت : چوومە لای إبن عباس رضـي الله عنهما وتم : ئامۆژگاریم بکە .

وتی : (پەیوەستبە بە ڕێگای ڕاستەوە، شوێنکەوتە بە و داهێنەر مەبە، وە شوێن ئەثەری یەکەمینەکان بکەوە و داهێنەر مەبە) .

١٣٨ - عبدالله بن المبارك ئەڵێت : (با ئەوەی پشتی پێ ئەبەستیت ئەثەر بێت، وە لە بۆچوون ئەوەندە وەربگرە کە فەرموودەکەت بۆ ڕوون بکاتەوە) .

**١٣٩ - نُعَيم بن حماد** ئەڵێت : (پرســیارم کرد لە إبن المبارك دەربارەی دوو فەرموودەی ســەحیح کە لە رسـول الله ـــەوە ﷺ هاتوون، دانەیەکیان شـتێک حەڵاڵ ئەکات، ئەوی تریان شتێک حەرام ئەکات ؟

وتی : (ئیمانیان پێ ئەهێنم و تەسلیمیان ئەبم، وە دانەیەکیان هەڵئەبژێرم) .

نعیم بن حماد لە ڕوونکردنەوەی قسـەی إبن المبارك ـــدا ئەڵێت : (ئەگەر نەمزانی کـامەیـان پێش کـامەیـانە ئەوە ئەو فەرموودەیە هەڵئەبژێرم کە لەگەڵ ئیجماعی هاوەڵاندایە رضي الله عنهم) .

---

**: کاتێک دوو فەرموودەی ســەحیحت هاتنە بەردەســت دەربارەی هەمان شــت، دانەیەکیان شـــتەکەی حەرام ئەکرد، ئەوی تریش شـــتەکەی حەڵاڵ ئەکرد ئەوە چەند ڕێگەیەکی هەیە تا دانەیەکیان هەڵببژێریت بەسەر ئەوی دیکەیاندا :**

**- وتەی : (ئەگەر نەمزانی کامەیان پێش کامەیانە) واتە ئەگەر نەمزانی کامەیان ناسخ ـە و کامەیان منسوخ ـە .**

**فەرموودەی ناســخ ئەو فەرموودەیەیە کە پاش فەرموودەیەکی تر دێت و حوکمی فەرموودەکەی تر هەڵئەوەشێنێتەوە .**

**وە فەرموودەی مَنســـوخ ئەو فەرموودەیەیە کە حوکمەکەی لەلایەن فەرموودەی ناسخ ـەوە هەڵوەشێندراوەتەوە .**

**جا جاری وا هەیە دوو فەرموودەت هەیە هەردووکیان ســـەحیحن و دەربـارەی هەمان شـــتن و لێک جیاوازن، هەربۆیە ئەکرێت یەکێک لەو فەرموودەیانە ببێت بە ناسخ بۆ فەرموودەکەی تر و لەو ڕێگەیەوە دانەیەکیان هەڵببژێریت .**

**- وتەی : (ئەو فەرموودەیە هەڵئەبژێرم کە لەگەڵ ئیجماعی هاوەڵاندایە)، بێگومان تێگەیشـتنی هاوەڵان رضـي الله عنهم بۆ فەرموودە لە تێگەیشـتنی ئەوانەی دوای خۆیان باشـــترە، هەربۆیە ئەگەڕێینەوە بۆلای هاوەڵان رضـــي الله عنهم بزانین فتوایان بە کام فەرموودەیە داوە و کاریان بە کامەیان کردووە، بەم شێوەیە ئەو فەرموودەیە هەڵئەبژێرین کە هاوەڵان رضي الله عنهم فەتوایان پێداوە .**

ڕێگەیەکی تریش هەیە کە پێی ئەوترێت (جمع)، لەم ڕێگەیەدا هیچ فەرموودەیەک وازیلێناهێنرێت، بەڵکو فەرموودەیەک بۆ شـوێنێک و حاڵ و کەسێکی جیاواز و تایبەت بەکاردێت، وە فەرموودەکەی تر بۆ شـــوێنێک و حاڵ و کەســێکی تایبەت و جیاواز بەکاردێت، والله تعالى أعلم .

**١٤٠ - وکیع بن جراح** ئەڵێت : (ئەوەی فەرموودە بەدەســـت بهێنێت بەو شـــێوەیەی کە هاتووە ئەوە ئەهلی ســـوننەیە، وە ئەوەی بەدەســـتی بهێنێت بۆ بەهێزکردنی بۆچوونەکەی ئەوە بیدعەچییە) .

---

:واتە نابێت پێشتر عەقیدەی خۆت بە بۆچوون و لێکدانەوەی خۆت دابمەزرێنیت و پاشان بەدوای ئەو فەرموودەیانەدا بگەڕێیت کە ئەتوانیت وەکو پشتگیریکەری بۆچوونەکەت بەکاریان بهێنیت، ئەگەر بەم جۆرە بیت ئەوە سوننەتت کردووە بە خزمەتکاری بۆچوونە پێشوەختەییەکانی خۆت .

بەڵکو نابێت بڕیاری پێش وەختە بدەیت; وە هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە بدەیت بەو نیەتەی فەرموودەکە هەرچیەکی فەرموو تۆ عەقیدەکەی لێ وەربگریت .

- إبن تيمية لە **(جواب الإعتراضات المصرية على الفتيا الحموية)** ــــدا ئەڵێت :

(ئەوە حەق و ڕاســـتیە، چونکە ئەوەی ئەوەندە لە فەرموودە وەرئەگرێت کە بگونجێت لەگەڵ بۆچوونەکەیدا ئەوە لەم پێگەیەدایە : ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ (٤٧) وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ (٤٨) وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن

يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ (٤٩) أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمًا لِّقَوۡمٍ يُوقِنُونَ (٥٠) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥١) فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ (٥٢) | (المَائِدَةِ) .

وە لەم پێگەیەدایە : | يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ (٤١) سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ (٤٢) | (المَائِدَةِ) .

وە هەر لەبەر ئەوەیە کۆمەڵەیەک لە ئەهلی حەدیث فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ نەئەگێڕایەوە بۆ ئەهلی هەوا و ئارەزووکان، چونکە بەشێوەی ڕاستی و ئەسڵی خۆی وەریناگرن، بەڵکو ئەوەی قبووڵ ئەکەن کە ئەنگونجێت لەگەڵ بۆچوون و هەوا و ئارەزووەکانیاندا، ئەوەش لەبەر گونجانی لەگەڵ هەوا و ئارەزوویاندا نەک لەبەر ئەوەی ئەوە وتەی پێغەمبەرە ﷺ، جا بەوشێوەیە ئەچنە ڕیزی ئەهلی کیتاب و مونافیقەکانەوە ئەوانەی کە ئەڵێن : | إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْ | .

ئەمە حاڵی زۆربەشیانە بەرامبەر قورئان لەگەڵ ئەو بابەتانەدا کە پێیان وایە بابەتەکان قبووڵ ناکرێن ئیللا بە عەقڵیان نەبێت، وەکو بابەتەکانی تەوحید و سیفات و قەدەر، وە نزیک لەوە کە چەندین کەس لە موتەکەلیمەکان و ئەهلی تەسەوف تێی کەوتوون، وا نابینن بەڵگە بە قورئان بهێننەوە بۆ پشتپێبەستن، بەڵکو بۆ بەهێزکردن بەڵگەی پێ ئەهێننەوە، وە هەر لەبەر ئەمەشە ئەو ئایەتانە وەرئەگرن ئەگونجێت لەگەڵ هەوا و

ئارەزووياندا كە پێی ئەڵێن معقولات، وە ئەو ئايەتانەشـــی كە لەگەڵيان ناگونجێت پێی ئەڵێن موتەشابيهەكان) هەتا دوايی .

وتەی : (وا نـابينن بەڵگە بە قورئان بهێننەوە بۆ پشـــتپێبەســـتن، بەڵكو بۆ بەهێزكردن بەڵگەی پێ ئەهێننەوە) واتە پشـــت نابەســـتن بە قورئان وەكو بەڵگەيەكی ســـەربەخۆ، بەڵكو بە هەوا و ئارەزوويان ئەو عەقيدەيە هەڵئەبژێرن كە ئەيانەوێت، دواتر دێن لە قورئان بەڵگە ئەهێننەوە بۆ هەوا و ئارەزووەكەيان تا بەهێزيان بكەن پێی .

١٤١ - يحيى بن الفضل البخاري وتی : (لە خەودا بينيم وەک بڵێيت لە گوندەكەی خۆمانم لە بوخارا دانيشتبووم لەسەر ڕێگەی مەدينە، وە بينيم رسول الله ﷺ بەپێ دەرچوو لە ڕێگای مەدينەوە وە محمد بن إسماعيل البخاري بەدوايەوە بوو، تەماشای ئەكرد هەركاتێک پێغەمبەر ﷺ پێی بەرز كردبايەتەوە ئەو پێی دائەنا لەو شوێنەدا) .

---

: واتە پێ بە پێ شوێن رسول الله ﷺ كەوتووە، ئەمەش بەهۆی نووسينی كتێبی الجامع الصحيح ەكەی .

١٤٢ - البخاري ئەڵێت : (ئێوارەيەک لەلای علي بن المديني بووين، هات بۆ لامان، كاتێک بينی وا كۆبووينەتەوە وتی : (ئەهلی بازرگانی لە بازرگانيەكانيانن، ئەهلی بازاڕ لە بازاڕەكانيانن، وە ئەهلی چێژ و خۆشيەكان لە چێژ و خۆشيەكانيانن، وە ئەم كۆمەڵەيەش سوننەت و ئاثارەكانيان ئەپارێزن[1]) .

---

: (١) واتە سوننەت و ئاثاری رسول الله ﷺ و هاوەڵان رضي الله عنهم و پاش ئەوان .

له (شرف أصحاب الحديث : ١٠١) هاتووه : محمد بن إسماعيل البخاري ئەڵێت : (سێ چوار کەس بووین لەبەردەم ماڵی علي بن عبدالله .

وتی : (من هیوام وایە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ : (هەمیشە و بە بەردەوامی کۆمەڵەیەک لە ئوممەتەکەم سەرکەوتوون بە حەق، زیانیان لێ نادەن ئەوەی یارمەتیان نەدات یان پێچەوانەیان بکات) ئێوە بن، چونکە بازرگانەکان خۆیان سەرقاڵ کردووە بە بازرگانیەکانەوە، وە خاوەن پیشەکان خۆیان سەرقاڵ کردووە بە پیشەکانیانەوە، وە خاوەن دەسەڵاتەکان خۆیان سەرقاڵ کردووە بە موڵکەکانیانەوە، وە ئێوەش سوننەتی رسول الله ﷺ زیندوو ئەکەنەوە) .

١٤٣ - محمد بن يحيى الذهلي ئەڵێت : گوێبیستی أبو الوليد هشام بن عبدالملک الطيالسي بووم ئەیوت - وە باسی فەرموودەیەکی مرفوع ی کرد تا رسول الله ﷺ - پێی وترا : بۆچوونت چییە ؟

وتی : (من لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆچوونم نییە) .

١٤٤ - زيد بن الحُباب ئەڵێت : (سفيان الثوري ـــم بینی کاتێک پرسیاری لێکرا دەربارەی بابەتەکان هێندە ئەیوت (نازانم) هەتا ئەو کەسەی ئەیبینی و نەیئەناسی وای ئەزانی هیچ نازانێت) .

---

- له (أخلاق العلماء) ـدا عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : کەسێک هات بۆ لای مالک بن أنس پرسیاری لێکرد دەربارەی شتێک .

مالک پێی وت : (نازانم) .

پیاوەکە وتی : لە تۆوە بگێڕمەوە کە نازانیت ؟

وتی : (بەڵێ، لە منەوە بگێڕەوە کە نازانم) .

- لە (جامع بيان العلم وفضـله) ـــدا عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : لەلای مالک بن أنس بووین، پیاوێک هات وتی : ئەی أبو عبدالله لە شـوێنێکەوە هاتووم ڕێگەکەی شەش مانگ دوورە، خەڵکی شارەکەم وایان لێ کردم بێم پرسیارت لێ بکەم .

مالک وتی : (بپرسە) .

پیاوەکە پرسیاری لێکرد دەربارەی بابەتێک، مالک وتی : (بەباشی نایزانم) .

پیاوەکە سەری سووڕما، وەک بڵێیت هاتووە بۆ لای کەسێک شارەزایە لە هەموو شتێکدا .

پیاوەکە وتی : ئەی چ شـتێم بڵێم بە خەڵکی شـارەکەم کاتێک گەڕامەوە بۆ لایان ؟!

پێیان بڵێ : مالک وتی : (بەباشی نایزانم) .

- لە (جامع بيان العلم وفضله) ـــدا مالک ئەڵێت : (پێویستە زانا ڕابێت لەگەڵ وتنی (نازانم) ـدا لەو شتانەدا کە ناڕوونە لەلای) .

- لە (جامع بيان العلم وفضله) ـــدا إبن وهب ئەڵێت : (ئەگەر وتەی (نازانم) ـمان لە مالک ـەوە بنووسیایە ئەوە لاپەڕەکانمان پڕ ئەکردەوە) .

- لە (البيان والتحصـيل) ـــدا عبدالرحمن بن القاسم ئەڵێت : یەکێک لە هاوەڵانی مالک هەواڵی پێدام وتی : دانیشـتبووین لەلای مالک کاتێک إبن أبي حازم هات بۆلای، ئەویش نزیکی خۆیی خسـتەوە و ڕووی تێکرد و پێی وت : (ئەی إبن أبي حازم، کاتێک کەسێک هات بۆ لات ئەگەر توانیت پێش ئەوەی ئەو ڕزگار بکەیت خۆت ڕزگار بکەیت ئەوە بیکە) .

- لە (البيان والتحصيل) ـدا إبن وهب ئەڵێت : کاتێک ماڵئاواییم لە مالک کرد پێی وتم : (پشـتت مەکە بە پردێک بۆ خەڵکی بەسـەریدا بپەڕنەوە بۆ ئەوەی کە پێیان خۆشـە و حەزیان لێیەتی، چونکە خەسـارەتمەندترین کەس ئەوەیە قیامەتی خۆی ئەفرۆشێت بۆ دنیای خەڵکی) .

- الآجري لە (أخلاق العلماء) ـــدا ئەڵێت : (ئەمە ڕێگە و ڕێبازی پێشـەوایانی موسـوڵمـانـانە لە هـاوەڵان رضـي الله عنهم، وە ئەوانەی پـاش ئەوانە لە پێشـەوا

ئیمانداره‌كان، له‌وه‌دا شوێنی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان ﷺ كه‌وتن، چونكه‌ كاتێك پرسیاری لێ بكرایه‌ ده‌رباره‌ی شتێك زانیاری پێ نه‌بووایه‌ له‌ وه‌حی الله عز وجل ـه‌وه‌ ئه‌وه‌ ئه‌یفه‌رموو : (نازانم) .

وه‌ هه‌ر به‌م شـێوه‌یه‌ واجبه‌ له‌ســه‌ر هه‌موو ئه‌وانه‌ی پرســیاریان لێ ئه‌كرێت ده‌رباره‌ی شتێك كه‌ زانیاریان نییه‌ ده‌رباره‌ی بڵێت : (الله زاناتره‌ پێی)، یان (زانیاریم نییه‌ پێی)، وه‌ زۆر نه‌كات له‌خۆی له‌و شـته‌دا كه‌ زانیاری نییه‌ ده‌رباره‌ی، چونكه‌ به‌و شـێوه‌یه‌ عوذری زیاتر هه‌یه‌ له‌لای الله عز وجل، وه‌ له‌لای خاوه‌ن عه‌قڵه‌كان) .

١٤٥ - محمد بن رُمح ئەڵێت : (ژماردم مالك بن أنس له‌ یه‌ك دانیشـــتندا سه‌د جار وتی :نازانم) .

١٤٦ - أبجر ئەڵێت : (هیچكاتێك پرسیارم له‌ إبراهیم النخعي نه‌كردووه‌ ئیللا پێناخۆشبوونم تێدا به‌دی كردووه‌) .

١٤٧ - الأعمش ئەڵێت : (هه‌رگیز نه‌مبینیوه‌ إبراهیمالنخعي له‌ بابه‌تێكدا به‌ بۆچوونی خۆی قسه‌ بكات) .

١٤٨ - محمد بن بشار ئەڵێت : باسی بۆچوونه‌كان كرا له‌لای عبدالرحمن بن مهدي له‌ به‌سرە، ئەویش ئەم هۆنراوه‌یه‌ی وت :

(دینی پێغه‌مبه‌ر محمد ئاثاره‌كانه‌ * باشترین پاڵپشت بۆ پیاو هه‌واڵه‌كانه‌ .

فریو نه‌درێیت له‌ فه‌رمووده‌ و ئەهله‌كه‌ی * چونكه‌ بۆچوون شه‌وه‌ و فه‌رمووده‌ش ڕۆژ .

له‌وانه‌یه‌ پیاو ڕێگاكانی هیدایه‌تی لێ هه‌ڵه‌ ببێت * له‌كاتێكدا خۆر به‌رزه‌ و ڕووناكی هه‌یه‌) .

١٤٩ - أبو سـعيد الحداد ئەڵێت : (فەرمووده پلیكانەیە بترســە لەوەی پێت بخزێت، وە ڕەئـو بۆچوونیش چیمەن و هەرێزە چۆنت ویست تیایدا ڕابكە) .

---

**: مەبەستی ئەوەیە هاوەڵانی فەرمووده بە وریاییەوە فتوا ئەدەن و قسە ئەكەن لە دیندا .**

**وە ئەهلی ڕەئی بە ئارەزوو و بۆچوون و قیاسی خۆیان بەناو دین كەوتوون .**

١٥٠ - إبن شـبرمة ئەڵێت : (من و ئەبو حەنیفە چووینە لای جعفر بن محمد الصادق، بە ئەبو حەنیفە ــی وت : (لە الله بترسە و دین بەپێی بۆچوونەكانی خۆت قیاس مەكە، چونكە یەكەم كەس كە قیاسی كرد ئیبلیس بوو) .

---

**- الخطيب البغدادي لە (الفقيه والمتفقه) ـــدا ئەڵێت : (وتەی جعفر بن محمد (یەكەم كەس قیاســی كرد ئیبلیس بوو) ڕاســتە، چونكە الله تعالى فەرمانی پێكرد بە ســوجدەبردن بۆ ئادەم، جا ئەویش قیاســی كرد بۆ ڕەتكردنەوەی ئەوەی الله عز وجل بە دەق فەرمانی پێ كردووە، هەربۆیە وتی : ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾ (الأَعۡرَاف : ١٢) .**

**جا ئیبلیس هێزی ئاگر ـــــی بەســەر قوڕدا كرد بە بەڵگەیەك كە ئەوەی لاوازترە ئەبێت ملكەچ بێت بۆ بەهێزترەكە، كەواتە ئادەم لەپێشترەو بەوەی سوجدەی بۆ ببات، جا قیاسی كرد لە شوێنێكدا كە قیاس ناكرێت) .**

**- أبو الحسين الملطي العسقلاني لە (التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع) ـدا ئەڵێـت : (كۆمەڵەیەك لە تـابیعیەكـان رحمهم الله وتیـان (یەكەم كەس قیـاســی كرد ئیبلیس بوو) .**

مەبەستیان لەوەیە ئیبلیس قیاسی کرد بۆ ئەوەی بە قیاسەکەی ئەوە ڕەت بکاتەوە کە بە دەق فەرمانی پێ کراوە، لەبەر ئەوەی الله عز وجل فەرمانی پێکرد بە سوجدەبردن بۆ ئادەم، ئەویش وتی : ﴿أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾ (الأَعْرَاف : ١٢) .

مەبەستی ئەوەیە هێزی ئاگر بەسەر قوڕدا بەڵگەیە کە ئەوەی لاوازترە ئەبێت ملکەچ بێت بۆ بەهێزترەکە، کەواتە ئادەم لەپێشترەوە بەوەی سوجدەی بۆ ببات، جا قیاسی کرد لە شوێنێکدا کە قیاس ناکرێت، لەبەر ئەوەی ئەو قیاسەی ئیبلیس کردی لە شوێنێکدا بەکاردێت کە فەرمان و دەق دەربارەی نەهاتبێت، جا کاتێک ئیبلیس ئەم قیاسەی بەکارهێنا لەگەڵ هەبوونی فەرمانی پێویستکەر و دەق دا هەڵە بوو لە قیاس کردنەکەیدا، جا بە قیاسە خراپەکەی بوو بە کافرێکی لەعنەتلێکراو، وە پێش ئەوە لە بەڕێزترینەکانی فریشتەکان بوو .

جا بیدعەچییەکانیش موافەقە ئیبلیسیان کرد لە بواری قیاسدا، وە وازیان لە دەقی قورئان و فەرمووده هێنا، وە بە لێکدانەوەیەکی خراپ لێکدانەوەیان کرد، جا لە دەقی هەواڵ لایاندا بۆ قیاسێکی خراپ) .

- لە (جامع بيان العلم وفضله) دا مالک بن أنس ئەڵێت : (ئەم دینە ڕێک بوو هەتا ئەبو حەنیفە دەرکەوت، جا بەقیاس بەناو کەوت، هەربۆیە نە سەرفراز بوو نە سەرکەوتوو) .

- لە (حلية الأولياء) دا حماد بن زيد ئەڵێت : (ئایا ئەزانن ئەبو حەنیفە چیی ئەکرد ؟ لە ئیرجائدا دەمە دەمێ و موناقەشەی ئەکرد، پاشان قسەی کرد بە ڕەئی و فتوای پێدا، جا سوننەتەکانی رسول الله ﷺ قیاس کردە سەر یەک بۆ ئەوەی بەتاڵیان بکاتەوە، وە سوننەتەکانی رسول الله ﷺ قیاس ناکرێنە سەر یەک) .

- إبن قتيبة لە (تأويل مختلف الحديث) دا ئەڵێت : (کەسم نەبینی زۆر بە گەرمی خەریکی باسکردنی ئەهلی ڕەئی بێت و لە پلەیان کەمبکاتەوە و بەدوای وتە ناشرینەکانیان بگەڕێت و ئاگادارکردنەوەیان لێ بدات وەکو إسحاق بن إبراهيم الحنظلي (إسحاق بن راهويه) .

ئەو ئەیوت : ئەهلی ڕەئی کتێبی الله و ســـوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیان ﷺ فڕێ دا و خویان دایە قیاس .

وە شتێکی لەمانە ئەژمارد) .

**١٥١ - الحسـن البصـري** ئایەتی : ﴿ خَلَقْتَنِي مِن نَّـارٍ وَخَلَقْتَـهُۥ مِن طِينٍ ﴾ **(الأعرَاف : ١٢)** ـی خوێندەوە ، وە وتی : (ئیبلیس قیاسی کرد ، وە یەکەم کەس بوو کە قیاسی کرد).

**١٥٢ - محمد بن سيرين** ئەڵێت : (یەکەم کەس کە قیاسـی کرد ئیبلیس بوو ، وە خۆر و مانگ نەپەرستراون ئیللا بە قیاسکردن نەبێت ) .

---

- إبن جرير الطبري لە **(التفسير)** ـــەکەیدا پاش وتەکەی الحسن و إبن سيرين (یەکەم کەس قیاسـی کرد ئیبلیس بوو) ئەڵێت : (مەبەسـتیان لەوە قیاسـی هەڵەیە ، ئەو قیاســە هەڵەیەش ئەوەیە کە باســمان کرد لە وتە هەڵە و دوورەکەی ئیبلیس لە پێکان و ڕاســتیەوە دەربارەی ئەو فەزڵە تایبەتەی الله داویەتی بە آدم عليه الســلام بەســەر دروستکراوەکانی دیکەیدا لە دروستکردنی بە دەستی و، ڕۆح بەبەردا کردنی بە ڕۆحێک لەلایەن خۆی و، سوجدەپێبردنی مەلائیکەکان بۆی و، فێرکردنی ناوی هەموو شتەکان و لەگەڵ ئەو شــتانەی دیکەدا کە تایبەتی کردووە بە ئەو، جا ئەو نەزانە ڕووی لە هەموو ئەوانە وەرگێڕا و ڕووی کردە ئەوەی بەڵگەی هێنایەوە بەوەی خۆی لە ئاگر دروستکراوە و ئادەمیش لە قوڕ) .

**١٥٣ - سعيد بن جبير** دەربارەی ئایەتی : ﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾ **(الفُرقَان : ٤٣)** .

ئەڵێت : (ئەهلی جاهیلیەت بەردیان ئەپەرســـت، ئەگەر لەو باشـــتریان ببینیایە ئەیانپەرست و وازیان لەوەی پێشووتر ئەهێنا) .

١٥٤ - الشعبي ئەڵێت : (ســـوێند بە الله ئەگەر دەســـت بدەنە قیاســـکردن حەڵاڵ حەرام ئەکەن، وە حەرام حەڵاڵ ئەکەن) .

---

- لە (جامع بيان العلم وفضله) دا ئەڵێت : (سوننەت بە قیاسکردن دانەنراوە) .

**: واتە فەرمانێکی الله عز وجل ـە بۆ رسول الله ﷺ و ئێمەش ئەبێت وەکو خۆی شوێنی بکەوین .**

**- لە (الفقيه والمتفقه) ـدا الشعبي ئەڵێت : (خەریکە وای لێبێت نەزانی ببێت بە زانست، وە زانست ببێت بە نەزانی) .**

**وترا : چۆن شتی وا ئەبێت ئەی أبو عمرو ؟**

**وتی : (ئێمە شـــوێن ئاثارەکان و ئەوە ئەکەوتین کە لە هاوەڵانەوە هاتووە، ئیتر خەڵکی لە غەیری ئەوەدا دەستیان دایە قیاسکردن) .**

١٥٥ - أبي الحفص دەربارەی ئایەتی : ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِـــفُ أَلْسِـــنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَـٰذَا حَلَـٰلٌ وَهَـٰذَا حَرَامٌ ﴾ (النَّحل : ١١٦) .

ئەڵێت : (دەربارەی ئەو زانا خراپانە دابەزی کە بە ڕەئـــــو بۆچوونی خۆیان فتوا بۆ خەڵکی ئەدەن) .

١٥٦ - جعفر بن إسماعيل الباذغيسي وتی : (لەلامان بابەتێک دروســـت بوو، دەستم دایە جامع ـەکەی النعمان - واتە ئەبو حەنیفە -، کاتێک تەماشام کرد خەو بردمیەوە، کاتێک خەبەرم بوویەوە ئەم ئایەتەم ئەخوێندەوە ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا

تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَـٰذَا حَلَـٰلٌ وَهَـٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿النَّحل : ١١٦﴾ .

**١٥٧ - عبدالعزيز بن رفيع** ئه‌ڵێت : پرسیار كرا له عطاء ده‌رباره‌ی شتێک ، وتی : (نازانم) .

پێی وترا : (ئایا به بۆچوونی خۆت قسه‌ی تیادا ناكه‌یت ؟) .

وتی : (من شه‌رم ئه‌كه‌م له الله دینداری بكرێت له‌سه‌ر زه‌وی به بۆچوونی من).

---

- له (مسند الدارمي) ـــدا الشـعبي ئه‌ڵێت كه پیاوێک هاتووه بۆ لای پرسـیاری لێكردووه ده‌رباره‌ی شتێک .

الشـعبي ـــش وتوویه‌تی : (إبن مسـعود رضـي الله عنه ده‌رباره‌ی ئاوا و ئاوا ئه‌فه‌رمووێت) .

پیاوه‌كه ئه‌ڵێت : تۆ بۆچوونی خۆتم پێ بڵێ .

الشـعبي ئه‌ڵێت : (ئایا سـه‌رتان له‌مه ناسوڕمێت ؟! هه‌واڵم پێداوه له إبن مسـعود ـه‌وه رضي الله عنه كه‌چی پرسیار ئه‌كات ده‌رباره‌ی بۆچوونی من ! والله ئه‌گه‌ر گۆرانیه‌ک بڵێم كه‌متر پێم ناخۆشه له‌وه‌ی هه‌واڵت پێ بده‌م ده‌رباره‌ی بۆچوونم) .

- له (الطبقات الكبرى لابن سعد) ـــدا محمد بن جحادة ئه‌ڵێت : عامر الشـعبي پرسیاری لێكرا ده‌رباره‌ی شتێک كه ده‌رباره‌ی هیچی له‌لا نه‌بوو .

پێی وترا : به بۆچوونی خۆت ده‌رباره‌ی قسه بكه .

وتی : (جا چی ئه‌كه‌یت له بۆچوونی من ؟! میز بكه به بۆچوونی مندا) .

- له (الإبانة الكبرى) ـــدا له إبن سـیرین ـــه‌وه پرسـیاری لێكراوه ده‌رباره‌ی شتێک ، ئه‌ویش ئه‌ڵێت : (حه‌زم له‌وه نییه به بۆچوونی خۆم قسه‌ی تیادا بكه‌م و پاشان بۆم ده‌ربكه‌وێت بۆچوونێكی تر ڕاسته و به‌دواتدا بگه‌ڕێم نه‌تدۆزمه‌وه) .

- له (السير) دا أبو هلال ئەڵێت : (پرسیارم کرد له قتادة دەربارەی شتێک .

وتی : (نازانم) .

وتم : به بۆچوونی خۆت قسەی تیادا بکه .

وتی : (چل ساڵه به بۆچوونی خۆم قسەم نەکردووه) .

وه ئەوکاته نزیکەی پەنجا ساڵ بوو) .

١٥٨ - الشافعي ئەڵێت : (هیچ کەسێک نییه له تابیعیەکان زیاتر له عطاء شوێنکەوتەی فەرمووده بێت) .

١٥٩ - عطاء بن أبي رباح ئەڵێت : (دین بۆچوون نییه بەڵکو بریتیه له بیستن) .

---

: واته دین ئەوەیه که ڕیوایەت کراوه له فەرمووده و ئاثارەکان .

١٦٠ - عثمان بن عطاء له باوکیەوه ئەگێڕێتەوه که وتوویەتی : (بووم به خاوەنی منداڵ و هیچ زانایەکم نەبینی بڵێت (ڕا و بۆچوونم وایه)، وه گوێم له فێرخوازێکی زانست نەبوو به زانایەک بڵێ (ڕا و بۆچوونت چییه ؟)، بەڵکو زانا ئەیوت : (ئەوه و ئەوەم بیست)، وه فێرخوازیش ئەیوت (الله باشت بکات لەو بابەتەدا چۆن ئەوه و ئەوەت بیستووه ؟) .

---

: عطاء واته زانای تابیعی عطاء الخراساني (٦١ - ١٣٥ هـ) .

**١٦١ - الأوزاعي** ئەڵێت : (توند نەبووین لەســەر ئەبو حەنیفە لەبەر ئەوەی بۆچوونی هەیە، هەمووکمان بۆچوونمان هەیە، بەڵام توند بووین لەســەری لەبەر ئەوەی فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئەهێنرا ئەو لای ئەدا لێی بۆ شتی تر) .

---

- لە (مســائل إبن هانئ) ــــدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (وازمان لە هاوەڵان و ئەهلی ڕەئی و بۆچوون هێنا لەکاتێکدا فەرموودەیەکی زۆریان لەلا بوو، لێیانەوە نەماننووسیەوە، لەبەر ئەوەی دژایەتی فەرموودە ئەکەن، هیچکامێکیان سەرفراز نابن).

- لە (تاريخ بغداد) دا أبو إسحاق الفزاري ئەڵێت : (فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئەهێنرا ئەو لای ئەدا لێی بۆ شتی تر) .

- لە (تاريخ بغداد) ــــدا وكيع بن الجراح ئەڵێت : (بینیمانەوە ئەبو حەنیفە موخالەفەی دووسەد فەرموودەی کردووە) .

- لە (الســنة لعبدالله بن أحمد) ــــدا مالك بن أنس دەربارەی ئەبو حەنیفە ئەڵێت : (سوننەتەکانی هەڵئەوەشاندەوە بە بۆچوون) .

- لە (السنة لعبدالله بن أحمد) ـدا حماد بن سلمة ئەڵێت : (ئەبو حەنیفە ئاثار و سوننەتەکانی لەپێش خۆی دانا و بە بۆچوونی خۆی ڕەتی کردنەوە) .

**١٦٢ - عمر بن عبدالعزيز** ئەڵێت : (ئەوەی الزهري بۆتی هێنا لەوەی کە گێڕاویەتیەوە توند دەستی پێوە بگرە، وە ئەوەی بۆتی هێنا لە بۆچوونی خۆی فڕێی بدە).

**١٦٣ - جعفر بن إسماعيل الباذغيسي** گێڕاپەوە لە سعید بن منصور ـەوە بیستوویەتی ئەڵێت : (پێغەمبەری ﷺ بینیوە لە خەودا، پرسیاری لێ کردوور

دەربارەی هشيم بن بشير، پێی فەرمووە : (کاتێک هشيم فەرموودەيەکی جێگير کرد[١] وەريبگرە) .

پێم وت : ئەی چی ئەفەرمووێت دەربارەی أبو يوسف[٢] و هاوەڵانی ؟

فەرمووی : (لە هيچ دا لەگەڵيان مەبە) .

---

: (١) واتە بە صحيح ی دانا .

(٢) القاضي، هاوەڵی ئەبو حەنيفە .

- لە (السير) دا نصر بن بسطام ئەڵێت : معروف الكرخي وتی : پێغەمبەرم ﷺ بينی لە خەودا بە هشيم ی فەرموو : (الله پاداشتت بداتەوە بەرامبەر ئوممەتەکەم) .

وتم : خۆت بينيت ؟

وتی : (هشيم باشتر بوو لەوەی کە ئێمە بيرمان لێ ئەکردەوە) .

**١٦٤ - سيار أبي الحكم** ئەڵێت : (ئێوە کۆمەڵە پرسيارێکمان لێ ئەکەن وەک بڵێيت وا ئەزانن ئێمە لێمان ناپرسرێتەوە دەربارەی ئەو فتوايەی بۆتان ئەدەين!) .

---

- لە (الفقيه والمتفقه) ـــدا إبن عمر رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (ئێوە داوای فتوامان لێ ئەکەن وەک چۆن داواتان لە هاوەڵە گەورەکان ئەکرد، وەک بڵێيت لێمان ناپرسرێتەوە سەبارەت ئەوەی فتواتان بۆ ئەدەين دەربارەی!) .

- لە (تعظيم الفتيا) ـدا عقبة بن مسلم ئەڵێت : هاوەڵايەتی إبن عمر م کرد سی و چوار مانگ، لە زۆربەی ئەوانەی پرسياری لێ ئەکرا ئەيفەرموو : (نازانم) .

پـاشـــان لای ئەکردەوە بۆ لام ئەيوت : (ئايا ئەزانيـت ئەوانە چييـان ئەوێـت؟ ئەيانەوێت پشتی ئێمە بکەن بە پردێک بۆ جەهەننەم) .

١٦٥ - النضـر بن شـميل ئەڵێت : (شـــعبة ڕیوایەتی نەکرد لە حماد بن أبي سليمان ـەوە تەنها شتێک نەبێت کە تەنها لەلای ئەو هەبێت، وە إبن عون سەلامی نەئەکرد لە حماد) .

---

: مەبەستی لە ماموستاکەی ئەبو حەنیفەیە، حماد بن أبي سليمان .

- العقيلي لە (الضعفاء) ـــدا ئەڵێت : (حماد بن أبي سليمان سەرگەورەیەک بوو لە مورجیئەکاندا) .

- (الضعفاء) دا الميموني ئەڵێت : وتم بە أحمد بن حنبل : حماد بن أبي سليمان ؟

وتی : یەکەم کەس بوو قسەی کرد لەم بۆچوونەدا .

وتم : ئایا بۆچوونی ئیرجاء ی هەبوو ؟

وتی : (بەڵێ) .

- لە (الضعفاء) دا سـفيان ئەڵێت : (الأعمش ئەگەیشت بە حماد کاتێک قسەی کرد لە ئیرجائدا، سەلامی نەئەکرد لێی) .

١٦٦ - عامر بن شَراحيل الشعبي ئەڵێت : (هیچ کەسێک نییە لەپاش پێغەمبەر ﷺ ئیللا تۆ لە وتەکەی وەرئەگریت و وازی لێ ئەهێنیت) .

١٦٧ - الأوزاعي ئەڵێت : (ڕەئ و بۆچوونی کەسێک لە بابەتێکدا کە لە پێغەمبەر ـەوە ﷺ دەربارەی پێی گەیشتووە تەنها شوێنکەوتنە، وە ئەگەر لە رسول الله ـەوە ﷺ دەربارەی نەهاتبوو و هاوەڵانی پاش خۆی قسەیان تێدا کردبوو، ئەوە ئەوان لەپێشترن بە حەق لە ئێمە، لەبەر ئەوەی الله وەسفی ئەوانەی پاش - هاوەڵانی - کردووە بە شوێنکەوتنیان بۆ - هاوەڵان - : ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ﴾ (التَّوبَة : ١٠٠) .

جا ئێوە وتتان نەخێر بەڵکو بەراوردی ئەکەین بە ڕەئ و بۆچوونی خۆمان دەربارەی قورئان، ئەوەی لەگەڵی ڕێککەوت ئەوە بەڕاستی ئەخەینەوە، وە ئەوەی یەکی نەگرتەوە ئەوە وازی لێ ئەهێنین، وە ئەوەش مەبەست و ئامانجی هەموو بیدعەچیەکە لە ئیسلامدا : ڕەتکردنەوەی ئەوەی یەکناگرێتەوە لە سوننەت لەگەڵ هەوا و ئارەزووی) .

---

- لە (الإبانة الكبرى) ـدا عبدالله بن صالح ئەڵێت : (الأوزاعي نووسی بۆ صالح بن بكر : أما بعد; نامەکەت پێم گەیشـت کە تیایدایەتی کتێب لەناو خەڵکیدا زیاد بووە، وە وتەکان دەربارەی قەدەر بە یەکتری ڕەت کراونەتەوە بەشـێوەیەک وای لێ هاتووە بیر لەوە ئەکەنەوە شـکتان هەبێت دەربارەی قەدەر، وە پرسـیارت لێ کردووم ئەوەت بۆ بنووسم کە بۆچوونم لەسەری جێگیر بووە، وە بە کورت و پوختی باسی لێوە بکەم، پەنا ئەگرین بە الله لە سەرلێشێواوی لە دینەکەماندا، وە لە جیانەکردنەوەی حەق و باتڵ .

من ئامۆژگاریت ئەکەم بە یەک شـت، کە إن شـاء الله شـک و گومان لەلات ڕائەماڵێت و بەهۆیەوە دەست ئەگریت بە ڕێگای هیدایەتەوە :

أ - تەماشـای ئەوە بکە کە هاوەڵانی محمد ﷺ لەم بابەتەدا لەسـەری بوون، ئەگەر ڕاجیاواز بووب تیایدا ئەو وتەیەیان هەڵبژێرە کە لەگەڵت ئەگونجێت، چونکە ئەوکاتە لە فراوانیدایت .

ب - وە ئەگەر هەموویان کۆک بوون لەسـەر شـتێک و هیچکامیان لێیان لانەدابوو، ئەوکات بۆچوونی ڕاست لەکوێدایە جگە لەوەی ئەوان لەسەرین ؟ لەناوچوون و بەهیلاکچوون لە موخالەفەکردنیـانـدایە، وە ئەوان هەرگیز لەسـەر شـتێک کۆنەبوونەتەوە و هیدایەت لە جگە ئەو شـتەدا بووبێت، وە بەڕاسـتی الله سـتایشـی ئەو کەسانەی کردووە کە شـوێنپێیان هەڵئەگرن، فەرموویەتی : ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَـٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّـٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ (التَّوۡبَة : ١٠٠) .

- الشـافعي لە (الرسـالة البغدادية) ـــدا ئەڵێت : (بەڕاسـتی الله عز وجل وەسـفی هاوەڵانی رسـول الله ـــی ﷺ کردووە لە قورئان و تەورات و ئینجیلدا، وە لەسـەر زمانی

رســـول الله ﷺ چەندین فەزڵیان بۆ پێشــخراوە کە بۆ ئەوانەی دوای هاوەڵان نییە، ڕەحمەتی الله ـــیان لێبێت، وە بەوەی پێی داون پێیان ببەخشێت گەیشتن بە بەرزترین پلەکانی ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکان .

ســوننەتی رســول الله ـــیان ﷺ بۆ گواســتینەوە، ئامادەبوون کاتێک وەحی دائەبەزیە سەری، هەربۆیە زانیان کامە رسول الله ﷺ مەبەستی پێی عام و خاص بووە، وە کامەیان مەبەســتی پێی جەختلەســەرکردنەوە و ڕێنمونی بووە، وە لە ســوننەتەکەی ئەوەیان زانی کە ئێمە ئەیزانین وە ئەوەش کە ئێمە نایزانین، ئەوان لە سەرو ئێمەوەن لە هەموو کردەوە و ئیجتیهاد و وەرع و عەقڵ و بابەتێک بە زانســـت پێی گەییراوە و هەڵهێنجراوە، وە بۆچوونی ئەوان بۆ ئێمە باشـــتر و ئەولاترە لە بۆچوونی خۆمان بۆ خۆمان .

وە ئەو کەســەی پێی گەیشـــتووین لەوەی کە قبووڵکراوە، یاخود لێوەی گێڕدراوەتەوە بۆمان لە شـــارەکامان; لەو بابەتەی کە لە رســـول الله ـــــەوە ﷺ سوننەتێکیان نەزانیوە وتەی هاوەڵانیان هەڵبژاردووە کاتێک لەسەر شتێک کۆک بوون، یان وتەی هەندێکیان ئەگەر کۆک نەبوون، ئێمەش هەر وا ئەڵێین و لە وتەی ئەوان دەرناچین، وە ئەگەر یەکێکیان قسەیەکی کرد و هیچ کەسێک لێیان موخالەفەی نەکرد ئەوە وتەکەی وەرئەگرین) .

١٦٨ - عمرو بن مهاجر الأنصاري ئەڵێت : (عمر بن عبدالعزيز بۆ خەڵکیی نووسی کە بۆ هیچ کەسێک بۆچوون نییە لەگەڵ سوننەتێکدا کە رسول الله ﷺ دایناوە) .

١٦٩ - الحميدي ئەڵێت : (لەلای الشافعي بووین پیاوێک هات بۆلای دەربارەی بابەتێک پرسیاری لێ کرد، وتی : (رسول الله ﷺ ئاوا و ئاوا بڕیاری داوە).

پیاوەکە بە الشافعي وت : ئەی تۆ چی ئەڵێیت ؟ .

وتی : (پاکوبێگەردی بۆ تۆ - **واتە بۆ الله عز وجل** -، ئایا ئەمبینی لە کەنیسەدا بم ؟ ئایا وا ئەمبینی لە پەرستگای یەهوودیەکاندا بم ؟ ئایا ئەبینیت زُنَّار م لە ناوقەدم بەستبێت ؟

من ئەڵێم رسول الله ﷺ ئاوا و ئاوا بڕیاری داوە، تۆش ئەڵێیت ئەی تۆ چی ئەڵێیت ؟!) .

**١٧٠ - الشافعي** ئەڵێت : (کاتێک سوننەتێکی رسول الله تان ﷺ بینیەوە شوێنی بکەون و لا مەکەنەوە بۆ هیچ کەسێک ) .

**١٧١ - أحمد بن حنبل** ئەڵێت : (نەمبینیوە شوێنکەوتووتر بۆ ئەثەر لە الشافعي ).

---

**- لە (آداب الشافعي) ـدا عبدالملک بن عبدالحميد بن ميمون بن مهران ئەڵێت : أحمد بن حنبل پێی وتم : (بۆچی تەماشای کتێبەکانی الشافعي ناکەیت، لەوەتەی دەرکەوتووە هیچ کەسێک نییە کتێبی نووسیبێت شوێنکەوتووتر بێت بۆ سوننەت لە الشافعي) .**

**- لە (تاريخ دمشق) ـدا الميموني ئەڵێت : أحمد پێی وتم : (پەیوەستبە بە کتێبەکانی الشافعي ـیەوە، هیچ کەسێک ناناسم کتێبی دانابێت زیاتر شوێنکەوتووی ئەثەر بێت لە الشافعي) .**

**- لە (تاريخ دمشق) ـدا أحمد بن حنبل بە الميموني ئەڵێت : (تەماشای کتێبی الرسالة ـەکەی بکە، چونکە ئەوە لە باشترینی کتێبەکانیەتی) .**

**١٧٢ - الشافعي** ئەڵێت : (ئەگەر لە کتێبەکەمدا پێچەوانەی سوننەتی رسول الله تان بینی ﷺ ئەوە بە سوننەتی رسول الله ﷺ قسە بکەن[1] وە واز لەوە بێنن کە من وتوومە).

---

: (١) واتە کاری پێ بکەن و فتوای پێ بدەن .

بەڕاستی شوێنکەوتنی ڕاستەقینە بۆ مەزهەبەکان ئەمەیە کە ئیمام وتوویەتی، تۆ کاتێک شوێن ئیمامێکی ئەهلی ئەثەر ئەکەویت و ئەچیتە سەر مەزهەبەکەی، وەکو (الأوزاعي و، سفيان و، مالك و، الشافعي و، إسحاق و، أحمد بن حنبل و، الطبري و إبن خزيمة و . . . ) لەبەر ئەوەیە گومانت نییە لەوە ویستوویانە شوێنی حەق بکەون و لە زۆربەی هەرە زۆریشیدا پێکاویانە .

وە کاتێک زانیت ئەو ئیمامەی لەسەر مەزهەبەکەی ئەڕۆیت لە شتێکدا هەڵەی کردووە، وە ڕاستەکە ئەوەیە کە ئیمامێکی تر لەسەریەتی، ئەوە شوێن ئیمامەکەی خۆت ناکەویت، بەڵکو تۆ شوێنی حەق ئەکەویت، وە یەکەمجاریش کە شوێن ئەم ئیمامە کەوتوویت لەبەر ئەوە بووە کە لەسەر حەق بووە، جا ئەگەر لە شتێکدا لەسەر حەق نەبوو ئەوە وتەکەی قبووڵ ناکەیت بەڵکو وتەی زانایانی دیکەی ئاست خۆی قبووڵ ئەکەیت .

**١٧٣ - الشافعي** ئەڵێت : (هەموو بابەتێک کە تیایدا قسەم کردبێت لەلای ئەهلی نەقل فەرموودە لە رسول الله ـەوە ﷺ تیایدا صحيح بێت بە پێچەوانەی ئەوەی من وتوومە; ئەوە من پاشگەز ئەبمەوە لێی لە ژیان و پاش مردنمدا) .

**١٧٤ - الربيع** ئەڵێت : گوێبیستی الشافعي بووم و فەرموودەیەکی گێڕایەوە .

پیاوێک پێی وت : ئەی أبو عبدالله ئایا وەری ئەگریت ؟

وتی : (هەرکەی من لە رسول الله ـەوە ﷺ فەرموودەیەکی صحیح م گێڕایەوە و وەرم نەگرت ئەوە شایەت بن کە ژیریم نەماوە) .

١٧٥ - موسى بن إبي الجارود ئەڵێت : الشافعي وتی : (ئەگەر فەرموودەیەک لە رسول الله ـەوە ﷺ صحیح بوو وە منیش قسەیەکم کردبوو ئەوە پاشگەز ئەبمەوە لە قسەکەم، وە قسە بە فەرموودەکە ئەکەم) .

وە ئەم فەرموودە صحیح ـە : (کەڵەشاخگر و کەڵەشاخبۆگیراو ڕۆژووەکەیان شکاوە).

منیش ئەڵێم : الشافعي ئەڵێت : (کەڵەشاخگر و کەڵەشاخبۆگیراو ڕۆژووەکەیان شکاوە) .

١٧٦ - الشافعي ئەڵێت : (کاتێک یەکێک لە هاوەڵانی فەرموودە ئەبینم وەکو ئەوە وایە یەکێکم بینیبێت لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ .

الله پاداشتی بەخێریان بداتەوە، ئەوان بنچینەکەیان بۆ ئێمە پاراست، هەربۆیە چاکەیەکیان بەسەرمانەوە هەیە) .

---

- لە (شرف أصحاب الحديث) ـدا الشافعي ئەڵێت : (کاتێک پیاوێک لە هاوەڵانی فەرموودە ئەبینم وەکو ئەوە وایە پێغەمبەرم ﷺ بە زیندوویی بینیبێت) .

١٧٧ - الشافعي ئەڵێت : (پەیوەست بن بە هاوەڵانی فەرموودەوە، چونکە چونکە ڕاستترینی خەڵکین) .

**١٧٨ - أحمد بن حنبل** ئەڵێت : الشافعي پێی وتین : (ئێوە شارەزاترن بە فەرموودە لە من، کاتێک فەرموودەیەک صحيح بوو لە رسول الله ـەوە ﷺ ئەوە بڵێن تا وەری بگرم) .

---

**: چەند سوودێکی تێدایە :**

**یەکەم : شوێنکەوتنی الشافعي بۆ سوننەت .**

**دووەم : خاکیبوونی الشافعي لەئاست کەسانێکدا کە لە بوارێکدا لە خۆی شارەزاترن.**

**سێیەم : دانانی بە فەزڵ و پێگەی أحمد بن حنبل و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەلایەن الشافعي ـەوە .**

**١٧٩ - أحمد بن حنبل** ئەڵێت : (پرسیارم کرد دەربارەی قیاس لە الشافعي، وتی لە کاتی ناچاریدا) .

---

**: ئەهلی ســوننە و جەماعە عەقیدەی خۆیان لە قورئان و فەرموودە و ئاثارەوە وەرئەگرن، وە ئەگەر لە بابەتێکدا هیچ شــتێکی تێدا نەهاتبێت ئینجا بە ناچاری قیاس بەکارئەهێنن، نەک وەکو ئەهلی ڕەئی قیاس بخەنە پێش هەموو شتێکەوە .**

**١٨٠ - الشـافعي** ئەڵێت : (نەمبیســتووە لە هیچ کەسـێکەوە خەڵکی بیدەنە پاڵ زانســت یان خۆی بداتە پاڵ زانســت موخالەفە بکات لەوەدا کە الله عز وجل شوێنکەوتنی فەرمانی رسول الله ی ﷺ فەرز کردووە .

وە فەرزی کردووە تەســلیم بوون بۆ بڕیارەکانی بەوەی الله عز وجل بۆ هیچ کەسێک لەپاش ئەو داینەناوە تەنها شوێنکەوتنی نەبێت .

وە هیچ وتەیەک نابێت تەنها بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ نەبێت، وە جگە لەوانە شوێنکەوتەیانن، وە الله تعالى لەسەر ئێمە و پێش ئێمە و پاش ئێمەی فەرز کردووە قبووڵکردنی ئەو هەواڵەی کە لەلایەن رسول الله ـــەوە ﷺ هاتووە .

موخالەفە نیە کە فەرز و واجب قبووڵکردنی ئەو هەواڵەیە کە لە رسول الله ـەوە ﷺ دێت تەنها کۆمەڵەیەک نەبێت کە إن شاء الله باسی وتەکانیان ئەکەم .

الله عز وجل شـوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی ﷺ لەسەر فەرز کردووین، فەرموویەتی : ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾ (النِّسَاء : ٦٥) .

وە فەرزی کردووە لەسەرمان شوێن فەرمانەکەی بکەوین، فەرموویەتی : ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْۚ ﴾ (الحَشْر: ٧) .

١٨١ - **قتادة** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ فَلَا يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ ﴾ (الأَعْرَاف : ٢) .

ئەڵێت : (شک و گومان) .

١٨٢ - **أبو ثور** ئەڵێت : (ئەگەر الله منەتی بەسەردا نەکردمایە بە الشافعي ئەوە بە گومڕایی پێی ئەگەیشتمەوە، کاتێک هات بۆ لامان من وام ئەزانی هیچ کەسێک الله ی نەپەرستووە تەنها لەسەر مەزهەبی ئەهلی ڕەئی نەبێت .

الشافعي وتی : (الله عز وجل پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئەهلی دینەکەی وەکو ڕوونکەرەوەیەک بۆ قورئان داناوە بەو واتایەی الله ئەیەوێت، وە گوێڕایەڵی واجب کردووە، وە وتی : ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ ﴾ (النِّسَاء : ٨٠)، جا بۆ هیچ موفتیەک نییە فتوا بدات، وە بۆ هیچ حاکمێک نییە حوکم بدات هەتا زانا ئەبێت

دەربارەیان، وە موخالەفەی هیچکامێکیان ناکات، ئەگەر وا نەکات ئەوە سەرپێچیکارە و حوکمەکەی ڕەتکراوەیە).

---

- الخطيب البغدادي لە (تاريخ مدينة السلام) ـــدا ئەڵێت: **(أبو ثور یەکەمجار خەریکی فیقهـــبوو بە ڕەئـــو بۆچوون، وە مەزهەبی بریتیبوو لە وتەی عێراقیەکان هەتا الشافعي هاتە بغداد، دواتر أبو ثور چوو بۆ لای و گەڕایەوە لە بۆچوون بۆ فەرموودە).**

**١٨٣ - الشـافعي** ئەڵێت: (ئەگەر قەڵەمەکان نەبوونایە ئەوە زەندیقەکان لەسەر مینبەرەکان وتاریان ئەدا).

---

**: واتە ئەگەر ئەهلی فەرموودە فەرموودەیان نەنووسـیایەتەوە و کاریان پێ نەکردایە و وەڵامی گومڕاکانیان پێ نەدابایەتەوە ئەوە زەندیقەکان لەسـەر مینبەرەکان وتاریان ئەدا.**

**١٨٤ - حرب بن إسماعيل الكرماني** ئەڵێت: (پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی تەماشاکردنی ڕەئی، جا ڕقی لێ بووەوە و نەهی لێ کرد).

**١٨٥ - عثمان بن سعيد الدارمي** ئەڵێت: (أحمد بن حنبل پێی وتم تەماشای ڕا و بۆچوونی هیچ کەسێک مەکە).

**١٨٦ - حرب بن إسماعيل الكرماني** ئەڵێت: (پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی پیاوێک کە پرسیارێکی هەیە، جا هیچ کەسێک - لە ئەهلی فەرموودە - نادۆزێتەوە پرسیاری لێ بکات، ئایا پرسیار لە ئەهلی ڕەئی بکات؟

وتى : نه‌خێر به‌ هیچ شێوه‌یه‌ک پرسیار ده‌رباره‌ى هیچ شتێک له‌ ئه‌هلى ڕه‌ئى ناكات ) .

١٨٧ - عبدالله بن أحمد بن حنبل ئه‌ڵێت : (گوێم له‌ باوكم بوو وتى : نابێت هیچ شتێک ڕیوایه‌ت بكرێت له‌ هاوه‌ڵانى ئه‌بو حه‌نیفه‌ ) .

---

- عبدالله بن أحمد بن حنبل له‌ (العلل ومعرفة الرجال) ـــدا ئه‌ڵێت : پرسیارم له‌ باوكم كرد ده‌رباره‌ى أبو یوسف .

وتى : (صـدوق ـــه‌، به‌ڵام له‌ هاوه‌ڵانى ئه‌بو حه‌نیفه‌یه‌، نابێت هیچ شـتێكى لێوه‌ ڕیوایه‌ت بكرێت ) .

- له‌ (المجروحین) ـــدا زیاد بن أیوب ئه‌ڵێت : پرسیارم كرد له‌ أحمد بن حنبل ده‌رباره‌ى ڕیوایه‌ت كردن له‌ ئه‌بو حه‌نیفه‌ و أبو یوسف ؟

وتى : (وا نابینم ڕیوایه‌تیان لێوه‌ بكرێت ) .

- له‌ (السنة لعبدالله) ـــدا هارون بن سـفیان ئه‌ڵێت : پرسیارم كرد له‌ أسود بن سالم ده‌رباره‌ى أبو زائدة ؟

وتى : (حافظ بوو، به‌ڵام باســى ئه‌بو حه‌نیفه‌ى ئه‌كرد و لێوه‌ى ئه‌گێڕایه‌وه‌ و به‌ فتواكانى ئه‌و قسه‌ى ئه‌كرد، هه‌ربۆیه‌ له‌لاى من لاوازه‌ ) .

١٨٨ - عثمان بن سعيد الدارمي ئه‌ڵێت : (أحمد بن حنبل پێى وتم نزیک ڕه‌ئى هیچ كه‌سێک مه‌كه‌وه‌ره‌وه‌ ) .

١٨٩ - عصمة بن عصام ئه‌ڵێت : (له‌لاى أبي سـليمان الجوزجاني بووم، نامه‌یه‌كى له‌لایه‌ن أحمد بن حنبل ــــه‌وه‌ بۆ هات، تێیدا نووســرابوو : ئه‌گه‌ر واز

بهێنێت لە ڕیوایەتکردنی کتێبەکانی ئەبو حەنیفە، ئەوە ئەهاتین بۆ لات بۆ بیستی کتێبەکانی عبدالله بن المبارک).

---

- لە (طبقات الحنابلة) دا يحيي الوحاظي ئەڵێت: أحمد بن حنبل هات بۆ ئێرە بۆ حمص، جا فەرمووده و ئاثاری نووسیەوە لە گەنجەکان و نەینووسیەوە لە شێخ و بەتەمەنەکان، لەبەر ئەوەی کاتێک ڕووی کردبوویە حمص نامەی ناردبوو بۆ یحیی ئەگەر واز لە ڕەئـ و بۆچوون بهێنیت ئەوە دێم بۆ لات، چونکە یحیی گوێبیستی کتێبەکانی ئەهلی ڕەئی ئەبوو و بۆچوونی ئەوانی هەبوو، هەربۆیە أحمد نەهات بۆ لای.

وە لەلای یحیی بووم ڕۆژێکیان گوێم لێبوو قسەیەکی مورجیئەکانی کرد، منیش ئیتر نەڕۆشتمەوە بۆ لای، هەر لەبەر ئەوەشە لێوەم نەنووسیەوە).

إبن أبي يعلي ئەڵێت: یحیی أبو سليمان الجوزجاني یە کە پێشەواکەمان نەچوو بۆ لای.

الوحاظي ئەڵێت: (لەلای أبو سليمان بووم نامەکەی أحمد بن حنبل ی بۆ هات تیایدا باسی ئەوەی کردبوو: ئەگەر واز لە ڕیوایەتکردنی کتێبەکانی ئەبو حەنیفە بهێنیت دێین بۆ لای و گوێبیستی کتێبەکانی عبدالله بن المبارک ئەبین لێتەوە).

- لە (طبقات الحنابلة) دا محمد بن ياسين ئەڵێت: پرسیارم کرد لە أحمد دەربارەی تەماشاکردنی ڕەئ و بۆچوون؟

وتی: (پەیوەستبە بە سوننەتەوە).

وتم: ئەی أبو عبدالله، هاوەڵی فەرموودە تەماشای ڕەئـ و بۆچوون بکات بە مەبەستی ئەوەی بۆچوونی موخالیفەکانی بزانێت؟

وتی: (پەیوەستبە بە سوننەتەوە).

- لە (طبقات الحنابلة) دا عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەڵێت: الفتح بن شخرف نووسی بۆم گوێبیستی موسی بن حزام الترمذي بووە ئەیوت: (ئەچووم بۆ لای أبو سليمان الجوزجاني بۆ کتێبەکانی محمد بن حسن الشيباني، جا أحمد بن حنبل بەرەووڕووم هات وتی: (بۆ کوێ ئەڕۆیت؟).

وتم : بۆ لای أبو سليمان .

وتی : (سه‌رمسووڕماوه له ئێوه! وازتان له يزيد له حميد له أنس رضي الله عنه له پێغه‌مبه‌ر ﷺ هێناوه .

كه‌چی ڕووتان كردووه‌ته سێ كه‌س هه‌تا ئه‌بو حه‌نيفه : أبو سليمان له محمد بن حسن له أبو يوسف له أبو حنيفة!) .

منيش ڕۆيشتم بۆ لای يزيد بن هارون) .

**١٩٠ - عثمان بن سعيد الدارمي** ئه‌ڵێت : (كاتێک أحمد بن حنبل ڕۆيشت بۆ حمص ناردی تا به يحيى بن صالح الوحاظي بووترێت : (ئه‌گه‌ر واز له ڕه‌ئـو بۆچوون بهێنيت، ئه‌وه دێم بۆ لات و لێته‌وه ئه‌نووسمه‌وه) .

ئه‌مه‌ش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی يحيى كتێبه‌كانی ڕه‌ئی و بۆچوونی ئه‌نووسيه‌وه، جا هه‌مان مه‌زهه‌بی ئه‌وانی هه‌بوو، هه‌ربۆيه أحمد نه‌ئه‌چوو بۆ لای) .

**١٩١ - بشر الحافي** ئه‌ڵێت : (نيشانه‌ی گوێڕايه‌ڵيكردنی الله بريتيه له ته‌سليم بوون بۆ فه‌رمانه‌كانی به گوێڕايه‌ڵی كردنی .

وه نيشانه‌ی خۆشه‌ويستی رسول الله ﷺ بريتيه له ته‌سليم بوون بۆ فه‌رمووده‌كانی، وه كار كردن له‌سه‌ر سوننه‌ته‌كه‌ی، وه ئاوڕ نه‌دانه‌وه بۆ غه‌يری ئه‌و) .

**١٩٢ - الهروي** ئه‌ڵێت : (ئه‌مه ده‌روازه‌يه‌كی گه‌وره‌يه، زانستێكی زۆری دين ئه‌گرێته خۆی، باسی ڕوو و جۆره‌كانيم كردووه له (باب إتباع السنة) له (كتاب القواعد) ـدا، وه هه‌ندێكيشی له (كتاب مناقب أهل الآثار)، هه‌ربۆيه به وردی باسم نه‌كردووه له‌م كتێبه‌مدا، به‌ڵام هيچ ڕێگه‌چاره‌يه‌كم نه‌بوو ته‌نها ئه‌وه نه‌بێت ده‌ری بخه‌م له توندی بێزراوی باشترينه‌كانی سه‌له‌ف و پياوچاكانی موسوڵمانانی

ئوممەت و هەڵبژێردراوانی زانـایـان لە ســەرەتـاوە، وە ئەوانەی هەســتـاون بە پاڵپشتیکردنی دین لە دژوەستانەوەی فەرمووده بە ڕەئ و بۆچوون، وە ڕوو وەرگێڕان لە خۆتەســلیمکردنی بە بەهێزکردنی قیاس لە فەرعەکانی دیندا کە بیرکردنەوەکان ئەگەن هەندێک لە بناغەکانی; وە خەڵکیش ئەچنە ناو ڕێگاکانی و ڕێ ئەکەن، وە لە هەندێک شــتیدا بێپێویســت نابێت تەماشــاکردنی قیاس و بۆچوونی بەهێز بە ئاگاداری ئەوەی بۆچوونە لاوازەکەیان بەهێز نەبێت، وە بۆچوونە ڕاســتەکەشــیان سنوور نەبەزێنێت .

واللە ئەوەی کە ئاگاداریـان لەبـارەی دا ڕوویـدا، وە ئەوەی بـاســیـان کرد سنووری بەزاند، وە ئەوە هات بەسەر موسوڵماناندا کە بە خراپە باسیان ئەکرد) .

## دەروازەی : (٩)

## تووندی بێزراوی المصطفی ﷺ و هەڵبژێردراوانی ئوممەتەکەی لە قووڵبوونەوە لە دیندا

**١٩٣** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (خۆ ئەگەر مانگ درێژ بکرێتەوە ئەوە بەسەریەکەوە هەمووی بەڕۆژوو ئەبم بۆ ئەوەی ئەوانەی قووڵ ئەبنەوە لە دیندا واز لە قووڵبوونەوەکەیان بهێنن، ئێوە بارودۆختان وەکو هی من نییە، من شەو ئەمێنمەوە پەروەردگارم خۆراک و خواردنەوەم پێ ئەدات) .

**١٩٤** - محمد بن عون الخراساني ئەڵێت : پرسیارم کرد لە نافع ـی مولای ـی إبن عمر رضي الله عنهما دەربارەی نوێژی کەسی گەشتیار ؟

وتی : إبن عمر رضي الله عنهما فەرمووی : (نوێژی موسافیر دوو ڕکعاتە، هەرکەسێک موخالەفەی سوننەت بکات کافر بووە) .

---

- لە (الإبانة الكبرى) دا مکحول ئەڵێت : (سوننەت دوو سوننەتە :

أ - سوننەتێک کارپێکردنی فەرزە و وازلێهێنانی کوفرە .

ب - وە سوننەتێک کارکردن پێی فەزڵ و گەورەییە و وازهێنان لێی نەنگی نییە) .

إبن بطة ئەڵێت : (من لایەکی وتەکەی مکحول تان بۆ ڕوون ئەکەمەوە، هانتان ئەدات و بانگتان ئەکات بۆ بەدەستهێنانی ئەو سوننەتانەی کە بەردەستهێنان و کارپێکردنی فەرزە، وە وازهێنان لێی و کەمتەرخەمی کردن تیایدا کوفرە .

بزانن الله عز وجل ڕەحمتان پێ بکات; ئەو سـوننەتەی کە کەسـانی تایبەت و ئاسایی لەسەریانە بیزانن و بەدوایدا بگەڕێن و پرسیاری دەربارە بکەن; ئەو سوننەتەیە کە هاتووە وەکو تەفسیر و ڕوونکردنەوەیەک بۆ ئەو فەرزانەی لە قورئاندا هاتووە لەوانەی نازاندرێت چۆن کاری پێ بکرێت ئیللا بە دەربڕین و وتەی ڕوونکەرەوە نەبێت .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ (البَقَرَة : ٤٣) .

پاشان باسی ئایەتەکانی حەج و ڕۆژوو و زەکاتی ئەکات و ئەڵێت : (هیچ کەسیک نییە ڕێگا بدۆزێتەوە بۆ کارکردن بەوەی کە ئەم فەرزانەی الله عز وجل گرتویەتیە خۆی ئیللا بە ڕوونکردنەوە و تەفسیری رسول الله ﷺ نەبێت بە وەستاندن و دیاریکردن و ڕیکخستن، جا فەرزە لەسەر ئوممەت فێربوونی زانستی ئەو سوننەتانەی کە هاتووە لە رسول الله ـــەوە ﷺ لە ڕوونکردنەوە و تەفسیری ئەم فەرزانەی کتێبی الله، چونکە یەکێکە لەو دوو ئەسڵەی کە الله عز وجل دینی پێ کامڵ کردووە بۆ موسوڵمانان، وە بە هەردووکیان بۆی کۆکردوونەتەوە چی ئەنجام بدەن و خۆیان لە چی بپارێزن، هەر لەبەر ئەوەشە کارکردن پێی واجبە و وازهێنان لێی کوفرە) .

- إبن القيم لە (تحفة المودود بأحكام المولود) ـدا ئەڵێت : (سوننەت بریتیە لە ڕێگە، ئەو ڕێگەیەیە کە پەیڕەو ئەکرێت وەکو واجب و خۆشـویسـتراوێک - إسـتحبابا - لەبەر فەرمایشتی رسول الله ﷺ : (هەرکەسێک ڕوو لە سوننەتەکەم وەربگێڕێت لە من نییە) .

وە فەرمایشتی : (پەیوەسـت بن بە سـوننەتەکەم و سـوننەتی خەلیفە هیدایەتدراوەکانی پاش من) .

وە إبن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (ئەوەی موخالەفەی سوننەت بکات کافر بووە) .

وە تایبەتکردنی سـوننەت بە شـتێک کە ڕێگەپێدراوە وازی لێ بهێندرێت دەستەواژەیەکی تازە و نوێیە، بەڵکو سـوننەت ئەوەیە کە رسول الله ﷺ دایناوە بۆ ئوممەتەکەی لە واجب و مستحب، هەربۆیە سـوننەت بریتیە لە ڕێگا، وە بریتیە لە شەریعەت و مەنهەج و ڕێچکە) .

١٩٥ - **عبدالله بن عمر** رضـــي الله عنه ئەفەرموویت : (گەشـــتم کرد لەگەڵ رسـول الله ﷺ و لەگەڵ عمر رضي الله عنه، نەمبینی لە دوو ڕکعات زیاتر بکەن، ئێمە گومڕابووین، جا الله هیدایەتی داین، هەربۆیە ئێمەش شوێنی ئەو ئەکەوین).

**: إبن عمر رضي الله عنهما مەبەستی ئەوەیە کە پێش ئیسلام گومڕا بوون، وە الله تعالی هیدایەتی داون بە پێغەمبەر ﷺ، وە کردوویەتی بە هۆکارێک بۆ دەرهێنانیان لەو جاهیلیەتە، هەربۆیە شوێن رسول الله ﷺ ئەکەوین .**

١٩٦ - **رسـول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (کۆمەڵەیەکتان تێدا ئەبێت دینداری ئەکەن هەتا خەڵکی پێیان سـەرسـام ئەبن، وە خۆیان بە خۆیان سـەرسـام ئەبن، وەک چۆن تیر لە نیشانە دەرئەچێت ئاوا لە دین دەرئەچن) .

١٩٧ - **جابر بن عبدالله** رضـــي الله عنهما ئەڵێت : رسـول الله ﷺ لە کاتی وتاردانی بەپێوە ئەوەستا و سوپاس و ستایشی الله ی ئەکرد و پیایدا هەڵدەدا بەوەی کە شـایەنیەتی، پاشـان ئەیفەرموو : (ئەوەی الله هیدایەتی بدات گومڕاکەری نییە، وە ئەوەی گومڕای بکات ڕێنمونیکەری نییە، ڕاسـتترین وتە کتێبی الله ـــیە، وە باشترین ڕێنمونیش ڕێنمونی محمد ـە، وە خراپترینی بابەتەکان داهێنراوەکانیەتی، وە هەموو داهێنراوێـک بیـدعەیە، وە هەموو بیـدعەیەک گومڕاییە، وە هەموو گومڕاییەک لە ئاگردایە) .

١٩٨ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (باشترین وتە کتێبی الله ـــیە، وە باشـترین ڕێباز ڕێبازی محمد ـــە ﷺ، وە خراپترینی بابەتەکان داهێنراوەکانن، وە ئەوەی کە پەیمانتان پێ دراوە دێت و ئێوەش ناتوانن ڕێگری لێ بکەن) .

- نصر المقدسي الشافعي له (مختصر الحجة) ـدا ئەڵێت : (ئەمە ڕێنمونی هەموو موســـوڵمانێکی عاقڵ ئەکات بۆ ئەوەی کە موخالەفەی ئەوەی کردووە کە رســـول الله ﷺ و هاوەڵانی رضـــي الله عنهم ـــــی لەســـەر بووە ئەوە گومڕاییەکی ڕەتکراوەیە، وە بیدعەیەکی قەدەغەیە .

وە ئەم بابەتە قورس و ناڕوون و، بۆچوونە گومڕاکەرانە لەو کاتەدا نەبوون، وە نە پێغەمبەر ﷺ و نە هاوەڵان قســـەیان تیادا نەکردووە، لەبەر ئەوەی ئەگەر قســـەیان تیادا بکردایە ئەوە بۆمان ئەگوازرایەوە لێیانەوە وەک چۆن جگە لەوە گواســـتراوەتەوە، جا لەبەر ئەوەی نەگواستراوەتەوە مانای وایە بنچینە نییە بۆ هیچ شتێک لەوانە، بەڵکو ئەوە لەوانەیە کە شەیتان خستوویەتیە ناو دڵی خۆشەویستانی خۆی، بۆ ئەوەی سەر لە موسوڵمانان تێکبدات، هەربۆیە قسەکردن تیایدا ڕێگەپێدراو نیە، جا هەرکەسێک قسەی تیادا کرد ئەوە شـــوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووە، گومڕایەکی گومڕاکەرە، دەرچووە لەوەی کە بۆیان دانراوە، جیایە لەو ڕێچکەیەی ئەوان لەســـەرین، وە ئەوان بەڵگەن لەســـەری، چونکە ئەوانە بەڵگەی الله عز وجل ـن لەسەر دروستکراوەکانی، وە دڵسۆزیەکانی ئەون بەرامبەر ئەهلی دینەکەی، جا ئەوەی قســـەیان تیادا کردووە جگە لەوانیش ئەکرێت قســـەی تیادا بکەن، وە ئەوەی بێدەنگ بوون دەربارەی و قســـەیان نەکردووە واجبە تەرک بکرێت، وە قسەکردن تیایدا حەرامە) .

١٩٩ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ڕێبازێک و وتەیەک، وە باشترین وتە وتەی الله یە، وە باشترین ڕێباز ڕێبازی محمد ـە ﷺ) .

٢٠٠ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (باشترین دین دینی ئیســـلامە، وە باشـــترین ڕێباز ڕێبازی محمد ـــــە ﷺ، وە خراپترینی بابەتەکان داهێنراوەکانن، ئێوە ئەمڕۆ لە سەردەمێکدان کە کار و کردەوە تێیدا باشترە لە هەوا و ئارەزوو، وە ســەردەمێک بە سـەرتاندا دێت کە تێیدا هەوا و ئارەزوو باشـترە لە کار و کردەوە) .

**٢٠١ - عائشة** رضي الله عنها وتی : پیاوێک بە رسول الله ﷺ ی وت : ئەی رسول الله، من بەیانی ئەکەمەوە بە لەشگرانی و ئەشمەوێت بەڕۆژووبم، جا غوسل دەرئەکەم و ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو ئەبم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (منیش بەیانی ئەکەمەوە بە لەشگرانی، وە منیش ئەمەوێت بەڕۆژووبم، جا غوسل دەرئەکەم و ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو ئەبم) .

پیاوەکە پێی وت : تۆ وەکو ئێمە نیت، الله عز وجل لە گوناهەکانی پێشوو و دواتریشیت خۆشبووە .

رسول الله ﷺ تووڕە بوو و فەرمووی : (والله ـــی من ئومێدەوارم لەخواترسترینتان بم، وە زاناترینتان بم بەوەی کە خۆمی پێ ئەپارێزم) .

**٢٠٢ - مكحول الشامي** ئەڵێت : بلال رضي الله عنه پیاوێکی بینی دەستنوێژی ئەگرت و خوف ـەکانی لەپێی داکەند .

بلال پێی فەرموو : (سنوور مەبەزێنن الله سنووربەزێنەرانی خۆش ناوێت) .

پیاوەکە پێی وت : ئایا لە دەستنوێژگرتندا سنوور بەزاندن هەیە ئەی بلال ؟

فەرمووی : (بەڵێ، رسول الله ـــم ﷺ بینی مەسحی ئەکرد بەسەر خوف ـەکاندا).

**٢٠٣ - معاذ بن جبل** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (من ئەخەوم، پاشان هەڵئەستم قورئان ئەخوێنمەوە، وەک چۆن کاتی هەستانم هەژمار ئەکەم ئاواش کاتی خەوتنەکەم هەژمار ئەکەم) .

---

**: واتە وەک چۆن کاتێک نەخەوتووم گوێڕایەڵی الله عز وجل ئەکەم و نوێژ و عیبادەتەکانی تر ئەکەم; وە ئەم گوێڕایەڵیە بە پاداشت هەژمار ئەکەم لەلای الله تعالى.**

**بە هەمان شـێوە خەوتنەکەشـم بە عیبادەت هەژمار ئەکەم چونکە بۆ ئەوە ئەخەوم تا وزەم بەبەردا بێتەوە و بتوانم هەستمەوە گوێڕایەڵی الله عز وجل بکەم .**

**٤٠٤ - عبدالله بن مسـعود** رضـي الله عنه ئەفەرمووێت : (نێوەندگیری لە سوننەتدا باشترە لە کۆشش کردن لە بیدعەدا) .

**٤٠٥ - سالم بن عبدالله بن عمر** ئەڵێت : (إبن عمر رضي الله عنهما پیاوێکی بینی لەدوای هەڵهاتنی خۆر نوێژی ئەکرد، پیاوەکە کەسـێک بوو نوێژی زۆر ئەکرد، إبن عمر ڕێگری لێ کرد و چەند بەردێکی تێگرت، پیاوەکە پێی وت : ئایا پێت وایە الله سزام ئەدات لەبەر زۆری نوێژکردنەکانم ؟

فەرمووی : (نەخێر ، بەڵکو سزات ئەدات لەسەر پێچەوانەکردنی سوونەت)) .

---

**- لە (الفقيه والمتفقه) ــدا عبدالرحمن بن حرملة ئەڵێت : سعید بن المسیب تەماشـای پیاوێکی کرد لە پاش بانگی نوێژی بەیانی نوێژی سـوننەتی زۆری کرد، سـعید یش بەردی تێ گرت .**

**پاشـان وتی : (ئەگەر یەکێکتان نەیئەزانی ئەوە با پرسـیار بکات، لەپاش بانگەوە تەنها دوو ڕکعات نوێژی سوننەت هەیە و هیچی تر) .**

**پیاوەکە وتی : ئەی أبو محمد ئەترسـیت الله سـزام بدات بەهۆی زۆر ئەنجامدانی نوێژەوە ؟**

**وتی : (بەڵکو ئەترسم الله سزات بدات لەسەر وازهێنانت لە سوننەت) .**

**٠٦ - ڕسول الله ﷺ** ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک کار بە بیدعەیەک بکات شەیتان لێی ئەگەڕێ عیبادەت ئەنجام بدات، وە خشوع و گریان ئەکاتە بەری) .

: شــەیتان وا لە کەســی بیدعەچی ئەکات خۆی بە باش بزانێت بەهۆی ئەو عیبادەتانەی ئەنجامی ئەکات و واز لە بیدعەکەی نەهێنێت، وە بە هەمان شێوە خەڵکی دیکەیش بەباشی بزانن و شوێنی بکەون بەهۆی ئەو ڕووکەشەی هەیەتی .

- لە (الحوادث والبدع) ــدا الأوزاعي ئەڵێت : (پێم گەیشتووە هەرکەسێک کار بە بیدعەیەک بکات شــەیتان لێی ئەگەڕێ عیبادەت ئەنجام بدات، وە خشــوع و گریان ئەکاتە بەری، بۆ ئەوەی کەسی دیکەی پێ ڕاو بکات) .

- لە (طبقات الحنابلة) ــدا علي بن أبي خالد ئەڵێت : وتم بە أحمد بن حنبل رحمه الله : ئەم شێخەی لەگەڵماندایە دراوسێمە، من نەهیم لێکرد لە کەسێک، وە حەز ئەکات وتەی تۆ دەربارەی ببیستێت، حارث القصير - واتە : المحاسبي - وە پێش بیست ساڵ منت لەگەڵ ئەودا بینی، پێت وتم لەگەڵی دامەنیشە و قسەی لەگەڵ مەکە، وە منیش تا ئێستا قسەم لەگەڵ نەکردووە، بەس ئەم شێخە لەلای دائەنیشێت، جا چی ئەڵێیت دەربارەی ؟

بینیم أحمد ڕەنگی ســوور داگەڕا و دەمارەکانی ئاوڵســان، هەرگیز نەمبینیبوو وا بێت، بە تووڕەییەوە وتی : (ئا ئەوە ؟! الله ئاوا و ئاوای لێ بکات، هیچ کەســێک حاڵی نازانێت تەنها کەسێک نەبێت کە بەباشی ئەیناسێت و شارەزایەتی، ئۆی ئۆی ئۆی، ئا ئەوە هیچ کەســێک حاڵی نازانێت تەنها کەســێک نەبێت کە بەباشــی ئەیناســێت و شارەزایەتی، ئا ئەوە المغازلي و يعقوب و فڵانە کەس لەلای دانیشتن و تووشی بۆچوونی جەهمی کردن، بەهۆی ئەوەوە تیاچوون!) .

پیاوەکە پێی وت : ئەی أبو عبدالله، فەرموودە ئەگێڕێتەوە، بێدەنگ و بەخشوعە، ئاوا و ئاوایە . . .

أبو عبدالله تووڕە بوو و وتی : (خشــوع و نەرمونیانیەکەی هەڵت نەخەڵەتێنێت! هەڵمەخەڵەتێن بە ســەردانەواندنەکەی، چونکە کەســێکی خراپە، ئەوە هیچ کەســێک حاڵی نازانێت تەنها کەسێک نەبێت کە بەباشی ئەیناسێت و شارەزایەتی، قسەی لەگەڵ مەکە و هیچ ڕێزێکی نییە، جا هەرکەسێک فەرموودەی رسول الله ــی ﷺ گێڕایەوە و بیدعەچی بوو تۆ لەلای دائەنیشیت ؟! نا نەخێر، هیچ ڕێزێکی نییە) .

- البرذعي له (سؤالات البرذعي) ـــدا ئەڵێت : ئامادەبووم أبو زرعة پرسیاری لێکرا دەربارەی الحارث المحاسبي و کتێبەکانی ؟

ئەویش بە پرســیارکەرەکەی وت : (ئاگاداری ئەم کتێبانە بە، ئەمانە کتێبی بیدعە و گومڕایین، دەســت بگرە بە ئەثەرەوە، چونکە ئەوەی تێدا ئەبینیتەوە کە بێپێویســتت بکات لەم کتێبانە) .

پێی وترا : لەناو ئەم کتێبانەدا پەند و عیبرەتی تێدایە .

وتی : (هەرکەســێـک کتێبی الله پەنـد و عیبرەتی تیـا نەبێـت بۆی ئەوە لەم کتێبانەشدا پەند و عیبرەتی تێدا نییە بۆی، پێتان گەیشتووە کە مالک بن أنس و سفیان الثوري و الأوزاعي و پێشــەوا پێشــینەکان ئەم کتێبانەیان لە ڕیزی وەسـوەســەکان و ئەو جۆرە شتانە هەژمار ئەکرد .

ئەوانە موخالەفەی زانایانیان کرد و جارێک قسـەی الحارث المحاسبي ـــیان بۆ هێنـاین، جارێکیشـــیـان قســـەی عبدالرحیم الـذبیلي، وە جارێکی تر حـاتم الأصـــم و جارێکیش شقیق البلخي، خەڵکی چەندە خێرا و ئازان بۆ بیدعە!) .

- لە (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة) ـدا إبن شـوذب ئەڵێت : وتم بە کثیر بن زیاد بن أبي سهل : خووڕەوشت و سَمت ی فلانە کەس چەندە ڕێکوپێکە!

وتی : (ئەوەی کە ئەیبینیت کەم هەیە هەبێت ئیللا لە ئەهلی هەوا و ئارەزوودا نەبێت) .

رســول الله ﷺ باســی خەواریجەکانی کردووە کە هاوەڵان نوێژکردن و قورئان خوێندنی خۆیان لە ئاســت نوێژکردن و قورئان خوێندنی ئەواندا بە هیچ نازانن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەواڵی داوە کە ئەوانە سەگەکانی ئاگرن .

- الآجري له (الشــريعة) ـــــدا ئەڵێت : (زانایان لە کۆن و نوێدا ڕاجیاواز نەبوون لەوەدا کە خەواریجەکـان کۆمەڵەیەکی خراپن، ســەرپێچیکـاری الله عز وجـل و پێغەمبەرەکەین ﷺ ئەگەرچی نوێژیش بکەن و ڕۆژووش بگرن، وە ئەگەرچی کۆشـــش بکەن و هەوڵی زۆر بدەن لە عیبادەتدا، ئەوە ســـوودی نییە بۆیان، بەڵێ فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە دەرئەخەن وە لە هەمان کاتدا ئەوە ســـوودی نییە بۆیان،

چونکە ئەوان کۆمەڵەیەکن قورئان لێک ئەدەنەوە بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان، وە سەر لە موسوڵمانان تێک ئەدەن) .

- لە (الحلية) دا عامر بن عبدالله بن الزبير ئەڵێت : (چووم بۆ لای باوکم، پێی وتم : (لە کوێ بوویت ؟) .

وتم : کۆمەڵە کەسێکم بینی نەمبینیوە لەوان باشتر، یادی الله تعالى ئەکەنەوە، هی وایان تێدایە دەنگی بەرز ئەکاتەوە هەتا ئەبوورێتەوە لە ترسی الله تعالى، جا منیش لەگەڵیان دانیشتم .

باوکم وتی : (ئیتر لەگەڵیان دامەنیشە) .

بینی قسەکەی زۆر کاری تێ نەکردووم .

وتی : (رسول الله ﷺ م بینی قورئانی خوێند، وە أبو بکر و عمر م رضي الله عنهما بینی قورئانیان ئەخوێند و تووشی ئەوە نەئەبوون، ئایا پێت وایە لە أبو بکر و عمر زیاتر ئەترسن لە الله ؟) .

منیش بۆم دەرکەوت شتەکە بەوجۆرەیە، هەربۆیە وازم لێ هێنان) .

٢٠٧ - معاذة ئەڵێت : وتم بە عائشة رضي الله عنها : ئایا یەکێک لە ئێمە نوێژ ئەگێڕێتەوە ؟

فەرمووی : (ئایا تۆ حەروریت ؟ لەلای پێغەمبەر ﷺ بووین و نەمان ئەگێڕایەوە، وە فەرمانمان پێ نەکرا) .

---

: چونکە حەروریەکان کە کۆمەڵەیەکی خەواریجن پێیان وایە ئافرەت ئەبێت ئەو نوێژانەی بگێڕێتەوە کە ئەنجامیان نادات بەهۆی سووڕی مانگانەوە .

جا گەیشتن بەم ئەنجامە بەهۆی قیاسێکی خراپی خۆیانەوە، وتیان : مادەم نوێژ دووەم پایەی ئیسلامە و ڕۆژوو چوارەم پایەی ئیسلامە، وە ئافرەت ئەبێت ئەو ڕۆژووانە

بگرێتەوە کە بەهۆی عوزری شـــەرعیەوە لە ڕەمەزانـدا نەیگرتـوون; ئەولاتـرە نـوێژ بگەڕێنێتەوە چونکە نوێژ دووەم پایەی ئیسلامە و لە ڕۆژوو گەورەترە .

بەڵام ئەم قیاسە هەڵەیە و سوننەتی رسول الله ﷺ بەخیلافی ئەوە هاتووە .

- إبن سـيرين ئەڵێت : عمر بن الخطاب رضي الله عنه لە شوێنی دەست بەئاو گەیاندن هاتە دەرچوو و دواتر قورئانی خوێند .

أبو مريم پێی وت : ئایا قورئان ئەخوێنیت ئەی پێشـــەوای ئیمانداران لەکاتێکدا دەستنوێژت نییە ؟

فەرمووی : (ئایا مسيلمة فتوای بۆ داویت بەمە ؟!) .

٢٠٨ - رسـول الله ﷺ ئەفەرمووێـت : (پەیوەســـت بن بە ڕێبـازێکی مامناوەندەوە، چونکە ئەوەی ئەم دینە لەســەر خۆی قورس بکات ئەوە بەســەریدا زاڵ ئەبێت ) .

---

: مەبەســتی ئەوەیە ڕێچکە و ڕێبازێکی مامناوەند بگرنەبەر لە دینەکەتاندا بەبێ زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی، لەبەر ئەوەی هەرکەسێک ئەم دینە لەسەر خۆی زۆر قورس بکات و لەو مامناوەندێتیە دەربچێت ئەوە دینەکە بەسەریدا زاڵ ئەبێت و بەرەو هیلاکی و هەلاکەتی ئەبات و وای لێ ئەکات بەهۆی قورســی ئەو شـتانەی لەســەر خۆیی داناوە تووشی وازهێنانی یەکجاری بێت چونکە عیبادەتکردنی الله عز وجل ی لەسەر خۆی زۆر قورس کردووە .

٢٠٩ - رسـول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەم دینە بەهێزە، هەربۆیە بە نەرمی قووڵ ببنەوە تیایدا، وە وا مەکە ڕقت لە عیبادەتکردنی الله ببێتەوە ) .

---

**: واتە هەر لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی زۆر توند دەست مەکە بە عیبادەکان و ئەو بابەتانەی دیکە کە لە دیندا هەیە، بەڵکو وردە وردە بڕۆ ناوی و دانە دانە دەستیان پێ بکە، بۆ نمونە کەسی وا هەیە تازە تەوحید و سوننەت ئەناسێت یەکسەر هەموو نوێژە سوننەتەکان ئەکات و ڕۆژووی زۆر ئەگرێت و هەموو ئیتیلزاماتەکانی تر یەکسەر ئەنجام ئەدات و لەسەر خۆیی قورس ئەکات؛ بەمشێوە بەپێی کات وای لێدێت لێیان سارد ئەبێتەوە .**

**بەڵکو ئەبێت مرۆڤ تەماشای حاڵ و توانای خۆی و دەوروبەرەکەی بکات و بەشێوەیەکی مامناوەند هەر لە سەرەتاوە دەست بکات بە عیبادەت و ئیلتیزاماتەکان .**

**٢١٠ - عروة** ئەڵێت : خێزانی عثمان بن مظعون رضي الله عنهما هات بۆ ماڵەوە بۆ لای عائشة رضي الله عنها، وە جلوبەرگ و ڕووخساری ئافرەتەکە ئیهمالی پێوە دیار بوو.

عائشة لێی پرسی : ئەوە چیتە ؟

وتی : هاوسەرەکەم بە شەو شەونوێژ ئەکات و بەڕۆژیش بەڕۆژوو ئەبێت .

رسول الله ﷺ هاتە ژوورەوە و عائشة بابەتەکەی بۆ باس کرد، رسول الله ﷺ عثمان ی بینی و پێی وت : (ئەی عثمان، ڕاهیبی لەسەر ئێمە نەنووسراوە، پێشەنگی تۆ کێیە ؟

والله من لە هەمووتان زیاتر ئەترسم لە الله عز وجل، وە من لە هەمووتان زیاتر سنوورەکانی ئەپارێزم) .

---

**: خێزانی عثمان بن مظعون رضي الله عنهما لەبەر ئەوەی پیاوەکەی نایەت بەلایدا گرنگی نەداوە بەخۆی و ئەم گرنگینەدانەشی پێوە دیارە، هەربۆیە رسول الله ﷺ فەرمان بەو هاوەڵە بەڕێزە ئەکات هەم عیبادەتی خۆی ئەنجام بدات وە هەم بڕواتە لای خێزانی چونکە ئەو جۆرە مامەڵەیە ئەنجامی باش نابێت .**

٢١١ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت: (ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت لە سوننەتەکەم و وازی لێ بهێنێت ئەوە لە من نییە).

---

- لە (الحجة في بيان المحجة) ـــدا الأوزاعي ئەڵێت: (هەرکەسێک ڕوو وەربگێڕێت لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە ڕێگاکانی بەردەم هیدایەتی پچڕاوە، وە گەیشتووە بە بەڵا و فیتنەی خۆی، ئەوەش بریتیە لە سزای گەورەترین شەڕ و خراپە لە دڵدا، وە بۆچوونی هیچ کەسێک کە رسول الله ﷺ پێشی کەوتووە تیایدا تەنها شوێنکەوتنیەتی).

٢١٢ - محمد بن حبان التميمي ئەڵێت: (لەسەر ڕووی زەوی هیچ کەسێکم نەبینیوە شارەزابێت لە پیشەی سوننەتەکاندا، وە دەربڕینە صحيح ەکانی لەبەر بێت، وە کار بکات لەگەڵ هەموو ئەو دەربڕینەی کەسێکی ثقة زیادی کردووە هەتا وەک بڵێیت سوننەتەکان هەمووی لەپێشچاویەتی؛ مەگەر تەنها محمد بن إسحاق بن خزيمة نەبێت).

٢١٣ - أبو بشر القطان ئەڵێت: (دراوسێیەکی إبن خزيمة لە زانایان لە خەودا بینی لەوحەیەک وێنەی پێغەمبەری ﷺ و محمد بن إسحاق بن خزيمة ش ئەیبریقاندەوە و ڕەونەقی پێ ئەدا.

لێکدەرەوەکە وتی: ئەمە پیاوێکە سوننەتی رسول الله ﷺ ئەژیەنێتەوە)

٢١٤ - غالب القطان ئەڵێت: لە خەودا بینیم مالک بن دینار ئەیوت: (دامەنیشە لەگەڵ دوو جۆر خەڵکیدا، چونکە دانیشتن لەگەڵیان خراپکەری دڵی هەموو موسوڵمانێکە:

- خاوەن بیدعەیەک زیادەڕەوی کردبێت لە بیدعەکەیدا.

- وە خاوەن دنیایەک ئیسرافی تیادا کردبێت).

٢١٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت: (هەموو کردەوەیەک ماوەیەکی پەرۆشی و چالاکی تێدایە، وە بۆ هەموو پەرۆشـــی و چالاکیەک ســـستبوونێک هەیە، جا ئەوەی ســستبوونەوەی بەرەو ســوننەتی من بێت ئەوە ســەرفراز بووە، وە ئەوە بۆ جگە لەوە بێت ئەوە بەهیلاک چووە).

---

: رسول الله ﷺ وەسفی بارودۆخی ژیانی موسوڵمان ئەکات، هەموو کردەوەیەک ماوەیەکی هەیە موسوڵمانەکە تیایدا زۆر چالاک و بەپەرۆشە، پاش ئەو ماوەیە چالاکی و بەپەرۆشیە ماوەیەکی سستبوون بەدوایدا دێت.

جا ئەو کەسەی سستی تووشی ئەبێت ئەگەر لەکاتی سستبوونەکەشیدا لەسەر سوننەت بێت و بەردەوام بە کەمی لەو کارە چاکە ئەنجام بدات کە پێشتر ئەنجامی داوە و بە کوللی لێی دانەبڕێت ئەوە سەرفراز بووە.

بەڵام ئەو کەســەی بەتەواوی داببڕێت و یاخود تووشــی تاوان و بیدعە ببێت لەپاش چوستی و چالاکی ئەوە لەناوچووە.

- إبن القیم لە (مدارج السالکین) ــدا ئەڵێت: (یەکێک لە سەلەف ئەڵێت: الله عز وجل هیچ فەرمانێکی دەرنەکردووە ئیللا شــەیتان دوو ئامانجی هەیە تیایدا، یان کەمتەرخەمی تیاداکردنی، یاخود زیادەڕەوی کردن تیایدا، جا گرنگی نییە بەلایەوە کامیان بەدەست ئەهێنێت; زیادەڕەویەکە یان کەمتەرخەمیەکە.

وە رسول الله ﷺ بە عبدالله بن عمرو بن العاص ــی رضي الله عنهما فەرموو: (هەموو کردەوەیەک ماوەیەکی پەرۆشــی و چالاکی تێدایە، وە بۆ هەموو پەرۆشــی و چالاکیەک ســستبوونێک هەیە، جا ئەوەی ســستبوونەوەی بەرەو ســوننەتی من بێت ئەوە سەرفراز بووە، وە ئەوە بۆ جگە لەوە بێت ئەوە بەهیلاک چووە).

ئەم قســەیەی کاتێک پێ فەرموو کە فەرمانی پێ کرد بە مامناوەندێتی لە ئەنجامدانی کردەوەدا.

هەموو چاکە و باشیەک لە هەوڵدان و کۆششکردندایە بە مامناوەندی، وە لەگەڵ ئیخلاص یێکدا شوێنکەوتنی لەگەڵدا بێت .

وەک چۆن یەکێک لە هاوەڵان رضـي الله عنهم فەرموویانە : (نێوەندگیری لە رێچکە و سوننەتدا باشترە لە کۆششکردن و هەوڵدانی زۆر لە خیلافی رێچکە و سوننەتدا)، هەربۆیە هەوڵ بدەن کردەوەکانتان لەسەر مەنهەج و سوننەتی پێغەمبەرەکان بێت علیهم السلام .

سستبوون بۆ رێبواران شتێکی رێلێنەگیراوە، جا ئەو کەسەی سستبوونەکەی لە سوننەت نەیکاتە دەرەوە و تووشی حەرامێکی نەکات، ئەوە هیوا هەیە بگەرێتەوە بۆ باشتر لە پێشووتری خۆی .

عمر بن الخطاب رضـي الله عنه ئەفەرموویێت : (ئەم دڵانە روو تێکردن و روو وەرگێرانیان هەیە .

جا کاتێک رووی تێکرد ئەوە بیگرن بە سوننەتەکان .

وە کاتێک رووی وەرگێرا ناچاری بکەن بە فەرزەکان) نقلەکەی تەواو بوو .

واتە دڵ و جەستە بەهۆی کاریگەریە دەرەکی و ناوەکیەکانەوە هەندێک جار لەرووی عیبادەتەوە بەرەو چووستی و چالاکی ئەروات، وە هەندێک جار بەرەو سست بوون .

جا ئەوکاتەی دڵ رووی وەرنەگێرابوو ئەوە سوننەتەکانی پێ بکە و هەڵەکە بقۆزەرەوە.

وە ئەوکاتەی رووی وەرگێرا بیگرە بە فەرزەکان با لەوە زیاتر نەروات .

٢١٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (الله رەتی ئەکاتەوە کردەوەی بیدعەچیەک وەربگرێت هەتا واز لە بیدعەکەی نەهێنێت) .

٢١٧ - سـليمان الأحول ئەڵێت : (الله تعالی هیچکاتێک باســی هەوا و ئارەزووی لە قورئاندا نەکردووە ئیللا بە خراپە نەبێت) .

٢١٨ - سـفيان بن عيينة ئەڵێت : (پیاوێک بە مالک بن أنس ـــــی وت : لە کوێوە ئیحرام ببەستم ؟

وتی : لەو شوێنەوەی کە رسول الله ﷺ ئیحرامی بەستووە .

پیاوەکە وتی : ئەی ئەگەر لەوە زیاتر بکەم ؟

وتی : وا مەکە، ئەترسم تووشی فیتنە ببیت .

پیاوەکە وتی : جا ئەوە چ فیتنەکەی تێدایە ؟ چەند میلێکە و زیادی ئەکەم .

وتی : الله تعـالی ئەفەرمووێـت : | فَلْيَحْـذَرِ الَّـذِينَ يُخَـالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ | (النور : ٦٣) .

پیاوەکە وتی : ئەمە چ فیتنەیەکە .

وتی : جا چ فیتنەکە لەوە گەورەترە وا بزانیت تۆ زیاتر پێکاوتە لە شــتێکدا و رســول الله ﷺ کەمتەرخەمی لەبارەوە کردووە ؟ یان وا بزانیت هەڵبژاردەکەت بۆ خۆت باشترە لە هەڵبژاردەی الله عز وجل و رسول الله ﷺ بۆت ؟!) .

٢١٩ - حذيفة رضـــي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەی کۆمەڵەی قورئانخوێنان، ڕێک و ڕاست بن، بەڕاستی بە پێشکەوتنێکی دوور پێشکەوتوون، وە ئەگەر بەلای ڕاست و چەپدا بڕۆن ئەوە بە گومڕابوونێکی دوور گومڕا بوون) .

---

**: واتە ئەی ئەوانەی قورئانتان لەبەرە لەســەر ڕێگە ڕاســتەکە لامەدەن چونکە بەهۆی ئەوەی قورئانتان لەبەرە زۆر پێشــکەوتوون، وە ئەگەر لابدەن ئەوە زۆر گومڕا بوون .**

٢٢٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (لەپێش قیامەت بە شمشێر نێردراوم، وە ڕزقەکەم لەژێر ڕمەکەمەدا دانراوە، وە بچووکی و زەلیلی دانراوە بۆ ئەو کەســەی پێچەوانەی فەرمانم ئەکات، وە هەر کەســێک خۆی بچوێنێت بە قەومێک ئەوە لەوانە) .

٢٢١ - الحسن البصري ئەڵێت : (کەســی بیدعەچی تا زیاتر عیبادەت بکات زیاتر لە الله دوور ئەکەوێتەوە) .

٢٢٢ - سفيان الثوري ئەڵێت : (فەقیهەکان ئەیانوت : وتە دروست نییە ئیللا بە کردەوە نەبێت، وە وتە و کردەوە دروســت نین ئیللا بە نیەت نەبێت، وە وتە و کردەوە و نیەت دروست نین ئیللا بە موافەقەکردنی سوننەت نەبێت) .

---

- لە (الإبانة الكبرى) ـــدا الأوزاعي ئەڵێت : (ئیمان ڕاست و دروست نییە ئیللا بە وتە نەبێت، وە وتە ڕاســت و دروســت نییە ئیللا بە کردەوە نەبێت، وە ئیمان و وتە و کردەوە دروست نییە ئیللا بە نیەتێک نەبێت کە موافەقەی سوننەت بێت، وە ئەوانەی پێش ئێمە تێپەڕین ئیمان و کردەوەیان لەیەک جیا نەئەکردەوە، کردەوە لە ئیمانە، وە ئیمانیش لە کردەوەیە) .

- الشـافعي لە (الأم) ـــدا ئەڵێت : (کۆدەنگی هاوەڵان و تابیعیەکانی پاش ئەوان لەوانەی پێیان گەیشــتین ئەیانوت : ئیمان وتە و کردەوە و نیەتە، هیچ یەکێک لەو سێ دانەیە بەس نییە ئیللا لەگەڵ ئەوانەی دیکەشدا نەبێت) .

- الـآجري لە (الشــريعة) ـــــدا ئەڵێت : ((دەروازەی وتە بەوەی ئیمـان بەڕاســتخســتنەوەیە بە دڵ و، دانپێدانانە بە زمان و کارکردنە بە ئەندامەکان، ئیماندار نییە ئیللا بە کۆبوونەوەی ئەم سێ تایبەتمەندیە نەبێت تیایدا) .

بزانن ئەوەی موســوڵمـانـان لەســەرین ئەوەیە ئیمـان واجبە لەســەر هەموو دروســتکراوەکان، ئیمانیش بریتیە لە بەڕاســتخســتنەوە بە دڵ و دانپێدانان زمان و کارکردن بە ئەندامەکان .

پاشان بزانن زانین بە دڵ و بەڕاستخستنەوە بەس نییە ئیللا بەوە نەبێت ئیمانی لەگەڵدا بێت بە زمان بە وتن .

وە ناسینی بە دڵ و، وتن بە زمان بەس نییە هەتا کردەوە نەبێت بە ئەندامەکان .

جا کاتێک ئەم سێ تایبەتمەندیە تەواو بوو ئەوە ئیمانداره .

قورئان و سوننەت و وتەی زانایانی موسوڵمانان بەڵگەیە بۆ ئەوە) .

**٢٢٣ - مالك بن أنس** ئەڵێت : (رسول الله ـــم ﷺ بینی - **واتە لە خەودا** -، مستیلەکەی لابرد و کردیە پەنجەم) .

---

- لە **(الإنتقاء)** دا الدراوردي ئەڵێت : (لە خەومدا بینیم چوومە مزگەوتی رسول الله ـەوە ﷺ، گەیشتم بە رسول الله ﷺ وتاری ئەدا، مالك بن أنس هاتە ژوورەوە لە دەرگای مزگەوتەکەوە، کاتێک رسول الله ﷺ بینی وتی : (بۆ لای من بۆ لای من) .

مالک بەرەورووی ڕۆیشت هەتا لێی نزیک بوویەوە، جا مستیلەکەی لە پەنجەتوتەی لابرد و کردیە پەنجەتوتەی مالک ـەوە) .

**٢٢٤ - محمد بن مقاتل** ئەڵێت : وتم بە وکیع بن الجراح : کۆمەڵێک هەن لەلای ئێمە ئەڵێن ئیمان زیاد ناکات .

وتی : (ئەوانە مورجیئە پیسەکانن .

ئەهلی ئیمان ئەڵێن وتە دروست نییە ئیللا بە کردەوە و بەڕاستدانانی دڵ و پێکانی سوننەت نەبێت) .

---

**- له (السـنة لعبدالله) ـــدا عبدالرزاق ئەڵێت : (معمر و إبن جريج و الثوري و مالک و إبن عيينة ئەيانوت (ئيمان وتە و كردەوەيە، زياد ئەكات و كەم ئەكات) .**

**وە منيش هەر وا ئەڵێم ئيمان وتە و كردەوەيە، ئيمان زياد ئەكات و كەم ئەكات، خۆ ئەگەر موخالەفەيان بكەم ئەوە گومڕا بووم و لە هيدايەتدراوان نيم) .**

**- له (الشريعة) دا وكيع ئەڵێت : (ئەهلی سوننە ئەڵێن ئيمان وتە و كردەوەيە .**

**وە مورجيئەكان ئەڵێن : ئيمان وتەيە بەبێ كردەوە .**

**جەهميەكان ئەڵێن : ئيمان ناسينە) .**

**مورجيئەكان ئەوانەن كە كردەوەيان دەركرد لە ئيمان و، ئيمانی كەسێک بە دروست ئەزانن بەبێ ئەوەی كردەوە بكات لەكاتێكدا توانای ئەنجامدانی كاری هەيە، وە پێيان وا نييە ئيمان زياد و كەم بكات .**

**ئيمام وكيع بە (مورجيئە پيسەكان) ناوی هێنان، وە هەركەسێک ئاوای پێ بوتريت جگە لە بيدعەچيەكی گومڕا هيچی تر نييە، كەچی ئێستا شێخە گومڕاكەرە سەردەميەكانمان لێ ڕاست بووەتەوە ئەڵێت (مورجيئەكانی ئەهلی سوننە)!**

**باشە ئەگەر مورجيئەی ئەهلی سوننە هەيە ئەی بۆ خەواريج و قەدەری و ڕافيزەی ئەهلی سوننە نييە ؟**

٢٢٥ - محمد بن الفضل بن سلمة ئەڵێت : كەمجار هەبووە لەلای الفضيل بن عياض دانيشتبين و ئەم قسەيەی نەكردبێت : (الله تەنها ئەو كار و كردەوەيە قبووڵ ئەكات بە تايبەت بۆ ئەو كرابێت، وە ئەگەر لەسەر سوننەت نەبێت قبووڵی ناكات) .

---

**- له (الإخلاص والنية) ـــدا محمد بن الفضل ئەڵێت : الفضيل بن عياض دەربارەی ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ (هود : ٧) .**

وتی : (ئەوەی کە خالِص ترین و صَواب ترین بێت) .

وتم : خالص ترین و صواب ترین چییە ؟

وتی : (کردەوە ئەگەر خالص بێت و صواب نەبێت ئەوە قبووڵ ناکرێت، وە ئەگەر صواب بێت خالص نەبێت ئەوە قبووڵ ناکرێت هەتا هەم خالص و هەم صواب نەبێت .

خالص ئەوەیە تەنها بۆ الله بێت .

وە صواب ئەوەیە لەسەر سوننەتی رسول الله ﷺ بێت) .

**٢٢٦ - یوسف بن أسباط** ئەڵێت : (ئەهلی سوننە کەمترن لە کبریتی سوور) .

---

: هەربۆیە کاتێک کارێک یان گوفتارێکت لەسەر سوننەت بوو چاوەڕێ مەکە خەڵکی لێت قبووڵ بکەن، چونکە لەناو موسوڵماناندا زۆربەیان ئەهلی سوننە نین .

وە کاتێک وترا ئایا تۆ لەسەر حەقیت و ئەو هەموو خەڵکە لەسەر حەق نین زۆر بە ئاسوودەی و بێ دوودڵی بڵێ بەڵێ .

**٢٢٧ - السري** ئەڵێت : (الحسن البصري پێی ڕاگەیاندم دووعای ئەکرد ئەیوت :(ئەی پەروەردگارم، بمانکەیت بە ئیماندارێکی ڕاستەقینە، وە دینەکەمان بکە بە ئیسلامە کۆنەکە **- واتە ئەوەی سەلەف لەسەری بووە -** ) .

---

- لە (الطبقات الکبری) ـــدا الحسن البصري کاتێک لە قسەکردن تەواو بوویایە بیویستایە هەستێتەوە ئەیوت : (اللهم دڵەکانمان بەدوور بگرە شیرک و خۆبەگەورەزانین و دووڕوویی و ڕووپامایی و، شک و گومان لە دینەکەتدا .

ئەی هەڵگێڕەرەوەی دڵەکان دڵەکانمان جێگیر بکە لەسەر دینەکەت، وە ئیسلامە پتەوەکە بکە بە دینەکەمان) .

**٢٢٨ - سلیمان بن حرب** ئەڵێت : (هەرکەسێک یەک تاڵە موو لایدا لە سوننەت ئەوە حسابی بۆ مەکە ) .

---

**: ئەمە دەربارەی کەسێکە کە لایداوە لە شتێکی سوننەت، چجای بگات بەو کەسەی قورئان و سوننەت ڕەت ئەکاتەوە و موخالەفەی ئیجماعی سەلەفی ئوممەتی کردووە و وە لە کتێبەکانیدا دەعوە ئەکات بۆ کوفر و گومڕاییەکانی ؟!**

**ئێمە گەیشتووین بە نەفامانێک ئەوانە بە ئیمام ئەزانن و تانە ئەدەن لەو کەسانەی ئاگاداریان لەبارەوە ئەدات و حوکمی شەرعی دەربارەیان ڕوون ئەکاتەوە !**

**٢٢٩ - سفیان الثوري** ئەڵێم : (بینیم کە دین بریتیە لە شوێنکەوتن ) .

---

**- لە (الفقیه والمتفقه) ـدا إسحاق بن أبي إسرائیل ئەڵێت : گوێبیستی سفیان بن عیینة بووم باسی حماد بن زید ـی لەلادا کرا، پێگە و فەزڵی بە گەورە ڕاگرت و وتی : (رحمه الله، بەڕاستی شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەرەکەی بوو ﷺ .**

**سفیان الثوري ئەڵێت : (بنچینە و ئەساسی دین شوێنکەوتنە) .**

**٢٣٠ - عبدالرزاق** ئەڵێت : گوێم لێبوو پیاوێک بە الثوري وت : آل محمد ﷺ کێن ؟

وتی : (ڕاجیاوازی هەیە لەوبارەیە، هەیانە ئەڵێت : ئەهلی بەیت ــــن، وە هەیانە ئەڵێت : ئەوەی کە گوێڕایەڵی بکات و کار بە سوننەتەکەی بکات) .

٢٣١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (آل ــــی أبو فلان ئەولیای من نین، وەلی من الله و ئیمانداره چاکەکانن) .

٢٣٢ - أبا بكر بن أبي عثمان النيسابوري ئەڵێت : گوێم لێبوو کۆتا وشـه کە بـاوکم وتی بریتی بوو لە : (پێچەوانەکردنی ســوننەت لە ڕووکەشـــدا بەهۆی دووڕوویيەکەوەیە لە ناو دڵدا) .

٢٣٤ - فضيل الناجي دەربارەی ئایەتی : ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ﴾ (طه : ٨٢) .

ئەڵێت : (شوێنی سوننەت بکەوێت) .

٢٣٥ - سعيد بن جبير دەربارەی ئایەتی : ﴿ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ﴾ (طه : ٨٢) .

ئەڵێت : (پەیوەست بێت بە سوننەت ـەوە) .

٢٣٦ - الضحاك بن مزاحم دەربارەی ئایەتی : ﴿ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ﴾ (طه : ٨٢) .

ئەڵێت : (لەسەر ڕێگەی ڕاست بێت) .

٢٣٧ - طاوس ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای إبن عباس رضي الله عنهما وتی : سوپاس بۆ الله کە خستمیە سەر هەوا و ئارەزووی ئێوە .

إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : (هەوا و ئارەزوو هەمووی گومڕاییە) .

**٢٣٨ - الزهري** ئەڵێت : (دەستگرتن بە سوننەتەوە ڕزگاربوونە) .

---

**- لە (السنة لـ المروذي) ـدا عمر بن عبدالعزيز ئەڵێت : (لەبەر زیندووكردنەوەی سوننەتێك و مراندنی بیدعەیەك نەبوویایە حەزم لەوە نەئەبوو یەك ساتیش لە ژیاندا بمێنمەوە .**

**وە هیواخوازم هەركاتێك سوننەتێكم ئەژیاندەوە و بیدعەیەكم ئەمراند ئەندامێك لە ئەندامەكانم لەگەڵیدا لێ ببوایەتەوە) .**

**٢٣٩ - زيد بن أرقم** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (هەركەسێك دەست بە سوننەتەوە بگرێت و لەسەری جێگیر بێت ئەوە ڕزگاری بووە، وە هەر كەسێك زیادەڕۆیی تێدا بكات ئەوە لایداوە لێی، وە هەركەسێك پێچەوانەی بكات ئەوە لەناوچووە) .

## دەروازەی : (١٠)

## بێزراوی زۆرلەخۆکردن لە دین و کۆڵینەوە لە حەقیقەتەکان، وە واجبێتی تەسلیم بوون

**٢٤٠ - أبو هريرة** رضـــي الله عنه ئەڵێت : رســـول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (خەڵکی بە ســێ شــێوە حەشــر ئەکرێن، لەســەر پێ، بە ســواری، یان لەســەر دەموچاو) .

وتیان : ئەی باشە چۆن لەسەر دەموچاو ئەڕۆن ؟

فەرمووی : (ئەوەی کە وای لێ کردوون بڕۆن لەســەر پێیەکانیان ئەتوانێت وایان لێ بکات لەسەر دەموچاویان بڕۆن) .

---

**: لێرەدا بەلایانەوە نامۆ بوو مرۆڤەکان بەسەر دەموچاودا حەشر بکرێن، هەربۆیە ویســتان حەقیقەت و چۆنیەتی حەشــرکردن بەســەر دەموچاودا بزانن، جا رســول الله ﷺ بەو شێوەیە وەڵامی دانەوە کە الله عز وجل ویستی لە هەر شتێک بێت ئەیکات و بۆ ئەو قورس نییە، وە ئێمەش تەنها ئەوەمان لەســەرە باوەڕ بهێنین و خۆمان تەســلیم بکەین و ئەوەندە لە حەقیقەتی شــتەکان نەکۆڵینەوە بمانەوێت ئیللا بزانین شــتەکان چۆنە، چونکە ئەوە نە ئیشی ئێمەیە وە نە پێی ئەگەین .**

**مەبەستی نووسەر لە (کۆڵینەوە لە حەقیقەتەکان) هەر ئەمەیە .**

**٢٤١ - طارق بن شهاب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : یەهودیەکان بە عمر بن الخطاب یان رضي الله عنه وت : بەهەشتێک ئەوەندەی ئاسمانەکان و زەوی گەورە بێت ئەی جەهەننەم لە کوێی ئاسمانەکان و زەویدایە ؟

عمر فەرمووی : (ئەی شـــەو چی لێ دێت کاتێک ڕۆژ دادێت ؟ وە ڕۆژ چی لێ دێت کاتێک شەو دادێت ؟) .

---

**: ئەو جۆرە شتانە ئیشی ئێمە نییە، الله عز وجل خۆی چۆنی بوویت بەو شێوەیە دایناوە، ئێمە نایەین کارەکانی الله عز وجل لێکبدەینەوە بە مێشـــکە لاواز و زانیاریە کەمەکەی خۆمان، چونکە :** | وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا | **(الإسراء : ٨٥) .**

**٢٤٢ - أبو هريرة** رضـــي الله عنه ئەڵێت : رســـول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (شـــەیتان دێت بۆ لای بەندە و پێی ئەڵێت : کێ فلانە شـــت و فلانە شـــتی دروســـت کرد ؟ هەتا پێی ئەڵێ : ئەی کێ پەروەردگاری تۆی دروســـت کرد ؟، جا کە گەیشـــتە ئەوە با پەنا بگرێت بە الله لێی و واز بهێنێت .

ئەگەر پرســـیارتان لێ کرا بڵێن : الله پێش هەموو شـــتێک هەبووە، وە پاش هەموو شتێکیش هەبێت، وە بەدیهێنەری هەموو شتێکیشە) .

**٢٤٣ - أبو هريرة** رضـــي الله عنه ئەڵێت : رســـول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (بەردەوام پرســـیارتان لێ ئەکرێت، هەتا پێتان ئەوترێت : الله ئێمەی دروســـت کردووە، ئەی کێ الله تبارک و تعالى ی دروست کردووە ؟) .

أبو هريرة رضي الله عنه ئەڵێت : (ڕۆژێکیان دانیشـتبووم پیاوێکی عێراقی پێی وتم : ئەی أبو هريرة الله ئێمەی دروســـت کردووە، ئەی کێ الله تبارک وتعالى ــــی دروست کردووە ؟

منیش بە پەنجەم گوێیەکانم گرت و هاوارم کرد : الله و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان کرد، الله تاک و تەنهایە، بێنیازە، نە لە کەس بووە نە کەسی لێ ئەبێت، وە هیچ هاوشێوەیەکی نییە ) .

**٢٤٤ - عائشة** رضي الله عنها ئەڵێت : گوێبیستی أبو القاسم ﷺ بووم ئەیفەرموو : (یەکەم شت کە دینی تیادا سەراوژور ئەکرێت وەک چۆن پەرداخ سەراوژور ئەکرێت؛ سەرخۆشکەرە ) .

وتم : چۆن خۆشەویستەکەم لەکاتێکدا الله ڕوونکردنەوەی داوە دەربارەی ؟

فەرمووی : (کۆمەڵانێک کە ئوممەتەکەم ناوی ئەنێن بە جگە لە ناوەکەی خۆی، بەوە حەڵاڵی ئەکەن و ئەیخۆنەوە ) .

**٢٤٥ - الشعبي** ئەڵێت : (وتنی (نازانم) نیوە زانستە ) .

---

**- لە (تاريخ بغداد) دا يحيى بن آدم ئەڵێت : (وتەی (وتنی (نازانم) نیوە زانستە) باسکرا بۆ ئەبو حەنیفە .**

**ئەبو حەنیفە وتی : (با دوو جار بڵێ (نازانم) بۆ ئەوەی زانستەکەی کامل ببێت) !**

**یحیی ئەڵێت : (مانای وتەکەی (نازانم) نیوە زانستە)؛ واتە زانست بریتیە لە ئەزانم و نازانم، هەریەکێکیان نیوەی ئەوەی دیکەیە) نقڵکە تەواو بوو .**

**ئەبو حەنیفە وەک چۆن لە وتەی الله عز وجل و رسول الله ﷺ تێنەگەیشتووە؛ بە هەمان شێوە لە وتەی تابیعیەکانیش تێنەگەیشتووە .**

**٢٤٦ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەگەر یەکێکتان پرسیاری لێ کرا دەربارەی شتێک کە نایزانێت با بڵێت (نازانم)، چونکە ئەوە سێیەکی زانستە ) .

**٢٤٧ - منصور بن الأصفر** ئەڵێت : (لەلای إبن عمر بووم رضـي الله عنهما ، پرسیاری لێکرا دەربارەی شتێک ، فەرمووی : (نازانم) .

کاتێک پرسیارکەرەکە ڕۆیشت إبن عمر بە خۆی فەرمەە : (پرسـیار کرا لە إبن عمر دەربارەی شـتێک کە نایزانێت ، جا وتی نازانم ، إبن عمر باشـترین شـتی وت دەربارەی شتێک کە نەیئەزانی وتی نایزانم) .

**٢٤٨ - عجلان** ئەڵێت : (ئەگەر زانا (نـازانم) فەرامۆش بکات ئەوە عەقڵی پێکراوە) .

**٢٤٩ - مالک بن أنس** ئەڵێت : پرسیار کرا لە القاسم دەربارەی شتێک ، وتی : (مرۆڤ ڕێز لە خۆی ئەگرێت کاتێک تەنها ئەوە ئەڵێت کە ئەیزانێت) .

**٢٥٠ - الشافعي** ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە لە خەڵکیدا ئامرازی زانستی تێدابێت ئەوەندەی لە إبن عیینة دا هەیە ، وە هیچ کەسێکم نەبینیوە شارەزاتر بێت لە لێکدانەوەی فەرموودەدا لە ئەو ، وە هیچ کەسێکم نەبینیوە خۆی زیاتر بگرێتەوە لە فتواداان لە ئەو) .

**٢٥١ - مطرف** ئەڵێت : (عەقڵ و ژیری مرۆڤەکان بەگوێرەی ئەو سـەردەمەیە کە تێیدان) .

**٢٥٢ - سهل بن سعد** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (رسـول الله ﷺ ڕقی لە زۆر پرسیارکردن بوو ، وە عەیبداری ئەکرد) .

**٢٥٣ - علي بن الحسن بن شقيق** ئەڵێت : إبن المبارک پێی وتم : پرسیار لە الثوري کرا دەربارەی إبن عیینة ، وتی : (ئەوە تاکی ناو تاکەکانە) .

**٢٥٤ - الشــافعي** وتی : (ئەگەر مالک و إبن عیینة نەبوونایە ئەوە زانســتی حیجاز ئەفەوتا) .

---

**: حیجاز مەککە و مەدینەیە، مالک لە مەدینە بووە، وە سفیان بن عیینة ــش لە مەککە رحمهم الله تعالى .**

**٢٥٥ - عبدالله بن مسـعود** رضــي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەو کەسـەی فتوا بۆ خەڵکی ئەدات لە هەموو ئەو شــتانەدا کە پرســیاری لێ ئەکەن دەربارەی ئەوە شێتە) .

**٢٥٦ - عبدالله بن مسـعود** رضــي الله عنه ئەفەرمووێت : (هەر یەکێک لە ئێوە شتێکی زانی با بیڵێت، وە ئەوەی کە نەیزانی با بڵێت : (الله زاناترە) .

چونکە زانســتی پیاو ئەوەیە لە بەرامبەر شــتێک کە نەیزانی بڵێت : (الله زاناترە) .

وە الله بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە : | قُلْ مَآ أَسْـَٔــلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ | (صٓ : ٨٦) .

**٢٥٧ - لە أنس** ــەوە رضي الله عنه کە : پیاوێک پرسیاری لە عمر بن الخطاب رضي الله عنه کرد دەربارەی فەرمایشتی تعالى | وَفَـٰكِهَةً وَأَبًّا | (عَبَسَ : ٣١) وتی الأبّ چییە ؟

عمر فەرمووی : (ڕێگریمان لێکراوە لە قووڵبوونەوە و زۆرلەخۆکردن) .

٢٥٨ - أنس ـەوە رضي الله عنه كە گوێبیستی عمر بن الخطاب رضي الله عنه بووە فەرموویەتی : (الأبّ چییە ؟) .

پاشان فەرموویەتی : (مە !) و گۆچانەکەی فڕێداوەتە سەر زەوی .

جا فەرموویەتی : (سوێند بە الله ئەمە زۆر لەخۆکردنە، شوێن ئەوە بکەون کە لە قورئاندا بۆتان ڕوونکراوەتەوە) .

٢٥٩ - لە أنس ــــەوە رضــي الله عنه كە : (عمر بن الخطاب ئەم ئايەتەی خوێندەوە ﴿ وَفَـٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾ .

فەرمووی : (ئەوە میوەیە، ئەو شتانە ئەزانین چییە، ئەی الأبّ چییە ؟) .

پاشــان دەســتی لەســەر ســەری دانا و فەرمووی : (ئەمە زۆرلەخۆکردنە ئەی کوڕەکەی دایکی عمر، چیت لەسەرە ئەگەر نەشزانی الأبّ چییە ؟) .

٢٦٠ - رســول الله ﷺ ئەفەرمووێــت : (ئەو موســـوڵمـانەی کە لەنـاو موسـوڵماناندا خاوەنی زۆرترین تاوانە ئەوەیە کە پرسیاری کردووە دەربارەی شـتێک کە حەرام نەکراوە، پاشان حەرام کراوە بەهۆی پرسیارکردنەکەی ئەوەوە) .

---

**: واتە یەکەمجار الله عز وجل حوکمی دەربارەی ئەو شتە دانەبەزاندووە و لە ڕیزی ڕێگەپێدراوەکان بووە، دواتر ئەوەندە پرسـیار کراوە و بەدوای شـتەکاندا ڕۆیشـتوون الله عز وجل ـیش حەرامی کردووە بۆ ئەوەی فێریان بکات ئەوەندە پرسیار نەکەن دەربارەی شتە مُباح ــەکان؛ بەتایبەتی لە سەردەمێکدا کە وەحی دابەزیوە و سەردەمی تەشریعات بووە، والله أعلم .**

**٢٦١ - سعد بن أبي وقاص** رضـي الله عنه ئەفەرمووێت : (دەربارەی شـتێکی حەڵاڵ پرسیاریان ئەکرد، جا بەردەوام ئەبوون لەسـەر پرسیارکردن دەربارەی هەتا حەرام ئەکرا لەســەریان، جا کە حەرام ئەکرا لەســەریان ئەکەوتنە ناوی **- واتە حەرامەکەیان ئەنجام ئەدا -** ) .

**٢٦٢ - مسعر بن كدام** ئەڵێت : (معن كتێبێكی بۆ هێنام و سـوێندی خوارد کە عبدالرحمن ـــی باوکی بە دەستەکانی نووسیویەتی، جا ئەمەی تێدابوو : عبدالله رضـي الله عنه فەرمووی : سـوێند بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە بێجگە لەو هیچ کەســێکم نەبینیوە هێندەی رســول الله ﷺ توونـد بێت لەســەر ئەو کەســانەی کە زۆر لە خۆیان ئەکەن، وە نەمانبینی دوای ئەو هیچ کەســێک زیاتر ترسی لەسـەریان هەبێت لە أبو بکر رضـي الله عنه، وە پێم وایە عمر رضـي الله عنه لە هەموو کەسی سەرزەوی زیاتر لێیان ئەترسا ) .

---

**: مەبەسـت لە (کەسـانەی کە زۆر لە خۆیان ئەکەن) کەسـانێکە کە زۆر پرسـیار ئەکەن دەربارەی شتانێک کە ئەگەر نەشیزانن هیچ کێشەیەکیان بۆ دروست نابێت، وە بە دەرەجەی یەک ئەهلی ڕەئی و کەلام ئەم ئاثارانە ئەیانگرێتەوە .**

**٢٦٣ - العوام بن حوشب** وتی : مجاهد پێی وتم : پرسـیارم کرد لە إبن عباس رضي الله عنهما دەربارەی ئەو سەجدەیەی لە سورەتی (ص) دا هەیە .

فەرمووی : (الله باسی پێغەمبەرانی کرد، پاشـان فەرمووی ﴿ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴾ **(الأَنْعَامِ : ٩٠)** .

جا رســول الله ﷺ شــوێنیان کەوت وەک چۆن فەرمانی پێکرا، وە ئێمەش شوێنی رسول الله ﷺ کەوتین ) .

---

: بزانە رحمک الله; الله عز وجل فەرمانی بە رســـول الله ﷺ کردووە تا چاو لە پێغەمبەرانی تر بکات و شـــوێنیان بکەوێت لە چۆنیەتی دەعوەکردن و ســـەبڕگرتن و هەموو شتێکی تریاندا .

وە هـاوەڵانیش رضـــي الله عنهم شـــوێنی رســـول الله ﷺ کەوتوون لە هەموو شـــتێکیدا، وەکو عەقیدە و تەوحید و شـــێوازی ئەنجامدانی عیبادەت و ناســـینی الله عز وجل و هەموو بابەتەکانی تر .

هەر بۆیە ئێمەش ئەبێت چاو لە هاوەڵان و تابیعیەکان و ســـەلەف بە گشـــتی بکەین تا بزانین ئەوان چۆن الله عز وجل و پێغەمبەر ﷺ ـــــیان ناســـیوە ئێمەش ئاوا بیناسین .

٢٦٤ - إبن عباس رضـي الله عنهما فەرمووی : (داود عليه السـلام لەوانە بوو کە فەرمان کرا بە پێغەمبەرەکەتان شوێنی بکەوێت) .

٢٦٥ - عمرو بن دينار وتی : (پرســـيار کرا لە جابر بن زيد دەربارەی پیاوێک کە چوار ژنی هەیە، یەکێکیانی تەڵاق داوە، کامەیان تەڵاقدراوە ؟

فەرمووی : ئەمە الأغلوطة يە) .

---

: (الأغلوطة) واتە شتێک کە نامۆ و قورسە و سەرت لێ ئەشێوێنێت .

- لە (جامع بيان العلم وفضـــلە) ـــــدا الأوزاعي ئەڵێت : (کاتێک الله عز وجل بیەوێت بەندەکەی بێبەش بکات الأغلوطة ئەخاتە سەر زمانی) .

مەبەســـتی لە پرسـیارە ورد و نارِوونەکانە کە زۆربەی جار پێویســـت نین لە دیندا، وە ئەکرێت هەرگیز ڕوونەدەن .

بۆ نموونە کەســـێک بڵێت ئەگەر گوێدرێژێک و مانگایەک جووت ببن; بێچوویان ببێت نیوە گوێدرێژ و نیوە مانگا بێت ئایا خواردنی گۆشتەکەی حەڵاڵە یان نا ؟

- الآجري لە (أخلاق العلماء) ـدا ئەڵێت : (وە ئەوەی باسمان کرد لە الأغلوطات و پرســیارە ورد و نامۆکان لە ئەوانەیە کە زانا ئەبێت خۆی بگرێتەوە لە گەڕان بەدوایدا هەتا ئەوکاتەی شــتەکان ڕووئەدەن; وە ئەگەریش هەیە هەرگیز ڕوو نەدەن و ئەوانیش خۆیان سـەرقاڵ بکەن بە موجادەلە و دەمەدەمێ هەتا وایان لێبێت ئەو شـتە فەرامۆش بکەن کە لەپێشــترە بۆیـان، وە هەوڵی ئەوە بـدەن یەکتری بخەنە هەڵەوە و بەدوای پێخلیسکانی یەکتریدا بگەڕێن .

هەموو ئەمانە بێزراو و نەهیلێکراوە، ئەو کەســە ســوودمەند نابێت کە ئەیەوێت ســوودێک لە دینەکەی ببینێت ئەگەر خەریکی ئەم شــتانە بێت، وە ئەمە لە ڕێبازی پێشینی سالح نییە، بەدوای هەڵەی یەکتری، وە مەبەستیان ئەوە نەبوو یەکتری بخەنە ناو هەڵەوە، بەڵکو زانایانێکی ژیر بوون، بە دڵسۆزیەوە قسەیان لە دیندا ئەکرد، بەڕاستی الله عز وجل سوودمەندی کردبوون بە زانست) .

- لە (جامع بيان العلم وفضله) ـــدا يزيد بن أبي حبيب ئەڵێت : عبدالملك بن مروان پرسیاری لە إبن شهاب الزهري کرد .

إبن شهاب پێی وت : (ئەی پێشەوای ئیمانداران ئایا ئەو شتە ڕوویداوە ؟) .

وتی : نەخێر .

وتی : (دەی وازی لێ بهێنە، هەرکاتێـک ڕوویـدا الله عز وجـل ڕێگەچارەیەکی بۆ ئەنێرێت) .

- لە (كتاب العلم لأبي خيثمة) ــــدا مسروق ئەڵێت : پرسـیارم کرد لە أُبي بن كعب رضي الله عنه دەربارەی شتێک .

فەرمووی : (ئایا ڕوویداوە ؟) .

وتم : نەخێر .

فەرمووی : (کەواتە مۆڵەتمـان بـدە هەتـا ڕووئەدات، ئەگەر ڕوویـدا بۆچوونی خۆمانت بۆ ئەخەینەکار).

٢٦٦ - الحسن البصري ئەڵێت : (خراپترین بەندەکانی الله ئەوانەن کە بەدوای خراپترین پرسیارەکاندا ئەگەڕێن و بەندەکانی الله ی پێ کوێر ئەکەن) .

---

**: واتە پرسیارانێک ئەکەن کە پرسیارلێکراو بەرچاوڕۆشنیەکی نییە دەربارەی .**

٢٦٧ - أبو خالد ئەگێڕێتەوە لە مامی ئەڵێت : (پیاوێک بۆ مامم دحیم بن مالک بن جبل ـــی نووسـی پرسـیار بکات لە ئەوەی لە کوفەیە دەربارەی پیاوێک ماڵاتەکەی ئەدات بە شوانێک، جا ئەیکات بە مەرج بەسەریەوە لە هەموو سەرێک ئەوەندە شیر و ئەوەندە خوری بداتێ .

منیش پرسیارم کرد لە علقمة .

وتی : (لە کەسێکی تر بپرسە، لە عبیدة بپرسە) .

منیش پرسیارم کرد لە عبیدة، وتی : (پرسیار لە کەسێکی تر بکە، پرسیار لە علقمة بکە) .

منیش وتم : علقمة ناردوومی بۆ لات .

وتی : (پرسیار لە مسروق بکە) .

منیش پرسیارم کرد لە مسروق و إبن أبي ليلى .

ئەوانیش وتیان : (ئەوە دروست نییە) .

وە ئەوترا : بوێرترینیان بۆ فتوادان ئەوەیە لە هەموویان کەمتر ئەزانێت) .

---

**- لە (أخلاق العلماء) ـــدا عمير بن ســـعيد ئەڵێت : پرســـیارم کرد لە علقمة دەربارەی بابەتێک .**

وتی : (برۆ بۆ لای عبيدة و پرسيار له ئەو بكه) .

چووم بۆ لای عبيدة و وتی : (برۆ بۆ لای علقمة) .

منيش وتم : علقمة ناردوومی بۆ لات .

وتی : (برۆ بۆ لای مسروق پرسياری لێ بكه) .

چووم بۆ لای مسروق پرسيارم لێ كرد .

وتی : (برۆ بۆ لای علقمة پرسياری لێ بكه) .

وتم : علقمة ناردمی بۆ لای عبيدة، وه عبيدة ش ناردمی بۆ لای تۆ .

وتی : (برۆ بۆ لای عبدالرحمن بن أبي ليلى) .

منيش چووم بۆ لای عبدالرحمن بن أبي ليلى پرسيارم لێكرد پێی ناخۆش بوو، دواتر گەڕامەوه بۆ لای علقمة و هەواڵم پێدا .

ئەويش وتی : (ئەوترا : بوێرترينيان بۆ فتوادان ئەوەيه له هەموويان كەمتر ئەزانێت).

٢٦٨ - **سعيد بن جمهان** ئەڵێت : لەگەڵ إبن عمر دا بووم رضي الله عنهما، كەسێك پێی وت : تێپەڕيم بەلای مريشكێكی مردارەوەبوودا، پێم پێدا نا، هێلكەيەكی لێ هاته دەرەوه، منيش خزمەتم كرد تا بوو به بێچوو، ئايا ئەتوانم بيخۆم ؟

فەرمووی : (تۆ خەڵكی كوێيت ؟!) .

وتی : عێراق .

فەرمووی : (الله ئاوا بكات له ئەهلی عێراق) .

- لە (الأدب المفرد) ــدا إبن أبي نعم ئەڵێت : ئامادە بووم لەلای إبن عمر رضي الله عنهما کاتێک پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی خوێنی مێشوولە .

پێی فەرموو : (خەڵکی کوێیت ؟) .

وتی : عێراق .

فەرمووی : (تەماشای ئەمە بکەن، دەربارەی خوێنی مێشوولە پرسیارم لێ ئەکات کەچی نەوەی پێغەمبەریان ﷺ کوشتووە، گوێبیستی پێغەمبەر ﷺ بووم فەرمووی : (ئەوانە - واتە حسن و حسین - دوو ڕەیحانەکەی منن لە دنیا) .

٢٦٩ - سعد بن عبادة رضي الله عنه بە رسول الله ـــی ﷺ فەرموو : ئایا ئەگەر لەگەڵ ژنەکەمدا پیاوێکم بینی - واتە لە کاتی زینادا - چاوەڕێ بکەم هەتا چوار کەس بکەم بە شایەت ؟

فەرمووی : (بەڵێ) .

٢٧٠ - عبدالله بن مسـعود رضـي الله عنه ئەفەرموویت : (ئەی خەڵکینە، ئێوە شــتی نوێ دائەهێنن و بۆتان دائەهێنرێت، جا هەر کە شـتێکی داهێنراوتان بینی پەیوەست بن بە دینی یەکەمینەکانەوە) .

٢٧١ - لە شریحـی القاضي ـــیەوە کە عمر بن الخطاب رضي الله عنه بۆی نووســی : (ئەگەر بابەتێکت هاتە پێش بڕیار بدە لەســەری بەوەی لە کتێبی الله ـــدایە، ئەگەر ئەو بابەتەی هاتە پێشت لە قورئاندا نەبوو ئەوکات بڕیار بدە بەوەی کە سوننەتی رسول الله ـیە ﷺ، جا ئەگەر ئەو بابەتەی هاتە پێشت لە کتێبی الله و سوننەتی رسول الله ـــدا ﷺ نەبوو، ئەوە بڕیار بدە بەوەی کە خەڵکی لەسەری کۆبوونەتەوە، ئەگەر ئەوەی هاتە پێشت لە کتێبی الله و سوننەتی رسول الله ـــدا ﷺ نەبوو، وە کەس قسەی تێدا نەکردبوو ئەوکات هەرکامێک لەم دووانە ویستت

بيكه، ئەگەر ويستت دەستپێشخەری بکه و ئيجتيهاد بکه به بۆچوونی خۆت، وه ئەگەر ويستت وازی لێ بهێنه، وه پێم وايه وازلێهێنانەکه باشتره بۆت).

٢٧٢ - قتيبة بن سعيد ئەڵێت : (پێم گەيشتووه که محمد بن کعب القرظي رحمه الله کاتێک لەدايک بووه پێغەمبەر ﷺ له ژياندا بووه).

٢٧٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئيختيلافتان بۆ دروست ببێت له هەر شتێکدا حوکمەکەی بۆ الله و بۆ محمد ه).

٢٧٤ - الربيع بن خثيم ئەڵێت : (تەقوای الله ـــــت هەبێت لەوەدا که ئەيزانيت، وه ئەوەی لێت ناديار بوو و نەتزانی بيگەڕێنەرەوه بۆ لای ئەوەی که ئەيزانێت).

٢٧٥ - نافع بن راشد ئەڵێت : عمر بن عبدالعزيز هەرگيز لەسەر مينبەری رسول الله ﷺ وتاری نەداوه ئيللا وتوويەتی : (ئەی خەڵکينه پەيوەست بن به قورئانەوه، فێری ببن و - خەڵکيش - فێر بکەن، چونکه هەر به قورئان فەقيهەکان بوون به فەقيه، وه زانايان بوون به زانا، وه به قورئان ئەگەيت به زانست و کۆتايی زانست هەر بۆ لای قورئانه).

٢٧٦ - عمرو بن مرة وتی : پياوێک هات بۆ لای إبن عمر رضي الله عنهما وتی : ئەوه چيته حەج و عومره ئەکەيت بەڵام جيهاد ناکەيت؟

فەرمووی : (ئيسلام پێنج پايەی هەيه : شايەتی دان به لا إله إلا الله و، نوێژ کردن و، زەکات دان و، حەج ی البيت و ڕۆژووی ڕەمەزان).

پياوەکه به دەستی ئەيژماردن و وتی : ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج ی البيت.

إبن عمر فەرمووی : (حەج ی البيت و ڕۆژووی ڕەمەزان، ئاوا بيستمان له رسول الله ﷺ).

**: واتە هاوەڵان رضي الله عنهم گرنگیان داوە فەرمووده ڕێک بەو شێوازە بخوێننەوە کە لە رسول الله ـەوە ﷺ بیستوویانە .**

**٢٧٧ - أيوب السختياني** ئەڵێت : وتم بە أبي قلابة وەسیەتێکم بۆ بکە .

وتی : (وەسیەتت بۆ ئەکەم بە سێ شت لە پاش من پارێزگاریان لێ بکە :

کتێبی الله لێکمەدەرەوە بە بۆچوونی خۆت .

وە باسی هیچ لە هاوەڵانی محمد ﷺ مەکە تەنها بە باشە نەبێت .

وە هیچ مەڵێ لە قەدەردا) .

**٢٧٨ - مجاهد** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ (الحُجُرَات : ١) .

ئەڵێت : (پێشی رسول الله ﷺ مەکەون هەتا الله عز وجل بڕیار ئەدات لەسەر زمانی) .

**٢٧٩ - القاسم بن مخيمرة** وتی : أبو موسى رضي الله عنه بۆ کوڕەکەی نووسی : (ئەی کوڕی خۆم، ئەوەی کە الله پێی داویت لە زانست مەیشارەرەوە بەوهۆیەوە لە دین پێی بچیتە دەرەوە، وە بۆی زیاد مەکە بەوهۆیەوە ببیت بە زۆرلەخۆکردوان) .

---

- لە (الفقيه والمتفقه) ـدا قتادة دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾ (آلِ عِمْرَان : ١٨٧) .

**ئەڵێت : (ئەمە پەیمانێکە الله وەریگرتووە لە زانایان، جا ئەوەی زانســـتێکی زانی ئەوە با فێر بکات، وە ئاگاداری شـاردنەوەی زانسـت بن چونکە ئەوە لەناوچوونە، وە با پیاو زۆر لە خۆی نەکات لەوەدا کە نـایزانێت بەو هۆیەوە لە دینی الله دەربچێت و لە زۆرلەخۆکەران بێت) .**

**٢٨٠ - عمر بن الخطاب** رضـــي الله عنه ئەفەرمووێت : (الله ئەو کتێبەی کە محمد ـــــی ﷺ پێ هیدایەت دا لە ناوتاندا هێڵاویەتەوە، جا دەســتی پێوە بگرن هیدایەتدراو ئەبن بەوەی کە رسول الله ی ﷺ پێ هیدایەت دراوە) .

**٢٨١ - عائشة** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (رسول الله ﷺ هیچی لە قورئان تەفسیر نەئەکرد جگە لە چەند ئایەتێک کە ئەمانژمارد کە جبریل عليه السلام فێری کردبوو) .

**٢٨٢ -** لە **هشـام بن عـروة** ـــوە لە باوکیەوە کە قسـەی نەکردووە دەربارەی هیچ شـتێک لە قورئان تەنها بەوە نەبێت کە لە عائشـة ـــی پوری گوێبیسـتی بووە و ئەویش لە رسول الله ـەوە ﷺ ئەیگێڕێتەوە) .

**٢٨٣ - أبو هريرة** رضـــي الله عنه ئەفەرمووێت : (لە کۆتایی زەماندا کۆمەڵە پێشـــەوایەکی نەزان ئەبن کە بە بۆچوونی خۆیان فتوا بۆ خەڵکی ئەدەن، جا گومڕا ئەبن و - **خەڵکی** - گومڕا ئەکەن) .

## دەروازەی : (١١)

## ترسی المصطفى ﷺ و سەلەفی ساڵح لەسەر ئەو کەسەی خۆی خەریك ئەکات بە وتەکانی ئەهلی کیتاب، وە لەسەر ئەو کەسەی خۆی تەرخان ئەکات بۆ کتێبێك لە جگە لە کتێبی الله تعالى، لەبەر ئەوەی رسول الله ﷺ ئەزانێت لەپاش ئەو چی دادێت کە کتێبی گومڕاکەرەکان لەپاش خۆی

٢٨٤ - لە أبو سعيد الخدري ـــەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرمووێت : (جگە لە قورئان مەنووسنەوە، ئەوەی جگە لە قورئانی نووسیوە با بیسڕێتەوە) .

---

: صحيح ئەوەیە ئەم وتەیە موقوف ـــە لەسەر أبو سعيد الخدري رضي الله عنه، وەکو چۆن البخاري و أبو داود باسیان کردووە .

ئەم دەروازەیەی نووسەر دایناوە دوو شت ئەگرێتەخۆ :

یەکەم : خۆسەرقاڵ نەکردن بە کتێبەکانی ئەهلی کیتاب و فەرامۆشکردنی قورئان و سوننەت .

دووەم : نەنووســینەوەی فەرموودە لە ســەردەمی خەلیفە ڕاشــیدەکان و پاش ئەوانیش بەو شــێوە زۆرەی کە لە دواتردا نووســراوەتەوە; وە پاراســتنی ســوننەت بە دەماودەم بەهۆی ترسی سەلەف لە دانانی کتێبێک لە خەڵکی بکات قورئان فەرامۆش بکەن، وە زەندیقەکانیش ئەم هەلە بقۆزنەوە تا لەڕێگەیەوە کتێب بنووســن و بیخەنە بەردەم خەڵکی .

هەردوو بابەتەکەش کە نووســـەر بەهۆکاری ئەوە ئەم ســـەرەبابەتەی داناوە و لەژێردا فەرمووده و ئاثار ئەهێنێت گەورەترین ڕەددە بۆ ئەهلی کەلام، چونکە ئەگەر نەهیکرابێت لە خوێندنەوەی کتێبی یەهودی نەسـڕانیەکان لەوکاتەدا کە بێگومان کەلامی الله عز وجل ـی تێدایە، ئەوە زۆر لەپێشترە نەهی لە ئەو بەناو زانستی الكلام ـە مەذمومە بکرێت کە سەرچاوەکەی فەلسەفەی یۆنان و هیند و فارسە .

- أبو الفتح المقدسي لە (مختصر الحجة) ـدا دەروازەیەکی نزیک لەوەی نووسەری داناوە و ئەڵێت : (دەروازەی نەهیکردن لە خوێندنەوەی کتێبەکانی ئەهلی کیتاب، وە نووسینەوەی، وە خۆسەرقاڵکردن پێوەی، وە ئەو ترسەی هەیە بەو هۆیەوە لە خراپبوونی دین، وە جیابوونەوەی مووەحیدەکان، وە واجبێتی دەستگرتن بەو شەریعەتەی الله عز وجل ڕێزداریکردووین پێی لەسەر زمانی محمد ﷺ، وە بەسبوونی ئەوە بۆمان لە غەیری کتێبەکانی تر) .

- إبن القيم لە (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية) ـــدا ئەڵێت : (بابەتی نووسین و دانانی کتێب ڕوونکردنەوە و تفصيل ی تێدایە کە ئەمە شوێنی نییە .

أحمد بۆیە حەزی لێ نەبووە لەبەر ئەو خۆســـەرقاڵکردنە پێوەی و پشـــتکردنە قورئان و ســـوننەتی تێدایە، خۆ ئەگەر کتێبەکان ناوەڕۆکیان ســـەرخســـتنی قورئان و ســـوننەت و بەرگری کردن بێت لێیان، وە بەتاڵکردنەوەی بۆچوون و مەزهەبی ئەو کەسانە بێت کە موخالەفەی قورئان و سوننەتیان کردووە؛ ئەوە کێشەی نییە .

وە ئەکرێت واجِب و مُستَحَب و مُباح بێت بەبێ بارودۆخەکە) .

**٢٨٥ - أبو نضرة** ئەڵێت : وتم بە أبو ســـعيد الخدري رضـــي الله عنه : بریا بتانوسیایەتەوە، چونکە ئێمە لەبەر - **حِفظ** - ناکەین .

فەرمووی : (بۆتان نانووســینەوە و نایکەین بە کتێب، رسـول الله ﷺ بۆی ئەگێڕاینەوە و ئێمەش لەبەرمان ئەکرد، ئێوەش لە ئێمەوە لەبەری بکەن وەک چۆن ئێمەش لە پێغەمبەرەکەتانەوە ﷺ لەبەرمان کرد) .

: بگەڕێرەوە بۆ (سُـنَن الدارِمي، مُقَدمة السـنن، باب مَنْ رَخَّصَ في كِتَابَةِ الْعِلْمِ)، بۆ ئاشنابوون بەوەی بۆچی دواتر ڕێگەدراوە بە شێوەیەکی بەرفراوان فەرمووده و زانست بنووسرێتەوە .

**٢٨٦ - الهروي** ئەڵێت : (وەک چۆن ئاماژەم پێدا سەرەتاکانی ئەم ئوممەتە بوون بە سێ چین :

چینی یەکەمیان : خەلیفەکان، وە ئەوەی ماوە لە دە مژدەپێدراوەکەی بەهەشت، وە کۆچبەرە یەکەمینەکان و گەورەکانی پشتیوانان .

چینی دووەم : ئەوانەی لەدوایان هاتن لە هاوەڵان، وە تابیعیە مخضرم ـەکان و گەورە تابیعیەکان .

چینی سێیەم : ئەوانەی پاش تابیعیەکان گەورەکان هاتن لەگەڵ زۆربەی ئەوانەی لەپاشیان هاتن لە تابیعی تابیعیەکان; فەرموودەیان نەئەنووسی، بەڵکو بە دەمی ئەیانگواستەوە و بە لەبەرکردن وەریان ئەگرت، تەنها کتێبی زەکات و وە شتی کەم نەبێت کە لێکۆڵەر دوای گەڕانێکی چڕوپڕ پێی ئەگات .

هەتا وای لێهات ترسی لەناوچوون پەیدا بوو، وە زانایان بە خێرایی وەفاتیان کرد، پێشەوای ئیمانداران عمر بن عبدالعزیز الأموي فەرمانی کرد بە أبو بکر بن محمد بن عمرو بن حزم لەوەدا کە بۆی نووسیبوو : (تەماشا بکە بزانە چی لە سوننەتە یان فەرموودەی عمرو ـە[1] بینووسە، من لە لەناوچوونی زانست و ڕۆیشتنی زانایان ئەترسم.

وە هیچ شتێک ڕێگری لێ نەکردن لە نووسینەوەی تەنها ترسی ئەوە نەبێت دەروازەیەک بکەنەوە لێیەوە بەلای گومڕاکاران لەڕێگەی کتێبەکانیانەوە بێتە ناو ئوممەتەوە، لەپێناو پاراستنی ئەوەی کە پێیان سپێردرابوو وە بۆ خۆپاراستن لەوەی کە ئاگادار کرابوونەوە دەربارەی ) .

---

: (١) نامەیەکە کە رسول الله ﷺ فەرمانی کرد بنووسرێت بۆ ئەهلی یەمەن تیایدا باسی میراتی و سوننەتەکان و خوێنبایی کرابوو، وە نامەکەی بە عمرو بن حزم دا نارد .

ئەمەش بەشێکە لە نامەکە :

مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، قِيلَ ذِي رُعَيْنٍ وَمَعَافِرَ وَهَمْدَانَ :

أَمَّا بَعْدُ :

فَقَدْ رَجَعَ رَسُولُكُمْ، وَأُعْطِيتُمْ مِنَ الْغَنَائِمِ خُمُسَ اللهِ، وَمَا كَتَبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ مِنَ الْعُشْرِ فِي الْعَقَارِ .

وَمَا سَقَتِ السَّمَاءُ أَوْ كَانَ سَيْحًا أَوْ بَعْلاً : فَفِيهِ الْعُشْرُ إِذَا بَلَغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَمَا سُقِيَ بِالرَّشَاءِ، وَالدَّالِيَةِ، فَفِيهِ نِصْفُ الْعُشْرِ إِذَا بَلَغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ . . .

واتە لە کاتێک رسول الله ﷺ لەژیاندا بووە فەرمووده نووسراوە بەڵام بەشێوەیەکی کەم، بەڵکو زیاتر پشتیان بە لەبەرکردن بەستووە، بۆ ئەوەی تەنها پشت ببەستن بە ئەوەی ڕیوایەت کراوە و خەڵکی گومڕای دیکەش فێری کتێب نووسین نەبن و لەڕێگەی کتێب نووسینەوە گومڕاییەکانیان بڵاو بکەنەوە .

- محمد بن عتیق لە (هداية الطريق) ـــدا ئەڵێت : (بزانە الله ڕێنمونیت بکات، ئەوەی کە لەسەری ئەڕۆین بریتیە لەوەی کاتێک شتێکمان پێ ئەگات لە نووسراوەکان لە تەفسیر ـــدا، یاخود شەرحی فەرموودە ئەوە ئەکۆڵینەوە لە عەقیدەی لە بابەتی العلو و ســیفەتەکـان و کردەوەکـاندا، جـا بینیمـانەوە ئەوەی کە زاڵە بەســەر هەموو موتەئەخیریەکاندا، یاخود زۆربەیان; مەزهەبی ئەشـعەریەکانە کە ئەنجامەکەی بریتیە لە نەفیکردنی العلو و تەئویلکردنی ئایەتەکـان لەم دەروازەیەدا بەو تەئویلاتـانەی کە بەمیرات ماوەتەوە لە بشر المريسي و هاوشێوەکانی لە ئەهلی بیدەع و گومڕایی، وە ئەو کەسـەی تەماشـای شـەرحەکانی البخاری و مسـلم و نزیک لەوانە بکات ئەوە ئەبینێتەوە تیایدا، وە هەرچی دەربارەی ئەوەشە کە لە نووسراوە لە بنچینە و بابەتە عەقیدەییەکاندا ئەوە بابەتەکە دیارە بۆ خاوەن ژیریەکان).

- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد في الحرف والصوت) ـدا باب ـێکی داناوە دەربـارەی ئەم بـابەتە بەنـاوی (ئاگـاداربوون لە نزیکبوونەوە لە هەموو کەســێک، وە

وەرگرتن لە هەموو کتێبێکەوە; چونکە سەرلێشێواندن و تەڵەکەبازی زۆر بووە و درۆکردن بەدەم مەزهەبەکانەوە بڵاو بووەتەوە) .

تیایدا ئەڵێت : (بزانن الله ڕەحم بە ئێمە و ئێوەش بکات سبحانه، ئەم بەشە لەپێشترینی ئەم بەشانەیە بە جێبەجێکردن لەبەر بەربڵاوی بەڵاکەی و، گوێپێنەدانی خەڵکی و ئیهمالیان تیایدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی بارودۆخی ئەهلی سەردەمەکە دژیەکە و ئەوەی کە پشتی پێ ئەبەسرێت و باوەڕی پێ ئەکرێت لەناویاندا کەمە، وە زۆر بوون لەو کەسانەی دینەکەی ئەفرۆشێت بە شتێکی کەم، یاخود بۆ خۆ خۆشەویستکردن لەلای ئەوەی بە زۆرینە ئەیبینێت، وە درۆکردن بەدەم مەزهەبەکانەوە زۆر بووە .

جا ئەوەی واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێک کە حەزی لە خۆپاراستنە نزیک نەبێتەوە لە هەموو کەسێک، وە پشت نەبەستێت بە هەموو کتێبێک، وە لغاوی خۆی نەدات بە دەستی ئەو کەسەوە کە گونجان لەگەڵی پیشان ئەدات .

چونکە نامەیەکەم بینی پیاوێک لە ئەهلی خۆراسان نووسیبووی، ناسراوە بە إبن اللبان، وە ئەوەندەی پێم گەیشتووە لەژیاندا ماوە، وە ناوی ناوە (ڕوونکردنەوەی وتەی پێشەوای تاک أبو عبدالله أحمد ابن محمد بن حنبل)، وە تیایدا باسی مەزهەبی أبو الحسن الأشعري موخالیفی أحمد ـــ ی کردووە، وە چەند نوسخەیەکی داوە بە کۆمەڵە کەسێک بەناو شارەکەدا ئەیسوڕێننەوە و ئەڵێن ئەمە هی پێشەوایەکە لە هاوەڵانی أحمد رحمه الله وتەکەی ڕوون کردووەتەوە; بۆ ئەوەی خەڵکی ئاسایی بینووسنەوە و باوەڕ بە ڕاستگۆیی گوازەرەوەکە بکەن و تووشی گومڕایی ببن .

ئەو پیاوە بەم هۆکارە لە بغداد وەدەرنرا، وە گەڕایەوە أصبهان بوو، وە یەکێکە لە هاوەڵانی أبو بكر ابن الباقلاني !

وە ئالێرە لە مەککە لێیەتی زۆربەی کاتەکەی ئیشی ڕیوایەتکردنی فەرموودەیە، وە ئەقیرێنێت گوایە ئەشعەری نییە، کەچی دواتر ئەڵێت : کەسانێکی زۆر باشم تیایاندا بینی کە خۆڵی ژێر پێیان باشترە لە کەسانێک .

وە کاتێک کەسێک بێتە شارەوە لە ئەشعەریەکان بەرەوڕووی ئەڕوات بۆ جێبەجێکردنی حەقی، وە کاتێک پیاوێک لە هاوەڵانمان دێتە شارەوە خۆیی لێ بەدوور ئەگرێت و ئاگاداری لەبارەوە ئەدات، وە هەرکاتێک باسی شێخێک لە شێخەکانی

حەنبەلیەکان بکرێت لەلایدا تانەی لێ ئەدات و ئەڵێت : أحمد خۆی بەڕێز و بەشکۆیە، بەڵام تاقیکراوەتەوە بە کەسانێک کە درۆی بەدەمەوە ئەکات .

وە ئەمەش فێڵێکە کە تەنها لە خۆی ئەوەشێتەوە .

خۆ ئەگەر ڕێگەپێدراو بێت بوترێت : هاوەڵانی أحمد درۆیان بەدەمیەوە کردووە لە ڕووکەشی مەزهەب و ئەوەی دەقی هەیە دەربارەی .

ئەوە ڕێگەپێدراویشە بوترێت : هاوەڵانی مالک و الشافعي و جگە لەوان درۆیان بەدەمیانەوە کردووە لەوەدا کە لێیانەوە نقڵیان کردووە، وە ئەمەش هیچ کەسێک نایڵێت تەنها نەزانێکی دین تەنک و کەم شەرم نەبێت .

وە لە خەڵکی هەیە خۆی وا پیشان ئەدات ڕەددی ئەشعەریەکان ئەداتەوە، کەچی ئەڵێت : من قسە ناکەم دەربارەی پیت و دەنگ .

وە ئەوەی بەمجۆرە بێت بارودۆخی یەکێک لەم دووانەیە :

یان ئەوەتا شارەزا نییە بە مەزهەبی ئەهلی ئەثەر، وە ئەیەوێت بەو ڕەددانەوەیە دەربکەوێت بۆ بەدەستهێنان سامان و خۆ خۆشەویستکردن .

یاخود هەر لە ئەشعەریەکانە و خۆی بە موخالەفەکردنیان دەرئەخات، بۆ ئەوەی وتەکەی ئەوان بخزێنێتە ناو ئەو وتەیەی خۆی ئەیڵێت، تا لێی وەربگیرێت، یاخود شتە پیس و خراپەیەکان بڕازێنێتەوە و بەباش پیشانی بدات خەڵکیش شوێنی بکەون و وا بزانن پێچەوانەی ئەشعەریەکانە، وە زۆربەی ئەوەی تێئەپەڕێ بەسەر ئەهلی سوننەدا لەم جۆرەیە .

جا ئەوەی ڕزگاربوون لەوانە و، سەلامەتی لە هەوا و ئارەزووەکان ئەوێت، ئەوە با پێوانەکەی قورئان و ئاثارەکان بێت لە هەموو ئەوەدا کە ئەیبینێت و ئەیبیستێت; ئەگەر زانا بوو ئەوە بەراوردی ئەکات پێیان، وە ئەگەر نەیتوانی ئەوە پیشانی ئەو کەسەی ئەدات کە پێشکەوتنی لەو زانستە و شوێنکەوتنی بۆ سەلەف زانراوە .

وە وتە لە هیچ کەسێک وەرناگرێت هەتا داوای لێ ئەکات بۆ بەڕاستخستنەوەی وتەکەی لە ئایەتێکی موحکەم، یان سوننەتێکی جێگیر، یاخود وتەی هاوەڵێک لە ڕێگەیەکی صحیح ـەوە .

وە با زۆر کتێبەکان دەربارەی ســوننەت بخوێنێتەوە هی ئەوانەی کە تێپەڕیون وەکو : أبو داود السجستاني و، عبدالله بن أحمد بن حنبل و، أبو بكر الأثرم و، حرب بن إسماعيل السيرجاني و، خُشَيش بن أصرم النسائي و، عروة بن مروان الرقي و عثمان بن سعيد الدارمي السجستاني .

وە با ئاگاداری نووســراوی ئەو کەســانە بێت کە بارودۆخیان دیار نییە، چونکە دوپشکیان تێدایە و لەوانەشە چارەسەر نەدۆزێتەوە بۆ ژەهرەکەی .

یەکێکە لە ســەلەف ئەڵێت : (لە منداڵیدا گوێبیســتی وتەی بیدعەچییەک بووم، هەوڵی زۆر ئەدەم دەری بکەم لە دڵ و گوێم بەتەواوی بۆم ناکرێت) .

وە إبن طاوس گوێیەکانی ئەگرت کاتێک گوێبیســتی بیدعەچییەک ببوایە و ئەیوت : (دڵ لاوازە) .

وە ئەو کەسـەی ڕوو ئەکاتە قسـەکردن لە سوننەتدا با مەبەسـتی شـوێنکەوتن و قبووڵکردنی بێت، نەوەک زاڵبوون بەسـەر دوژمنەکاندا، چونکە لەوەدا یارمەتی ئەدرێت بەسەریاندا، وە ئەگەر مەبەستی زاڵبوون بێت لەوانەیە زاڵ ببن بەسەریدا .

کەوایە با هەموو موسـوڵمانێکی لێپرسـراو ئاگاداری چوونە ناو ئەو شـتانە بێت کە ئینکاری لە غەیری خۆی ئەکات لە چوونە ناوی، وە با هەوڵی زۆر بدات بۆ شـوێنکەوتنی ســوننەت و، دوورەپەرێزی لە داهێنراوەکان وەک چۆن فەرمانی پێ کراوە، وە با بزانێت ئەگەر الله ســبحانە بیویســتایە دین بداتە دەســتی خەڵکی و فەرمانی پێ بکردنایە بە هەوڵدان و کۆشــشــکردن تیایدا بە بۆچوونی خۆیان ئەوە ئەیکرد، بەڵام ڕێگری کردووە لەوە، وە فەرمـانی پێ کردوون و نەهی لێ کردوون، پـاشــــانی مولزەمی کردوون بە کۆششـکردن لە جێبەجێکردنی ئەوەی فەرمانیان پێکراوە، وە دوورکەوتنەوە لەوەی کە نەهیان لێ کراوە) .

**٢٨٧ - إبن أبي نملة الأنصـاري** ئەڵێت کە أبو نملة هەواڵی پێداوە کاتێک لەلای رســول الله ﷺ دانیشــتووە پیاوێکی یەهودی هات بۆ لای، جەنازەیەک بەلایاندا تێپەڕی و یەهودیەکە وتی : ئەی محمد، ئایا ئەو جەنازەیە قسە ئەکات ؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله زاناترە ) .

یەهودیەکە وتی : قسە ئەکات .

رســـول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوەی ئەهلی کیتاب گێڕایانەوە بەڕاســـتیان مەخەنەوە و بەدرۆشیان مەخەنەوە، وە بڵێن : ئیمانمان هێنا بە الله و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی، ئەگەر ڕاســت نەبێ ئەوە بەڕاســتان نەخســتووەتەوە، وە ئەگەر ڕاستیش بێت ئەوە بەدرۆتان نەخستووەتەوە ) .

---

**: هۆکاری هێنانی ئەم فەرموودەیە لەم دەروازەیەدا وەکو دیارە ئاگاداری دانە لە خۆخەریک کردن بە کتێبەکانی ئەهلی کیتاب و پشـــتکردنە قورئان و ســـوننەت، ئەمە مانای وا نییە لە هیچ شـــتێکدا ســـوود لە کتێبە ئاســـمانیەکانی دیکە نەبیندرێت، بەڵکو ئەبێت بگەڕێنەوە بۆ ســـەلەف تا بزانین چۆن ئەم فەرمانەی رســـول الله ـــــیان ﷺ جێبەجێ کردووە.**

**ســـەلەف ئەوەنـدەی بە پێویســـتیان زانی بێـت لێیانەوە وەریان گرتووە و ئەو ڕیوایەتـانەش بە (ئیســـرائیلیـات) نـاوبراوە، ئەوەی پێچەوانەی وتەی الله عز وجـل و پێغەمبەرەکەی ﷺ نەبێـت لەو ڕیوایەتـانە ئەوەنـدەی پێویســـتیـان بووبێـت وەریـان گرتووە.**

**- لە (المصنف لعبدالرزاق) ـدا عبدالله بن مسعود رضي الله عنە ئەفەرمووێت : (پرســـیـار مەکەن لە ئەهلی کیتاب دەربارەی هیچ شـــتێـک، چونکە ئەوان ڕێنمونیتان نـاکەن لەکـاتێکدا خۆیـان گومڕا بوون، بەوهۆیەوە ڕاســـتێـک بەدرۆ بخەنەوە یـاخود درۆیەک بەڕاست بزانن .**

**خۆ ئەگەر هەر پرســـیاریان لێ ئەکەن تەماشـــا بکەن بزانن کامەی لەگەڵ کتێبی الله ـــــدا ئەگونجێت وەری بگرن، وە ئەوەی موخالەفەی کتێبی الله ـــــی کرد وازی لێ بهێنن) .**

**٢٨٨ - أبو جُحَيفة** رضي الله عنه وتی : وتم بە علي بن أبي طالب رضي الله عنە : ئایا لە رسول الله ـوە ﷺ شتێکی دیکەتان لەلایە جگە لە قورئان ؟

وتی : (نەخێر، مەگەر پیاوێک تێگەیشتنێکی پێدرابێت، وە ئەوەی لەناو ئەم پەڕاوەدایە) .

وتم : چی لەناو ئەو پەڕاوەدایە ؟

فەرمووی : (گرتن و، بەردانی بارمتە، وە موسوڵمان بە کافر ناکوژرێتەوە) .

---

**: ئەثەرەکە دەرخەری ئەوەیە کە لەو سەردەمەشدا فەرموودەی رسول الله ﷺ نووسراوەتەوە .**

**٢٨٩ - أبو قلابة** ئەڵێت : عمر رضي الله عنه بەلای کەسێکدا رۆیشت **- واتە لە ئەهلی کیتاب -** کتێبێکی ئەخوێندەوە، ئەویش ساتێک گوێی بۆ گرت و بەباشی زانی .

پێی وت : ئایا لەو کتێبە بۆم ئەنووسیتەوە ؟

پیاوەکە وتی : بەڵێ .

عمر ـیش رضي الله عنه چەرمێکی کڕی و ئامادەی کرد و بۆی هێنا، ئەویش بۆی نووسینەوە لە پێش و پاشەکەی .

پاشان هێنای بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و خوێندیەوە بەسەریدا، پێغەمبەریش ﷺ ڕەنگی گۆڕا و دەموچاوی تێکچوو، پیاوێکی ئەنسارییەکان دای لەو چەرمەی وتەکانی لەسەر نووسرابوو، وە وتی : دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ئەی کوڕەکەی الخطاب، ئایا ڕووخساری رسول الله ﷺ نابینیت لەوکاتەوەی ئەم نووسراوەی بەسەردا ئەخوێنیتەوە ؟!

پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا فەرمووی : (من وەکو فاتح و خاتم ـــێک هاتووم، وە کۆکراوەی وتەکانم پێدراوە، وە قســـەم بۆ کورت کراوەتەوە، جا کەوابێ ئەوانە لاڕێتان نەکەن کە خەریکی گومڕایین) .

---

: (فاتح) واتە ئەوەی ئەبێتە مایەی هیدایەت و خێر .

(خاتم) واتە کۆتایی پێغەمبەران علیهم السلام .

٤٩٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەگەر موسی بۆتان دەربکەوێت ئەوە شـــوێنی ئەکەون و واز لە من ئەهێنن، ئەوکاتیش گومڕا ئەبن و لائەدەن لە ڕێگەی ڕاست، خۆ ئەگەر زیندوو بوویایە و بگەیشتایە بە پێغەمبەرایەتیەکەم ئەوە شوێنم ئەکەوت) .

٤٩١ - یحیی بن جعدة ئەڵێـت : نووســـراوێـک هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ و تەماشـای کرد، پاشـان فەرمووی : (ئەوەندە گومڕایی بەسـە بۆ خەڵکانێک پشـت بکەنە ئەوەی پێغەمبەرەکەیان هێناویەتی لەپێناو شـتێک کە پێغەمبەرێکی تر پێش پێغەمبەرەکەیان هێناویەتی، یاخود کتێبێک) .

---

چونکە :

یەکەم : شــەریعەتی پێغەمبەر محمد ﷺ لە شــەریعەتی موســی ﷺ و عیســی ﷺ و پێغەمبەرانی تر جیاوازە علیهم الســـلام، ئێمە بەوە فەرمانمان پێکراوە شـــوێن شەریعەتی پێغەمبەر محمد ﷺ بکەوین .

دووەم : لەبەر ئەوەی کتێبەکـانی ئەوان گۆڕاوە دڵنیـایی نییە ئاخۆ ئەوەی لە کتێبەکانیاندا نووسـراوە و ئەیڵێن ڕاسـتە یان نا لەو شـتانەی کە نازاندرێت ڕاستن یان نا بە بەراوردکردنیان بە قورئان و سوننەت .

**٢٩٢ - مُرة الهمداني** ئەڵێت : أبو قُرَّة الهمداني هات بۆ لای إبن مسعود رضي الله عنه و کتێبێکی پێبوو .

وتی : (ئەم کتێبەم خوێندەوە لە شام پێی سەرسام بووم) .

ئەوەش کتێبێک بوو لە کتێبی ئەهلی کیتاب .

عبدالله بن مسعود یش رضي الله عنه فەرمووی : (ئەوانەی پێش ئێوە لەناوچوون بەهۆی وازهێنانیان لە کتێبەکەی الله و شوێنکەوتنی کتێبەکانی تر) .

داوای ئاو و تەشتێکی کرد، کتێبەکەی تیادا دانا و بە دەستی سڕیەوە هەتا ڕەشی حیبرەکەم بینی لەناو ئاوەکەدا) .

---

**مرة لە (سنن الدارمي) دا ئەڵێت : (ئەگەر قورئان و سوننەتی تیادا بنووسرایەتەوە نەیئەسڕیەوە، بەڵکو کتێبی ئەهلی کیتابی تیایدا بوو) .**

**- أبو عبيد القاسم بن سلام لە (غريب الحديث) دا ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە پیاوێک لە زانا بوو دەربارەی کتێبەکانی پێشوو وتی : (ئەحبار و ڕاهیبەکان لە بەنی ئیسرائیل لە پاش موسى عليه السلام کتێبانێکیان دانا لە نێوان خۆیاندا بەو شێوەیەی خۆیان ویستیان لە غەیری کتێبی الله وە ناویان نا (المثناة)) .**

**واتە ئەوەی ویستیان حەڵاڵیان کرد تیایدا، ئەوە ئەوەی ویستیان حەرامیان کرد تیایدا بە خیلافی کتێبی الله عز وجل ەوە) .**

**٢٩٣ - أبو بكر أحمد بن محمد بن هانئ الأثرم** ئەڵێت : وتم بە أحمد بن حنبل رحمه الله : بە چ شتێک دوعا بکەم لەدوای خوێندنی شایەتومان لە تەحیاتدا ؟

وتی : (بەوەی کە لە فەرموودەدا هاتووە) .

وتم : ئەی رسول الله ﷺ نافەرموویت : (پاشان لە دوعا با ئەوە هەڵبژێرێت کە ئەیەوێت)؟

وتی : (هەڵی ئەبژێرێت لەوەی کە لە فەرموودەدا هاتووە) .

---

- إبن قدامة لە (المغني) دا ئەڵێت : (دوعاکردن بەوەی کە پێی نزیک ئەبیتەوە لە الله عز وجل; بەوەی کە لە ئاثارەکاندا نەهاتووە، وە مەبەست پێی قازانجی دنیایی نییە; ڕووکەشی وتەی الخرقي و کۆمەڵەیەک هاوەڵانمان ئەوەیە کە ڕێگەپێدراو نییە، وە وتەکەی أحمد یش ئەو مانایە هەڵئەگرێت، بەهۆی ئەو وتەیەی ئەڵێت : (دوعا ئەکات بەوەی کە هاتووە و ناسراوە) .

وە إبن المنذر لێوەی گێڕاوەتەوە کە وتوویەتی : (کێشە نییە پیاو دوعا بکات بۆ هەموو پێداویستیەکانی; لە پێداویستیەکانی دنیا و ئاخیرەتی .

ئەوەش إن شاء الله ڕاستە لەبەر ڕووکەشی فەرموودەکان .

چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموویت : (پاشان با هەڵبژێرێت لە دوعا) .

وە فەرمایشتی : (پاشان دوعا ئەکات بۆ خۆی بەوەی بۆی دێت) .

وە فەرمایشتی : (پاشان با دوعا بکات بەوەی کە ئەیەوێت) .

وە لەبەر ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دوعایان ئەکرد لە نوێژەکانیاندا بە شتانێک کە فێری نەبووبوون - واتە لە رسول الله ـوە ﷺ ئەو دوعایە فێر نەبووبوون - ، جا پێغەمبەریش ﷺ ئینکاری لێ نەکردن .

وە هەر لەبەر ئەوە کاتێک پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو : (چی ئەڵێیت لە نوێژەکەتدا؟ - واتە لە پاش تەحیات - ) .

وتی : شایەتومان ئەهێنم، دواتر داوای بەهەشت ئەکەم لە الله، وە پەنای پێ ئەگرم لە جەهەننەم .

رسول الله ﷺ بە ڕاستی زانی لە دوعاکەیدا بەبێ ئەوەی خۆی فێری کردبێت .

وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (لە سوجدەدا دوعا زۆر بکەن) .

**بۆی دیاری نەکردن دوعا بە چی بکەن، ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی ڕێگەی پێداون بۆ هەموو دوعایەک مەگەر دوعایەک نەبێت بە بەڵگە لێی دەربچێت) .**

**مەبەســتی ئەوەیە داوای قازانجی دنیایی نەکات وەک چۆن ئەوترێت : اللهم ژنێکی جوانم پێ ببەخشــە، وە جگە لەوە، ئەو وتەیانەی داناوە لە وتەی خەڵکی کە لە نوێژدا ڕێگەپێدراو نییە .**

**٢٩٤ - الأوزاعي** دەربارەی بیدعە ئەڵێت : (ئەگەر باش بووایە ئەوە سەلەفی ئێوەی لێ بێبەش نەئەکرا و بە ئێوە بدرێت، وە هیچ چاکەیەک لە ئەوان نەشــاردراوەتەوە و درابێت بە ئێوە بەهۆی فەزڵێکەوە ئێوە هەتانبێت، ئەوان هاوەڵانی رسول الله ـن ﷺ کە الله بۆی هەڵبژاردن و لە ناو ئەواندا ناردی و وەسفی کردووە بەوەی کە وەســفی کردوون، فەرموویەتی : ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾ (الفَتْح : ٢٩) .

**٢٩٥ - الحسن بن أبي الحسن** ئەڵێت : (ســوێند بە الله، الله عیبادەت لە بیدعەچیەک وەرناگرێت لە نوێژ و ڕۆژوو، وە هیچ کەســێک زیاتر لە بیدعەکەیدا ڕۆنەچووە ئیللا زیاتر لە الله تعالی دوورکەوتووەتەوە) .

---

**- إبن القيم لە (کتاب الصلاة) ـدا باسی ئەو بەڵگەیانەی کردووە کە ئەکرێت کار و کردەوە پووچەڵ ببێتەوە لە غەیری مورتەدبوونەوەشدا .**

ئەڵێت : (ئەگەر وترا چۆن کار و کردەوە پووچەڵ ئەبێتەوە لە غەیری مورتەدبوونەوەدا ؟

ئەوترێت : (بەڵێ، بەڕاستی قورئان و سوننەت و ئەوەی گواستراوەتەوە لە هاوەڵانەوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کارە خراپەکان کارە باشەکان پووچەڵ ئەکاتەوە، وەک چۆن کارە باشەکانیش کارە خراپەکان لائەبەن .

الله تعالى ئەفەرموویێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ﴾ (البَقَرَة : ٢٦٤) .

وە ئەفەرموویێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ (الحُجُرَات : ٢) .

وە عائشة رضي الله عنها بە دایکی زید بن أرقم ـی فەرموو : (هەواڵ بدەن بە زید کە جیهادەکەی بەتاڵ کردووەتەوە لەگەڕ رسول الله ـدا ﷺ مەگەر تۆبە بکات) .

وە ئیمام أحمد دەقی وتەی هەیە لەوبارەیەوە، ئەڵێت : (پێویستە بەندە لەم سەردەمەدا قەرز بکات و هاوسەرگیری بکات، بۆ ئەوەی تەماشای شتێک نەکات کە بۆی حەڵاڵ نییە، بەهۆیەوە کاروکردەوەی پووچەڵ ببێتەوە) .

- محمد بن عبدالوهاب لە (الدرر السنية) ـدا ئەڵێت : (الله سبحانە دەربارەی زانایانی ئەهلی کیتاب و عیبادەتکار و کتێبخوێنەکانیان فەرموویەتی : ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا * ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا﴾ (الكَهف : ١٠٣ - ١٠٤) .

وە ئەفەرموویێت : ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ * وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ * عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ * تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ * تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ﴾ (الغَاشِيَة : ١ - ٥) .

وە ئەم ئایەتانە تایبەت نییە بە ئەهلی کیتاب، بەڵکو هەموو ئەوەی ئیجتیهاد بکات لە زانست، یان کار و کردەوە، یاخود خوێندنەوەدا و یەک نەگرێتەوە لەگەڵ شەریعەتی محمد ـدا ﷺ ئەوە لە خاوەن دوڕاوترینی کار و کردەوەکانە لەوانەی کە الله

**تعالى باسى كردووه كه محكم ــى كتێبه العزيز ــەكەيدا ئەگەرچى ئەو كەسە زيرەک و لێهاتوو بێت، یاخود زوهد و دنیانەویســتی هەبێت، ئەو عوذره بەختیارى و ڕزگارى واجب ناكات لە سزاى الله تەنها بە شوێنكەوتنى قورئان و سوننەت نەبێت) .**

**٤٩٦ - عرباض بن سارية** رضـي الله عنه ئەڵێت : رسـول الله ﷺ ئەو ڕۆژە نوێژى بۆ كردين، پاشـان ڕووى تێكردين و ئامۆژگاريەكى بەهێزى كردين، چاوەكان پڕ فرمێسک بوون و دڵەكان پێی داخورپان .

كەســێک وتی : ئەی رســول الله وەک بڵێیت ئەمە ئامۆژگارى كەســێكى ماڵئاواييكەر بێت، دەربارەى چ شتێک ئاگاداريمان پێ ئەدەيت ؟

فەرمووی : (وەسـيەتتان بۆ ئەكەم بە تەقواى الله، وە گوێگرتن و گوێڕايەڵی، ئەگەرچى بەندەيەكى حەبەش ــيش بێت، چونكە ئەوەى لە ئێوە لەپاش من ئەژى ئيختيلافێكى زۆر ئەبينێت، هەربۆيە پەيوەســت بن بە ســوننەتەوە، وە ســوننەتى خەليفە هيدايەتدراوەكان، دەســتى پێوە بگرن و بە خرێكان قەپى پێدا بكەن، وە ئاگادارى شــتە تـازە و داهێنراوەكـان بن، چونكە هەموو تـازەيەک داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێكيش گومڕاييە) .

---

- الآجري لە **(الأربعين)** ــدا ئەڵێت : (لەم فەرموودەيەدا زانستێكى زۆر هەيە كە هەموو موسوڵمانان پێويستيانە بيزانن، وە بۆيان نيیە نەيزانن .

لەو ســوودانە : فەرمانى پێ كردوون بە گوێگرتن و گوێڕايەڵی بۆ هەموو ئەوانەى دەسەڵاتداريان بوون لە بەندەيەكى ڕەش يان جگە لە ڕەش، وە گوێڕايەڵی تەنها لە شتى باشدا ئەبێت، چونكە لە زياتر لە يەک شوێندا زانيارى پێداون دەربارەى و فەرموويەتى : (گوێڕايەڵی كردن لە شتى باشدايە) .

وە لەو ســوودانە : زانيارى پێداون دەربارەى ئەوەى ڕاجياوازيەكى زۆر ئەبێت لە نێوان خەڵكيدا، هەربۆيە فەرمانى پێ كردن بە شــوێنكەوتنى ســوننەتى خۆى ﷺ، وە ســوننەتى خەليفە ڕاشــيدە هيدايەتدراوەكان، وە هانى دان دەســتى پێوە بگرن بە

دەســتپێوەگرتنێکی توند وەک چۆن مرۆڤ بە کاکیلەکانی قەپ ئەکات بە شــتێکدا ئەیەوێت لە دەستی نەچێت .

کەواتە واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێک شوێن سوننەتەکانی رسول الله ﷺ بکەون، وە کـار و کردەوە نەکەن ئیللا بە ســوننەتەکەی ئەو نەبێـت، وە ســوننەتی خەلیفە هیدایەتدراوەکان لە پاش ئەو : أبو بكر و عمر و عثمان و علي، الله لە هەموویان ڕازی بێت .

وە بە هەمان شێوە لە وتەی هاوەڵانی دەرناچێت ڕەحمەتی الله یان لێبێت .

وە لەو ســوودانە : ئاگاداری کردوونەتەوە لە بیدعەکان، وە زانیاری پێ داون کە گومڕایین، جا هەرکەســێک کار و کردەوەیەک ئەنجام بدات، وە قســەیەک بکات موافەقەی کتێبی الله عز وجل و سوننەتی رسول الله ﷺ نەبێت، وە سوننەتی خەلیفە هیدایەتدراوەکان، وە وتەی هاوەڵانی الله لە هەموویان ڕازی بێت؛ ئەوە بیدعەیە، وە گومڕایەتیە، وە ئەدرێتەوە بە ناوچاوی ئەوەی توویەتی یان ئەنجامی داوە) .

- إبن القيم لە (إعلام الموقعين) ـــدا ئەڵێت : (ســوننەتی خەلیفەکانی لەگەڵ ســوننەتی خۆی هێنـا، وە فەرمانی کرد بە شــوێنکەوتنی وەک چۆن فەرمانی کرد بە شــوێنکەوتنی ســوننەتەکەی خۆی، وە زۆر جەختی کردەوە لە فەرمانکردن پێی هەتا فەرمانی کرد بەوەی قەپی پیادا بکرێت بە کاکیلەکان، ئەمەش ئەوە ئەگرێتەوە کە فتوایان پێ داوە و دایانناوە بۆ ئوممەت ئەگەرچی پێغەمبەرەکەشیان بە شتێک لەوەدا پێشیان نەکەوتبێت، ئەوەش ئەبێت بە سوننەتی - چونکە لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە شــوێن ســوننەتی خەلیفە هیدایەتدراوەکان بکەوین -، وە ئەوە ئەگرێتەوە کە هەموویان یان زۆربەیان یاخود هەندێکیان فتوایان پێداوە) .

٢٩٧ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (کتێبێک نازانین لە ئیسلامدا لەپاش کتێبی الله ڕاستتر بێت لە الموطأ ی مالک) .

## دەروازەی : (١٢)

## باسكردنی زانیاریدانی المصطفي ﷺ بە ئوممەتەكەی كە موتەكەلیمەكانیان تیایدا ئەبێت

٢٩٨ - أبو ذر رضي الله عنه ئەفەرموویت : (رسول الله ﷺ بەجێی هێلاین و هیچ بالندەیەک نەبوو بفڕێت لە نێوان ئاسمان و زەویدا ئیللا لەبارەیەوە زانیاریەكی پێ وتین) .

---

- أبو الفتح المقدسي لە (الحجة) دا ئەلێت : (مادەم رسول الله ﷺ زانیاری پێداوین لەبارەی ئەوەی هیچ شتێک نەماوە نزیكمان بكاتەوە ئیللا ئەو فەرمانی پێ كردووین، وە هیچ شتێک نییە لە ئاگر دوورمان بخاتەوە ئیللا ڕێگری لێ كردووین; وە بۆی ڕوون كردووینەتەوە، وە فەرمانی پێ كردووین بە هەموو ئەوەی الله عز وجل فەرمانی پێ كردووە، وە نەهی لێكردووین دەربارەی هەموو ئەوەی الله عز وجل نەهی لێ كردووە; جا ئەوەی كە لە ڕوونكردنەوە و فەرمان و نەهیەكانی نییە بیدعە و گومڕاییە، كاری پێ ناكرێت و ناوترێت و قسەی تیایدا ناكرێت چونكە لە دەرەوەی شەریعەتە، وە جیاوازە لەو دینەی الله عز وجل كە فەرمانی پێ كردووە بە پێغەمبەرەكەی ﷺ، هەربۆیە بۆ هیچ كەسێک حەلاڵ نییە خۆی تێوە بگلێنێت و قسەی پێ بكات و پشتی پێ ببەستێت) .

٢٩٩ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویت : (قیامەت هەڵناســتێت هەتا کوفر بە الله ئەکرێت بە ئاشــکرایی، ئەوەش ئەو کاتەیە قسە ئەکەن دەربارەی پەروەردگاریان) .

٣٠٠ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویت : (قیامەت نایەت هەتا جیدال و دەمەدەمێکانیان لە پەروەردگاریاندا نەبێت) .

٣٠١ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویت : (لە کۆتایی ئوممەتەکەمدا کەسانێک شتانێکتان بۆ ئەگێڕنەوە کە نە خۆتان و نە باپیرانتان نەیانبیستووە، جا ئاگاداریان بن) .

٣٠٢ - مجاهد بن جبر دەربارەی فەرمایشتی : ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾ (نُوح : ١٣) .

ئەڵێت : (گرنگیان نەئەدا بە گەورەیی پەروەردگاریان) .

---

: نووسەر بەو مەبەستە هێناویەتی کە ئەهلی کەلام گرنگی نادەن بە گەورەیی و پێگەی الله عز وجل؛ بەڵکو بە عەقڵی پوچی خۆیان یاسا و ڕێسا بۆ الله عز وجل و سیفاتەکانی دائەنێن .

٣٠٣ - رسـول الله ﷺ ئەفەرموویت : (ئەم قورئانە قورسە و قورسکراوە لەسەر ئەو کەسەی ڕقی لێیەتی، وە ئاسانکراوە بۆ ئەو کەسەی کە شوێنی ئەکەوێت، وە فەرموودەی من قورسە و قورسکراوە لەسەر ئەو کەسەی ڕقی لێیەتی، وە ئاسانکراوە بۆ ئەو کەسەی شوێنی ئەکەوێت .

هەرکەســێک فەرموودەی من ببیســتێت و لەبەری بکات و کاری پێ بکات ئەوە ڕۆژی قیامەت لەگەڵ قورئاندا دێت .

ئەو کەسەی کەمتەرخەمی بکات بەرامبەر فەرموودەی من ئەوە کەمتەرخەمی کردووە بەرامبەر قورئان، وە ئەو کەســەی کەمتەرخەمی بکات بەرامبەر قورئان دنیا و ئاخیرەتی دۆڕاندووە، فەرمان ئەکەم بە ئوممەتەکەم کە وتەی من وەربگرن، وە گوێڕایەڵیم بکەن، وە شوێن سوننەتەکەم بکەون) .

**٣٠٤ - أبي الجلاس** ئەڵێت : گوێبیستی علي بن أبي طالب بووم رضي الله عنه بە السبئي ـــی وت : سـوێند بە الله هیچ شـتێک **- بەدرۆ -** نادەمە پاڵ رسـول الله ﷺ، وە گوێبیســـتی بووم وتی : (**لە پێش قیامەتدا ســـی درۆزن هەن**)، وە تۆش یەکێکی لەوان .

**٣٠٥ - أبو البختري** ئەڵێت : حذيفة رضـــي الله عنه فەرمووی : (هاوەڵانم فێری خێر ئەبن، وە منیش فێری شەڕ ئەبم) .

وترا : چی وات لێ ئەکات ئەو کارە بکەیت ؟

فەرمووی : (ئەوە فێری شەڕ ببێت ئەوە خۆیی لێ ئەپارێزێت) .

**٣٠٦ - جابر بن سمرة** رضـــي الله عنـه ئەفەرمووێـت : (لە پێش قیـامەت چەندین درۆزن ئەبن) .

**٣٠٧ - حبيب بن أبي ثابت** ئەڵێت : کاتێک حذيفة رضـــي الله عنه کەوتە سەرەمەرگ أبو مسعود رضي الله عنه چووە لای، پێی فەرموو : ئامۆژگاریمان بکە، چونکە بەڕاستی رسول الله ﷺ قسەگەلێکی بۆ ئەگێڕایتەوە .

فەرمووی : (ئایا حەق و دڵنیاییت پێ نەگەیشتووە ؟) .

فەرمووی : بەڵێ با .

فەرمووی : (بزانە لە گومڕایی و بەرچاوتاریکیەکان بریتیە لەوە شتێک بەباش بزانیت پێشــتر بە خراپت ئەزانی ، وە شــتێک بە خراپ بزانیت پێشــتر بە باشــت ئەزانی ، وە ئاگاداری ڕەنگگۆڕین بە لە دینی الله عز وجل ـــــدا ، چونکە دینی الله یەکێکە ) .

---

**- إبن تيمية لە (الإنتصار لأهل الأثر) دا ئەڵێت : (ئەبینیت ئەهلی کەلام لە هەموو کەس زیاتر لە وتەیەکەوە ئەچن بۆ وتەیەکی دیکە ، لە شـــوێنێکدا جەخت لە وتەیەک ئەکەنەوە ، وە لە شـــوێنێکی تردا جەخت لە پێچەوانەکەی ئەکەنەوە و ئەوەی ئەیڵێت تەکفیری ئەکەن ; ئەمەش بەڵگە بۆ نەبوونی یەقین و دڵنیایی ) .**

## دەروازەی : (١٣)

## باسکردنی شتانێك لەم بابەتە لە سەردەمی رسول الله ـدا ﷺ ڕوویداوە

٣٠٨ - عبدالله بن عمر رضـــي الله عنهما وتی : بینیم عبدالله بن أبي بن سـلول بە خێرایی لە پێش پێغەمبەرەوە ﷺ ئەڕۆیشــت و پێی ئەوت : ئەی محمد ئێمە گاڵتە و گەپمان کرد .

وە پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو : | أَبِٱللَّهِ وَءَايَـــــٰتِهِۦ وَرَسُـــولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ | (التَّوْبَة : ٦٥) .

٣٠٩ - أنس بن مالک رضــــي الله عنه ئەڵێت : جارێکیان رســـول الله ﷺ هاوەڵێک لە هاوەڵانی نارد بۆ لای سـەرگەورەیەک لە سـەرگەورەی موشـریکەکان تا بانگی بکات بۆ لای الله .

موشـریکەکە بە هاوەڵەکەی وت : ئەو پەرستراوەی تۆ بانگەواز ئەکەیت بۆی چییە ؟ لە ئاڵتوونە ؟ یان زیو ؟

جا ئەمە زۆر قورس بوو لەســـەر دڵی هاوەڵەکە، هاتەوە بۆ لای رســـول الله ﷺ و وتی : ئەی رسول الله ناردووتم بۆ لای کەسێک قسەیەکم لێوە بیست ئازارم ئەدات ئەگەر بیگێڕمەوە .

رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (بگەڕێرەوە بۆ لای ) .

جا گەڕایەوە بۆ لای و ئەویش هەمان شتی پێ وتەوە .

گەڕایەوە بۆ لای رســـول الله ﷺ و وتی : ئەی رســـول الله، زیاتری نەوت لەوەی کە پێشتر پێی وتبووم .

فەرمووی : (بگەڕێرەوە بۆ لای ) .

ئەویش هەمان شتی پێوتەوە، الله تعالی لە ئاسمانەوە هەورەبروسکەیەکی بۆ موشـــریکەکە ناردەخوارەوە و لەناوی برد، وە هاوەڵەکە ئاگای لەو شـــتە نەبوو، هاوەڵەکە هاتەوە بۆ لای رسول الله ﷺ و پێی فەرموو : (الله لە پاش تۆ ئەو کەسەی لەناوبرد ) .

دواتر الله ئەمەی دابەزاند : | وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ | (الرَّعْد : ١٣) .

٣١٠ - سـعيد بن جبير ئەڵێت : (یەهوودیەکان وتیان بە پێغەمبەر ﷺ : نەسەبی خواکەت چییە ؟

جا الله تعالی ئەمەی دابەزاند : | قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ * ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ * لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ * وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ | (الإخْلَاص : ١ - ٤) .

٣١١ - عبدالله بن سلام رضي الله عنه ئەڵێت : ڕۆیشـتم بۆ لای رسـول الله ﷺ و وتم : ئەی محمد، نەسەبی پەروەردگاری خۆتمان پێ بڵێ .

بينيم ئەو قســـەيەی پێ ناخۆش بوو، بێدەنگ بوو، پاشـــان جبريل عليه السلام هات بۆ لای و وتی : | قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ * ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ * لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ * وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ | (الإخْلَاص : ١ - ٤) .

منيش وتم : أشهد أن لا إله إلا الله، وأنک رسول الله ) .

**٣١٢ - أُبَي بن كعب** رضـي الله عنه ئەفەرمووێت : موشـریکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان باسی نەسەبی خواکەتمان بۆ بکە .

جا الله عز وجل ئەمەی دابەزاند : ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ * ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾ .

فەرمووی : (الصـمد ئەوەیە کە ﴿ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴾، چونکە هیچ شـتێک نییە لەدایکبووبێت ئیللا ئەمرێت، وە هیچ شــتێک نییە بمرێت ئیللا میرات بەجێ ئەهێڵێت، وە الله تعالى نە ئەمرێت وە نە میراتی بەجێئەهێڵێت .

﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴾، هیچ هاوشـێوە و هاوتایەکی نییە، هیچ شـتێک نییە وەکو ئەو بێت) .

**٣١٣ - عبدالله بن عمر** رضـــي الله عنه ئەڵێت : لەلای رســول الله ﷺ بووین، پیاوێک هات جلەکانی زۆر ناشـــرین بوو، وە بۆنێکی زۆر ناخۆشـــی لێ ئەهات، چوویە پێشـــەوە و قاچی بەســـەر خەڵکیدا بەرزکردەوە هەتا دانیشـــت لە بەردەم رسول الله ﷺ و وتی : کێ تۆی دروست کرد ؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (الله) .

وتی : ئەی کێ ئاسمانی دروست کرد ؟

فەرمووی : (الله) .

وتی : ئەی کێ زەوی دروست کرد ؟

فەرمووی : (الله) .

وتی : ئەی کێ الله ی دروست کرد ؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (سبحان الله! سبحان الله!) .

دەســتی بە ناوچاویەوە گرت و پیاوەکە هەســتا و ڕۆیشــت، رســول الله ﷺ پێی فەرمووین : (دوای ئەو پیاوە بکەون) .

ئێمەش دوای کەوتین بەڵام نەمانبینیەوە .

رسـول الله ﷺ پێی فەرمووین : (ئەوە ئیبلیس بوو هات بۆ ئەوەی شـکتان بۆ دروست بکات لە دینەکەتاندا ) .

**٣١٤ - عبدالله بن عباس** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : کاتێک ئەمە دابەزی ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَرِدُونَ﴾ (الأنبِيَاء : ٩٨) .

موشریکەکان وتیان : ئەی خۆ عیسی و عزیر و مانگ و خۆر ئەپەرسترێن ؟!

جا الله تعالى ئەمەی دابەزاند ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُوْلَـٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾ (الأنبِيَاء : ١٠١) .

**٣١٥ - عبدالله بن مسعود** رضـي الله عنه ئەڵێت : ڕۆژێک رسـول الله ﷺ سوێندێکی خوارد، جا پیاوێک وتی : ئەم سوێندە لەپێناو ڕەزامەندی الله نەبوو!

منیش خۆم پێ نەگیرا و هاتمە لای رسول الله ﷺ و ئەوەم بۆ باس کرد، جا دەموچاو و ڕەنگی گۆڕا، ئاواتەخوازبووم ئەوڕۆژە موسوڵمان بوومایە، پاشان رسول الله ﷺ فەرمووی : (موسی بە زیاتر لەوە ئازادرا و ئارامی گرت ) .

**٣١٦ - رسول الله** ﷺ دەربارەی خەواریجەکان ئەفەرمووێت : (کۆمەڵەیەک دەرچوو لە دین دەرئەچن وەک چۆن تیر لە ئامانجەکەی دەرئەچێت، پاشـان ناگەڕێنەوە بۆی - **واتە بۆ دین** - هەتا تیرەکە ئەگەڕێتەوە بۆ شـوێنی خۆی - **واتە ناگەڕێنەوە** -، کتێبی الله ئەخوێننەوە بەڵام لە قوڕگیان ناڕواتە خوارەوە، قسـەی باش ئەکەن و کردەوەی خراپ ئەنجام ئەدەن، هەرکەسـێک پێیان گەیشـت با شەڕیان لەگەڵ بکات، جا هەر کەسێک بیانکوژێت ئەوە باشترین پاداشتی هەیە، وە هەرکەسـێک بیکوژن ئەوە باشـترین شـەهیدبوونی بۆ هەیە، ئەوانە خراپترینی دروسـتکراوەکـانن، الله لەوان بەریە، نزیکـترینی دوو کۆمەڵەکە لە حەق ئەیانکوژن).

**٣١٧ - جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما ئەڵێت : لەگەڵ رسول الله ﷺ دا بووم ساڵی الجِعرانة و زیوی ئەبەخشیەوە لە جلەکەی بلال دا، پیاوێک وتی : ئەی رسول الله دادپەروەربە !

رســول الله ﷺ فەرمووی : (مـاڵوێرانی بۆ تۆ، کەواتە کێ دادپەروەرە ؟ دۆڕاویت ئەگەر من دادپەروەر نەبم) .

عمر رضي الله عنه وتی : ڕێگەم بدە با ئەم دووڕووە بکوژم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (پەنا بە الله لەوەی خەڵکی بڵێن کە من هاوەڵانی خۆم ئەکوژم، ئەمانە و هاوڕێکانی قورئان ئەخوێننەوە و لە قوڕگیان ناڕواتەخوارەوە، دەرئەچن لە دین وەکو دەرچوونی تیر لە ئامانجەکەی) .

---

- **الآجري** لە **(الشـــريعة)** ـــــدا ئەڵێت : (زانایان لە کۆن و نوێدا ڕاجیاواز نەبوون لەوەی کە خەواریجەکـان کۆمەڵەیەکی خراپن، ســەرپێچیکـاری الله عز وجـل و پێغەمبەرەکەین ﷺ، ئەگەرچی نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن و کۆشش بکەن لە عیبادەتدا ئەوە سوودی نییە بۆیان .

فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە پیشـــان ئەدەن، وە ئەوە ســـوودی نییە بۆیان .

چونکە ئەوان قورئان لێک ئەدەنەوە بەو شـــێوەیەی کە ئەیانەوێت و ئارەزووی ئەکەن و سەر لە موسوڵمانان تێک ئەدەن .

یەکەم قۆچیان لە سەردەمی رسول الله ـــدا ﷺ دەرکەوت، ئەویش پیاوێک بوو تانەی دا لە رسول الله ﷺ کاتێک غەنیمەتی دابەش ئەکرد .

پێی وت : ئەی محمد دادپەروەر بە وات نابینم دادپەروەر بیت .

ئەویش فەرمووی : (مـاڵوێرانی بۆ تۆ! جـا کێ دادپەروەرد ئەبێـت ئەگەر من دادپەروەر نەبم ؟!) .

عمر رضي الله عنه ویستی بیکوژێت، پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد لە کوشتنی و هەواڵی دا کە : (ئەمە و کۆمەڵێک لە هاوەڵانی نوێژەکەتان بە کەم ئەزانن لەچاو نوێژەکەی ئەوان، وە ڕۆژووەکەتان بەراورد بە ڕۆژووەکەی، وە لە دین دەرئەچن) .

وە لە زیاتر لە فەرموودەیەکدا فەرمانی کردووە بە شەڕکردن لەگەڵیان، وە پێگە و فەزڵی ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە ئەیانکوژێت یان ئەیکوژن .

پاشان لە چەندین شوێنی جیاواز دەرچوون و، فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپەیان دەرخست هەتا هاتنە مەدینە و عثمان بن عفان یان رضي الله عنه کوشت، وە لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ لەوانەی کە لە مەدینە بوون هەوڵی زۆریاندا عثمان رضي الله عنه نەکوژرێت، بەڵام توانایان بەسەر ئەو کارەدا نەشکا .

پاشان لەسەر پێشەوای ئیمانداران علي بن أبي طالب دەرچوون و ڕازی نەبوون بە حوکمی، وە قسەی خۆیان بە ئاشکرا وت، وتیان (حوکم تەنها بۆ الله یە) .

علي ش رضي الله عنه فەرمووی : (ڕستەیەکی حەقە و مەبەست پێی باتڵە) .

دواتر علي رضي الله عنه شەڕی لەگەڵ کردن و الله تعالی ڕێزداری کرد بە کوشتنیان، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە دەربارەی فەزڵی ئەو کەسەی ئەیانکوژن یان ئەیکوژن، وە هاوەڵان رضي الله عنهم لەگەڵی جەنگان، ئیتر شمشێری علي رضي الله عنه لەسەر خەواریجەکان بوو بە شمشێری حەق هەتا قیامەت) .

- قتادة لە (تفسیر عبدالرزاق) دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ﴾ (آلِ عِمۡرَان : ٧) .

ئەڵێت : (خۆ ئەگەر حەروریەکان و سەبەئیەکان نەبن ئەوە نازانم کێن .

لە هاوەڵانی بەدر و حودەیبیە ئەوانەی کە لە بەیعەتی الرضوان ـــدا ئامادە بوون لە کۆچبەران و پشتیوانان و هەواڵ هەیە بۆ ئەو کەسەی پرسیار ئەکات، وە پەند هەیە بۆ ئەو کەسەی پەند وەرئەگرێت، بۆ ئەو کەسەی کە ژیرە و بەرچاوڕۆشنە .

کاتێک خەواریجەکان دەرچوون هاوەڵانی رسول الله ﷺ زۆر بوون لە مەدینە و شام و عێراق، وە هاوسەرەکانیشی لەژیاندا بوون، سوێند بە الله هیچ پیاو یان ژنێکیان تێدا دەرنەچوو حەروری بێت، وە ڕازی نەبوون بەوەی ئەوان لەسەری بوون، وە مەیلیان

**بەلایاندا نەبوو، بەڵکو ئەو عەیبداکردن و وەسـفانەیان ئەگێڕایەوە کە رسـول الله ﷺ وەسفی پێ کردبوون، وە ڕقیان لێیان بوو و بە زمانیان دژایەتیان ئەکردن، وە سوێند بە الله دەستیان توەند بوو لەسەریان کاتێک پێیان ئەگەیشتن .**

**ئەگەر خەواریجبوون حەق بوویایە ئەوە کۆئەبوونەوە، بەڵام گومڕایی و سەرلێشێواوی بوو بۆیە جیابوونەوە، وە هەر بەو شتێک لە کەسێکی دیکەوە بێت بێجگە لە الله عز وجل ئەوە ئیختیلافێکی زۆری تێدا ئەبینیتەوە، لە زووەوە ئەم کارانە ئەکەن، ئایا هیچ ڕۆژێک سەرفراز و سەرکەوتوو بوون ؟**

**سبحان الله ! چۆنە وا پاشینەکانی ئەوانە پەند وەرناگرن لە پێشینەکانیان ؟! خۆ ئەگەر ئەوان لەسەر حەق و هیدایەت بوونایە الله عز وجل سەری ئەخستن و زاڵی ئەکردن، بەڵام لەسەر باتڵ و هیچ بوون هەربۆیە الله عز وجل بەدۆی خستنەوە .**

**ئەوە دینێکی خراپە سوێند بە الله لێی دوور بکەونەوە، سوێند بە الله یەهوودیەت بیدعەیە، وە نەسرانیەت بیدعەیە، وە حەروریەت بیدعەیە، وە سەبەئیەت بیدعەیە، الله لە کتێبدا باسی نەکردوون و هیچ پێغەمبەرێکیش وەکو سوننەت دایان نەناوە) .**

**٣١٨ - أبي بكرة** رضـي الله عنه ئەڵێت : رسـول الله ﷺ چەند دینارێکی بۆهات لە شوێنێکەوە و بەخشی ، جا هەرکاتێک مشتێکی هەڵبگرتایە تەماشایەکی لای ڕاستی ئەکرد وەک بڵێیت کەسێک فەرمانی پێ بکات ، وە لەلایەوە پیاوێکی ڕەشی لێبوو سەری تاشیبوو دوو جلی سپی لەبەردا بوو، وە لە ناوچاوانیدا شوێنەواری سوجدە بەدی ئەکرا .

پیاوەکە وتی : ئەی محمد ئەمڕۆ لە دابەشکردندا دادپەروەر نەبوویت !

جا رسـول الله ﷺ تووڕە بوو و فەرمووی : (جا لە پاش من کێ دادپەروەر ئەبێت بەرامبەرتان ؟) .

وتیان : ئەی رسول الله نەیکوژین ؟

فەرمووی : (نەخێر، ئەمە و هاوڕێکانی لە دین دەرئەچن وەک چۆن تیر لە ئامانجەکەی دەرئەچێت) .

- الهروي ئەڵێت : (پاشـان ئێمە ئێسـتا بە یارمەتی و ویسـت و تەوفیقی الله بـاسـی ڕێگریکردن و ئینکـاریکردنی هەڵبژێردراوانی ئەم ئوممەتە ئەکەین بەپێی چینەکان، چین لە دوای چین لە زانایان، باسـی جێگیریان لە نەهیلێکردن و کۆڕابوونیان لە ڕقلێبوونەوە و ڕەددانەوەی ئەهلی دەمە دەمێ و خۆسـەرقاڵکەران بە الكلام و پشـتکەران لە تەسـلیمبوون بە خوودانە زۆرلەخۆکردن ئەکەین؛ پاش ئەو فەرموودەیانەی المصـطفي ﷺ کە پێشـتر باسـمان کرد و ئەو وتەیانەی سـەلەفی سـاڵح کە بەدوایدا هێنامان، چونکە الله هیچ سـەردەمێکی خاڵی نەکردووە لە کەسێک کە هەڵئەستێت بە سەرخستنی دینەکەی و بەرگریکردن لێی) .

٣١٩ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەمیشە لە ئوممەتەکەم کۆمەڵەیەک سەرکەوتوون بەسەر خەڵکیدا، هەتا ئەمری الله ـیان بەسەردا دێت و ئەوان هەر سەرکەوتوون) .

٣٢٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەمیشە کۆمەڵەیەک لە ئوممەتەکەم لەسـەر دینی الله جێگیرن، ئەو کەسـانەی سـەریان ناخەن و پشـتگیریان ناکەن و پێچەوانەیان ئەکەن زیانیان لێنادەن، هەتا ئەمری الله دێت و ئەوان سـەرکەوتوون بەسەر خەڵکیدا) .

٣٢١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەمیشە کۆمەڵەیەک لە ئوممەتەکەم شـەڕ ئەکەن و سـەرکەوتوون بە حەق هەتا ڕۆژی قیامەت، جا عیسـی بن مریم دائەبەزێت و پێشەواکەیان ئەڵێت : پێشنوێژیمان بۆ بکە .

ئەویش ئەفەرمووێت : نەخێر، ئێوە هەندێکتان پێشـەوای هەندێکی ترتانن، ڕێزلێنانی الله یە بۆ ئەم ئوممەتە) .

٣٢٢ - محمد بن إسماعيل البخاري ئەڵێت : گوێبیستی علي بن المديني بووم باسی ئەم فەرموودەیەی کرد (هەمیشە کۆمەڵەیەک لە ئوممەتەکەم سەرکەوتوون بە حەق) .

علي بن المديني وتی : (ئەوانە هاوەڵانی فەرموودەن) .

---

: ئەم وتەیە جێگیرە لە زانایانی دیکەی سـەلەف وەکو : عبدالله بن المبارک و، يزيد بن هارون و، أحمد بن حنبل و، البخاري و أحمد بن السـنان و جگە لەوان کە الخطيب لێوەی هێناون لە کتێبی (شرف أصحاب الحديث) دا .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـدا ئەڵێت : (ئێمە مەبەسـتمان لە (ئەهلی فەرموودە) کورتناکەینەوە لە بیسـتن یان نووسـین یاخود ڕیوایەت کردنیدا، بەڵکو مەبەستمان بە (ئەهلی فەرموودە) هەر کەسێکە شایەن بێت بە لەبەرکردن و پاراستن و شـارەزابوون و تێگەیشـتن لێی لە ڕووکەش و ناوەڕۆکدا، وە شـوێنی بکەوێت لە ناخ و ڕووکەشدا) .

- الحاكم النيسابوري لە (معرفة علوم الحديث) ـدا ئەڵێت : (بەڕاستی أحمد بن حنبل باشی وتووە لە تەفسیری ئەم وتەیەدا کۆمەڵەی سەرخراو کە شکست لەسەریان هەڵئەگیرێت هەتا هەسـتانی قیامەت هاوەڵانی فەرموودەن، جا کێ شـایەنی ئەم لێکدانەوەیەیە جگە کە کۆمەڵەیەک نەبێت کە شـوێن ڕێبازی پیاوچاکان کەوتوون و، دەسـتیان گرتووە بە ئاثارەکانی سـەلەفی تێپەڕیو و، لوتی بیدعەچی و موخالیفەکانیان شکاندووە بە سوننەتی رسول الله ﷺ) .

- محمد بن علي الطائي لە (الأربعين) ـدا ئەڵێت : (نقڵکراوە لە زۆرێک لە زانایانی ئوممەت و زانا دیارەکان وەکو : عبدالله بن المبارک و، أحمد بن حنبل و، يزيد بن هـارون و، إبراهيم بن الحسـين ديزيل الهمذاني مەبەسـت لە ئەو کۆمەڵەیەی باسکراون لە فەرموودەدا : هاوەڵانی فەرموودە و ئەهلی ئاثارەکانن .

ئەوانەی کە لەسەر دینە بەهێزەکەن و شوێن ڕێگا ڕاستەکە کەوتوون .

جا ئەوانە دەستیان گرتووە بە مەنهەجە ڕاستەکەوە و، ڕێگاکەیان گرتووەتەبەر، ئاڵاکانیان توند کردووە و حوکمەکانیان بڵاو کردووەتەوە و لەپێناو الله ـــدا لە لۆمەی لۆمەکار نەترساون .

وە ئەوەی کە بە عەقڵ پێی ئەگەیرێت کردوویانە بە شـوێنکەوتەی ئەوەی نقڵ کراوە لە حەڵاڵ و حەرام و شەرائیع و حوکمەکاندا) .

**٣٢٣** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەم زانستە لە هەر پاشینێک کەسە عەدلەکانیان هەڵیئەگرن، لادانی زیادەڕەوەکان و خۆدانەپاڵی درۆزنەکان و لێکدانەوەی نەزانەکانی لێ دوور ئەخەنەوە) .

- **الهروي** ئەڵێت : (جا ئێستا وتەی فەقیهەکان و باشترینەکان لە چینەکانی زانایان ئەهێنین لە ڕوونکردنەوە و دەرخستنی ئەم کۆمەڵە لادەر و دەستبەردەرە لە حەق، بەکوێرایی چاوی ئەو نەزانانەی کە تانە ئەدەن لە ئەهلی سوننە لە ڕەخنەگرتنیان لە گومڕاکان، وە ئەیاندەنە پاڵ غەیبەتکردن) .

---

- إبن المبرد لە **(جمع الجيوش والدساكر على إبن العساكر)** ـدا ئەڵێت : (ئەوەی باسکراوە لە نەهیکردنی پێغەمبەر ﷺ لە غەیبەت کردن، جا باسکردنی وتەی بیدعەچیەکی دیاریکراو و دەرخستنی بیدعەکەی و ڕوونکردنەوەی درۆیەکەی لە غەیبەتکردن نییە بەڵکو لە دینە) .

- أبو حفص عمرو بن علي الفلاس لە **(كتاب فى علل الحديث)** ـدا ئەڵێت : (عفان بۆی گێڕاینەوە وتی : لەلای إسماعیل بن علیة بووم، پیاوێک شتێکی گێڕایەوە لە پیاوێکی ترەوە، منیش وتم : (لەوەوە مەگێڕەرەوە، چونکە جێگیر نییە) .

پیاوەکە وتی : غەیبەتت کرد .

إسماعیل وتی : غەیبەتی نەکردووە، بەڵکو حوکمی داوە بەوەی جێگیر نییە) .

٣٢٤ - مكي بن إبراهيم ئەڵێت : شـــعبة ئەهات بۆ لای عمران بن حدير و ئەيوت : (وەرە با لەپێناو الله ساتێک غەيبەت بکەين) .

---

: واتە باسی بيدعەچی و فاجرەکان، ياخود ڕاوی فەرمووده‌کان بکەين .

٣٢٥ - محمد بن بشار ئەڵێت : (کەسی بيدعەچی غەيبەتی نييە) .

---

: واتە کاتێک باسی بيدعەی بيدعەچيەک يان خراپی کەسێکی خراپەکار ئەکەيت ئەو غەيبەتەت نەکردووە کە لە شەرعدا نەهی لێ کراوە .

٣٢٦ - أبو زرعة الدمشقي ئەڵێت : (گوێبيستی أبو مسهر بووم پرسياری لێ ئەکرا دەربارەی پياوێک کە هەڵە ئەکات - واتە لە گێڕانەوەی فەرمووده‌دا - وە تووشی وەهم و بەهەڵە خوێندنەوە ئەبێت ؟

وتی : بارودۆخی ڕوون بکەرەوە .

وتم : ئايا پێت وايە ئەوە غەيبەت بێت ؟

وتی : نەخێر) .

٣٢٧ - يحيى بن سعيد القطان ئەڵێت : (پرسيارم کرد لە شعبة و سفيان و إبن عيينة و مالک دەربارەی پياوێک کە تۆمەتبارە بە شتێک يان لاوازی تێدايە - لە فەرمووده‌دا -، ئايا بێدەنگ بم ؟ يان بيناسێنم ؟

هەموويان وتيان : بارودۆخی ڕوون بکەرەوە) .

٣٢٨ - الحسن البصري ئەڵێت : (کەسی بیدعەچی غەیبەتی نییە) .

٣٢٩ - يحيى بن أبي كثير ئەڵێت : (سێ کەس غەیبەتیان نییە : دەسەڵاتدارێکی زاڵم، وە بیدعەچیەک، وە خراپەکارێک) .

٣٣٠ - أبو جعفر ئەڵێت : وتم بە سفیان بن عیینة : ئەمە قسە ئەکات لە قەدەردا، مەبەستم إبراهيم بن أبي يحيى بوو .

وتی : (ئاگاداری خەڵکی بکەنەوە کە بیدعەچیە، وە داوای سەلامەتی لە پەروەردگارتان بکەن) .

---

: اللهم نسألك العافية .

٣٣١ - عثمان بن سعيد الدارمي ئەڵێت : علي بن خشرم بۆی نووسیم کە گوێبیستی عیسی بن یونس بووە وتوویەتی : (لەگەڵ جەهمیەکاندا دامەنیشن، وە کار و باریان بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە، بۆ ئەوەی بیانناسن و ئاگاداریان بن) .

---

**: سەلەف کۆکن لەسەر ئەوەی بیدعەچیەکان حورمەت و غەیبەتیان نییە و ئەبێت ئاگاداریان لەبارەوە بدرێت لەلای خەڵکیەوە، وە ئەمەش لە دەروازەی فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپەیە نەوەک غەیبەتکردن .**

**- لە (طبقات الحنابلة) ـــدا محمد الجرجاني ئەڵێت : وتم بە أحمد : من لەسەرم قورسە بڵێم فلانە کەس لاوازە، وە فلانە درۆزنە .**

**أحمد وتی : (ئەگەر تۆ بێدەنگ بیت و منیش بێدەنگ بم، ئەوکات کەی نەزان فەرمووەدەی صحيح لە ضعيف جیا ئەکاتەوە؟) .**

- لە (طبقات الحنابلة) ــــدا المروزي ئەڵێت : وتم بە أبو عبدالله : پێت وایە پیاو خۆی خەریک بکات بە ڕۆژوو و نوێژەوە، وە بێدەنگ بێت لەســەر بیدعەچییەکان و قسەیان لەسەر نەکات ؟

دەموچاوی دا بەیەکدا و وتی : (کاتێک ڕۆژوو بگرێت و نوێژ بکات و خۆی جیا بکاتەوە لە خەڵکی ئایا بەس بۆ خۆی نییە ؟) .

وتم : بەڵێ .

وتی : (کاتێک قسەیان لەسەر ئەکات هەم بۆ خۆیەتی وە هەم بۆ خەڵکیش، قسە بکات باشترە) .

- لە (الکامل) ـدا عاصم الأحول ئەڵێت : دانیشتم لەلای قتادة، باسی عمرو بن عبید ی کرد و قسەی پێ وت و تانەی لێ دا .

منیش وتم : ئەی أبو الخطاب، ئەبینم زانایان تانە ئەدەن لە یەکتری .

وتی : (ئەی أحول، ئەی نازانی کاتێک پیاو بیدعەیەک ئەنجام ئەدات پێویســتە باس بکرێت هەتا حەزەر ئەکرێت لێی ؟!) .

- لە (المعرفة والتاريخ) ــــدا یەکێکە لە سـۆفیەکان کاتێک عبدالله بن المبارک قســە ئەکات دەربارەی المعلى بن هلال پێی ئەڵێت : ئەی أبو عبدالرحمن ئایا غەیبەت ئەکەیت ؟

عبدالله پێی ئەڵێت : (ئەگەر ئێمە ڕوونکردنەوە نەدەین چۆن حەق لە باتڵ جیا ئەکرێتەوە ؟) .

- لە (طبقات الحنابلة) ــــدا عبدالله بن أحمد ئەڵێت : أبو تراب النخشبي هات بۆ لای باوکم رحمه الله، باوکم ئەیوت : (فلان لاوازە، فلان ثقة یە) .

أبو تراب وتی : غەیبەتی زانایان مەکە!

باوکم ئاوڕی بۆ دایەوە و وتی : (ويحک! ئەمە ئامۆژگاری و دڵسۆزیە، ئەمە غەیبەت نییە) .

- حرب الكرماني لە (السنة) ـــدا ئەڵێت : (پرسـیارم کرد لە إسحاق دەربارەی غەیبەتی بیدعەچییەکان ؟

وتی : (حورمەتیان نییە) .

وە لە عبدالله بن المبارک ـەوە گێڕایەوە کە ئەڵێت : غەیبەتیان نییە) .

- لە (مختصر الحجة) ـدا بشر بن الحارث ئەڵێت : (باشتر بە بۆ بیدعەچییەکان لە خۆیان بۆ خۆیان، وا ئەکەیت خەڵکی بەلایاندا نەڕوات تا تاوانەکانیان زیاتر نەبێت) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــدا ئەڵێت : (وە هاوشێوەی پێشەوایانی بیدعە لە ئەهلی وتە پێچەوانەکان بۆ قورئان و سوننەت، یان عیبادەتە پێچەوانەکان بۆ قورئان و ســوننەت؛ ڕوونکردنەوەی حـاڵیـان و ئاگـادارکردنەوەی ئوممەت لێیـان واجبە بە کۆکبوونی موسوڵمانان لەسەری .

هەتـا بە أحمـد وترا : پیـاو ڕۆژوو بگرێـت و نوێژ و ئیعتیکـاف بکـات بەلاتەوە خۆشەویستر؟ یان قسە بکات دەربارەی بیدعەچییەکان ؟

وتی : (کاتێک شـــەونوێژ و نوێژ و ئیعتیکاف ئەکات ئەوە بۆ خۆیەتی، وە کاتێک قسە ئەکات دەربارەی بیدعەچییەکان ئەوە بۆ موسوڵمانانە، ئەوە باشترە .

ڕوونی کردەوە سوودی ئەمەیان گشتگیترە بۆ موسوڵمانان لە جۆری جیهادکردن لەپێناو الله) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـدا دەربارەی بیدعەچییەکان ئەڵێت : (هەستان لەســـەر ئەوانە لە گەورەترینی واجباتەکانە، چونکە ئەوانە عەقڵ و دینی کەســـانێکی زۆریان لە شـێخەکان و زانایان و پاشـا و دەسـەڵاتدارەکان تێکداوە، وە لە زەویدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی خراپە ئەکەن، وە ڕێگە لە دینی الله عز وجل ئەگرن .

جا زیانی ئەمانە لە دیندا زیاترە لە زیانی ئەو کەســەی دنیای موســوڵمانان تێک ئەدات و حەقی بەســەر دینەکەیانەوە نییە؛ وەکو چەتە و ڕێگرەکان، وە وەکو تەتارەکان کە پارەی موسوڵمانان ئەبەن و دینەکەیان بۆ ئەهێڵنەوە .

هەربۆیە گومڕایی و گومڕاکردنی ئەوانە زیاتر و گەورەترە لەوەی وەسف بکرێت) .

## دەروازەی : (١٤)

## ئینکاریکردنی پێشەوایانی ئیسلام لە ئەوەی ئەهلی الكلام دایانهێناوە لە دیندا لە الأغلوطة و، وتەی قورس و، گومان و، دەمەدەمێ و، تەئویلی خراپ، وە بۆچوونیان دەربارەیان بەپێی چینەکان

٣٣٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەم زانستە لە هەر پاشینێک باش و عەدلەکانیان هەڵیئەگرن، مانا گۆڕینی زیادەڕە و، خۆدانەپاڵی بەتاڵکەرەوەکان و لێکدانەوەی نەزانەکانی لێ دوور ئەخەنەوە) .

- أحمد بن حنبل لە (الرد على الزنادقة والجهمية) ــدا ئەڵێت : (سوپاس بۆ ئەو الله ـــــیەی کە لە هەموو ســەردەمێکی پچڕانی پێغەمبەرێتیدا; کۆمەڵێک لە زانایانی هێڵاوەتەوە، بانگەشەی ئەو کەسانە ئەکەن کە گومڕا بوون بۆ هیدایەت، وە ئارام ئەگرن لەســەر ئازارەکانیان، بە کتێبی الله عز وجل مردووەکان زیندوو ئەکەنەوە، وە بە نووری الله عز وجل کوێرەکان بەرچاوڕۆشن ئەکەن، چەندە کوژراوی دەستی ئیبلیسیان زیندوو کردووەتەوە، وە چەندە گومڕایان ڕێنوێنی کردووە، شـــوێنەوار و کاریگەریان لەســەر خەڵکی چەندە باش و جوانە، و شوێنەواری خەڵکیش لەسەریان چەندە ناشرینە .

لە کتێبی الله عز وجل مانا گۆڕینی زیادەڕە و، خۆدانەپاڵی بەتاڵکەرەوەکان و لێکدانەوەی نەزانەکانی لێ دوور ئەخەنەوە .

ئەوانەی کە ئاڵای بیدعەیان هەڵداوە و ڕێگای فیتنەیان واڵا کردووە، جا ئەوانە ڕاجیاوازن لە قورئاندا، وە پێچەوانەی قورئانن، وە کۆکن لەسەر پێچەوانەکردنی قورئان، وە دەربارەی الله و بەناوی الله و لە کتێبی الله عز وجل ـــدا قسە ئەکەن بەبێ زانست، قســە ئەکەن بە وتەیانێکی ســەرلێتێکدەر و ناڕوون، وە خەڵکی نەزان هەڵئەخەڵەتێنن

بەو شـــتەی کە ســـەریان پێ لێ تێک ئەدەن، هەربۆیە پەنا ئەگرین بە الله لە فیتنەی گومڕاکەران) .

- إبن أبي حاتم لە (الجرح والتعديل) ـــدا ئەڵێت : بینیم لە نامەی عبدالرحمن بن عمر الأصبهاني ناسراو بە رُستە بە دەستوخەتی لە أصبهان ـــەوە بۆ أبو زرعة الرازي : (بزانە الله ڕەحمت پێ بکات من لەبیرت ناکەم دوعات بۆ بکەم لە شـــەو و ڕۆژمدا الله موســـوڵمانان بەهرەوەر بکات بە زیاتر مانەوەت، چونکە خەڵکی لە خێر و باشـــیدا ئەبن هەتا کەسێک بمێنێت زانست، وە ڕاست و هەڵەی زانستەکەش بزانێت، خۆ ئەگەر ئەوە نەبوویایە زانست نەئەما، وە خەڵکی ڕوویان ئەکردە جەهل و نەزانی، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هـاتووە فەرموویەتی : (ئەم زانســـتە لە هەر پـاشـــینێـک بـاش و عەدلەکـانیـان هەڵیئەگرن، مـانـا گۆڕینی زیـادەڕە و، خۆدانەپـاڵی بەتـاڵکەرەوەکـان و لێکـدانەوەی نەزانەکانی لێ دوور ئەخەنەوە) .

بەڕاســـتی الله عز وجل کردوویتی بە یەکێک لەوان، کەواتە ســـتایشـــی الله بکە لەسەر ئەوە، الله عز وجل شوکرانەبژێری واجب کردووە لەسەرت بۆ ئەوە) .

**٣٣٣** - الحسن بن علي رضـي الله عنهم وتی : رســول الله ﷺ فەرمووی : (ڕەحمەتی الله لە جێنشینەکانم) .

وترا : جێنشینەکانت کێن ئەی رسول الله ؟

فەرمووی : (ئەوانەی ســـوننەتەکـانم زینـدوو ئەکەنەوە و فێری خەڵکیـان ئەکەن) .

**٣٣٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک مردن پێی بگات کاتێک زانست بەدەست ئەهێنێت بۆ زیندووکردنەوەی ئیسلام، وە لەسەر ئەوە بمرێت، ئەوە نێوانی ئەو و پێغەمبەران تەنها یەک پلەیە) .

**٣٢٥** - رسول الله ﷺ ئه‌فه‌رمووێت : (هه‌ركه‌سێک سوننه‌ته‌كه‌م بژیه‌نێته‌وه ئه‌وه منی خۆش ئه‌وێت، وه هه‌ركه‌سێک منی خۆشبووێت له‌گه‌ڵمدایه له به‌هه‌شتدا ) .

## چینی یەکەم : لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، وە الله لێیان ڕازی بێت، ئەوانەن کە الله عز وجل دەربارەیان ئەفەرمووێت : ﴿فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ﴾ (البقرة : ١٣٧)

**٣٣٦** - سلیمان بن یسار ئەڵێت : (پیاوێک پێی ئەوترا صَبیغ، هات بۆ مەدینە، دەستی کرد بە پرسیارکردن دەربارەی ئایەتە موتەشابیهەکانی قورئان، عمر رضي الله عنه ناردی بەدوایدا، وە پەلی دارخورمای بۆ ئامادە کردبوو .

پێی فەرموو : (تۆ کێیت ؟) .

وتی : من عبدالله صبیغ م .

عمر یش رضي الله عنه پەلەدارخورمایەکی هەڵگرت و لێیدا و فەرمووی : (منیش عبدالله عمر م) .

لێی دا هەتا سەری خوێناوی کرد، پێی وت : ئەی پێشەوای ئیمانداران بەسە، ئەوەی کە لە سەرمدا بوو ڕۆیشت) .

---

- لە (مختصر الحجة على تارك المحجة) دا الفرغاني ئەڵێت : **(ئەم ئینکارلێکردن و تەربیەتدان و هەجرکردنە کۆدەنگیەکە لە هاوەڵانەوە رضي الله عنهم، چونکە عمر رضي الله عنه ئەو کارەی کرد بە ئامادەبوونی هاوەڵان، وە گەیشت بەوانەشیان کە ئامادە نەبوون، جا هیچ کەسێک ئینکاریی ئەوەی لێ نەکرد، وە هیچ کەسێک بەرپەرچی نەدایەوە، هەربۆیە بوو بە ئیجماع) .**

- إبن قدامة له (ذم التأويل) ـــــدا ئەڵێت : (هاوەڵان رضـــي الله عنهم كاتێک بیانبینیایە کەسێک شوێن موتەشابیهەکان ئەکەوێت و پرسیار دەربارەیان ئەکات، بەوە بەڵگەیان ئەهێنایەوە ئەو کەسە لە گومڕا و لادەرەکانە، وە عمر رضي الله عنه صبیغ ـــی بە یەکێک لە لادەرەکان هەژمار کرد، هەتا تێهەڵدان و زیندانیکردن بە حەڵاڵ زانی، وە فەرمانی کرد بە خەڵکی لێی دوور بکەونەوە، پاشان صبیغ دانی نا بە بیرتیژی عمر رضي الله عنه و تۆبەی کرد، وە وازی هێنا و ســـوودی بینی، وە بەوە پارێزراو بوو لە دەرچوون لەگەڵ خەواریجەکاندا) .

- له (كتاب السنة لـ الخلال) دا لەو نامەیەدا هاتووە کە زانایانی بغداد ئەینووسن بۆ الخلال : (هیهات هیهات! نابێت زانایان و ئەوانەی الله ئەناســـن هەرکاتێک نەزانێک قسـەی کرد بە نەزانیەکەی وەڵامی بدەنەوە و بەڵگەی بەسـەردا بهێننەوە و موناقەشـەی لەگەڵدا بکەن بەوهۆیەوە بەشدار بن لە تاوانەکەی و ڕۆبچن لە دەریای هەڵەکانیدا .

ئەگەر عمر بن الخطاب رضـي الله عنه بیویستایە لەگەڵ صبیغ ـــدا موناقەشە بکات و هاوەڵانی رسول الله ی ﷺ بۆ کۆ بکردایەتەوە هەتا موناقەشەی لەگەڵدا بکەن و بەڵگەی بەســـەردا بهێننەوە؛ ئەوە ئەتوانی، بەڵام نەزانیەکەی ســـەرکوتکرد و، لێیدا تا ئازاری پێ گەیاند و، لە پێســـتی خۆیدا بەجێی هێڵا و، وازی لێ هێنا ناخی لە ئازار و خەفەتدا هەڵبقوڵێت لەنێوان خەڵکیدا بە نەفیکراوی و بێزراوی، نە قســـەی لەگەڵدا بکرێت وە نە خەڵکی لەگەڵی دابنیشن، وە نە بەڵگەی بۆ بهێننەوە) .

## ٣٣٧ - أبو عثمان النَهدي ئەڵێت : عمر رضـــي الله عنه بۆی نووســـین : (دامەنیشن لەگەڵ صبیغ دا) .

ئێمەش ئەگەر بهاتایە بۆ لامان سەد کەس بووینایە لێی جیا ئەبووینەوە .

---

- إبن تيمية له (منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة والقدرية) ـدا ئەڵێت : (عمر رضي الله عنه نەفی صبیغ بن عسل التمیمي کرد کاتێک شوێنکەوتنی موتەشابیهی دەرخست بە مەبەستی فیتنە و لێکدانەوەکەی، وە لێیدا و فەرمانی کرد بە موسوڵمانان

**هەجر بكرێت دوای ساڵێک لە دەرخستنی تەوبەکەی، کاتێک تۆبەی کرد فەرمانی کرد بە موسوڵمانان قسەی لەگەڵدا بکەن).**

**٣٣٨ - الشافعي** ئەڵێت : (حوکمی من لە ئەهلی کەلامدا حوکمی عمر ــە لە صبيغ دا).

---

**: هۆکاری بە حەرامدانانی الكلام لەلایەن الشافعي ــیەوە ترسە لە دروستبوونی گومان و سەرکێشان بۆ بیدعە وەک چۆن لە خوودانە ئایەتە موتەشابیهەکان کەسەکە تووشی ئەبێت، الشافعي خوودانە الكلام ی قیاس کردووەتە سەر گەڕان بەدوای ئایەتە موتەشابهیەکاندا، ئەم قیاسەش دروستە .**

**- لە (الشريعة) ــدا أبو داود ئەڵێت : بینیم پیاوێک لە خەڵکی بەغداد لەوانەی کە وەفق یان کردووە لە قورئاندا لەوەی کە پێم گەیشتووە; سەلامی کرد لە أحمد .**

**أحمد ــیش بە تووڕوییەوە پێی وت : (ون بە، نەتبینم بێیت بۆ بەردەرگای ماڵەکەم) .**

**وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە و پێی وت : (چەندە پێویستە ئەوەت پێ بکرێت لە عمر بن الخطاب رضي الله عنه کردی بەرامبەر صبيغ) .**

**٣٣٩ - علي بن أبي طالب** رضـــي الله عنه ئەفەرمووێت : (لە کۆتایی زەماندا کەسانێک دەرئەچن کۆمەڵە قسەیەک ئەکەن کە ئەهلی ئیسلام ئاشنا نین پێی، وە خەڵکی بانگهێشت ئەکەن بۆ وتەکانیان، جا هەرکەسێک پێیان گەیشت با شەڕیان لەگەڵدا بکات چونکە کوشتنیان پاداشت و ئەجرە لەلای الله) .

---

**: الهروي مەبەستی لە هێنانی ئەم ئەثەرە ئەو یاسا کەلامیە کوفریانەیە کە ئەهلی کەلام دروستیان کردوو و بە ئەسڵ دایاننا و خەڵکیان بانگ کرد بۆ لای .**

٣٤٠ - علي بن أبي طالب رضـــي الله عنه ئەفەرموویت : (ڕاجیاوازی داماڵەری دینە، وە خراپکردنی ئەوەیە کە ڕوون و ئاشـــکرایە، وە ئاگـاداری دەمەدەمێ و موناقەشـــە بن، چونکە ئەوە کار و کردەوە پووچەڵ ئەکاتەوە، وە ڕاجیاوازی بەرەو فیتنە ئەڕوات، وە فیتنەش بەرەو ئاگر ئەڕوات : ﴿وَلَا تَنَـٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ﴾ (الأنفَال : ٤٦) .

٣٤١ - الهروي ئەڵێت : (وە یەکەم وتە کە لە ڕەددی موتەکەلیمەکاندا وتراوە لەم ئوممەتەدا وە باشترین وتە وتەکەی علي بن أبي طالب ـە رضي الله عنه کاتێک خەواریجەکـان وتیـان (لا حكم إلا لله) ئەویش فەرمووی : (وتەیەکی حەق کە مەبەست پێی باتڵە) .

٣٤٢ - عبدالله بن عباس رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَـٰتِنَا﴾ (الأنعَام : ٦٨) .

فەرمووی : (ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەمە دەمێ و موناقەشە ئەکەن لە دینی الله ـدا) .

---

**- لە (تفسير الطبري) ـــدا إبن عباس رضي الله عنهما لە تەفسیری ئایەتەکەدا ئەڵێت : (الله عز وجل فەرمانی بە ئیمانداران کردووە بە جەماعەت، وە نەهی لێ کردوون لە ڕاجیاوازی و جیابوونەوە، وە هەواڵی پێداون ئەوانەی پێش خۆیان لەناوچوون بە دەمەدەمێ و بەربەرەکانێ کردن لە دینی الله ـدا) .**

**- لە (البدع والنهي عنها لـ محمد بن وضاح) ـدا بە سـفيان الثوريِ ترا : سفيان بن عيينة ئەڵێت : (سـەردەمێک دێت بەسـەر خەڵکیدا لە مزگەوتەکانیاندا شـەیتانانێک دائەنیشن فێری دینەکەیانیان ئەکەن) .**

**الثوري وتی : (ئەوەمان پێ گەیشتووە لە عبدالله بن عمرو ـەوە رضي الله عنهما کە فەرموویەتی : (سـەردەمێک دێت بەسـەر خەڵکیدا لە مزگەوتەکانیاندا شـەیتانانێک لە**

مزگەوتەکانیاندا دائەنیشن، سلیمان بن داود بەندی کردبوون لە دەریادا، دەرئەچن و خەڵکی فێری دینەکەیان ئەکەن).

سفیان وتی : (بابەتانێکی گەورە ماوە - واتە هێشتا ڕووی نەداوە لەو بەڵایانە - ).

محمد بن وضاح ئەڵێت : (زهیر بن عباد ئەڵێت : سفیان رحمه الله مەبەستی ئەوەیە : خەڵکی فێر ئەکەن، لەڕێگەی ئەو فێرکردنانەوە هەوا و ئارەزووە تازەکان ئەخەنە ناویان، جا حەرامیان بۆ حەڵاڵ ئەکەن، وە گومانیان بۆ دروست ئەکەن دەربارەی شتە باشەکان و ئارامگرتن و سوننەت، وە فەزڵی دنیانەویستی بەتاڵ ئەکەنەوە و فەرمانیان پێ ئەکەن بە ڕووکردنە بەدەستهێنانی دنیا، ئەوەش بنەڕەتی هەموو هەڵەیەکە).

- أبو الفتح المقدسي لە (مختصر الحجة) ـدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی (ئەوەی لێی ئەترسێت لەو کەسانەی خۆیان ئەچوێنن بە زانایان و لەوانیش نین، وە ئەیەوێت لە ڕیزی ئەوان دابنرێت و لەوان هەژمار بکرێت، بۆ ئەوەی کەسی دیکە بخزێنێتە ناو گومڕایەتیەکەی، وە بیکاتە بیدعە و نەزانیەکەیەوە).

وە ئەڵێت : (ئەگەر ترسان قسەکانی ئەوان نەناسنەوە، وە لوتبەرزیانتان لێ شاراوە نەبێت; بەهۆی خۆ ڕازاندنەوەیان بە زانست و لە هەمان کاتدا دووریان لێی، وە خۆپیشاندانیان بە لەسەرخۆیی و ئارامی لەکاتێکدا بەتاڵن لێی; ئەوە ئەو شتانەی بۆتان ئەهێنن بەراوردی بکەن، جا ئەگەر لە کتێب الله یان فەرموودەری رسول الله ﷺ، یاخود لە کۆدەنگی هاوەڵان رضي الله عنهم یان وتەی پێشەوایەک لەوان یان ئەوانەی پاشیان هەبوو لە تابیعیەکان و پێشەوا دیارەکانی زانست، دروست بێت بە سەنەدە صحيح ـە بەناوبانگەکان ئەوە قبووڵی بکەن، وە ئەگەر ئەوەی تیادا نەبوو ئەوە وازی لێ بهێنن و فڕێی بدەن، چونکە ئەوەی لەم بنچینەیانە دەرئەچێت ئەوە بیدعەیە و گومڕایەتیەکەی تازەیە، وە فەرمانمان پێکراوە بە دوورکەوتنەوە لەوەی ئەمە ڕێگەیەکیەتی، وە ڕەددانەوەی خاوەنەکەی).

**٣٤٣ - عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک دان بنێت بە ناوێک لەم ناوە داهێنراوانەدا ئەوە پەتی ئیسلامی لە ملی داکەندووە).

**٣٤٤ - وهب بن منبه** ئەڵێت : من و عكرمة چاوڕاســـتی إبن عباس بووین رضـــي الله عنهما دوای ئەوەی بینایی چاوەکانی لەدەســـت دا هەتا چوینە مســـجد الحرام ـەوە; بینیمان کۆمەڵەیەک لە حەلقەیەکدا بوون دەمەدەمێیان ئەکرد .

پێی فەرمووین : (نزیکم بکەنەوە لە حەلقەی دەمەقاڵێیەکە) .

ئێمەش بردمان بۆ لایان، لەلایان وەســـتا و پرســـیاری لێ کردن، ئەوان ویســـتیان دابنیشـــێت بەڵام ڕەتی کردەوە و پێی فەرموون : (ڕەچەڵەکی خۆتانم پێ بڵێن تا بتانناسم) .

فەرمووی : (ئایا نازانن الله عز وجل کۆمەڵە بەندەیەکی هەیە ترســـی خۆی بێـدەنگی کردوون بەبێ ئەوەی لاڵ بن یـاخود توانـای قســـەکردنیـان نەبێـت ؟ لەکاتێکدا ئەوان زانا و ڕەوانبێژ و بەڕێزەکانن، ئەوە نەبێت کاتێک یادی گەورەیی الله عز وجل ئەکەنەوە مێشـــکیان ئەشـــڵەژێ و دڵیان خورپە ئەکات و زمانیان لە گۆکردن ئەکەوێت، کاتێک چاک ئەبنەوە پەلە ئەکەن بۆ لای الله بە کارە چاکەکان، ئێوە لە کوێی ئەواندان ؟) .

پاشان لەلایان ڕۆیشت، پاش ئەوە پیاوێکمان نەبینیەوە لەوێ) .

**٣٤٥ - عكرمة** ئەڵێت : نجدة الحروري **- یەکێک لە سەرگەورەی خەواریجەکان** - بە عبدالله بن عباس رضـــي الله عنهما ــــــی وت : چۆن پەروەردگارت ئەناســـیت ؟ چونکە ئەوانەی پێش ئێمە جیاواز بوون لە ئێمە ؟

فەرمووی : (ئەو کەســەی بنچینەکەی دینەکەی دابنێت لەســەر قیاســکردن ئەوە بە درێژایـی تەمەنی لە گێژاودایە، لادەرە لە ڕێبـاز و، لە نـاو خراپیـدا ئەخولێتەوە، ئەینـاســـم بەوەی کە خۆی خۆیی پێی نـاســـاندووە بەبێ ئەوەی بینیبێتم، وە وەسفی ئەکەم بەوەی کە وەسفی نەفسی خۆیی پێ کردووە) .

**٣٤٦ - عبدالله بن عباس** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : | فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ | (آلِ عِمرَان : ٧) .

ئەفەرمووێت : (ئەوانەی خاوەنی دەمەدەمێ و جیدالن لە دینی الله دا) .

**٣٤٧ - محمد بن جبير بن مطعم** ئەڵێت : معاوية رضي الله عنه هەستایە سەرپێ، ستایشتی الله ـــی کرد بەوەی کە شایەنیەتی، وتی : (أما بعد، پێم گەیشتووە هەندێک پیاو لە ئێوە کۆمەڵە قسەیەک ئەکەن کە لە کتێبی الله نییە و نەناسراوە لە رسول الله ـەوە ﷺ، ئەوانە نەزانەکانتانن) .

**٣٤٨ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (فێری زانست ببن پێش ئەوەی بگیرێتەوە، وە گیرانەوەکەی ئەوەیە ئەهلەکەی بڕۆن، وە دەست بگرن بە زانستەوە، چونکە هیچ کەسێکتان نییە بزانێت کەی پێویستی بەوە ئەبێت کە ئەیزانێت، وە ئێوە کۆمەڵەیەک ئەبینن کە بە قسەی خۆیان بانگتان ئەکەن بۆ لای کتێبی الله و کەچی فەرامۆشیان کردووە و پشتیان تێکردووە، جا دەست بگرن بە زانستەوە و ئاگاداری داهێنان و زۆرلەخۆکردن و قووڵبوونەوە بن) .

**٣٤٩** - لە **شقيق بن سلمة** ـــەوە کە عبدالله بن مسعود رضي الله عنه : (فەرمانی پێ کردوون ململانێ لە قورئاندا نەکەن، وە هەواڵی پێداون ئەوەی کە نکۆڵی لە یەک ئایەتی بکات نکۆڵی لە هەمووی کردووە) .

**٣٥٠ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (مەهێڵە خاوەن هەوا و ئارەزوویەک قسەت بۆ بکات نەخۆشیەک بخاتە دڵتەوە چارەسەری نەبێت).

---

- لە (الجامع لـ معمر بن راشد) ـدا الحسن البصري ئەڵێت : (گوێت هەڵمەخە بۆ خاوەن هەوا و ئارەزوویەک بەوهۆیەوە دڵت نەخۆش بکەوێت، وە بەدەم داواکاری

دەسەڵاتدارێکەوە مەچۆ ئەگەر داوای لێ کردیت سورەتێکی قورئان لەلای بخوێنیتەوە، چونکە نایەیتە دەرەوە لەلای ئیللا بە خراپتر نەبێت لەوەی کە چوویتەتە ژوورەوە بۆ لای) .

- لە (البدع والنهي عنها) ـــــدا الأوزاعي ئەڵێت : (ڕێگە بە خاوەن بیدعەیەک مەدەن جیدال بکات، دڵەکانتان تووشی فیتنە ئەبێت بەهۆی گومانەوە) .

- لە (الإبانة الكبرى) ـــدا سـفيان الثوري ئەڵێت : (هەرکەسێک دابنیشێت لەگەڵ خاوەن بیدعەیەکدا سەلامەت نابێت لە سێ شت :

یان ئەبێت بە فیتنەیەک بۆ جگە لە خۆی .

یاخود شتێک ئەکەوێتە دڵیەوە بەهۆیەوە پێی ئەخزێت و ئەیخاتە ئاگرەوە .

یان ئەڵێت : (واللە گرنگی نادەم بەوەی کە چی ئەڵێن، من متمانەم بە خۆم هەیە، جا هەرکەسێک اللە بێخەمی بکات لە دینەکەی هێندەی چاو تروکاندنێک ئەوە لێی ئەسەنێتەوە) .

- إبن بطـة لە (الإبانة الكبرى) ـدا دەربارەی بیدعەچییەکان ئەڵێت : (دانیشتن و موناقەشەکردن لەگەڵیان : ئەبێت بە مایەی تانە و لووتبەرزی و زیان، وە دڵ نەخۆش ئەخات، وە دین لەکەدار ئەکات و ئیمان تێک ئەدات، وە شـەیتان ڕازی ئەکات و الرحمن تووڕە ئەکات) .

**٣٥١ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (هەرکەسێکتان شتێکی زانی با بیڵێت، وە ئەوەی کە نەیزانی با بڵێت (اللە زاناترە) .

چونکە لە زانستی پیاو ئەوەیە بەرامبەر ئەو شتەی کە نەیزانی بڵێت (اللە زاناترە) .

اللە تعالى بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمووە : ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾ (ص : ٨٦) .

٣٥٢ - عائشة رضي الله عنها ئەفەرمووێت : (ئەگەر رسول الله ﷺ شتێکی نەزانیایە بە بۆچوونی خۆی قسەی تێدا نەئەکرد، وە زۆری لە خۆی نەئەکرد) .

٣٥٣ - الشعبي ئەڵێت : (عبدالله بن مسعود و حذيفة رضي الله عنهم دانیشتبوون، پیاوێک هات و پرسیاری لێ کردن دەربارەی شتێک، إبن مسعود فەرمووی بە حذيفة : (پێت وایە بۆ چ مەبەستێک پرسیارمان لێ ئەکەن دەربارەی ئەم شتە ؟) .

فەرمووی : (بیزانن، وە دواتر وازی لێ بهێنن) .

عبدالله بن مسعود ڕووی تێ کرد و فەرمووی : (پرسیارمان لێ بکەن دەربارەی شتێک لە کتێبی الله بیزانین وەڵامتان ئەدەینەوە، یان سوننەتێک بێت لە پێغەمبەری الله ـەوە ﷺ وەڵامتان ئەدەینەوە، وە توانامان نییە بۆ ئەوەی کە داتانهێناوە) .

٣٥٤ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەگەر واز بهێنن لە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ گومڕا ئەبن) .

٣٥٥ - أُبَي بن كعب رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئەوەی کە بۆت دەرکەوت کاری پێ بکە و سوودی لێ ببینە، ئەوەشی کە سەرت لێی دەرنەچوو ئیمانی پێ بهێنە و بیگەڕێنەرەوە بۆ ئەوەی کە ئەیزانێت) .

٣٥٦ - عبدالله بن عمر رضي الله عنهما فەرمووی : (قەدەریەکان لاوازی بۆچوونی خۆیان خستەسەر قەدەرەکانی الله تعالی، وتیان : (بۆچی ؟) .

نابێت بە الله عز وجل بوترێت : (بۆچی ؟) .

چونکە ئەو پرسیاری لێ ناکرێت دەربارەی ئەوەی ئەیکات بەڵکو ئەوان لێپرسینەوەیان لەگەڵ ئەکرێت) .

: واتە قەدەریەکان کاتێک لە حیکمەتی کارەکانی الله عز وجل تێنەگەیشتن ئیتر گومانی خراپیان پێ برد و دەستیان کرد بە لێپرسینەوەی الله عز وجل لەجیاتی ئەوەی لێپرسینەوە لە نەفسی خۆیان بکەن .

٣٥٧ - مجاهد ئەڵێت : (وترا بە إبن عمر : نجدة الحروري ئاوا و ئاوا ئەڵێت .

ئەویش پەنجەکانی کردە گوێیەوە لە ترسی ئەوەی لەرێیەوە شتێک بچێتە دڵیەوە) .

٣٥٨ - معاذ بن جبل رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (قورئان ئەکرێتەوە بەسەر خەڵکیدا هەتا ئافرەت و منداڵ و پیاو ئەیخوێننەوە .

پیاو ئەڵێت : (من قورئانم خوێندەوە، بۆچی کەس شوێنم ناکەوێت ؟ سوێند بە الله لەناویدا نوێژ ئەکەم بەڵکو شوێنم بکەون) .

لەناویاندا نوێژ ئەکات بەڵام کەس شوێنی ناکەوێت، ئینجا ئەڵێت : (قورئانم خوێندەوە بەڵام کەس شوێنم نەکەوت، ماڵەکەم ئەکەم بە شوێنی نوێژ، بەڵکو شوێنم بکەون) .

ماڵەکەی ئەکات بە مزگەوت هەر کەس شوێنی ناکەوێت، ئینجا ئەڵێت : (سوێند بە الله، قسەیەکیان بۆ ئەهێنم کە لە کتێبی الله دا عز وجل نەیدۆزنەوە و وە نەیانبیستبێت لە رسول الله ـەوە ﷺ بەڵکو شوێنم بکەون) .

جا ئاگاتان لەوە بێت کە هێناویەتی، چونکە ئەوەی هێناویەتی گومڕاییە) .

٣٥٩ - إبن أبي جعفر ئەڵێت : وترا بە عیسى بن مريم عليه السلام : ئەی روح و كلمة ی الله چ کەسێک خاوەن گەورەترین فیتنەیە ؟

فەرمووی : (هەڵەی زانا، کاتێک زانا هەڵە ئەکات کەسانێکی زۆر ئەکەونە ناو هەڵەوە) .

---

- إبن القيم لە (إعلام الموقعين) ـــدا ئەڵێت : (ئەوانەی کە دەربارەی سوننەت نووســیویانە هەردوو بابەتی خراپێتی لاســاییکردنەوە و بەتاڵکردنەوەی و؛ هەڵەی زانایانیان پێکەوە کۆکردووەتەوە بۆ ئەوەی خراپێتی لاسایی کردنەوە ڕوون بکەنەوە، زانا هەر هەڵە ئەکات چونکە معصــوم نییە، هەربۆیە ڕێگەپێدراو نییە هەموو ئەوەی ئەیڵێت قبووڵ بکرێت، وە وتەکەی بخرێتە ئاســتی وتەی کەســێکی معصــوم، ئەمە ئەوەیە کە هەموو زانایان لەســەر ڕووی زەوی تانەیان لێ داوە و بە حەرامیان زانیوە و زەمی ئەهلەکەیان کردووە، وە ئەوە بنچینەی بەڵا و فیتنەی لاســاییکەرەوانە، چونکە ئەوان لاســایی زانا ئەکەنەوە لەوەدا کە هەڵەی تیادا کردووە وە لەوەشــدا کە هەڵەی تیادا نەکردووە، وە جیاکاریەکیان نییە لەو نێوانەدا، جا هیچ مەجالێکی تیایدا نییە دین بە هەڵە وەرئەگرن، هەربۆیە ئەوە حەڵاڵ ئەکەن کە الله حەرامی کردووە، وە ئەوە حەرام ئەکەن کە الله حەڵاڵی کردووە، وە ئەو شــتە بە شــەرع دائەنێن کە بە شــەرع دانەنراوە، هیچ بوار و دەرچەکیان نییە لەوە کاتێک شوێنی کەسێک کەوتوون کە معصوم ـــبوونی لێ نەفی کراوە .

وە لەوەی کە زانراوە ئەو ترسەی هەیە دەربارەی هەڵەی زانا لاساییکردنەوەیەتی تیایدا، خۆ ئەگەر لاســاییکردنەوەی نەبوویایە ئەوە ئەو ترســە نەئەبوو بەرامبەر هەڵەی زانا لەچاو هەڵەی جگە لە خۆی، جا کاتێک زانرا شــتێک هەڵەیە ئەوە ڕێگەپێدراو نییە شوێنی بکەوێت بە ڕێککەوتنی موسوڵمانان لەسەری) .

٣٦٠ - نعيم بن أبي هند ئەڵێت : أبو مسعود الأنصاري دەرچوو بە مەبەستی حەج کردن، ئێمەش کۆبووینەوە لەلای و پێمان وت : وەســیەتێکمان بۆ بکە ئەی أبو مسعود .

فەرمووی : (ڕا و بۆچوون تۆمەتبار بکەن، ئەمبینیت کە نەفسم بانگم ئەکات بۆ ئەوەی بە شمشێرەکەمەوە دەربچم و بەکاریبهێنم و بچمە جەهەننەمەوە) .

**٣٦١ - زيد بن أرقم** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (هەرکەسێک دەستبگرێت بە ســوننەتەوە و جێگیر ببێت ڕزگاری ئەبێت، وە هەرکەســێک زیادەڕەوی بکات دەرئەچێت، وە ئەوەی لێی لابدات لەناوئەچێت).

**٣٦٢ - عبدالله بن عمر** رضـي الله عنهما ئەفەرموویت : (لە پاش ئیسـلام بە هیچ شــتێـک زۆر دڵخۆش نەبووم هێنـدەی ئەوەی دڵم هیچکـام لەم هەوا و ئارەزوویانەی لەخۆ نەگرتووە).

**٣٦٣ - عبدالله بن مسعود** رضـي الله عنه ئەفەرموویت : (هەرکەسـێک لە ئێوە شــوێنکەوتە بوو با شــوێن هاوەڵانی محمد ﷺ بکەوێت رضـــي الله عنهم، چونکە ئەوان لەم ئوممەتەدا خاوەنی پاکترین دڵن، وە قوڵترین زانســتیان هەیە، وە کەمترین تەکلیف ئەخەنەسەر خۆیان و زۆر لە خۆیان ناکەن، وە باشترین ڕێباز و ڕەوشــتیـان هەیە، الله هەڵیبژاردن بۆ هـاوەڵایەتیکردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ و چەســپاندنی دینەکەی، کەوایە پێگە و فەزڵیان بزانن و شــوێن شــوێنەوارەکانیان بکەون، چونکە ئەوان لەسەر ڕێگایەکی ڕاست بوون).

**٣٦٤ - عبدالله بن عباس** رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل ﴿فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍۖ﴾ (البقرة : ١٣٧).

ئەفەرموویت : (مەبەستی هاوەڵانە رضي الله عنهم).

---

**: لەم ئایەتەدا الله عز وجل پێوانەی حەق و ڕاستی و پێکان و هیدایەت ئەکات بە شـوێنکەوتی هاوەڵان لەو فەرمایشـتانەی کە فەرموویانە و لەو کردارانەی کە ئەنجامیان داوە.**

## چینی دووەم : ئەوانەش تابیعیە فەقیهە سەرەتاییەکانن لە شارەکان

**٣٦٥ - الحسن البصري** ئەڵێت : (ئیماندار لەسەر بەڵگە و ڕوونیە لەلایەن پەروەردگاریەوە) .

**٣٦٦ - الحسن البصري** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ﴾ (هُود : ١٧) .

ئەڵێت : (محمد ﷺ شایەتێکە لەلایەن پەروەردگاری بەرزیەوە) .

**٣٦٧ - يحيى بن سعيد القطان** ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە شعبة و سفيان و إبن عيينة و مالك دەربارەی پیاوێک تۆمەتێک یان لاوازیەکی تێدایە، ئایا بێدەنگ بم یان ڕوونی بکەمەوە ؟

هەموویان وتیان : (حاڵی ڕوون بکەرەوە) .

**٣٦٨ - محمد بن سيرين** ئەڵێت : (پرسیار دەربارەی سەنەدی فەرموودە نەئەکرا هەتا فیتنە ڕوویدا، دوای ئەوەی فیتنە دەرکەوت پرسیار کرا دەربارەی سەنەدی فەرموودە; بۆ ئەوەی ئەهلی سوننە ببیندرێت و لێیان وەربگیرێت، وە بیدعەچییەکان ببیندرێت و فەرموودەکانیان ڕەت بکرێتەوە) .

---

**: محمد بن سيرين تابیعیە، وە کاتێک وەفاتی کردووە سەد ساڵ بەسەر وەفاتی رسول الله دا ﷺ تێنەپەڕیوە، چونکە رسول الله ﷺ ساڵی ١١ هـ وەفاتی کردووە .**

تەماشا بکە رحمک زانایان هەر لە زووەوە گرنگیان داوە بە سەنەدی فەرموودە و خەمی دینەکەیان بۆ پاش خۆیان خواردووە، چونکە ئەگەر فەرموودە بە سـەنەدەوە ڕیوایەت نەکرێت ئەوە هەر کەسێک هەر شتێکی پێ خۆش بێت ئەیڵێت .

هەر بۆیە زانایان رحمهم الله لەو سـەردەمە نزیکە کە تێیدا هاوەڵان و تابیعیەکان و تابیعی تابیعیەکانی تێدا ژیاوە گرنگیان داوە بە سەنەد بۆ پاراستنی وتە ڕاستەقینەکانی رسول الله ﷺ .

وە گرنگیـان داوە بەوەی ڕیوایەت لە ئەهلی سـوننەوە بکەن، چونکە ئەهلی سوننە جێی سیقەن .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەکرێت لە ئەهلی بیدەع ڕیوایەت بکرێت بە هەندێک مەرج .

**٣٦٩ - الحسن البصري** ئەڵێت : (دامەنیشە لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا ئەگەر واشتزانی وەلام -ی گومانەکانیان -ت پێیە ) .

**٣٧٠ - هشـام** ئەڵێت : الحسـن البصـري و محمد بن سـيرين وتیان : (دامەنیشـن لەگەڵ خـاوەن هەوا و ئارەزووەکـانـدا، وە گوێیـان لێ مەگرن و موناقەشەیان لەگەڵ مەکەن ) .

**٣٧١ - محمد بن سيرين** ئەڵێت : (خۆ ئەگەر بمویسـتایە موناقەشـە بکەم ئەوە ئەمتوانی لێزانانە بیکەم ) .

---

: واتە مەسـەلەکە ئەوە نییە بڵێم نازانم موناقەشـە بکەم بەڵکو زۆر باشـم تیایدا بەلام خۆم موناقەشە ناکەم لەبەر ئەو فەرموودە و ئاثارانەی دەربارەی هاتووە .

٣٧٢ - أيوب السختياني ئەڵێت : محمد بن سيرين وتی : (پیاو دەستی نەگرتووە بە بیدعەیەکەوە پاشان گەڕابێتەوە بۆ سوننەت) .

---

: ئەوەی کە باوە لەو کەسانەدا کە تووشی بیدعە بوون وە بە تایبەتی ئەوانەی کە تیایدا ڕۆچوون و بانگەشەی بۆ ئەکەن و درۆ ئەکەن لەپێناو سەرخستنی بیدعەیەکاندا؛ تەوبە ناکەن لە بیدعەکەیان .

- لە (السنة لـ عبدالله بن أحمد) دا سلام بن أبي مطيع ئەڵێت : سعید بە أیوب ی وت : ئەی أبا بكر، عمرو بن عبيد گەڕاوەتەوە لە وتەکەی - **واتە تۆبەی کردووە لە عەقیدەی موعتەزیلە و قەدەریەکان** - .

سلام وتی : وە خەڵکی لەو ڕۆژانەدا ئەیانوت کە ئەو گەڕاوەتەوە .

جا أیوب وتی : ئەو نەگەڕاوەتەوە .

پێی وت : بەڵێ، بەڵکو گەڕاوەتەوە .

وتی : ئەو نەگەڕاوەتەوە .

ئەمەی وتەوە زیاتر لە جارێك، پاشان أیوب وتی : ئایا گوێت لە ووتەکەی نەبووە - واتە : لە فەرموودەدا : دەرئەچن لە دین وەکو چۆن تیر لە نێچیرەکە دەرئەچێت، پاشان ناگەڕێنەوە هەتاوەکو و تیرەکە نەگەڕێتەوە شوێنی خۆی)؟

ئەو هەرگیز ناگەڕێتەوە) .

- لە (الإبانة الكبرى) دا الفضل بن زياد ئەڵێت : وتم بە أبو عبدالله : پێم گەیشتووە لە الشراک ـەوە تۆبەی کردووە و گەڕاوەتەوە .

وتی : (درۆ ئەکات، ئەوانە تۆبە ناکەن، وەکو چۆن أیوب ئەڵێت : کاتێک یەکێکیان لێی دەرئەچن ناگەڕێنەوە ناوی) .

٣٧٣ - عبدالله بن عون ئەڵێت : (محمد بن سـيرين پێی وابوو مەبەسـت لەم ئایەتە | فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ | (النِّسَاء : ٦٣) .

ئەهلی هەوا و ئارەزووە) .

٣٧٤ - معمر ئەڵێت : (إبن طاوس دانیشتبوو، کەسێکی موعتەزیلی هات و قسـەی کرد، جا إبن طاوس پەنجەکانی کردە گوێیەکانیەوە و بە کوڕەکەی وت : (کوڕی خۆم بە توندی پەنجەکانت بکە بە گوێتدا و گوێ لە هیچ شتێک لە قسەکانی مەگرە) .

واتە دڵ لاوازە) .

٣٧٥ - عبدالرزاق ئەڵێـت : إبراهیم بن أبي یحیی پێی وتم : من ئەبینم لەلای ئێوە موعتەزیلی زۆرە .

وتم : (بەڵێ) .

وتی : وە ئەڵێن تۆش لەوانیـت، ئایا پێکەوە نەچینە نـاو ئەو دوکـانەوە بۆ ئەوەی قسەت لەگەڵدا بکەم ؟

وتم : (نەخێر) .

وتی : بۆچی ؟

وتم : (چونکە دڵ لاوازە، وە دینیش بۆ ئەو کەسە نییە کە زاڵ ئەبێت) .

٣٧٦ - الحسـن البصـري ئەڵێت : (هەرکەسـێک شـوێنکەوتە بوو ئەوە با شوێنی رسول الله ﷺ بکەوێت) .

٣٧٧ - سعید بن المسیب ئەڵێت : (من شەو و ڕۆژ هەبوو ڕێم ئەکرد بۆ بەدەستهێنانی تەنها فەرموودەیەک) .

**: ئێمەش الحمدلله ئێستا ئەتوانین لەناو موبایلەکانماندا لە بەرنامەیەکی ئاساییدا هەموو فەرمووده و ڕوونکردنەوەکانیان دابەزێنین بەڵام قەدری نیعمەتەکە نازانین و خۆمان بە دنیا و شتی پووچەوە سەرقاڵ کردووە .**

٣٧٨ - حجاج الأحول ئەڵێت : عكرمة وتی : (زانســـت نرخ و بەهای خۆیی هەیە ) .

وتیان : نرخ و بەهاکەی چییە ؟

وتی : (بە ئەو کەســەی بڵێت کە بە باشــی ئەیپارێزێت و لەدەســتی نادات و نایفەوتێنێت ) .

٣٧٩ - محمد بن علي ئەڵێـت : (لەگەڵ دەمەدەمێکـارانـدا دامەنیشـــن ، چونکە ئەوانە لە ئایەتەکانی الله عز وجل دا قسە و دەمەدەمێ ئەکەن ) .

٣٨٠ - عطاء بن أبي رباح دەربارەی فەرمایشـــتی الله عز وجل : | إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ | (الأَنْعَام : ١٥٩) .

وتی : (ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەمەدەمێ ئەکەن لە دینی الله عز وجل دا ) .

٣٨١ - محمد بن سـيرين ئەڵێت : (ئەگەر دەججال دەربچێت خاوەن هەوا و ئارەزووەکان شوێنی ئەکەون ) .

٣٨٢ - مُطِّرف ئەڵێـت : (زۆربەی شـــوێنکەوتووانی دەججـال یەهودی و بیدعەچیەکانن ) .

**٣٨٣ - مجاهد بن جبر** لە تەفسیری فەرمایشتی الله عز وجل : | وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ | (الأَنْعَام : ١٥٣) .

ئەڵێت : (بیدعە و شوبهە و گومانەکان) .

**٣٨٤ - مجاهد بن جبر** ئەڵێت : (نازانم کام لەم دوو نیعمەتە گەورەترە ؟ ئەوەی کە الله هیدایەتی داوم بۆ ئیسلام، یان ئەوەی پاراستوومی لەم هەوا و ئارەزووویانە) .

**٣٨٥ - مجاهد بن جبر** لە تەفسیری فەرمایشتی الله عز وجل : | زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا | (الأَنْعَام : ١١٢) .

ئەڵێت : (ڕازاندنەوەی باتڵ بە زمانەکان) .

---

- لە (قصيدة الزنجاني في السنة) دا هاتووە نعيم بن حماد لە عبدالله بن المبارك لە ڕێگەی سفيان الثوري ئەویش لە ڕێگەی منصور بن المعتمر ئەگێڕێتەوە لە علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب ئەڵێت : باوکم الحسين بن علي بن أبي طالب بۆی گێڕامەوە وتی : (لەلای پێشەوای ئیمانداران علي بن أبي طالب منداڵەکانی خۆی و منداڵی جعفر ی برای کۆبووینەوە، باسی سەرەتای بەدیهێنانی بۆ کردین، وە یەکەم شت الله عز وجل دروستی کرد قەڵەم بوو، پاشان بردی بەسەر لوح المحفوظ دا بەوەی کە ڕووئەدات هەتا ڕۆژی قیامەت، پاشان عەرشی دروست کرد و، لەسەر ئاو داینا، پاشان ئاسمانەکان و زەویەکانی دروست کرد هەتا لە کۆتاییدا ئادەمی دروست کرد، دواتر دابەزێندرا بۆ سەر زەوی، کردی بە جێنشینی خۆی تیایدا، وە وەچەی بۆ دانا، ئەوانەش دانیشتووانی سەر زەوین، پاشان لە هەموو سەردەمێکدا پێغەمبەرانێکی مژدەدەر و ئاگادارکەرەوەی ناردووە بۆ ئەوەی خەڵکی بانگ بکەن بۆ تەوحید، وە دایانبمەزرێنن لەسەر ڕێبازی فەرمان و نەهیکردن، جا وەڵامیان دایەوە ئەوانەیان کە الله خۆشبەختی ویست بۆیان، بەردەوام هەموو ئوممەتێک لەسەر بەرچاوڕۆشنی بوون لە دینەکەیاندا هەتا دەستگرتوو بوون بە پەیمانی پێغەمبەرەکەی و، لەسەر ئەوە بمێننەوە کە

پێغەمبەرەکەیان جێی هێڵان لەسەری، هەتا کاتێک الله ویستی لەناوچوویانی هەبوو، ئیتر ئەو شەیتان و ئینسانانەی کار بە بۆچوون ئەکەن لەناویاندا دەرکەوتن، لایاندان لەسەر ڕێگە و مەنهەجی پێغەمبەرەکەیان و باتڵیان بۆ ڕازاندنەوە و بانگیان کردن بۆی، ئیتر الله پێویستی پێیان نەما و لەناوی بردن، وە دینی خەڵکیی نوێ کردەوە بە پێغەمبەرێکی تر، وە من ترسام لەوەی ئەو شەیتانانە پەلەیان کردبێت بۆ ئەم دینە) .

نعيم بن حماد ئەڵێت : عبدالله بن المبارك وتی : (تێرامام لە وتەی پێشەوای ئیمانداران علي بن أبي طالب رضي الله عنه بینیم لە قورئاندا ڕوون کراوەتەوە) .

پێی وترا : لە چ شوێنێکدا ؟

وتی : (لە سورەتی الأنعام ـدا، الله تعالى و تقدس ئەفەرموێت : | وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًاۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ | (١١٢) .

الله ناوی فەیلەسوف موتەکەلیمەکانی نا لەم ئایەتە بە پێنج ناو .

ناوی نان : (دووژمنەکانی ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە) .

وە ناوی ناون : (شەیتانە مرۆڤەکان)، لە سوورەتەکەدا فەرموویەتی : | وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْۖ | (١٢١) .

واتە شەیتانی جنۆکە وەحی ئەکەن بۆ ئەولیاکانیان لە شەیتانە مرۆڤەکان بۆ ئەوەی موجادەلەتان لەگەڵدا بکەن .

وە وتەکەیانی ناو ناوە | زُخْرُف |، ئەوەش بریتیە لە ئەوەی دەرەوەی ڕازێندراوەتەوە، وە لە ناوەڕۆکدا مانایەکی بەدەستهاتووی تیادا نییە .

وە ناوی ناوە | غُرُورًاۚ |، ئەوەش بریتیە لە سەراب، کەسی تینوو وا ئەزانێت ئاوە هەتا ئەگاتە لای و هیچ نابینێتەوە .

وە ناوی ناوە (إفتراء)، چونکە فەرموویەتی | فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ | واتە ئەوەی بە درۆ ئەیلێن .

پاشان فەرموویەتی : | وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡـَٔاخِرَةِ | .

| تَصۡغَىٰٓ | واتە مەیلی هەبێت، واتە ئەوانەی ئیمانیان بە الله و ڕۆژی دوایی نییە مەیلیان هەبێت بۆ لای وتە ڕازێندراوەکانیان .

پاشان ئەفەرمووێت : | وَلِيَرۡضَوۡهُ وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ | (١١٣) .

ئەو پیتی (لام) ـــە پێی ئەوترێت لام ـــم هەڕەشـــەکردن، وەکو چۆن پیاو بە هاوەڵەکەی ئەڵێی : (ليفعل ما يشاء، فإني من وراء مجازاته) .

واتە : با ئەوە بکات کە ئەیەوێت، من خۆم دواتر سزای ئەدەم .

پاشـان ئەفەرمووێت : | أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡتَغِي حَكَمٗا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰـــبَ مُفَصَّلٗاۚ | .

واتە ڕوونکەرەوەی ئەوەی کە پێویستە .

| وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰـــهُمُ ٱلۡكِتَٰـــبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ | (١١٤) .

لەوانەی کە گومانیان هەیە لەوەی لەلایەن الله ـەوە دابەزیبێت .

پاشان ئەفەرمووێت : | وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰـتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ | (١١٥) .

جا ئەوەی شایەتی بۆ کتێبی الله بدات بە تەواوێتی و ڕاستی و دروستی ئەوکات چ پێویستی بە تەئویلی تەئویلکاران و تەحریفی لەسنوور دەرچووان هەیە ؟

پاشان فەرمووی : | وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ | (١١٦) .

بەوە ئاماژەی دا بەوەی زۆری و بڵاوبوونەوە بۆ ئەهلی باتڵە، وە حەق و ڕاســتی کاتێک قیامەت نزیک ئەبێتەوە بەرەو لاوازیە) .

٣٨٦ - مجاهد بن جبر لە تەفسیری فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۚ ﴾ (التَّوْبَة : ١١٠) .

ئەڵێت : (مەگەر بمرن) .

---

: ﴿ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ (التَّوْبَة : ١١٠) .

**مەبەستی لەو مزگەوتەیە کە مونافیقەکان بۆ زیانگەیاندن بە مزگەوتی قباء و دووڕووی دروستیان کرد، جا ئەفەرموویێت داخ و پەژارەی ئەو مزگەوتەی کە ڕووخانتان لە دڵیان دەرناچێت مەگەر بمرن .**

٣٨٧ - مجاهد بن جبر لە تەفسیری فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ﴾ (الأَنْعَام : ٦٨) .

ئەڵێت : (گاڵتە بکەن، وە ڕێگری لە محمد ﷺ کرا لەگەڵیاندا دابنیشێت کاتێک گوێی لێبوو قسە بکەن لە قورئاندا بە شتێک کە ڕاست نییە) .

٣٨٨ - عمرو بن مالک ئەڵێت : گوێبیستی أبو الجوزاء بووم باسی خاوەن هەوا و ئارەزووەکانی کرد و وتی : (ئەگەر ماڵەکەم پڕ بێت لە مەیمون و بەراز، پێم خۆشترە یەکێک لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو ببێت بە دراوسێم) .

٣٨٩ - علقمة بن قیس ئەڵێت : (لەناو خۆتاندا باسی فەرموودە بکەن، چونکە زیندووکردنەوەکەی باسکردنیەتی) .

**٣٩٠ - أيوب السختياني** ئەڵێت : دانیشتم لەلای طلق بن حبیب، سعید بن جبیر بینیمی، وتی : (دامەنیشــە لەگەڵ طلق، ئایا ڕێگریم لێ نەکردیت و ئاگادارم نەکردیتەوە لە طلق ؟) .

**٣٩١ - عطاء الخراسـاني** ئەڵێت : (نزیکە الله عز وجل مۆڵەت بە بیدعەچی نەدات بۆ تەوبەکردن) .

---

- لە **(بدائع الفوائد)** ـــدا المروذي ئەڵێت : پرسیار کرا لە أحمد دەربارەی ئەوەی هـاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ : (**الله تەوبەی گرتووەتەوە لە خـاوەنی بیـدعە**)، مـانـای چییە ؟

وتی : (خاوەن بیدعەیەک ڕێنمونی ناکرێت بۆ تەوبە و بۆی ئاسان ناکرێت) .

- إبن تيمية لە **(مجموع الفتاوى)** ـــــدا دەربارەی فەرموودەکە ئەڵێت : (واتاکەی ئەوەیە تۆبەی لێ ناکات، چونکە وا حســاب ئەکات لەســەر هیدایەتە، خۆ ئەگەر تۆبە بکات ئەوە الله وەریئەگرێت وەکو چۆن تۆبە لە کافریش وەرئەگرێت، وە ئەو کەســەی بڵێـت : تەوبەی کەســی بیدعەچی بە ڕەهـایی وەرنـاگیرێت ئەوە هەڵەیەکی گەورەی کردووە) .

- وە إبن أبي عاصم لە **(السـنة)** ـــکەیدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی : (ئەوەی بـاســکراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی : (**الله کردەوەی خـاوەن بیـدعە قبووڵ ناکات**) .

- وە محمد بن وضاح لە **(البدع والني عنها)** ـدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی (ئایا خاوەنی بیدعە تەوبەی هەیە ؟) .

**٣٩٢ - عطاء** ئەڵێت : (پێم گەیشـــتووە لەوەی کە الله دایبەزاندووەتە ســەر موسـی : لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا دامەنیشــە، بەوهۆیەوە شـتێک دروسـت بکەن لە دڵتدا کە تیایدا نەبووە ) .

**- إبن القیم لە (بدائع الفوائد) ــدا دەربارەی تێکەڵبوون لەگەڵ بیدعەچییەکاندا ئەڵێت : (هەموو لەناوچوونێک لە تێکەڵبوونەوەیە، وە تێکەڵبوون وەکو خواردنەوەی ژەهر وایە، ئەم جۆرە کەسـانە چەندە زۆرن الله زیادیان نەکات، ئەوانەی ئەهلی بیدعە و گومڕایین، ڕێگە لە ســوننەتی رســول الله ﷺ ئەگرن و بانگەوازی ئەکەن بۆ خیلافی ســوننەتەکەی، ئەوانەن کە ڕێگە ئەگرن لە ڕێبـازی الله عز وجـل و بە خواروخێچی ئەیانەوێت، هەربۆیە بیدعە ئەکەن بە ســوننەت، وە ســوننەت ئەکەن بە بیدعە، چاکە ئەکەن بە خراپە و خراپەش ئەکەن بە چاکە .**

**ئەگەر لەناویدا بە باســی تەوحید بکەیت وەکو خۆی ئەوە ئەڵێن : تانەت دا و کەمتکردەوە لە ئەولیا و پیاوچاکان .**

**وە کاتێک باسی شوێنکەوتنی رسول الله ﷺ ئەکەیت ئەڵێن : کەمیت نواندووە بەرامبەر ئەو پێشەوایانەی خەڵکی شوێنیان کەوتوون .**

**وە کاتێک وەسـفی الله ئەکەیت بەوەی کە وەسـفی خۆیی پێ کردووە، وە بەوەی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەســفی پێکردووە بەبێ زیـاد و کەم، ئەوە پێی ئەڵێن : تۆ لە موشەبیهەکانیت .**

**وە ئەگەر وازت لەوە هێنا کە خۆت لەســەریت و شــوێن هەوا و ئارەزووەکانیان کەوتیت ئەوە لەلای الله تعالى لە دوڕاوانیت، لەلای ئەوانیش لە دووڕووەکان) .**

**٣٩٣ - عبدالعزیز** ئەڵێت : (الحســن ڕێگری ئەکرد لە دانیشــتن لەگەڵ معبد الجهني ، وە ئەیوت : ئەو گومڕایەکی گومڕاکەرە)) .

**٣٩٤ - معاوية بن قرة** ئەڵێت : (دەمە دەمێکردن لە دیندا کار و کردەوە پووچەڵ ئەکاتەوە) .

**٣٩٥ - مغيرة** ئەڵێت : عبيدة السلماني وتی : (لەپێش قیامەتدا بیست و شتێک دەججال هەیە) .

وتم : ئایا پێت وایە المختار یش لەوان بێت ؟

وتی : (ئەو لە سەرگەورەکانە) .

---

**- إبن عبدالبر لە (الإستيعاب) ـدا ئەڵێت : (المختار بن أبي عبيد بن مسعود الثقفي، باوکی لە بەڕێزترینی هاوەڵان بوو رضي الله عنهم، المختار ساڵی هیجرەت لەدایک بوو و هاوەڵێتی نییە، وە ڕیوایەتی نییە، وە ئەو هەواڵانەی دەربارەی هاتوون باش نییە، کەسە خاوەن متمانەکان دەربارەی گێڕاویانەتەوە، وەکو سويد بن غفلة و الشعبي و جگە لەوان، مصعب بن الزبير کوشتی لە کوفە ساڵی ٧٧ ھ) .**

**- إبن قايماز لە (السير) دا ئەڵێت : (المختار درۆزنەکەیە، پێغەمبەر فەرموویەتی : (لە ثقيف درۆزنێک و بکوژێک ئەبێت)، درۆزنەکە ئەمە بوو، بانگەشەی ئەوەی کرد وەحی دێت بۆی، وە غەیب ئەزانێت، وە بکوژەکەش الحجاج بوو، قبحهما الله) .**

**٣٩٦ - أبو علقمة الفَرَوي** ئەڵێت : زيد بن أسلم شتێکی گێڕایەوە، پێی وترا : کێ بۆی گێڕایتەوە ؟

وتی : (مەگەر پرسیارم هاوەڵانی سەرخۆشکەر و گۆرانی کردووە ؟ بەڵکو ئێمە بۆ خۆمانمان هەڵئەبژارد) .

---

**: واتە لە هەموو کەسێکەوە ڕیوایەتمان نەئەکرد، بەڵکو لەو کەسانەمان ئەکرد کە خاوەن متمانەن، ئەمەش مانای ئەو هەڵبژاردنەیە کە باسی ئەکات، زید بن أسلم تابیعیە.**

**٣٩٧ - الحسن البصري** ئەڵێت : (بیدعەچیەکان هاوشێوەی یەهوودی و نەسرانیەکانن) .

---

**- لە (الإستقامة) دا سفیان بن عیینة ئەڵێت : (ئەیانوت ئەو زانایەی خراپ ئەبێت ئەوە لێکچوویەکی تێدایە لەگەڵ یەهوودیەکان، وە پەرستشکارەی خراپ ئەبێت لێکچوویەکی تێدایە لەگەڵ نەسرانیەکاندا) .**

**٣٩٨ - عمران بن عبدالله بن طلحة** ئەڵێت : القاسم بن محمد بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی باسی قەدەریان ئەکرد، وتی : (قسە بکەن لەوەدا کە بیستووتانە الله عز وجل باسی کردووە لە کتێبەکەیدا، وە واز لەوە بهێنن کە وازی لێ هێناوە - **واتە ئەوەی کە باسی نەکردووە -** ) .

**٣٩٩ - مورق العجلي** ئەڵێت : (فێری سوننەت و الفرائض ببن وەک چۆن فێری قورئان ئەبن) .

**٤٠٠ - عاصم الأحول** ئەڵێت : أبو العالية پێی ئەوتین : (فێری ئیسلام ببن، هەر کە فێری ئیسلام بوون ئینجا فێری قورئان ببن، کە فێری قورئان بوون ئینجا فێری سوننەت ببن، چونکە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ ڕێگە ڕاستەکەیە، وە ئاگاداری ئەوە بن ڕێگە ڕاستەکە بە ڕاست و چەپدا ببەن، وە ئاگاداری ئەو هەوا و ئارەزووانە بن کە دوژمنایەتی ئەخاتە نێوان خەڵکیەوە) .

: واتە فێر ببە بزانە ئیسلام چییە و بۆچی پێت ئەوترێت موسوڵمان، وە چ ئەرکێکت لەسەرە بەرامبەر دینەکە .

ئێستا بە پێچەوانەوەیە، منداڵەکە هەر لە سەرەتاوە پێی ناوترێت تۆ لەبەر ئەوە موسوڵمانیت تەنها الله عز وجل ئەپەرستیت و شەریکی بۆ دانانێیت لە هیچ تایبەتمەندیەکیدا، بەڵکو فێری تەجوید و زانستەکانی قورئان ئەکرێت بەس نازانێت قورئانەکە بۆچی دابەزێندراوە و مەبەستی سەرەکی قورئان چییە .

- محمد بن عبدالوهاب لە (فضل الإسلام) ـــدا ئەڵێت : (ڕابمێنە لەم وتەیەی أبو العالية چەندە گەورەیە، وە شارەزای ئەو سەردەمە ببە کە ئاگاداری ئەدات لەبارەی ئەو هەوا و ئارەزوویانەی کە ئەو کەسەی شوێنی بکەوێت لە ئیسلام لایداوە .

وە تەفسیرکردنی ئیسلام بە سوننەت .

وە ئەو ترســەی هەیەتی لەســەر زانا و دیارەکانی تابیعیەکان لەوەی لە قورئان و سوننەت دەربچن .

ئەم فەرمایشتانەی الله عز وجل ــت بۆ ڕوون ئەبێتەوە : ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ ﴾ (البَقَرَة : ١٣١) .

وە فەرمایشتی : ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ (البَقَرَة : ١٣٢) .

﴿ وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ ﴾ (البَقَرَة : ١٣٠) .

وە هـاوشـێوەی ئەم بنچینە گەورەیـانە کە بریتین لە بنچینەی بنچینەکـان و خەڵکیش بێئاگان لێی .

وە بە زانینی واتای فەرموودەکانی ئەن دەروازەیە و هاوشێوەکانی ڕوون ئەبێتەوە.

**وە ئەو کەسەی لە ئەو ئایەتانە و هاوشێوەکانیان ئەخوێنێتەوە و دڵنیا و بێخەمە لەوەی تووشی نابێت، وە پێی وایە تووشی کۆمەڵە کەسانێک بووە و نەماوە، ئەوە :** | أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَـٰسِرُونَ | (الأَعۡرَاف : ٩٩) .

**٤٠١ - قتادة** ئەڵێت : أبو العالیة پێی وتین : (دە ساڵ پاش وەفاتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ قورئانم خوێندەوە، الله عز وجل دوو نیعمەتی پێداوم نازانم کامەیان گەورەترە، ئەوەی کە هیدایەتی دام بۆ ئیسلام، یان پاراستمی لەوەی ببم بە حەروریەک - گروپێکن لە خەواریجەکان - ) .

**٤٠٢ - عبدالعزیز بن عبیدالله** ئەڵێت : پیاوێک بە عامر الشعبي ی وت : شُرَیح و إبن مسعود هاوڕان .

الشعبي وتی : (بەڵکو شریح شوێن إبن مسعود کەوت، هاوەڵانی رسول الله ﷺ ڕێک ئەکەون و خەڵکی دیکەش شوێنیان ئەکەون) .

---

: شریح یەکێکە لە گەورە تابیعیەکان .

**٤٠٣ - الشعبي** ئەڵێت : (وشەی نازانم نیوەی زانستە) .

**٤٠٤ - إبن أبي لیلى** ئەڵێت : (دەمەدەمێ ناکەم لەگەڵ هاوڕێکەمدا، چونکە یان بەدرۆی ئەخەمەوە، یاخود تووڕەی ئەکەم) .

**٤٠٥ - مصعب بن سعد** ئەڵێت : (لەگەڵ کەسێکدا دامەنیشە کە تووشی فیتنە بووە، چونکە یەکێک لەم دوو شتەت بەهۆیەوە تووش ئەبێت : یان دڵت

نەخۆش ئەخات و شـــوێنی ئەکەویت، یاخود ئازارت ئەدات پێش ئەوەی بەجێی بهێڵێت ) .

---

- لە (أصول السنة لابن أبي زمنين) ـــدا مصعب بن سعد ئەڵێت : (دامەنیشە لەگەڵ کەســێکدا کە خۆی تووشــی فیتنە بووە، چونکە یەکێک لەم دووانەت تووش ئەبێت :

یان ئەوەتا تووشی پێخلیسکانت ئەکات .

یاخود دڵت نەخۆش ئەخات ) .

**٤٠٦ - أبو إدريس الخولاني** ئەڵێت : (ئەگەر ببینم ئاگرێک لە مزگەوت بلێسە ئەسێنێت، بەلامەوە خۆشترە لەوەی ببینم بیدعەیەکی تێدایە و ناگۆڕدرێت ) .

**٤٠٧ - سعيد بن جبير** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ وَلَا تُجَـٰدِلُوٓاْ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ ﴾ (العَنكَبُوت : ٤٦) .

ئەڵێت : (ئەهلی حەرب، بانگیان بکەن، ئەگەر قبووڵیان نەکرد ئەوە بە شمشێر بەرامبەریان بجووڵێنەوە ) .

---

**: مەبەستی ئیمام لە قسەکانی ئەم بەشەی ئایەتەکەیە** ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ ﴾ .

**٤٠٨ - الحسن البصري** ئەڵێت : (زانا دنیا نەویســـتە، ڕووی کردووەتە ئاخیرەت، دەستی گرتووە بە سوننەتی رسول الله ﷺ) .

# چینی سێیەم

**٤٠٩ - الحسـن بن بشـر** ئەڵێت : (عمر بن عبدالعزیز بۆ پیاوێکی نووسـی : سلام علیک، أما بعد، من وەسیەتت بۆ ئەکەم بە تەقوای اللە، وە بە نێوەندگیری لە دینەکەیدا، وە بە شـوێنکەوتنی سـوننەتی رسـول اللە ﷺ، وە بە وازهێنان لەوەی بیدعەچیەکان دایانهێناوە لەپاش خۆی، چونکە سـوننەتەکەی هاتووە و جێگیر بووە .

پاشـان بزانە هەرگیز هیچ بیدعەیەک نەبووە ئیللا لە پێش ئەوەوە شـتێک تێپەڕیوە کە بەڵگە و نیشـانە بووە لەسـەری و پەند و ئامۆژگاری بووە دەربارەی، جا پەیوەستبە بە سوننەتەوە، چونکە بە ئیزنی اللە پارێزراویە بۆت، چونکە سـوننەت کەسێک دایناوە کە زانیویەتی لە غەیری لە سـوننەتدا چ هەڵە و پێهەڵخلیسـکان و قووڵبوونەوە و گەوجێتیەک هەیە، جا ڕازیبە بەوەی ئەو خەڵکە **- واتە هاوەڵان رضي اللە عنهم -** ڕازی بوون پێی بۆ خۆیان، چونکە ئەوان سـەرەڕای زانیاریان وەسـتان، وە بە بەرچاوڕۆشـنیەوە وازیان هێنا، وە ئەوان لە دەرخسـتنی بابەتەکاندا بەهێزتر بوون، وە ئەولاتر بوون بە فەزڵێک ئەگەر تێیدا بێت، چونکە ئەوان پێشتانکەوتوون، خۆ ئەگەر هیدایەت ئەوە بووایە کە ئێوە لەسەرینی ئەوە پێشتان ئەکەوتن بۆ ئەو هیدایەتە، خۆ ئەگەر بڵێیت : (داهێنراوێکە لە پاش ئەوان داهێنراوە) ئەوە هیچ کەسێک داینەهێناوە ئیللا ئەوە نەبێت کە شوێنی ڕێگەیەک بێجگە لە ڕێگەی ئەوان کەوتووە، وە خۆی لەوان دوورخستووەتەوە .

بێگومان قسـەیان کردووە **- واتە لە دیندا -**، جا ئەوەی کەمتر لەوان بڵێت ئەوە کەمترخەمە، وە ئەوەی زیاتر لەوان بڵێت ئەوە سـنووربەزێنە، خەڵکانێک لەدوای ئەوان کەمتەرخەمیان کرد لەوەی کە ئەوان لەسـەری بوون و تووشـی

شـــلرەوی بوون، وە خەڵکانێکیش خۆیان لەوان بەرزترکردەوە تاوەکو تووشـــی زێدەڕەوی بوون، بەڕاســتی لەگەڵ ئەوەشــدا هەر ئەوان - هاوەڵان - لەســەر ڕێگا ڕاستەکە بوون .

خۆ ئەگەر ئەڵێیت : نیشانە و بەڵگەی ئەمە لەکوێیە ؟ وە بۆچی الله ئاوا و ئاوا ئەفەرموویت ؟

بەڕاستی ئەوەی ئێوە ئەیخوێننەوە ئەوانیش خووێندوویانەتەوە، وە لە واتای ئەوە تێگەشتن و زانیان کە ئێوە نەزان بوون پێی و تێنەگەشتن لێی، پاشان لەدوای هەموو ئەمانە وتیان : هەموو  شتێک بە قەدەرە و نوسراوەتەوە) .

٤١٠ - **میمون بن مهران** ئەڵێت : (ڕۆیشـــتین بۆ لای عمر بن عبدالعزیز، وامانزانی ئەو پێویستی بە ئێمەیە، کەچی ئێمە لەلای ئەو تەلەبە بووین) .

٤١١ - **عمرو بن مهاجر** ئەڵێت : عمر بن عبدالعزیز بۆ خەڵکی نووســی کە : (هیچ کەســێک بۆی نییە بۆچوونێکی هەبێت لەگەڵ ســوننەتێکدا کە رســول الله ﷺ دایناوە) .

٤١٢ - **محمد بن الحجاج بن أبي قتلة الخولاني** ئەڵێت : عمر بن عبدالعزیز بۆ عبدالملك ـــی کوڕی نووسی : (حەق و ڕاستی بکە بە پێشـەوای خۆت، وە لەو کەســـانە مەبە کـاتێـک حەق قبووڵ ئەکەن گەر لەگەڵ هەوا و ئارەزوویـانـدا بگونجێت، وە وازی لێ ئەهێنن گەر پێچەوانەی هەوا و ئارەزوویان بێت، چونکە پاداشــتت نادرێتەوە لەوەی کە قبووڵت کردووە لێی، وە ڕزگارت نابێت لە تاوانی ئەوەی کە قبووڵی ناکەیت کاتێک لەگەڵتدا نەگونجا .

وە با زانستەکەت ئەو زانستە بێت کە الله دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە تێیدا ئەو شتەی خۆشی ئەوێت و ڕقی لێئەبێتەوە ڕوونی کردووەتەوە، وە خەڵکی ئاشـــنا کردووە بە کاروباری دین، وە بانگی کردوون بۆ لای کتێبەکەی، وە ڕێنموونیـان ئەکـات بۆ لای ڕێزلێنـانەکەی، وە بەهۆیەوە لە ســزا و تۆڵەی

ئەیانپارێزێت، وە ڕازی بوونی خۆی بۆیان مسـۆگەر ئەکات، وە بەهۆیەوە ئەینباتە باشترین شوێن و مەنزیلەتی دروست کراوەکانی الله عز وجل، ئەمە ئەو زانستەیە کە ئەوەی بیزانێت نەزان نییە، وە ئەوەی نەزان بێت پێی زانا نییە، جا پێشـی بخە بەسەر جگە لە خۆیدا، وە بووەستە لە سنووری ڕێگریەکانیدا، چونکە ئەمە حەقە لەسەر ئەوەی کە فێری ئەبێت و ئەیزانێت، وە شوێن گوێڕایەڵی و فەرمانەکانی الله بکەوە لەوەی کە ئەو وەسیەتی پێ کردووە، ئەو زانستە نوری الله یە دایبەزاندوە وە هیدایەتی دۆستانی خۆی پێداوە، وە هەرکەسێ بەشێکی لەم زانستە نەبێت، ئەوا لە هیچی سوودمەند نابێت، وە لە تاریکیدا ئەبێت تا لە دونیا بمێنێتەوە).

**٤١٣ - محمد بن أبي بَرزة** ئەڵێت: (عمر بن عبدالعزیز لە الموقف ـدا دوعای ئەکرد ئەیوت: ئەی پەروەردگارم سـوودمەندم بکە بە ئیسـلام و سـوننەت، وە بەرەکەت بخەرە ناویانەوە بۆم).

---

**- لە (تاريخ بغداد) ــدا طلحة بن عبيدالله البغدادي ئەڵێت: من و أحمد بن حنبل وا ڕێککەوت پێکەوە بڕۆینە کەشـتیەوە، ماوەیەکی زۆر بێدەنگ ئەبوو، کاتێک قسەی بکردایە ئەیوت: (ئەی پەروەردگارم بمانمرێنە لەسەر ئیسلام و سوننەت).**

**- لە (طبقات الحنابلة) ـدا الحسن بن أيوب ئەڵێت: أحمد بن حنبل پێی وترا: الله بتژیەنێت ئەی أبو عبدالله لەسەر ئیسلام.**

**وتی: (سوننەتیش).**

**- المروزي لە (الورع) دا ئەڵێت: وتم بە أبو عبدالله: هەرکەسێک لەسەر ئیسلام و سوننەت بمرێت لەسەر چاکەیەک مردووە؟**

**پێی وتم: (بێدەنگ بە! ئەوەی لەسەر ئیسلام و سوننەت بمرێت لەسەر هەموو خێرێک مردووە).**

**- لە (شرح أصول إعتقاد لـ اللالكائي) دا عون ئەڵێت: (ئەوەی لەسەر ئیسلام و سوننەت بمرێت موژدەی لێبێت بە هەموو خێر و چاکەیەک).**

- له (الحلية) ـــدا يوسف بن موسى القطان ئەگێڕێتەوە لە الأوزاعي وتی : پەروەردگاری خاوەن عیززەتم بینی لە خەودا، پێی فەرمووم : (ئەی عبدالرحمن، ئەوە تۆی کە فەرمان بە چاکە ئەکەیت و ڕێگری لە خراپە ئەکەیت ؟) .

وتم : بە فەزڵی تۆ ئەی پەروەردگار .

وتم : ئەی پەروەردگار لەسەر ئیسلام بممرێنە .

فەرمووی : (وە لەسەر سوننەتیش) .

٤١٤ - علي بن أبي حملة ئەڵێت : عمر بن عبدالعزيز بە سليمان بن سعد ـــی وت : (پێم گەیشتووە کە باوکی کاربەردەستی فڵانە شوێنمان زندیقە) .

ســـليمان وتی : جا ئەوە چ زیانێکی بۆی هەیە ئەی پێشـــەوای ئیمانداران ؟ باوک و دایکی پێغەمبەریش ﷺ کافر بوون و زیانیان لێی نەدا) .

عمر ـــيش زۆر تووڕە بوو و وتی : (هیچ نموونەیەکت بۆ نەدۆزیەوە پێغەمبەر ﷺ نەبێت ؟!) .

٤١٥ - مسلم بن يسار ئەڵێت : (ئاگاداری دەمەدەمێ بە، چونکە ئەوە ساتی جاهیلبوونی زانایە، وە شەیتان لەوساتەدا بەشوێن هەڵەی زاناکەوەیە) .

٤١٦ - عبدالله بن مسلم بن يسار لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێت : (ئەگەر بۆت گێڕدرایەوە لە قورئان، ئەوە قسە مەکە هەتا ئەزانیت پێش و پاشەکەی چییە).

---

: واتە کاتێک باسی ئایەتێک بۆ کرا لەلایەن کەسێکەوە کە وەکو شوبهە یان بۆ سوودی خۆی بەکاری ئەهێنێت ئەوە تۆ قسەی لەسەر مەکە هەتا ئەزانیت پێش و پاش ئایەتەکە چییە، چونکە بەوجۆرە مەبەستی ئایاتەکە ڕوون ئەبێتەوە، والله أعلم .

٤١٧ - **محمد بن ثور** ئەگێڕێتەوە لە معمر لە أيوب ئەڵێت : أبو قلابة ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ﴾ (الأَعۡرَاف : ١٥٢) .

وە وتی : (ئەوە سزای هەموو درۆزنێکە، الله سووک و ڕسوای ئەکات) .

---

- لە (الكشف والبيان لـ الثعلبي) ـدا هاتووە مالک بن أنس ئەڵێت : (هیچی بیدعەچییەک نییە ئیللا ئەبینیت لەسەر سەری ڕسوایی و سوکی هەیە، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ﴾ .

واتە : بیدعەچییەکان) .

- لە (الحلية) ـدا سفيان بن عيينة ئەڵێت : (لەسەر زەوی خاوەن بیدعەیەک نییە ئیللا ڕسواییەک دایئەپۆشێت، وە ئەوە لە کتێبی الله دایە) .

وتیان : لە چ شوێنێکی کتێبی الله دایە ؟

وتی : (ئایا گوێبیستی فەرمایشتی نەبوون ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ﴾ ) .

وتیان : ئەی أبو محمد ئەوە تایبەتە بە هاوەڵانی گوێرەکەکە .

وتی : (نەخێر، پاش ئەوە بخوێنەرەوە ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ﴾، ئەوە بۆ هەموو درۆزن و بیدعەچییەکە هەتا ڕۆژی قیامەت) .

- إبن رجب لە (الحكم الجديرة بالإذاعة) ـدا ئەڵێت : (جۆری دووەم : ئەوەی موخالەفەی فەرمانەکەی ئەکات لەبەر گومانەکان، ئەوانەش بیدعەچی و ئەهلی هەوا و ئارەزووەکانن، هەموویان بەشێکیان هەیە لە ڕسوایی و بچووکێتی بە گوێرەی ئەو

موخالەفەیەی هەیانە بۆ فەرمانەکانی، الله تعالى فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ﴾ .

وە ئەهلی هەوا و ئارەزوو و بیدعەچییەکان هەموویان درۆ ئەکەن بەسەر الله عز وجل ـەوە، وە بیدعەکەیان توند و پیس ئەبێت بە گوێرەی زۆری ئەو درۆیانەی ئەیکەن بەسەریەوە .

جا الله عز وجل دایناوە ئەو کەسەی ئەوە حەرام ئەکات کە الله حەڵاڵی کردووە، وە ئەوە حەڵاڵ ئەکات کە حەرامی کردووە ئەوە درۆی بەسەریەوە کردووە .

وە ئەو کەسەی شتێک ئەداتە پاڵ الله لەو شتانەی کە ڕێگەپێدراو نییە بدرێتە پاڵی لە نموونەبۆدانان یان پەکخستن، یاخود بەدرۆخستنەوەی قەدەرەکانی؛ ئەوە درۆی بەسەر الله عز وجل ـەوە کردووە) .

٤١٨ - الفضيل بن عياض ئەڵێت : (وە ئێمەش بە هەمان شێوە پاداشتی بیدعەچییەکان ئەدەینەوە) .

---

: مەبەستی لە ئایەتەکەی سەرەوەیە، واتە ئێمەش بیدعەچیەکان زەلیل و ڕسوا ئەکەین .

٤١٩ - أيوب السختياني ئەڵێت : أبو قلابة وتی : (ئەی أيوب، چوار شت لە منەوە لەبەر بکە :

- لە قورئاندا بە بۆچوونی خۆت قسە مەکە .

- وە ئاگاداری قەدەر بە - واتە قسەی تێدا مەکە - .

- وە کاتێک باسی هاوەڵانی محمد ﷺ کرا ئەوە تۆش قسە مەکە .

- وە ڕێگە مەدە هاوەڵانی هەوا و ئارەزوو قسـەت بۆ بکەن، ئەوەی ویسـتیان بیدەن بە گوێتدا).

**٤٢٠ - أيوب** ئەڵێت : (أبو قلابة وتی : (دامەنیشـە لەگەڵ خاوەن هەوا و ئارەزووەکاندا، چونکە دڵنیانیم لێت لەوەی نەتبەنە ناو گومڕاییەکەیانەوە، یاخود لە شتێکدا سەرت لێ تێکبدەن کە خۆت ئەتزانی).

وە والله لە قورئانخوێنە خاوەن ژیری و عەقڵەکان بوو).

**٤٢١ - إبراهيم النخعي** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : | فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ | (المائدة : ١٤).

ئەڵێت : (وا نازانم ئەو خسـتنە نێوانە لە ئوممەتەدا تەنها هەوا و ئارەزووی جیاواز و ڕک و کینە نەبێت).

---

- **إبن أبي زمنين لە (تفسـير القرآن العزيز) ـــدا ئەڵێت : (لە مانای ڕاسـتی | أَغۡرَيۡنَا | لە زماندا واتە : لکاندمان.**

**وە واتای : | بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَـآءَ | بریتیە لە : بوون بە چەند کۆمەڵەیەکەوە، یەکتری بە کافر ئەزانن).**

**٤٢٢ - إبراهيم النخعي** ئەڵێت : (کاتێک بهاتینایە بۆلای پیاوێک تا لێوەی وەربگرین تەماشای خووڕەوشت و نوێژەکەیمان ئەکرد، پاشان لێمان وەرئەگرت).

**٤٢٣ - عبدالملك بن أبجر** لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێت : (هیچ کاتێک پرسیارم لە إبراهيم نەکردووە دەربارەی شتێک ئیللا پێناخۆشبوونم لە ڕووخساریدا بەدی کردووە).

**٤٢٤ - عبدالله بن الحسن** ئەڵێت : (دەمەدەمە هاوڕێیەتی کۆن تێک ئەدات، وە گرێ و پەیوەندیە توندوتۆڵەکان شل ئەکاتەوە، وە کەمترین شتی بریتیە لە زاڵبوون، ئەوەش بەهێزترین هۆکاری لێکدابڕان و پچڕانە).

**٤٢٥ - أبو قلابة** ئەڵێت : (ئەهلی هەوا و ئارەزوو ئەهلی گومڕایین، واینابینم دەرئەنجامیان شتێکی تر بێت جگە لە ئاگر، تاقیان بکەرەوە، هیچ یەکێکیان نییە خۆی بداتە پاڵ وتەیەک یان کردەوەیەک ئیللا ئەگات بە شمشێر **- واتە لە سەرەتاوە تەنها بیدعەکە دائەهێنێت، پاشان وای لێدێت هەر کەسێک لەسەر بیدعەکەی ئەو نەبێت بە گومڕا یان کافری ئەزانێت -**، وە دووڕوویش چەند جۆرێک بوو، ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ (التَّوْبَة : ٥٨)، ﴿وَمِنۡهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلنَّبِيَّ﴾ (التَّوْبَة : ٦١)، ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ﴾ (التَّوْبَة : ٧٥).

وتەکانیان جیاواز بوو بەڵام کۆبووبوونەوە لەسەر بەدرۆخستنەوە و هەبوونی گومان، وە ئەو کۆمەڵەیەش وتەیان جیاوازە بەڵام کۆبوونەتەوە لەسەر شمشێر).

**٤٢٦ - الربيع بن خثيم** ئەڵێت : (ئەی فتوادەرەکان، بزانن کە چۆن فتوا ئەدەن، هیچ کەسێکتان نەڵێت : الله فلانەی حەلاڵکردووە و فەرمانی پێکردووە، الله عز وجل ـیش پێی بفەرموویت : (درۆت کرد، نە حەلاڵم کردووە وە نە فەرمانم پێکردووە).

وە هیچ کەسێکتان نەڵێت : الله فلانەی حەرام کردووە و ڕێگری لێ کردووە.

الله عز وجل ـیش پێی بفەرموویت : (درۆت کرد، حەرامم نەکردووە و ڕێگریشم لێ نەکردووە)).

٤٢٧ - رَبيع بن خُثَيم ئەڵێت : (نە هەموو ئەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە لەسەر محمد ﷺ پێی گەیشتوون، وە نە هەموو ئەوەی ئەیخوێننەوە ئەزانن چییە).

٤٢٨ - یحیى بن أبي كثیر ئەڵێت : سـلیمان بن داود علیهم السـلام بە کوڕەکەی فەرموو : (ئەی کوڕی خۆم، ئاگاداری دەمەدەمە بە، چونکە سـوودی تیایدا نییە بۆ تۆ، وە ئەبێتە هۆی دوژمنایەتی لە نێوان برایاندا).

٤٢٩ - یحیى بن أبي كثیر ئەڵێت : (کاتێک بیدعەچیەکت بینی لەسـەر ڕێگایەک ئەوە ڕێگایەکی تر بگرەرەبەر).

---

**- لە (البدع والنهي عنها) یحي بن عبید ئەڵێت : (یەکێک لە موعتەزیلیەکان گەیشـت پێم، وەسـتا و منیش وەسـتام، وتم : یان تۆ بڕۆ، یان من ئەڕۆم، لەگەڵ نەسڕانیەکدا ڕێ بکەم پێم خۆشترە لەوەی لەگەڵ تۆدا ڕێ بکەم).**

٤٣٠ - یحیى بن أبي كثیر ئەڵێت : سـلیمان بن داود علیهم السـلام بە کوڕەکەی فەرموو : (عەقڵەکان کەم ئەپێکن و زۆر هەڵە ئەکەن، هەربۆیە پەیوەستبە بە کتێبی الله وە، وە بەرەڕووی برۆ و بگەڕێرەوە بۆ لای).

٤٣١ - قتادة دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ﴾ (البقرة : ٢٠٤).

ئەڵێت : (دەمەدەمەی هیچ و باتڵ).

---

: واته له‌سه‌ر شتی زۆر هیچ ده‌مه‌ده‌مه و موناقه‌شه ئه‌كات، والله أعلم، ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ﴾.

٤٣٢ - قتادة ده‌رباره‌ی فه‌رمایشتی الله عز وجل : ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ﴾ (الأَنْعَام : ١٢١).

ئه‌ڵێت : (موشریكه‌كان موجاده‌له‌یان له‌گه‌ڵدا كردن له‌سه‌ر سه‌ربڕاو).

---

- له (تفسير عبدالرزاق) دا هاتووه قتادة ده‌رباره‌ی ئایه‌ته‌كه ئه‌ڵێت : (موشریكه‌كان موجاده‌له‌یان له‌گه‌ڵدا كردن له‌سه‌ر سه‌ربڕاو، وتیان : ئه‌وه كه به ده‌ستی خۆتان ئه‌یكوژنه‌وه ئه‌یخۆن، به‌ڵام ئه‌وه‌ی الله كوشتوویه‌تی - واته مرداره‌وه بوو - ئه‌یخۆن ؟!

ئه‌وه موجاده‌له‌كه‌یان بوو به‌رامبه‌ریان).

٤٣٣ - إبراهيم بن أدهم ئه‌ڵێت : (به‌هۆی هاوه‌ڵانی فه‌رمووده‌وه به‌ڵا و ئافاته‌كان دووره‌خرێنه‌وه له خه‌ڵكی).

---

: واته له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هاوه‌ڵانی فه‌رمووده‌یان تێدایه الله عز وجل به‌هۆی ئه‌وانه‌وه ڕه‌حم ئه‌كات به خه‌ڵكی و سزایان نادات.

یاخود به جێبه‌جێكردنی سوننه‌ت و عه‌قیده‌ی ڕاست بڵاوكردنه‌وه و فێركردنی خه‌ڵكی له‌لایه‌ن هاوه‌ڵانی فه‌رمووده‌وه سزای الله عز وجل له‌و كۆمه‌ڵگایه دوور ئه‌كه‌وێته‌وه، والله أعلم.

٤٣٤ - سالم الخواص ئەڵێت : (بەڵا دوورئەخرێتەوە لە خەڵکی سەرزەوی بەهۆی هاوەڵانی فەرموودەوە).

: واتە سوننەت فێری خەڵکی ئەکەن، ئەوانیش کار بە سوننەت ئەکەن، هەربۆیە الله عز وجل لێیان تووڕە نابێت و سزایان نادات، والله أعلم .

- لە (العلل ومعرفة الرجال) ـــــدا إبراهيم النخعي ئەڵێت : (هیچ گوند و ئاوەدانیەک نییە ئیللا کەسێک بەرگری ئەکات لە خەڵکەکەی، من هیوادارم أبو وائل یەکێک بێت لەوان).

٤٣٥ - يوسف بن أسباط ئەڵێت : (بەهۆی فێرخوازی فەرموودەوە بەڵا و نەهامەتی لەسەر ئەهلی زەوی دوور ئەخرێتەوە).

٤٣٦ - أبو حمزة الأعور ئەڵێت : (کاتێک وتەکان لە کوفە زۆر بوون - واتەی بیدعەچییەکان -، هاتم بۆ لای إبراهيم النخعي وتم : ئەی أبو عمران، چی ئەڵێیت دەربارەی ئەم وتەیانەی کە لە کوفە بڵاوبوونەتەوە؟

وتی : (أوە! وتەیەکیان ڕازاندەوە و دینێکیان لەلایەن خۆیانەوە داهێنا کە لە کتێبی الله عز وجل و سوونەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ نییە، وە وتیان ئەوەی موخالەفەی بکات هیچ و باتڵە .

والله ئەوانە وازیان لە دینی محمد ﷺ هێناوە، ئاگاداریان بە).

٤٣٧ - إبراهيم بن أدهم ئەڵێت : (هەرکەسێک شتە نامۆکانی زانایان هەڵبگرێت ئەوە شەڕ و خراپەیەکی زۆری هەڵگرتووە).

: مەبەستی ئەوەیە هەموو زانایاک پلەی چەندە بەرزیش بێت هەڵە و وتەی شازی هەیە، جا ئەگەر کەسێک تەنها شوێن وتە شاز و هەڵەکانی زانایان بکەوێت ئەوە شەڕ و خراپەیەکی زۆری لە خۆیدا کۆکردووەتەوە .

- لە (شـــرح أصـــول إعتقاد لــــ اللالكائي) ـــــدا هاتووە أبو زرعة و أبو حاتم لە عەقیدەکەیاندا کە ئیجماعی ئەو زانایانە ئەگێڕنەوە کە پێیان گەیشتوون ئەڵێن : خۆمان بەدوور ئەگرین لە شازبوون و خیلاف و جیاوازی) .

- لە (مسائل عبدالله) ـــدا يحيى بن سـعيد القطان ئەڵێت : (ئەگەر کەسێک کار بە هەموو ڕووخسەتێک بکات ئەوە پێی ئەبێت بە فاسق) .

- لە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) ـــدا سـليمان التيمي ئەڵێت : (ئەگەر هەڵەی هەموو زانایان وەربگریت ئەوە هەموو خراپەیەکت تیادا کۆبووەتەوە) .

- لە (مســائل الكوسـج) ـــــدا إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (زانا فتوا ئەدات بە شـــتێک پێچەوانەی ئەوەیە کە لە هـاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یـان ئەوانەی بەباشــی شـــوێنیان کەوتوون هاتووە، بەهۆی ئەوەی لەوانەیە لەو زانســـتە بێبەش بووبێت کە لەوبارەیەوە هاتووە، ئەوەی لەســـەر فێرخوازانە هەجرکردنی ئەو وتە دیاریکراوەی ئەو زانایەیە کە سوننەتی لەوبارەیەوە لێ شاراوە بووە) .

- الدارمي لە (النقض) دا ئەڵێت : (ئەوەی ئەیەوێت شاز بێت و لابدات لە حەق شوێن وتەی شـازی زانایان ئەکەوێت، وە خۆی ئەنووسێنێت بە هەڵەکانیانەوە، وە ئەو کەســـەش کە لە نەفســـیدا حەق پێش ئەخات شـــوێن وتەی ناســـراو و بەناوبانگی جەماعەتەکەیان ئەکەوێت، وە لەگەڵ زۆربەیاندا هەڵئەســـووڕێت، ئەمە دوو نیشـــانەی ڕوونە بەڵگەی پێ ئەهێندرێتەوە دەربارەی شوێنکەوتەیی پیاو، یان داهێنان و بیدعەچی بوونی) .

٤٣٨ - الزهري ئەڵێت : (فێربوونی سوننەت باشترە لە پەرستشی دووسەد ساڵ) .

٤٣٩ - السدي ئەگێڕێتەو لە أبو مالك دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل :

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا ﴾ (الأنعام : ٦٨) .

ئەڵێت : (الخوض واتە بەدرۆ خستنەوە) .

٤٤٠ - أسيد بن عبدالرحمن ئەڵێت : (بينيم مكحول سەلامی لە رجاء بن حيوة كرد، جا رجاء وەڵامی سەلامەكەی نەدایەوە) .

**: مكحول لەبەر ئەوە وەڵامی سەلامەكەی نەدراوەتەوە چونكە غيلان القدري لەلای دائەنیشێت، غيلان یەكەمجار طالب علم بووە لای زانایان دواتر بووە بە سەرگەورەی دیاری قەدەریەكان .**

٤٤١ - علي بن أبي جميلة ئەڵێت : غيلان دائەنیشت لەلای مكحول، پێی وترا : ئەوە لەلات دائەنیشێت .

وتی : (دێت و لەلام دائەنیشێت، چیی لێ بكەم ؟!) .

**: ئەكرێت پێش ئەوەی غيلان بانگەشە بۆ عەقیدەكەی خۆی بكات ئەم حاڵەتە روویدابێت، وە دوای دەرخستنی عەقیدەكەی لەلایەن مكحولەوە هەجر كرابێت وەک چۆن لە دواتردا دێت .**

**- لە (السنة لـ عبدالله) دا إبراهيم بن أبي عبلة ئەڵێت : لەگەڵ رجاء بن حيوة دا بووم لەلای مكحول دا وەستا وتی : ئەی مكحول، پێم گەیشتووە تۆ قسەت كردووە لە شتێک لە قەدەردا .**

**مكحول وتی : (نەواللە، الله باشت بكات، ئەوە بابەت و ئیشی من نییە، وە وتەی من نییە) .**

- لە (الإبانة الكبرى) ـدا إبراهيم بن عبدالله الكناني ئەڵێت : (مكحول سوێندی خوارد هیچ سەقفێک ئەو و غیلان كۆنەكاتەوە تەنها سەقفی مزگەوت نەبێت، وە ئەگەر لەلای پایەیەک لە پایەكانی بازاڕیش ببینێت بڕواتە دەرەوە لە بازاڕەكە) .

- لە (القضاء والقدر) ـدا رجاء بن حيوة ئەڵێت : عمر بن عبدالعزیز بە مكحول ــی وت : (ئاگات لەوە بێت لە قەدەردا شتێک بڵێیت كە ئەوانە ئەیڵێن - واتە : غیلان و هاوەڵەكانی - ) .

- لە (لسان الميزان) دا هاتووە مكحول بە غیلان ئەڵێت : (لەلام دامەنیشە) .

- لە (الضعفاء لـ العقيلي) دا محمد بن عبدالله الشعيثي ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای مكحول وتی : ئەی أبو عبدالله هاتووم ئەمڕۆ هاوڕێیەكت بەسەر بكەمەوە، ئیتر هاتە دڵمەوە بچم بۆلای كەسی دیكەش .

مكحول وتی : (كێ یە ؟) .

پیاوەكە وەک بڵێیت پێی ناخۆش بوو بیڵێت، مكحول ــیش بەردەوام بوس هەتا پیاوەكە وتی : غیلان .

مكحول وتی : (غیلان ؟!) .

پیاوەكە وتی : بەڵێ .

مكحول وتی : (ئەگەر غیلان بـانگهێشــتی كردی مەڕۆ بەدەمیەوە، وە ئەگەر نەخۆش كەوت بەسەری مەكەرەوە، وە كاتێک مرد مەكەوەرە دوای جەنازەكەی) .

- لە (الإبانة الكبرى) ـدا إبراهيم بن مروان ئەڵێت : باوكم وتی : وتم بە سعيد بن عبدالعزیز : ئەی أبو محمد، خەڵكی مكحول تۆمەتبار ئەكەن بە قەدەر .

وتی : (درۆیان كرد، مكحول قەدەری نەبوو) .

- لە (إكمال تهذيب الكمال) ـــــدا أبو داود ئەڵێت : پرســیارم كرد لە أبو عبدالله أحمد بن حنبل، ئایا زانایان هیچ شتێكی مكحول یان بەخراپ زانیوە ؟

وتی : (ئینكاریان لە دانیشتنی لەگەڵ غیلان ـــدا كرد، وە تۆمەتباریان كرد پێی - واتە قەدەر -، ئەویش بێتاوانی خۆی دەرخست بەوەی دووری خستەوە) .

**- له (الإبانة الكبرى) دا الأوزاعي ئه‌ڵێت : (پێمان نه‌گه‌یشتووه له هیچ كه‌سێك له تابیعیه‌كانه‌وه قســه‌ی كردبێت له قه‌ده‌ردا ته‌نها ئه‌م دوو پیاوه نه‌بێت : الحســن و مكحول، به‌دوایدا گه‌ڕاین و ده‌ركه‌وت باتڵه) .**

٤٤٢ - عبيدالله بن عمر ئه‌ڵێت : (يحيى بن سعيد الأنصاري فه‌رمووده‌ی بۆ ئه‌گێڕاینه‌وه، كاتێك رَبيعة ده‌ربكه‌وتایه له قســه‌كردن ئه‌وه‌ستــا له‌به‌ر گه‌وره‌یی و به‌ڕێزی ربيعة .

ڕۆژێكیان يحيى ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه : ﴿وَإِن مِّن شَىۡءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ﴾ (الحِجْر : ٢١) .

جميل بن نباتة العراقي وتی : ئه‌ی أبو ســعيد ئایا پێت وایه ســیحر له گه‌نجینه‌كانی الله بێت ؟

يحيى وتی : (ماڵ ئاوه‌دان! ئه‌مه له پرســیار و باســوخواســی موســوڵمانان نییه)، وه خه‌ڵكه‌كه‌ی بێده‌نگ كرد .

عبدالله بن أبي حبيبة وتی : (أبو ســعيد له هاوه‌ڵانی ده‌مه‌ده‌مه و موناقه‌شــه نییه، به‌ڵكو پێشه‌وایه‌كه له پێشه‌واكانی موسوڵمانان، وه منیش ئه‌ڵێم سیحر زیان ناگه‌یه‌نێت ته‌نها به مۆڵه‌تی الله نه‌بێت، ئایا تۆ جیاواز له ئه‌وه ئه‌ڵێیت ؟) .

جا بێده‌نگ بوو، وه‌كو بڵێیت شاخێكمان له‌سه‌ر شان بووبێت و لاابرابێت) .

---

**: له عه‌قیده‌ی قه‌ده‌ریه‌كانه كه هه‌موو شتێكی خراپ له‌لایه‌ن الله عز وجل ــه‌وه نییه و به قه‌ده‌ر داینه‌ناوه له‌ســه‌ر به‌نده‌كانی، هه‌ربۆیه ئه‌و كه‌ســه ڕه‌تی كردووه ســیحر له‌لایه‌ن الله عز وجل ـه‌وه بێت .**

**وه له عه‌قیده‌ی ئه‌هلی سوننه‌دا هه‌موو شتێك به باش و خراپیه‌وه دروستكراوی الله عز وجل ـن و قه‌ده‌ری ئه‌ون، ئه‌و باشه‌یانه‌ی مرۆڤ ئه‌یانكات فه‌زڵێكه الله عز وجل**

**پێیان ئەبەخشـێت، وە ئەو خراپەیانەی تووشـی مرۆڤ ئەبێت هەندێک جار بۆ تاقیکردنەوەیە، وە هەندێک جاریش بەهۆی خراپی مرۆڤەکان خۆیانەوە و شـایستەن، وە لە هەردوو حاڵەتەکە قەدەری الله عز وجل ـە .**

**٤٤٣ - هارون الأعور** ئەڵێت : هشام بن عبدالملک بە کوڕەکانی وت : (فێری ئەدەب بن، چونکە ئەدەبتان بە میراتی بۆ بەجێ بهێڵم بەلامەوە خۆشترە و وە پێم باشـترە لەوەی پارەتان بۆ جێبهێڵم، چونکە پارە ئەڕوات بەڵام ئەدەب ئەمێنێتەوە، وە زانسـت جوانیە و نەزانیش ناشـرینیە، وە باسـی ئەو فەرموودەیانە بکەن کە بە سەنەد لە رسول الله ـەوە ﷺ هاتووە، وە ئاگاداری ئەوە بن فەرموودە کۆبکەنەوە وەک چۆن کەسێک بە شەو دار کۆئەکاتەوە، بەهۆیەوە گومانتان بۆ دروست ببێت دەربارەی دروسـتکەر و دروسـتکراو، وە پەروەردگار و بەندەکان، وە لەگەڵ گەمژەکاندا دامەنیشـن و گاڵتەیان لەگەڵدا مەکەن، وە ئاگاداری هاوەڵانی الکلام بن، چونکە بەرەو هیدایەت و باشی ناڕۆن) .

**٤٤٤ - عمرو بن قيس** ئەڵێت : وتم بە الحکم : چی وای لە مورجیئەکان کرد ببن بە خاوەنی ئەو بۆچوونەی کە ئێستا هەیانە ؟

وتی : (دەمەدەمە) .

**٤٤٥ - علي بن عاصم** ئەڵێت : سکین بن قبیصة بۆی گێڕامەوە وتی : لەلای إیاس بن معاویة بووم پیاوێک پێی وت : ئایا پێت وایە کێشـە بێت بۆم ئەگەر خورمایەک بخۆم ؟

وتی : (نەخێر) .

پیاوەکە وتی : ئەی ئەگەر لە پاش ئەوە کشوت **- جۆرێکی ڕووەکە -** بخۆم ؟

وتی : (نەخێر) .

پیاوەکە وتی : ئەی ئەگەر دوای ئەوە ئاو بخۆمەوە ؟

وتی : (نەخێر) .

پیاوەکە وتی : ئەی بۆچی سەرخۆشکەر حەرام کراوە لەکاتێکدا لە خورما و کشوث و ئاو پێکهاتووە ؟

وتی : (ئایا ئەگەر کیسەیەک خۆل بێنم بیکەم بەسەرتدا ئایا هیچ زیانێکت لێ ئەدات ؟) .

پیاوەکە وتی : نەخێر .

وتی : (ئەی ئەگەر سەتڵێک ئاو بکەم بەسەرتدا ، ئایا زیانت لێ ئەدات ؟) .

پیاوەکە وتی : نەخێر .

وتی : (ئەی ئەگەر کیسەیەک پووش بکەم بەسەرتدا ئایا زیانت لێ ئەدات ؟).

پیاوەکە وتی : نەخێر .

وتی : (ئەی ئەگەر پووش و خۆڵ و ئاوەکە بهێنم و بیکەم بە خشتێک و پاشان بیکێشم بەسەرتدا ؟) .

پیاوەکە وتی : ئەوکات ئەمکوژی .

وتی : (ئەویش هەر وایە) .

٤٤٦ - یونس بن یزید ئەڵێت : الزهري وتی : (دەستگرتن بە سوننەتەوە رزگاربوونە).

٤٤٧ - مکحول ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە شارەزاتر بێت بە ڕێبازی ئەوانەی تێپەڕیون لە الزهري) .

**٤٤٨ - سفيان بن عيينة** ئەڵێت : پرسیاری شتێکم لە هشام بن حجير کرد دەربارەی شتێک ، وتی : (ئایا ئەتەوێت فێری دەمەدەمێت بکەم ؟

ئەگەر پێیان وتیت : نەخێر .

تۆ بڵێ : بەڵێ .

ئەگەر وتیان : بەڵێ .

تۆ بڵێ : نەخێر ) .

---

**: واتە حەقیقەتی دەمەدەمە و جیدال بریتیە لە ملنەدان بۆ حەق و سەرخستنی خۆت بەسەر کەسی بەرامبەردا بە هەر نرخێک بێت .**

**٤٤٩ - عبدالله بن عمر الهدادي** ئەڵێت : هشـــام بن عبدالملک جگە لەم بەیتە شیعرە هیچ بەیتە شیعرێکی تری نەوتووە :

(ئەگەر سەرپێچی ئارەزوو نەکەیت ، ئەوە ئارەزوو * ئەتبات بەرەو شتانێک کە قسەت دێتە سەر بەهۆیەوە ) .

## چینی چوارەم

**٤٥٠ - إسحاق بن عیسی** ئەڵێت : گوێبیستی مالک بووم دەمەدەمەکردنی عەیبدار ئەکرد و ئەیوت : (هەرکاتێک کەسێکی دەمەدەمێکارتر بێت بۆ لامان لە کەسێکی تر، ئەیەوێت ئێمە ئەوە ڕەت بکەینەوە کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی لە جبریل علیه السلام لە الله عز وجل ـەوە) .

---

**- نصر المقدسي لە (مختصر الحجة) ـدا ئەڵێت پاش باسکردنی ئەثەرەکەی مالک بن أنس ئەڵێت : (ئەمە یاسای هاوەڵانی الکلام ـە، وە بناغە و پایەی دینەکەیان بریتیە لە جیدالکردن و دەمەدەمێ لەو شتانەدا کە شەرع پێی نەهاتووە، وە هیچ یەکێک لە پێشەوایانی دین پێشیان نەکەوتووە بۆی، جا خراپی و بەتاڵیەکەی زانرا) .**

**- لە (الإبانة الکبری) ـدا معن بن عیسی ئەڵێت : ڕۆژێکیان مالک لە مزگەوت دەرچوو، پیاوێک کە شوێنی کەوت پێی ئەوترا أبو جویریة، تۆمەتبار ئەکرا بە ئیرجاء .**

**پێی وت : ئەی أبو عبدالله، گوێم لێ بگرە شتێکت بۆ ئەگێڕمەوە، وە بەڵگەت بۆ ئەهێنمەوە، وە بۆچوونی خۆمت پێ ئەڵێم .**

**مالک وتی : (ئەگەر بەسەرمدا زاڵ بوویت) .**

**وتی : (ئەگەر بەسەرتدا زاڵ بووم شوێنم ئەکەویت) .**

**مالک وتی : (ئەگەر پیاوێکی تر هات قسەی لەگەڵ کردین بەسەر هەردووکماندا زاڵ بوو؟) .**

**وتی : شوێنی ئەکەوین .**

مالک وتی : (ئەی عبدالله، الله عز وجل محمد ـی ﷺ بە یەک دین ناردووە، وە ئەتبینم لە دینێکەوە ئەڕۆیت بۆ دینێکی تر، عمر بن عبدالعزیز ئەڵێت : هەرکەسێک دینەکەی بکات بە جێگای مشتومڕ و دەمەدەمە گواستنەوەی زۆر ئەبێت) .

- لە (المعرفة والتاريخ) ـدا مالک بن أنس ئەڵێت : (رسول الله ﷺ ڕۆحی کێشرا و ئەم دینە تەواو و کامل بوو، پێویستە شوێنی ئاثارەکانی رسول الله ﷺ بکەوین، وە شوێن بۆچوون نەکەوین، چونکە هەرکاتێک شوێنکەوتن بۆ ڕەئـو بۆچوون بوو ئەوە کەسێکی تر بەهێزتر لە تۆ لە بۆچووندا دێت و شوێنی ئەکەویت، هەرجارێک کەسێک بێت شوێنی ئەکەویت، وانابینم ئەمە تەواو ببێت) .

- لە (الشريعة) ـدا هشام بن حسان ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای الحسن وتی : ئەی أبو سعید، وەرە با موناقەشەت لەگەڵدا بکەم لە دیندا .

الحسن وتی : (من بەرچاوڕۆشنم لە دینەکەمدا، تۆ ئەگەر دینەکەتت ون کردووە بەدوایدا بگەڕێ) .

- قوام السنة لە (الحجة في بيان المحجة) ـدا ئەڵێت : (زانایانی سەلەف وتیان : هیچ کەسێکمان نەبینیوەتەوە لە موتەکەلیمەکان لە سەردەمانی پێشووەوە هەتا ئێستامان گەڕابێتەوە بۆ وتەی ئەو کەسەی دەمەدەمێی لەگەڵدا ئەکات، وە لە ڕێچکە و ڕێبازی خۆیەوە نەڕۆشتووەتەسەر ڕێچکە و ڕێبازی ئەوەی موناقەشە و مونازەرەی لەگەڵدا ئەکات، ئەمەش بەڵگە بۆ ئەوەی ئەوان خۆیان سەرقاڵ کردووە بە شتێکەوە وازهێنان لێی باشترە لە سەرقاڵ بوون پێیەوە، وە سەلەف زەمی دەمەدەمێکردنی لە دیندا کردووە، وە لەوبارەیەوە چەندین فەرمووده‌یان گێڕاتەوە، وە ئەوان زەمی شتێک ناکەن و تانەی لێ نادەن ئەگەر ڕاست بێت) .

**٤٥١ - أشـهب** ئەڵێت : گوێبیستی مالک بووم وتی : (هەرکاتێک کەسێکی دەمەدەمێکارتر بێت بۆ لامان لە کەسێکی تر، ئەوە واز لەوە ئەهێنین کە خۆمان لەسەرینی، جا ئەگەر وابێت ئێمە هەمیشە بەدوای دۆزینەوەی دینەوەین) .

٤٥٢ - أشهب بن عبدالعزيز ئه‌ڵێت : گوێبیستی مالک بن أنس بووم وتی : (ئاگاداری بیدعه‌کان بن) .

پێی وترا : ئه‌ی أبو عبدالله ، بیدعه‌کان کامانه‌ن ؟

وتی : (بیدعه‌چییه‌کان ئه‌وانه‌ن که قسه ئه‌که‌ن له ناو و سیفاته‌کانی الله عز وجل و که‌لامه‌که‌ی و زانسته‌که‌ی و قودره‌ته‌که‌ی ، وه بێده‌نگ نابن له‌وه‌ی که هاوه‌ڵان و شوێنکه‌وتووه‌کانیان به‌باشی لێی بێده‌نگ بوون) .

٤٥٣ - إسحاق بن عيسى ئه‌ڵێت : گوێبیستی مالک بووم وتی : (هه‌رکه‌سێک بیه‌وێت فێری دین ببێت و به‌ده‌ستی بهێنێت به الكلام ئه‌وه ئه‌بێت به زنديق) .

---

**- له (الإبانة الصغرى) ـدا عبدالله بن المبارك ئه‌ڵێت : (هه‌رکه‌سێک خوو بداته الكلام زه‌نديق ئه‌بێت) .**

**- له (مختصر الحجة) ـدا عبدالرحمن بن مهدي ئه‌ڵێت : (هه‌رکه‌سێک هه‌وڵی به‌ده‌ستهێنانی الكلام بدات ئه‌وه زنديق ئه‌بێت) .**

**- له (الإبانة الصغرى) ـدا أحمد بن حنبل ئه‌ڵێت : (هاوه‌ڵی الكلام سه‌رفراز نابێت ، هه‌رکه‌سێک خوو بداته الكلام خاڵی نابێت له‌وه‌ی ببێت به جه‌همی) .**

٤٥٤ - عبدالرحمن بن مهدي ئه‌ڵێت : چوومه ماڵه‌وه بۆ لای مالک بن أنس و پیاوێک له‌لای بوو پرسیاری لێ ئه‌کرد ده‌رباره‌ی قورئان .

ئه‌ویش وتی : (له‌وانه‌یه تۆ له هاوه‌ڵانی عمرو بن عبيد بیت ، له‌عنه‌تی الله له عمرو ، ئه‌و ئه‌م بیدعه که‌لامیه‌ی داهێنا ، خۆ ئه‌گه‌ر الكلام زانست بوویایه ئه‌وه هاوه‌ڵان و تابیعیه‌کان قسه‌یان تیادا ئه‌کرد وه‌ک چۆن قسه‌یان کردووه له حوکم و فه‌رز و حه‌ڵاڵ و حه‌رامه‌کاندا ، به‌ڵام باتڵێکه که به‌ره‌ورووی باتڵێکت ئه‌بات) .

- له (جامع بيان العلم وفضله) ـدا مصعب بن عبدالله الزبيري ئەڵێت : مالك بن أنس ئەيوت : (حەزم له قسەكردن له ديندا نييه، وه خەڵكی شارەكەمان حەزيان لێی نەبوو وه نەهيان لێی ئەكرد، وەكو قســەكردن له بۆچوونی جەهم و قەدەردا وه هەموو شــتێكی تر لەوانه بچن، وه حەزم له قســەكردن نييه تەنها له شــتێكدا نەبێت كه كردەوەپێكردنی لەدوايه، وه هەرچی دەربارەی دين و الله عز وجل ـه ئەوه بێدەنگبوونم بەلاوه باشتره، چونكه بينيومه خەڵكی شارەكەمان نەهيان ئەكرد له قسەكردن له ديندا تەنها له شتێكدا نەبێت كه كردەوەپێكردنی لەدوايه) .

إبن عبدالبر له ڕوونكردنەوەی وتەكەی ئيمام مالك ــــدا ئەڵێت : (مالك ڕوونی كردەوه قســەكردن دەربارەی ئەو شــتەی كردەوەپێكردنی لەدوايه ڕێگەپێدراوه لەلای خۆی و خەڵكی شارەكەی، وه خەڵكی شارەكەی واته زاناكانيان، وه هەواڵی دا قسەكردن له ديندا وەكو قسەكردن دەربارەی سيفاتەكانی الله و ناوەكانی، وه نموونەيەكی هێنايەوه وتی (وەكو بۆچوونی جەهم و قەدەر)، وه ئەوەی مـالـك وتی كۆمەڵەی فەقيهەكـان و زاناياني له كۆن و نوێدا لەســەر له ئەهلی حەديث و فەتوا، موعتەزيلەكان و كۆمەڵەكانی تر موخالەفەی ئەو شتەيان كردووه .

كۆمەڵەی زانايان لەســەر ئەوەن مالك وتی تەنها كاتێك نەبێت يەكێكيان ناچار بكرێت قسەبكات، ئەوكات بۆی نييه بێدەنگ بێت ئەگەر هيوای هەبوو ڕەددی باتڵەكه بداتەوه، وه خـاوەنەكەی لابـات لەســەر ئەو بۆچوونەی كه هەيەتی، يـاخود ترســی گومڕابوونی گشتيی هەبێت، ياخود نزيك لەوه) .

٤٥٥ - عبدالله بن وهب ئەڵێت : مالك پێی وتم : (هيچ كەسێك مەخەسەر كۆڵ و پشــتی خۆت، وه وا له خەڵكی مەكە شــت بكەن بەرامبەرت، ئەوەی كه گوێبيســتی بوويت بيڵێرەوه و ئەوەت بەس بێت، وه لاســايی خەڵكی مەكەرەوه به لاسايی كردنەوەيەكی خراپ) .

وه وتی : (نزیکبوونەوە لە باتڵ لەناوچوونە، وه قسـەکردن لە باتڵدا لابەرە لە حەق، وه شـتێکی دنیا خێری تێدا نییە کە دین و پیاوەتی پیاو تێکبدات، وه کێشـە نییە بۆ خەڵکی لەوەدا کە الله حەڵاڵی کردووە بۆیان) .

---

**- لە (جامع بيان العلم وفضله) ـــدا الهيثم بن جميل ئەڵێت : وتم بە مالک بن أنس : ئەی أبو عبدالله، پیاو زانابێت بە سوننەت ئایا موجادەڵەی لەسەر ئەکات ؟**

**وتی : (نەخێر، بەڵکو باسـی سـوننەت ئەکات ئەگەر لێوەرگیرا، وەگەرنا بێدەنگ ئەبێت) .**

**٤٥٦ - إبن وهب** ئەڵێت : (گەیشتم بە سێسەد و شەست زانا، ئەگەر مالک بن أنس و لیث بن سعد نەبوویایە لە زانستدا گومڕا ئەبووم) .

**٤٥٧ - بشـر بن عمران الزهراني** ئەڵێت : گوێبیســتی مالک بن أنس بووم ئەیوت : (هەرکەسێک ڕزگاربوونی ئەوێت، ئەوە با پەیوەست بێت بە کتێبی الله عز وجل و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ) .

**٤٥٨ - عبدالرحمن بن مهدي** ئەڵێت : گوێبیســتی مالک بووم ئەیوت : (ئەم هەوا و ئارەزوویانە لە ســەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەبوو، وه لە ســەردەمی أبو بکر و، عمر و عثمان یشدا رضي الله عنهم) .

---

: لە خەلافەتی علي رضي الله عنه دا بوو کە خەواریجەکان وەکو کۆمەڵ دەرکەوتن .

**٤٥٩ - عبدالله بن نافع** ئەڵێت : گوێبیســتی مالک بن أنس بووم ئەیوت : (خۆ ئەگەر بەندە تاوانە گەورەکان بکات بەمەرجێک شــەریک بۆ الله دانەنێت،

پاشان ڕزگاری ببێت لەم هەوا و ئارەزوو و بیدعە و قسەکردنە لەسەر هاوەڵانی رسول الله ﷺ، ئەوە هیوام وایە لە بەرزترین پلەی بەهەشتدا بێت لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکاندا، ئەوانەش چەندە هاودەمانێکی چاکن!

چونکە هەموو تاوانێکی گەورە کە لە نێوان بەندە و الله عز وجل ـدایە ئومێد هەیە لێی خۆش ببێت، وە هەموو هەوا و ئارەزوویەک ئومێد نییە لێی خۆش ببێت، بەڵکو هەوا و ئارەزووەکە خاوەنەکەی ئەخاتە ئاگری جەهەنەمەوە .

هەرکەسێک لەسەر سوننەت بمرێت موژدەی لێبێت، هەرکەسێک لەسەر سوننەت بمرێت موژدەی لێبێت، هەرکەسێک لەسەر سوننەت بمرێت موژدەی لێبێت) .

---

**: ئەوەی مالک مەبەستیەتی بریتیە لە ترساندنی خەڵکی لە بیدعە و هەوا و ئارەزووەکان، وە ڕوونکردنەوەی ئەوەی تاوانەکان زیانیان کەمترە لەسەر خاوەنەکەی لە بیدعە و هەوا و ئارەزووەکان، نەوەک بیەوێت لە مەترسی و گەورەیی تاوان و سەرپێچیەکان کەم بکاتەوە .**

**٤٦٠ - یحیى بن سلیمان بن نضلة** ئەڵێت : گوێبیستی مالک بن أنس بووم ئەیوت : (ئەگەر کەسێک هەموو تاوانە گەورەکان ئەنجام بدات پاشان هیچ شتێک لەو هەوا و ئارەزوویانەی تیادا نەبێت، ئەوە ئومێدم هەیە بۆی **- واتە الله عز وجل لێی خۆش ببێت -**، هەرکەسێک لەسەر سوننەت بمرێت موژدەی لێبێت) .

**٤٦١ - یعقوب بن حمید بن کاسب** ئەڵێت : مالک بن أنس وتی : (ئەگەر پیاو بگەڕێتەوە بۆ لای الله عز وجل بە پڕی زەوی تاوانەوە، پاشان بە سوننەتەوە پێی بگاتەوە; ئەوە لە بەهەشتدایە لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکاندا، ئەوانەش چەندە هاودەمی باشن) .

٤٦٢ - إسـماعيل بن أبي أويس ئەڵێت : گوێبیســتی مالک بن أنس بووم ئەیوت : (ئاثار لەناو هیچ قەومێکدا کەمی نەکردووە ئیللا هەوا و ئارەزوو تیایاندا دەرکەوتووە، وە زانایان کەمیان نەکردووە ئیللا لەناو خەڵکیدا باتڵ و گومڕایی دەرکەوتووە) .

---

**: چونکە ئەگەر خەڵکی لەســەر ئاثار بمێننەوە هەموویان ئەوە گومڕا نابن، بەڵام کاتێک ئاثار کەم بکات یان نەمێنێت لەناو خەڵکیدا ئەوە بە بۆچوون و ڕەئی خۆیان قسە ئەکەن لە بابەتەکاندا .**

**- لە (تهذيب التهذيب) ـدا عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەڵێت : کاتێک أبو بكر الأعين وەفاتی کرد باوکم باســی کرد و وتی : (رحمه الله، من غيبتەی پێ ئەبەم، مرد و تەنها فەرموودەی ئەزانی، هاوەڵی الكلام نەبوو، بەڵکو فەرموودەی ئەنووسی) .**

٤٦٣ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : پرســیارم کرد لە مالک بن أنس دەربارەی فەرموودەیەک، ئەویش بەپێوە بوو، ڕەتیکردەوە بۆم بگێڕێتەوە، کاتێک دانیشــت وتی : (ئەی فلانە کەس، تۆ پرســیارت لێ کردم و منیش بەپێوە بووم، حەزم لەوە نەبوو فەرموودەی رسول الله ﷺ بگێڕمەوە و بەپێوە بم) .

٤٦٤ - سعيد بن كثير بن عفير ئەڵێت : پرسیارم کرد لە مالک بن أنس دەربارەی پیاو گوێبیستی وتە ئەبێت و بە ماناکەی ئەیگێڕێتەوە .

وتی : (کێشەی نیە تەنها فەرموودەی رسول الله ﷺ نەبێت; پێم خۆشە کە بە دەربڕینەکانی خۆی بیگێڕێتەوە) .

٤٦٥ - **عبدالله بن وهب** ئه‌ڵێت : له‌لای مالک بن أنس بووین، باسی سوننه‌ت کرا، مالک وتی : (سوننه‌ت که‌شتیه‌که‌ی نوح ـه، هه‌رکه‌سێک بڕواته‌ناوی ئه‌وه ڕزگاری ئه‌بێت، وه هه‌رکه‌سێک نه‌ڕواته ناوی ئه‌وه نوقم ئه‌بێت) .

٤٦٦ - **خالد بن خداش** ئه‌ڵێت : ماڵئاواییم له مالک بن أنس کرد وتم : ئه‌ی باوکی عبدالله ئامۆژگاری و وه‌سیه‌تم بۆ بکه .

وتی : (ته‌قوای الله و، به‌ده‌ستهێنانی زانست له‌لای ئه‌و که‌سانه‌ی شایسته‌ین) .

---

**: هه‌رکه‌سێک زانستی پێ بوو شایه‌نی ئه‌وه نییه لێی وه‌ربگیرێت، به‌ڵکو ئه‌وانه‌یان شایه‌نیانه که له‌سه‌ر ڕێچکه و ڕێبازی سه‌له‌فی ئومه‌تن .**

٤٦٧ - **إسماعيل بن أبي أويس** ئه‌ڵێت : گوێبیستی مالک بن أنس ـی خاڵم بووم وتی : (ئه‌م زانسته دینه، ته‌ماشا بکه‌ن و بزانن له کێی وه‌رئه‌گرن، ئا له‌م مزگه‌وتدا گه‌یشتم به حه‌فتا که‌س)، ئاماژه‌ی کرد بۆ مزگه‌وته‌که‌ی رسول الله ﷺ، (هه‌موویان ئه‌یانوت : فلانه که‌س وتی : رسول الله ﷺ وای فه‌رموو .

جا هیچم لێ وه‌رنه‌گرتن، خۆ ئه‌گه‌ر هه‌ریه‌کێکیان بکرانایه به ئه‌میندای بيت المال ئه‌وه ده‌ستپاک بوون، وه إبن شهاب الزهري ئه‌هات بۆ لامان و له‌به‌رده‌م ده‌رگای ماڵه‌که‌یدا ئه‌مانکرد به قه‌ره‌باڵغی) .

---

**: واته دینه‌که‌ت وه‌ربگره له که‌سی متمانه‌پێکراو، وه که‌سێک له‌به‌رکردن و حِفظ ـی باشه و به که‌می هه‌ڵه ئه‌کات له گێڕانه‌وه‌ی فه‌رمووده‌دا، چونکه ئه‌وه‌ی که ئه‌و بۆت ئه‌گێڕێته‌وه دینداری خۆتی له‌سه‌ر دائه‌مه‌زرێنیت، وه ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێیته‌وه بۆ ئه‌و کتێبانه‌ی سه‌له‌ف که باسی ڕاوی فه‌رمووده‌کان ئه‌که‌ن ئه‌بینیت گێڕه‌وه‌ی فه‌رمووده**

**هەیە لە پلەیەکی بەرزی زوهد و بەخشـــین و هەموو کارە چاکەکاندایە بەڵام ســـەلەف پشتیان پێ نەبەستوون لە گێڕانەوەی فەرموودەدا لەبەر خراپی لەبەرکردن و ضَبط یان.**

**وە دینداری لەسەر زانست و عیلم ئەکرێت، نابێت بەبێ بەڵگەیەکی شەرعی دینداری بە شتێکەوە بکەیت .**

**وە ئەو عیلمەی کە ئێستا وەریئەگریت ئەبێت بەو دینەی کە داهاتوو لەسەری ئەبێت، هەربۆیە بزانە چ شتێک لە چ کەسێکەوە وەرئەگریت .**

٤٦٨ - عبدالله بن المبارک ئەڵێت : (هیچ پیاوێکم نەبینیوە بەرز ببێتەوە وەکو چۆن مالک بەرز بووەتەوە، لە پیاوێک کە هێندە زۆر ڕۆژوو و نوێژی نەبوو، مەگەر تەنها شتێکی شاراوە و پەنهانی هەبووبێت[1]) .

---

**: (١) واتە خاوەن نیەتێکی باش، یاخود کردەوەیەکی باش بووە لە نێوان الله عز وجل و خۆیدا .**

٤٦٩ - عبدالله بن وهب ئەڵێت : (چووم بۆ لای أبو جعفر المنصـــور، بینیم زیاد لە یەکێک لە بني هاشم دوو بۆ سێ جار ماچی دەستی ئەکرد، وە الله پارێزراوی لەوە پێبەخشیم و دەستیم ماچ نەکرد) .

٤٧٠ - أحمد بن أبي الحواري ئەڵێت : گوێبیستی یەکێک لە هاوەڵانمان بووم ئەیوت : (کاتێک بوترایە بە مالک بن أنس : ئەی باوکی عبدالله، ئەم فەرموودەیە جگە لە تۆ کەس نەیگێڕاوەتەوە .

ئەوە وازی لێ ئەهێنا .

وە کاتێک پێی بوترایە : ئەم فەرموودەیە بیدعەچییەکان بە بەڵگە بۆ خۆیانی ئەهێننەوە .

ئەوە وازی لێ ئەهێنا ) .

---

**- لە (الجرح والتعديل) ـــدا عبدالله بن وهب ئەڵێت : (زانستی خەڵکی زیادی ئەکرد، وە زانستی مالک کەمی ئەکرد هەموو ساڵێک لە فەرموودەکەیدا ) .**

**- لە (التمهيد) ـدا عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (ئەو کەسە نابێت بە پێشەوا لە دیندا لە زانستدا شازەکان وەربگرێت، وە نابێت بە پێشەوا لە دیندا ئەو کەسەی لە هەموو کەسێکەوە بگێڕێتەوە، وە نابێت بە پێشەوا ئەو کەسەی هەموو ئەوە بگێڕێتەوە کە گوێبیستی بووە ) .**

**٤٧١ - عبدالرحمن بن القاسم** ئەڵێت : گوێبیستی مالک بووم وتی : (هیچ کەسێک نییە لەوانەی کە زانستیان لێوە فێربووم ئیللا هاتووەتەوە بۆ لای خۆم پرسیاری پێ کردووم دەربارەی بابەتێک لە دینەکەی ) .

**٤٧٢ - مصعب** ئەڵێت : (هارون الرشيد داوای لە مالک بن أنس کرد بەسەریاندا بیخوێنێتەوە کاتێک خۆی و کوڕەکانی لە ماڵەکەیدا بوون .

مالک وتی : (ماوەیەکی زۆرە نەمخوێندووەتەوە بەسەر هیچ کەسێکدا، بەڵکو ئەوان بەسەر مندا ئەیخوێننەوە ) .

هارون وتی : خەڵکی بکەرە دەرەوە با من بەسەرتدا بیخوێنمەوە .

مالک وتی : (ئەگەر خەڵکی گشتی ڕێگری لێ بکرێت لەبەر چەند کەسێکی تایبەت، ئەوە تایبەتەکانیش سوود نابینن ) .

دواتر فەرمانی کرد بە معن بن عيسى، ئەویش خوێندیەوە بەسەریاندا ) .

**٤٧٣ - الربيع بن سليمان** ئەڵێت : گوێبیستی الشافعي بووم ئەیوت : (لەلای محمد بن الحسن بووم، باسی مالک بن أنس ـمان کرد، منیش ستایشم کرد .

جا محمد بن الحسن وتی : مالک ـم بینی و پرسیارم لێ کرد دەربارەی چەند شتێک، بۆی حەڵاڵ نییە فتوا بدات .

منیش پێم وت : (سوێندت ئەدەم بە الله کاتێک پرسیاری شتێکم لێ کردیت بەڕاستی وەڵامم بدەیتەوە ؟) .

وتی : بەڵێ .

وتم : (کامیان شارەزاتر بوون بە قورئان، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : (کامیان شارەزاتر بوون بە تەفسیری قورئان، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : (کامیان شارەزاتر بوون بە زمانی عەرەبی، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : (پیاوانی فەرموودەی کامیان صحیح تر بوو، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : (ڕیوایەتی کامیان صحیح تر بوو، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : کامیان شارەزاتر بوون بە غەزوەکانی رسول الله ﷺ، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : (کامیان شارەزاتر بوون بە سوننەتی رسول الله ﷺ، مالک یان أبو حنیفة ؟) .

وتی : مالک .

وتم : (ئایا حەڵاڵە بۆ أبو حنیفة فتوا بدات بەڵام حەڵاڵ نییە بۆ مالک فتوا بدات ؟) .

٤٧٤ - یحیی بن سلیمان ئەڵێت : گوێبیستی مالک بن أنس بووم وتی : (هیچ کەسێک ناهێندرێت بۆلام کە کتێبی الله تەفسیر ئەکات و شارەزا نییە بە لەهجەکانی زمانی عەرەب ئیللا ئەیکەم بە پەند و عیبرەت!) .

٤٧٥ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (إبن أبي ذئب پیاوێکی صالِح بوو، حەقبێژ بوو) .

---

- لە (الحجة في بيان المحجة) ـدا إبن سماک بن الفضل الشهابي ئەڵێت : إبن أبي ذئب فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ، پێم وت : ئەی أبا الحارث، ئایا کار بەم فەرموودەیە ئەکەیت ؟

جا دای بەسەر سنگمدا، وە هاوارێکی زۆری بەسەردا کردم و لێیدام، وە وتی : (من فەرموودەت بۆ ئەگێڕمەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ تۆش ئەڵێیت کاری پێ ئەکەیت ؟

بەڵێ کاری پێ ئەکەم، وە ئەوەش فەرزە لەسەر من و ئەوەشی گوێی لە فەرموودەکە بووە، الله تبارک و تعالی محمد ـی ﷺ هەڵبژارد لە خەڵکی و بەهۆیەوە و لەسەر دەستی هیدایەتی دان، وە ئەوەی بۆ هەڵبژاردن کە لەسەر زمانی ئەو بۆی هەڵبژاردن، جا لەسەر هەموو دروستکراوەکان واجبە شوێنی بکەون پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆش بێت) .

إبن سماک ئەڵێت : بێدەگ نەبوو هەر قسەی کرد هەتا هیوام ئەخواست بێدەنگ بووایە .

٤٧٦ - علي بۆی گێڕاینەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوە وتی : (قسـه بكەن دەربارەی ئەوەی لە خوار عەرشــەوەیە، قسـه مەكەن دەربارەی ئەوەی لەسـەرو عەرشــەوەیە - واتە اللە عز وجل -، چونكە كۆمەڵەیەک قسـەیان تیادا كرد لەناو چوون) .

٤٧٧ - جعفر الصادق ئەڵێت : (لەوە زیاتر مەڕۆ لەوەی لە قورئاندا هاتووە) .

٤٧٨ - عبدالصمد بن حسان ئەڵێت : گوێبیستی سـفیان الثوري بووم ئەیوت : (سـەنەد چەكی ئیمانداره، ئەگەر چەكی پێ نەبێت بە چ شـتێک شـەڕ ئەكات ؟!) .

٤٧٩ - الحجاج بن دينار ئەڵێت : منصـور بن المعتمر وتی : (هەرگیز ئەهلی دینێک لەناو نەچوون هەتا المنانية لەناویاندا بەجێما) .

وتم : المنانية كێن ؟

وتی : (زەندیقەكان) .

٤٨٠ - سفيان الثوري ئەڵێت : (تەفسیری فەرموودە باشترە لە فەرموودە) .

---

**: واتە ئەگەر فەرموودەیەکت لەلا بێت و بزانیت ماناكەی چییە، ئەوە باشــترە لە خودی فەرموودەكە ئەگەر نەزانیت مانای چییە و لێی تێنەگەیشــتیت، چونكە ئەگەر لێی تێنەگەیت ناشتوانیت كاری پێ بكەیت .**

**- لە (الجامع لأخلاق الراوي وأداب السامع) ـدا عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (ئەگەر بمتوانیایە لە سـەرەتاوە ئەو كارانە دەسـتپێبكەمەوە لە كردوومە ئەوە لەلای هەموو فەرموودەیەكدا ماناكەیم ئەنووسی) .**

٤٨١ - معن بن عيسـى وتی : (پێشـەوای ئیمانداران هارون الرشـيد هات بۆ مەدینە بە مەبەستی حەج، وە یعقوب ـیشی لەگەڵدا بوو ئەوەی پێی ئەوترێت أبو یوسـف - **واتە هاوەڵە نزیکەکەی ئەبو حەنیفە** -، مالـک هات بۆ لای پێشـەوای ئیمانداران، ئەویش نزیکی کردەوە و رێزی لێ گرت، کاتێک دانیشت یعقوب رووی تێ کرد و پرسیاری لێ کرد دەربارەی بابەتێک، مالک یش وەڵامی نەدایەوە .

پاشان پرسیاری لێ کردەوە هەر وەڵامی نەدایەوە، دواتر پرسیاری لێ کردەوە هەر وەڵامی نەدایەوە .

هارون بە مالک ـی وت : ئەی باوکی عبدالله، ئەمە یعقوب ـە قازی ئێمەیە پرسیارت لێ ئەکات .

مالک ـیش وتی : (ئەی فلانە کەس ئەگەر ئێمەت بینی لەگەڵ ئەهلی باتڵ دا ئەوە لەگەڵیان ئامادە بە وەڵامت ئەدەینەوە) .

---

**: واتە ئێمە تەنها لەگەڵ ئەهلی سـوننەدا دائەنیشـین و وەڵامی پرسـیارەکانیان ئەدەینەوە، خۆ ئەگەر ئێمەت بینی لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا دائەنیشـین ئەوکات وەرە با وەڵامت بدەینەوە چونکە تۆش ئەهلی هەوا و ئارەزوویت، مەبەستی هاوەڵەکەی ئەبو حەنیفەیە .**

٤٨٢ - عطاء بن مسلم ئەڵێت : گوێبیستی سفیان الثوري بووم ئەیوت : (لە فەرموودەدا دەست بگرن و پەیوەست بن بەوەی کە ناسراوە و زمانەکان لەسەری ڕاهاتووە، وە ئاگاداری ئەم فەرموودەیانەی بن) واتە : شازەکان .

---

**- الخطيب البغدادي لە (شرف أصحاب الحديث) ـدا باسی نەهێکردنی سفیان الثوري ئەکات لە نووسـینەوەی فەرموودە غریب ـەکان و لە ڕوونکردنەوەیدا ئەڵێت :**

**(الثوري مەبەستی لە فەرموودە غريب و منكر ـەكانە، نەک فەرموودە ناسراو و بەناوبانگەکان، لەبەر ئەوەی هەواڵە شاذ ـەکان و فەرموودە منكر ـەكان زۆرترە لەوەی بژمێردرێت، بۆچوونی الثوري دەربارەی ئەوەیە کە هیچ خێرێکی تیادا نییە چونکە ڕیوایەتی کەسە ثقة ـەکان بە خیلافی ئەو جۆرە فەرموودەیانەوەیە، وە کردەوەی فەقیهەکان بە پێچەوانەوەیەتی، وە جگە لە الثوري لە چەند زانایەک بێزراوبوونی خۆسەرقاڵکردن پێوەی هاتووە، وە بەفیرۆچوونی کاتەکان لە بەدەستهێنانیدا) .**

**٤٨٣ - أحمد بن يونس** ئەڵێت : پیاوێک بە سفیان ـی وت : وەسیەتم بۆ بکە.

وتی : (ئاگاداری هەوا و ئارەزووەکان بە ، ئاگاداری دەمەدەمە بە ، وە ئاگاداری دەسەڵاتدار بە ) .

**٤٨٤ - عبدالله بن داود الخُريبي** ئەڵێت : پرسیارم لە سفیان کرد دەربارەی الكلام ؟

وتی : (واز لە باتڵ بهێنە ، تۆ چەندە حەق شارەزایت ؟ شوێن سوننەت بکەوە و واز لە باتڵ بهێنە ) .

**٤٨٥ - الأشجعي** ئەڵێت : گوێبیستی سفیان بووم وتی : (ئەگەر پیاوێک لە ماڵەکەی خۆیدا بەتەمای ئەوە بێت درۆ بکات لە فەرموودەیەکدا ئەوە الله کەسێک سەرئەخات بەسەریدا ) .

---

**: واتە الله عز وجل کەسێک موسەخەر ئەکات بۆ هەڵماڵینی درۆکانی و وەلامدانەوەی چەواشەکاریەکانی، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ پاراستی سوننەتی رسول الله ﷺ لەلایەن الله عز وجل ـەوە .**

٤٨٦ - يحيى بن يمان ئەڵێت : گوێبیستی سفیان بووم ئەیوت : (خۆ ئەگەر ئەوان نەیەن بۆ لام ئەوە من ئەچمە ماڵەوە بۆ لایان) واتە : هاوەڵانی فەرموودە .

---

**: واتە بۆ ئەوەی فەرموودەیان پێ بڵێت و فێری زانستیان بکات .**

٤٨٧ - زيد بن الحباب ئەڵێت : گوێبیستی سفیان الثوري بوو وتی : ئەگەر بمزانیایە کەسێک ئەمە - **واتە فەرموودە** - بە نیتەوە بەدوایەوەیەتی ئەوە ئەرۆشتم بۆ ماڵەوەی و بۆم ئەگێڕایەوە) .

٤٨٨ - يحيى بن يمان ئەڵێت : گوێبیستی سفیان الثوري بووم پێش پەنجا ساڵ وتی : (هیچ کاتێک بەدەستهێنانی زانست ئەوەندەی ئەمڕۆ باشتر و چاکتر نەبووە، خۆ ئەگەر ئەوان نەیەن بۆ لام من ئەچم بۆ ماڵەوە بۆلایان) .

وترا : ئەی أبو عبدالله، ئەوان هەوڵی بەدەستهێنانی زانست ئەدەن بەبێ نیەت .

وتی : (هەوڵدانیان بۆ بەدەستهێنانی زانست خۆی لە خۆیدا نیەتە) .

---

**: سفيان رحمه الله ساڵی (١٦١ هـ) وەفاتی کردووە و ئەڵێت : (هەرگیز بەدەستهێنانی زانست لە ئەمڕۆ باشتر نەبووە) .**

**ئەمە لەکاتێکدا ئەو فیتنە و گروپە کافر و گومڕایانەی لەو کاتەدا هەبوون زۆر کەمترن لەوانەی ئێستا .**

**ئەبێت چ شتێک بڵێت ئەگەر بگەیشتایە بە سەردەمی ئێمە و ببینیایە پێوەرەکان تەواو پێچەوانە بووەتەوە و خەڵکی هیچ سیمایەکی سوننەتیان پێوە دیار نییە و ئیسلام و سوننەتی ڕاستەقینە زۆر نامۆ بوونەتەوە بە نامۆبوونێک زیاتر لە پێشوو .**

٤٨٩ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : لەگەڵ الثوري ـــدا بەلای پیاوێکدا تێپەڕین، وتی : (والله درۆزنە، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوویایە بۆم حەلاڵ نییە بێدەنگ ببم ئەوە بێدەنگ ئەبووم) .

٤٩٠ - أبو الحارث الزبيري ئەڵێت : گوێبیســـتی ســـفیان الثوري بووم وتی : (بارودۆخی هیچ کەسێک ناشارمەوە درۆ بکات لە گێڕانەوە فەرموودەکەیدا) .

**: واتە ئەگەر موسـولْمانێک لە نێوان خۆی و الله عز وجل ـــدا تاوانێکی هەبێت ئەوە بڵاوی مەکەرەوە و با کەس نەزانێت مەگەر لەبەر پێویستیەک نەبێت، بەڵام ئەگەر لە گێڕانەوەی فەرمووده‌دا درۆ بکات ئەوە واجبە ئاگاداری بدەیت دەربارەی چونکە پەیوەندی هەیە بە دینی خۆی و خەڵکی دیکەشەوە .**

٤٩١ - زيد بن الحباب ئەڵێت : (سفیان الثوري ـــم بینی کاتێک پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی بابەتانێک ئەیوت : (نازانم)، هەتا وای لێهات ئەوەی بیبینیایە وای ئەزانی هیچ شارەزایی نییە لە زانستدا) .

٤٩٢ - خلف بن تميم ئەڵێت : پیاوێک وتی بە ســـفیان الثوري : خەڵکی ڕۆیشتن و ئێمەش لەسەر چەند گوێدرێژێکی شەل ماینەوە!

سفیان وتی : (جا ئەوە چەندە حاڵی باشە ئەگەر لەسەر ڕێگا ڕاستەکە بێت) .

**: واتە هاوەڵان رضـــي الله عنهم و تابیعیەکان لەســـەر دینە ڕاســـتەکە بوون و کاروکردەوەی چاکی زۆریان هەبوو، بەڵام ئێمە وا نین، وە بە سواربوونی گوێدرێژی شەل وەسفی ئەو حاڵەتەی کردووە .**

**جا سـفيان الثوري ـــيش ئاماژە ئەدات بەوەی ئەگەر کەسـەکە لەسـەر ڕێگە ڕاسـتەکە بێت ئەوە هەر باشـە چونکە ئێمە وەکو ئەوانەی پێش خۆمان ناتوانین کاروکردەوەی زۆر و باش ئەنجام بدەین، والله أعلم .**

**٤٩٣ - يعقوب بن إسحاق الحضرمي** ئەڵێت : گوێبیستی شعبة بووم ئەیوت : (سفیان پێشەوای ئیماندارانە لە فەرموودەدا) .

**٤٩٤ - أبو إسحاق الفزاري** ئەڵێت : الأوزاعي وتی : (ئارام بگرە لەسـەر سـوننەت، وە بووەسـتە لەو شـوێنەدا کە ئەوان وەسـتاون، وە قسـە بکە لەوەدا کە قسـەیان کردووە دەربارەی، وە دەم بگرەرەوە لەوەی کە باسـیان نەکردووە، وە ڕێچکەی پێشـینی چاکەکاری خۆت بگرەرەبەر، چونکە ئەوەی بۆ ئەوان بەس بووە بۆ تۆش بەسە) .

- وە دەربارەی ئەو بیدعەیانەی کە بیدعەچییەکان دایانهێناوە ئەڵێت : - (ئەگەر باش و چاک بووایە ئەوە ئێوەی پێ تایبەتمەند نەئەکران دوور لە پێشینەکانتان، وە هیچ باشە و خێرێک هەڵنەگیراوە بۆ ئێوە و لەوان گیردرابێتەوە بەهۆی فەزڵ و چاکەیەکەوە ئێوە هەتانە، چونکە ئەوان هاوەڵانی محمد رسول الله ـــن ﷺ، الله ئەوانی بۆ ئەو هەڵبژراد و هەر لەناو ئەواندا ناردی، وە وەسـفی کردوون بەوەی کە وەسـفی کردوون، فەرموویەتی : ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾ (الفتح : ٢٩) .

- إبن تيمية له (مجموع الفتاوى) ـــــدا ئەڵێت : (وه لەوەی پێویســـته له دیندا بزانرێت لەلایەن ئەو کەســـەی ڕائەمێنێت له قورئان و فەرمووده، وه ئەوەی لەســـەری کۆکن له ئەهلی سوننه و جەماعه له هەموو تائیفەکان; باشترینی قەرنەکانی ئەم ئوممەته له کردەوه و وته و عەقیده و له هەموو فەزیلەتێکی تر جگه لەوەدا; باشترینیان بریتیه له (قەرنی یەکەم، پاشـان ئەوانەی لەدوایان دێت، پاشـان ئەوانەی لەدوایان دێن) وەک چۆن جێگیر بووه له پێغەمبەرەوه ﷺ له زیاتر له ڕوویەکەوه، وه ئەوان باشـــترن له خەلەف له هەموو فەزیلەتێکدا، له زانســـت و، کردەوه و، ئیمان و، ژیری و، دین و، ڕوونکردنەوه و، عیبادەت، وه ئەوان لەپێشـــترن بۆ ڕوونکردنەوه له هەموو شـــتێکی نـاڕووندا، ئەمه کەس ڕەتی نـاکـاتەوه ئیللا ئەو کەســـه نەبێـت که ئەو شـــتەی ڕەت کردووەتەوه که له دیندا پێویســـته بزانرێت، وه الله عز وجل لەســـەر زانســـت گومڕای کردووه) .

٤٩٥ - الهِقل بن زياد ئەڵێـت : الأوزاعي وتی : (بۆچوونی پیـاو دەربـارەی شـتێک که له رسـول الله ـــەوه ﷺ پێی ئەگات هیچ نییه جگه له شـوێنکەوتنی نەبێت، خۆ ئەگەر دەربارەی ئەو شته له رسـول الله ـــەوه ﷺ هیچ نەهاتبێت و هاوەڵانی پاش خۆی قســـەیان تیادا کردبێت ئەوه شـایســـتەترن به حەق تیایدا له ئێمه، چونکه الله ســـتایشـــی کەســـانی پاش ئەوانی کردووه به شـــوێنکەوتنیان، فەرموویەتی : ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ (التَّوْبَة : ١٠٠).

بەڵام ئێوه وتتان بەڵکو بەراوردی ئەکەین به بۆچوونی خۆمان له قورئاندا، جـا ئەوەی لەگەڵیـدا یەک بگرێتەوه ئەوه بەڕاســـتی ئەزانین، وه ئەوەی یەک نەگرێتەوه لەگەڵی ئەوه وازی لێ ئەهێنین .

وه ئەوەش کۆتایی و چارەنووس و ئامانجی هەموو داهێنەرێکه له ئیسـلامدا : ڕەتکردنەوەی ئەوەی له سوننەت یەک ناگرێتەوه لەگەڵ بۆچوونی) .

---

- لە (بدائع الفوائد) ـــــدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (ئەوەی لەســـەر خەڵکیە شوێنکەوتنی ئاثارەکانە لە رسول الله ـــەوە ﷺ، وە زانینی صحیح ـــەکەی لە ضعیف ـــەکەیەتی، پاشان دوای ئەوە شوێنکەوتنی هاوەڵانی رسول الله ﷺ؛ ئەگەر وتەکانیان پێچەوانەی یەکتر نەبن، خۆ ئەگەر جیاواز بوو تەماشـــای قورئان ئەکات؛ کام وتەیەیان زیـاتر لە قورئان ئەچێـت ئەوە وەرئەگرێـت، یـاخود لە وتەی رســـول الله ﷺ وەری ئەگرێت، خۆ ئەگەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهـاتبوو، وە لە هیچ یەکێک لە هـاوەڵانی پێغەمبەر ـەوە ﷺ نەهاتبێت، ئەوە تەماشای وتەی تابیعیەکان ئەکات، وتەی کامیان زیـاتر لە قورئان و فەرموودە ئەچێـت ئەوەیـان وەرئەگرێـت، وە واز لەوە ئەهێنێـت کە خەڵکی دایانهێناوە دوای ئەوان) .

٤٩٦ - الهقل بن زياد ئەڵێت : الأوزاعي ئەڵێت : (ئێوە لە هیچ بیدعەیەک ناگەڕێنەوە ئیللا خۆتان هەڵئەواسن بە دانەیەکی تردا کە لەوەی دیکەیان بەزیانترە بۆتان) .

٤٩٧ - الأوزاعي ئەڵێت : حســـان بن عطية ئەڵێت : (هیچ کۆمەڵەیەک نییە بیدعەیەکیان داهێنابێت لە دینەکەیاندا ئیللا الله هاوشـــێوەی ئەوەی لە ســـوننەت لابردووە، پاشان نایگەڕێنێتەوە بۆیان هەتا ڕۆژی قیامەت) .

---

: واتە بە ســەرهەڵدانی هەر بیدعەیەک سـوننەتێک ئەمرێت، وە ئەگەر تەماشـای ئەو کەســـانە بکرێت کە بیدعە ئەنجام ئەدەن ئەبینیت وازیان هێناوە لە ســـوننەت لەو بابەتەدا، بۆ نمونە سۆفیەک ئەبینیت بەناو خۆشەویستی رسول الله ـــەوە ﷺ مەولود ئەکات و بیدعەی مەولودی داهێناوە، کەچی یەکەم شـــت ئەیکات بۆ یادی مەولودەکە صافکردنی ڕیشیەتی بەناوی ئەوەی سوننەتە و فەرز نییە .

**٤٩٨ - يحيى بن يمان** ئەڵێت : سفيان وتی : (بیدعه خۆشەویستتره لەلای شەیتان له تاوان، چونکه تاوان تۆبەی لێ ئەکرێت، وه بیدعه تۆبەی لێ ناکرێت).

---

**: چونکه ئەوەی بیدعه ئەکات پێی وایه کارێکی باش ئەنجام ئەدات بۆیه تەوبەی لێ ناکات .**

**- إبن تيمية له (مجموع الفتاوى) ـدا ئەڵێت : (وه واتای وتەکەیان (بیدعه تۆبەی لێ ناکرێت) ئەوەیه : ئەو بیدعەچیەی دینێک دائەهێنێت که نه الله عز وجل و، نه پێغەمبەرەکەی ﷺ دایاننەناوه; ئەوه کاره خراپەکەی لەپێشچاو ڕازێندراوەتەوه، هەربۆیه به کارێکی باش ئەیبینێت، بەوجۆره تۆبەی لێ ناکات هەتا ئەو کارەی به باشە ئەبینێت، چونکه سەرەتای تەوبه بریتیه له هەبوونی زانست دەربارەی ئەوەی کردەوەکەی خراپه بۆ ئەوەی تۆبەی لێ بکات، یان بزانێت وازی له کارێک هێناوه که فەرمانی پێکراوه به فەرمانێکی واجبێتی یان خۆشویستراوی; بۆ ئەوەی تۆبه بکات و ئەو کاره ئەنجام بدات، جا لەبەر ئەوەی کارەکەی به کارێکی باش ئەبینێت لەکاتێکدا کارەکەی خۆی له خۆیدا خراپه ئەوه ئیتر تۆبەی لێ ناکات) .**

**٤٩٩ - بقية** ئەڵێت : أرطاة بن المنذر السكوني پێی وتم : (ئەی باوکی محمد، ئەگەر منداڵەکەم خراپەکارێک بێت له فاسقەکان ئەوه کەمتر پێم ناخۆشه لەوەی خاوەن هەوا و ئارەزوو بێت) .

---

**- له (الإبانة الصغرى) ـدا سعيد بن جبير ئەڵێت : (ئەگەر کوڕەکەم ڕەفیقی سوننەیەکی فاسق بکات ئەوه پێم خۆشتره لەوەی ڕەفیقی پەرستشکارێکی بیدعەچیدا بکات) .**

٥٠٠ - البابلتي ئەڵێت : الأوزاعي بۆی گێڕاینەوە وتی : (کاتێک الله شـەڕی بوویت بۆ کۆمەڵەیەک، ئەوە دەرگای دەمەدەمەیان بەسـەردا ئەکاتەوە و دەرگای کار و کردەوەیان لێ دائەخات) .

٥٠١ - أبو أسامة ئەڵێت : (سفیان الثوري و الأوزاعي م بینی تەوافی کەعبەیان ئەکرد، ئەگەر پێم بوترایە دانایەکیان هەڵبژێرە بۆ ئوممەت، ئەوە الأوزاعي ـــم هەڵئەبژارد، چونکە نەرمونیانتر بوو) .

---

**- لە (تاریخ بغداد) دا الأوزاعي ئەڵێت : (ئەگەر پێم بوترێت : پیاوێک هەڵبژێرە بۆ ئەوەی هەسـتێت بە جێبەجێکردنی کتێبی الله تعالى و سـوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەوە الثوري م بۆ هەڵئەبژاردن) .**

٥٠٢ - نعیم بن غریب ئەڵێت : گوێبیستی عنبسة بن سعید الکلاعي بووم ئەیوت : (هیچ پیاوێک بیدعەی نەکردووە ئیللا دڵی بەرامبەر موسوڵمانان داخراوە، وە ئەمانەتی لێ وەرگیراوەتەوە) .

الأوزاعي لێمی بیست و وتی : ئایا خۆت بیستووتە لە عنبسة ـەوە ؟

وتم : بەڵێ .

وتی : (ڕاسـت ئەکات، باسـی ئەوەمان ئەکرد هیچ پیاوێک بیدعەیەکی دانەهێناوە ئیللا وەرعەکەی لێ داماڵدراوە) .

---

**: وە کاتێک وەرعی لێ دائەماڵدرێت بە کەیفی خۆی قسە ئەکات لە دیندا .**

٥٠٣ - إسحاق بن إبراهيم القاضي ئەڵێت : (پێم گەیشتووە کە الأوزاعي و ثور بن يزيد لەسەر پردەکە گەیشتن بە یەک، الأوزاعي وتی : (ئەی ثور، ئەگەر هەجر کردن لەدین نەبوویایە ئەوە سەلاممان لێ ئەکردیت) .

وە قەدەری بوو - واتە ثور - ) .

- عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەگێڕێتەوە لە باوکیەوە کە ئەڵێت : (ثور بن يزيد الكلاعي، قەدەری بوو، خەڵکی حمص بوو، دەریانکرد نەفیان کرد، چونکە قەدەری بوو).

٥٠٤ - عمرو بن أبي سلمة ئەڵێت : گوێبیستی الأوزاعي بووم ئەیوت : (هەرکەسێک ڕێز لە خاوەن بیدعەیەک بگرێت و بەگەورەی ڕابگرێت ئەوە هاوکاری کردووە لە ڕووخاندنی ئیسلامدا) .

٥٠٥ - عتاب بن زياد ئەڵێت : گوێبیستی محمد بن مسلم بووم ئەیوت : (هەرکەسێک ڕێز لە خاوەن بیدعەیەک بگرێت و بەگەورەی ڕابگرێت ئەوە هاوکاری کردووە لە ڕووخاندنی ئیسلامدا) .

٥٠٦ - سعيد بن أبي مريم ئەڵێت : سفيان بن عيينة بۆی گێڕاینەوە وتی : (پێم گەیشتووە هەرکەسێک ڕێز لە خاوەن بیدعەیەک بگرێت و بەگەورەی ڕابگرێت ئەوە هاوکاری کردووە لە ڕووخاندنی ئیسلامدا) .

- لە (الحلية) ـدا عبدالرحمن بن عمر ئەڵێت گوێبیستی عبدالرحمن بن مهدي بووم حەزی لە دانیشتن لەگەڵی ئەهلی ڕەئی و خاوەن هەوا و ئارەزووەکان نەبوو، وە دانیشتن و دەمەدەمەکردن لەگەڵیانی بەلاوە بێزراو بوو .

پێم وت : ئایا پێت وایە پیاوێک ناکۆکیەکی هەبێت و بیەوێت بەڵێن و پەیمانێک بنووسێتەوە بڕوات بۆ لایان ؟

وتی : (نەخێر، ڕۆشـــتنت بۆ لایان لە ڕێزدانانە بۆیان، وە دەربارەی ڕێزگرتن لە خاوەنی بیدعە ئەوە هاتووە کە هاتووە) .

٥٠٧ - إسماعيل بن عبدالجبار العسقلاني ئەڵێت : إبراهيم بن أدهم ئەڵێت : (هەرکەسێک تەوقە بکات لەگەڵ بیدعەچییەکدا ئەوە هاوکاری کردووە لە ڕووخاندنی ئیسلامدا) .

٥٠٨ - عبدالصمد بن يزيد ئەڵێت : گوێبیستی الفضيل بن عياض بووم ئەیوت : (هەرکەسێک خاوەن بیدعەیەکی خۆش بووێت، الله کاروکردەوەی پووچەڵ ئەکاتەوە، وە نووری ئیسلام لە دڵی دەرئەکات) .

٥٠٩ - يوسف بن أسباط ئەڵێت : (هەرکەسێک گوێ بگرێت بۆ خاوەن بیدعەیەک ئەوە پارێزراوی لێ دائەماڵدرێت و ئەدرێتە دەستی خۆی) .

---

- إبن بطة لە (الإبانة الكبرى) ـــدا دەربارەی فەرمایشـــتی پێغەمبەر ﷺ : (هەرکەسێکتان دەرچوونی دەججالی بیســت ئەوە با لێی دوور بکەوێتەوە ئەوەندەی ئەتوانێت، چونکە پیاو دێت بۆ لای وا ئەزانێت ئیماندارە، لەگەڵی بەردەوام ئەبێت هەتا شوێنی ئەکەوێت بەهۆی ئەو گومانانەی ئەیبینێت) .

ئەڵێت : (ئەمە فەرمایشـــتی پێغەمبەرە ﷺ، وە هەر خۆی ڕاســـتگۆی بەڕاستخراوەیە .

الله الله ئەی کۆمەڵەی موسوڵمانان، با هیچکەسێکتان گومانی باشی بە خۆی؛ وە ئەو زانیاریەی هەیەتی دەربارەی ڕاستێتی مەزهەبەکەی وای لێ بکات دینەکەی بخاتە مەترسیەوە لە دانیشتنی یەکێک لەو ئەهلی هەوا و ئارەزوویانەدا، بڵێت ئەڕۆمە ژوورەوە

**موناقه‌شـــه‌ی له‌گه‌ڵدا ئه‌كه‌م، یان ده‌ری ئه‌كه‌م له‌ مه‌زهه‌به‌كه‌ی خۆی، چونكه‌ ئه‌وانه‌ فیتنه‌كه‌یان توندتره‌ له‌ هی ده‌ججال، وه‌ قسه‌كانیان لكاوتره‌ له‌ پیسی، وه‌ سوتێنه‌رتره‌ بۆ دڵ له‌ بڵێسه‌ی ئاگر .**

**وه‌ بینیم كۆمه‌ڵه‌ كه‌ســێك له‌عنه‌تیان لێ ئه‌كردن و قســه‌یان پێ ئه‌وتن، دواتر له‌گه‌ڵیان دانیشـــتن به‌ دانیشـــتنی ئینكاری لێكردن و ڕه‌ددانه‌وه‌ی، بیدعه‌چیه‌كانیش له‌گه‌ڵیان به‌رده‌وام بوون به‌ شێوازێكی ڕووخۆش و هاوڕێیانه‌؛ وه‌ هه‌ڵخه‌ڵه‌تاندنی شاراوه‌ و كوفری ورد هه‌تا ڕایانكێشان بۆناو خۆیان) .**

**٥١٠ - شـعبة** ئـه‌ڵێت : (ســفیان الثوري ڕقی له‌ خاوه‌ن هه‌وا و ئاره‌زووه‌كان ئه‌بوویه‌وه‌ و ڕێگری ئه‌كرد له‌ دانیشـتن له‌گه‌ڵیان به‌ توندترین ڕێگری، وه‌ ئه‌یوت : ده‌ست بگرن به‌ ئه‌ثه‌ر ـه‌وه‌، وه‌ ئاگاداری قسه‌كردن بن ده‌رباره‌ی ذات ی الله) .

**٥١١ - علي بن حرب** ئه‌ڵێت : گوێبیســـتی ســـفیان بن عیینة بووم ده‌رباره‌ی فه‌رمایشتی الله عز وجل : | وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقاً | (النِّسَاء : ٦٩) .

وتی : ( | وَٱلصَّـٰلِحِينَۚ | هاوه‌ڵانی فه‌رمووده‌ن) .

**٥١٢ - عبدالله بن صـالح** ئـه‌ڵێت : (پیاوێک هات بۆ لای ســفیان وتی : بۆم بنووسه‌ بۆ الأوزاعي تا فه‌رمووده‌م بۆ بگێڕێته‌وه‌ .

ســفیان وتی : (من بۆت ئه‌نووســم، وه‌ وانازانم ببینیته‌وه‌ ئیللا به‌ مردوویی نه‌بێـت، چونكه‌ من ڕه‌یحانه‌یه‌كم بینی **- واته‌ له‌ خه‌ودا -** كه‌وت له‌لای ڕۆژئاواوه‌، وای نابینم هیچ شتێكی تر بێت جگه‌ له‌ مردنی الأوزاعي نه‌بێت) .

جا پیاوه‌كه‌ گه‌یشته‌ لای و ئه‌و وه‌فاتی كردبوو) .

---

: لەو کاتەدا ئەگەر کەسێک بیویستایە سەفەر بکات بۆ شار و وڵاتێکی تر تا فێری زانست ببێت ئەچوو بۆ لای شێخێکی شوێنەکەی خۆیان هەتا نامەیەک بنووسێت و تیایدا تەزکیەی بکات تا شێخەکەی تر فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە .

٥١٣ - عمران بن موسى الطرسوسي ئەڵێت : (هەرکەسێک ئامادە بێت لە بەخاکسپاردنی بیدعەچیەکدا ئەوە لەوکاتەوە لەژێر تووڕەیی الله عز وجل دایە هەتا ئەگەڕێتەوە) .

---

: وە هەرکەسێک بیدعەیەکی دیاری ئەبێت واجبە ئینکاری لەسەر بکرێت، وە لەو ئینکاریەی ڕێگەپێدراوە بریتیە لە : هەجر بکرێت هەتا ئەگەڕێتەوە، وە لە هەجرکردن ئەوەیە ڕێگری بکرێت لە ئەهلی دین نوێژی لەسەر بکەن بۆ ئەوەی ئەو کەسەی لەسەر ڕێبازێکە لە ڕێبازەکەی ئەو ئەچێت و بانگەوازی بۆ ئەکات لەو شتە دوور بکەوێتەوە، وە مالک بن أنس و أحمد بن حنبل و جگە لەوان لە پێشەوایان فەرمانیان بەمە کردووە) .

٥١٤ - إبراهيم بن المنذر ئەڵێت : (گوێبیستی سفیان بن عیينة بووم ئەیوت : (من ئەولاترم بە الحطيئة بۆ گریان، ئەو بۆ شیعر ئەگریا، وە منیش ئەگریم بۆ فەرموودە) .

وا بزانم کاتێک ئەم قسەیەی کرد کە لەماڵەوە ئەمایەوە و فەرموودەی نەئەگێڕایەوە، چونکە یەک ساڵ پێش وەفاتی تووشی تێکەڵکردن بوو رحمه الله) .

٥١٥ - عبدالله بن المبارك ئەڵێت : الأوزاعي بۆی گێڕاینەوە وتی : (ئیبلیس بە هاوەڵانی خۆی وت : لە کوێوە دێن بۆ ئادەمیزاد ؟

وتیان : لە هەموو لایەکەوە .

وتی : ئایا لەڕووی داوای لێخۆشبوون کردنەوە دێن بۆیان ؟

وتیان : ئەوە شتێکە نایتوانین، چونکە ئەوە بەستراوە بە تەوحید ـەوە .

وتی : دەی لە دەروازەیەکەوە دێم بۆیان کە داوای لێخۆشبوون نەکەن لە الله دەربارەی .

جا هات هەوا و ئارەزووی تیادا بڵاو کردنەوە) .

---

**: واتە ئەیانەوێت مرۆڤەکان لەخشــتە ببەن، جا لەجیاتی ئەوەی بێن شــتێک بە مرۆڤەکە بکەن کە خۆی بە تاوانی ئەزانێت و دواتر تەوبەی لێ بکات، دێن بیدعەی پێ ئەکەن، چونکە بەباشــی ئەزانێت و تەوبەی لێ ناکات، هەربۆیە بە تاوانی بیدعەکەوە ئەگاتەوە بە الله عز وجل .**

**- لە (مختصر الحجة) ــدا هاتووە لە عطاء الخراساني ــەوە : (کاتێک فەرمایشتی الله تبارک و تعالی ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ (النِّسَاء : ١١٠) .**

**دابەزی شــەیتان هاوارێکی هێندە بەرزی کرد ســەربازەکانی لە لایەکانی زەویەوە لەلای کۆبوونەوە، وتیان : ئەی ســەری هەڵەکە، ئەم هاوار چییە ئێمەت پێ ترســاند؟ هاوشێوەی ئەوە لێتەوە نەمانبیستووە .**

**وتی : شتێک تووشم بوو کە هەرگیز شتێکی وا گەورە تووشم نەبووە .**

**وتیان : چییە ؟**

**تا ئەویا ئایەتەکەی خوێندەوە .**

**پاشــان وتی : بەنی ئادەم لاڕێ ئەکەم، هەتا ئەوکاتەی پێویســتیەکەی خۆیی لێ بەدەست ئەهێنێت، پاشان تۆبە ئەکات و تۆبەکەی لێ قبووڵ ئەکرێت .**

**وتی : ئایا فێڵێکتان لەلایە ؟**

**وتیان : فێڵمان لەلا نییە .**

وتی : ئێوه به‌دوایدا بگه‌ڕێن و منیش به‌دوایدا ئه‌گه‌ڕێم .

دواتر ئه‌وه‌نده‌ی الله عز وجل ویستی مانه‌وه، پاشان هاوارێکی تری کردوو کۆبوونه‌وه له‌لای .

وتیان : ئه‌ی سه‌ری هه‌ڵکه، ئه‌م هاواره چییه که گوێمان لێنه‌بووه لێته‌وه ته‌نها ئه‌وه‌ی پێش ئه‌مه نه‌بێت ؟

وتی : ئایا شتێکتان دۆزیه‌وه ؟

وتیان : نه‌خێر .

وتی : به‌ڵام من دۆزیمه‌وه .

وتیان : ئه‌وه چییه که دۆزیوته‌ته‌وه ؟

وتی : ئه‌و بیدعه‌یانه‌یان بۆ ئه‌ڕازێنمه‌وه که دینداری پێوه ئه‌که‌ن، پاشان داوای لێخۆشبوون ناکه‌ن) .

- إبن القيم له (بدائع الفوائد) دا باسی خراپتربوونی بیدعه ئه‌کات له سه‌رپێچی و تاوان، ئه‌ڵێت : (پله‌ی دوازده‌یه‌م بریتیه له بیدعه : بیدعه به‌لایه‌وه - واته شه‌یتان - خۆشه‌ویستتره له فیسق و سه‌رپێچیه‌کان، چونکه زیان ئه‌دات له خودی دین، وه تاوانێکه که تۆبه‌ی لێ ناکرێت و پێچه‌وانه‌ی بانگه‌وازی پێغه‌مبه‌رانه، وه بانگه‌شه‌یه‌که بۆ پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی که پێغه‌مبه‌ران پێی هاتوون، وه ده‌روازه‌ی کوفر و شیرکه) .

٥١٦ - إبراهيم النخعي ئه‌ڵێت : (به‌نده کاتێک ڕێگه‌چاره‌یه‌ک بۆ شه‌یتان ناهێڵێته‌وه، شه‌یتان ئه‌ڵێت : له کوێوه ؟ له‌کوێوه ؟

دواتر بۆی ئه‌ڕوات له‌ڕێی هه‌وا و ئاره‌زوویه‌وه) .

٥١٧ - أبو الزبير له جابر ـــه‌وه رضي الله عنه : رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (ده‌ست بگرن به لا إله إلا الله و داوای لێخۆشبوون کردن، چونکه ئیبلیس وتی : خه‌ڵکیم له‌ناوبرد به تاوان، ئه‌وانیش له‌ناویانبردم به لا إله إلا الله و داوای

لێخۆشبوون کردن، جا کاتێک ئەوەم بینی لەناوم بردن بە هەوا و ئارەزووەکان، جا ئەوان وا ئەزانن هیدایەت دراون).

جابر رضـــي الله عنه وتی : (تۆبەی لێ ناکەن و داوای لێخۆشـــبوون ناکەن بۆی).

٥١٨ - سعيد بن أبي مريم ئەڵێت : گوێبیســتی الليث بن ســعد بووم وتی : (گەیشـــتووم بە هەشـــتا ســـاڵی و هەرگیز دەمەدەمەم لەگەڵ خـاوەن هەوا و ئارەزوویەکدا نەکردووە).

٥١٩ - عبدالأعلى بن حماد ئەڵێت : گوێبیســتی حماد بن ســلمة بووم وتی : (ئەگەر أصـــحاب المحجن لەناو ئەم ئوممەتەدا بوویانە ئەوە هاوەڵانی ئەبو حەنیفە ئەبوون).

---

**: (أصـحاب المحجن) واتە هاوەڵانی گۆچان، کەسـێک بووە هاتووە بۆ حەج لە سـەردەمی جاهیلیەتدا، بە گۆچانەکەی دزی لە حاجیەکان کردووە، ئەگەر حاجیەکان پێیان بزانیایە ئەیوت ئەوە ئاڵاوە بە کۆچانەکەمەوە .**

**جا ئەو کەسە لە ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی ئەچێت لەو فێڵانەی لە دیندا ئەیکەن.**

٥٢٠ - إبراهيم بن أدهم ئەڵێت : (سـەردەمێک دێت بەسـەر خەڵکیدا سـێ دەگمەنترین شـــت ئەمانەن : برایەک دڵ پێی بکرێتەوە و لەلای ئارام بیت، وە پارەیەکی حەلاڵ، وە سوننەتێک کاری پێ بکرێت).

٥٢١ - سلیمان بن حرب ئەڵێت : گوێبیستی حماد بن زید بووم دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ (الحُجُرَات : ٢) .

ئەیوت : (پێم وایە دەنگ بەرز کردنەوە بەسەریدا لە پاش وەفاتی وەکو دەنگ بەرزکردنەوە وایە بەسەریدا لە ژیانیدا، کاتێک فەرموودەی رسول الله ﷺ خوێندرایەوە بەسەرتدا واجبە لەسەرت بێدەنگ بیت و گوێی بۆ بگریت وەکو چۆن بێدەنگ ئەبیت و گوێ ئەگریت بۆ قورئان) .

---

- لە (الجامع لأخلاق الراوي) ـدا حماد بن زید ئەڵێت : لەلای أیوب السختیاني بووین گوێی لە دەنگە دەنگێک بوو .

وتی : (ئەو دەنگە دەنگە چییە ؟! پێیان گەیشتووە دەنگ بەرز کردنەوە لەکاتی فەرموودە لە رسول الله ـەوە ﷺ وەکو دەنگبەرزکردنەوە وایە لەکاتێکدا لە ژیاندابوو) .

٥٢٢ - سلیمان بن حرب ئەڵێت : (حماد کاتێک فەرموودەی بۆ بگێڕابایەنەتەوە و ببینیایە قسە ئەکەین ئەوە بۆی نەئەگێڕاینەوە، وە ئەیوت ئەترسم بەر ئەم فەرمایشتەی الله عز وجل : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ بکەوێت) .

٥٢٣ - نافع ئەڵێت : (الأقرع بن حابس هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، أبو بكر رضي الله عنه وتی : (ئەی رسول الله ئەو بکە بە کاربەدەست) .

عمر رضي الله عنه وتی : (ئەی رسول الله مەیکە بە کاربەدەست) .

أبو بكر بە عمر ـــی وت رضي الله عنهما : (بەس لەبەر پێچەوانەکردنی من وا ئەڵێیت) .

عمر رضي الله عنه وتی : (مەبەستم موخالەفەکردنی تۆ نەبوو) .

هەتا دەنگیان بەرز بوویەوە، جا ئەمە دابەزی : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ .

جا دوای ئەوە کاتێک عمر قسـەی بکردایە لەگەڵ رسـول الله ﷺ لەبەر نزمی دەنگی گوێی لە قسەکەی نەئەبوو هەتا داوای لێ ئەکرد دەنگی بەرز بکاتەوە).

**٥٢٤ - موسى بن أيوب** ئەڵێت : لەلای بقية بن الوليد بووم، نووسـيم (عن النبي ﷺ) .

وتی : گوێبیسـتی أرطاة بن المنذر بووم ئەیوت : پێغەمبەرانێک هەن رسـول نین، وە پێغەمبەرمان رسـول ـــە، هەربۆیە بە گەورەی ڕا بگرن و بنووسـن : (عن رسول الله ﷺ) .

**٥٢٥ - الحسن بن علي** ئەڵێت : گوێبیستی الشافعي بووم ئەیوت : (مەکروهە پیاو بڵێت : (رسول وای وت) .

بەڵکو ئەبێت بڵێت : (رسـول الله ﷺ وای فەرموو)، بۆ بەگەورەڕاگرتنی رسول الله ﷺ) .

---

**: مەبەستی ئەوەیە لەپاش ناوهێنانی بوترێت (صلى الله عليه وسلم) .**

**دیاردەیەکی ناشرین هەیە لەناو موسوڵماناندا کاتێک ناوی رسول الله ﷺ ئەهێندرێت بەجوانی ناڵێت (صلى الله عليه وسلم)، بەڵکو بەپەلە وەک بڵێیت ڕاوی بنێن ئەڵێت (صەعە سەلەم)، ئەم جۆرە کەسانە یان بە جوانی بیڵێن، یان با هەر نەیڵێن .**

٥٢٦ - عبدالرحمن بن عمر رُستـه ئەڵێت : گوێبیستـی عبدالرحمن بن مهدي بووم ئەیوت : (پێشـەوایانی خەڵکی لە سـەردەمی خۆیاندا چوار کەس بوون : حماد بن زید لە بەسرەو، سفیان لە کوفە و، مالک لە حیجاز و، الأوزاعي لە شام).

٥٢٧ - أبو بکر بن عیاش ئەڵێـت : پیـاوێـک بە الأعمش ـــــی وت : ئەو مێردمندالانەی دەوربەرت ؟!

وتی : (بێدەنگ بە، ئەوانە دینەکەت بۆ ئەپارێزن) .

---

: پیـاوەکە ئەیەوێـت تـانە لە الأعمش بـدات بەوەی وتی ئەم منـدالانە چیە لە دەورووبەرت، ویستی عەیبداری بکات، وای لێ بکات شەرم بکات خۆی پیاوێکی گەورە و ئەم مندالانە لەلای زانست فێر ئەبن .

٥٢٨ - عطاء بن مسـلم الرازي ئەڵێـت : الأعمش ئەیوت : (وا نـازانم کۆمەڵەیەک هەبن باشتر بن لە ئەوانەی هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە ئەدەن و، ئەم سـوننەتە زیندوو ئەکەنەوە، ئێوە چەندن لەناو خەڵکیدا ؟! ئێوە دەگمەنترن لە ئاڵتوون!) .

٥٢٩ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : گوێبیستـی سـفیان بن عیینة بووم ئەیوت : (ڕەحمەت دائەبەزێت لەکاتی باسکردنی پیاوچاکاندا) .

وترا بە سفیان : ئەمە لە کێ وە ؟

وتی : (لە زانایانەوە) .

---

- لە (مناقب الإمام أحمد) دا المروزي ئەڵێت : باسم کرد بۆ أبو عبدالله، الفضیل بن عیاض و بێپۆشـاکیەکەی، وە فتح الموصـلي و بێپۆشـاکی و ئارامگریەکەی، چاوی پڕ

**لە فرمێسک بوو و وتی : (الله ڕەحمیان پێ بکات، ئەوترا : لەکاتی باسکردنی پیاوچاکاندا ڕەحمەت دائەبەزێت) .**

**- لە (الســیر) ـــــدا هاتووە أبو عثمان بن أبو جعفر بن حمدان ئەڵێت : (ئایا نەتانئەگێڕایەوە لەکاتی باسکردنی پیاوچاکاندا ڕەحمەت دائەبەزێت ؟) .**

**وتی : بەڵێ .**

**وتی : (دەی رسول الله ﷺ گەورەی پیاوچاکانە) .**

**٥٣٠ - یحیی بن حسـان** ئەڵێت : وکیع وتی : (گوێبیســـتی هاوڕێیەکم بووم کونیەکەی أبو المنذر بوو وتی : (پێمان گەیشـــتووە کە ڕەحمەت دائەبەزێت لەکاتی باسکردنیاندا) .

وکیع وتی : واتە ئەوانەی فەرموودە ئەپارێزن و لەبەری ئەکەن و ئەیگوازنەوە).

**٥٣١ - وکیع** ئەڵێت : القاسـم بن أرقم وتی : (لەکاتی باسـکردنی پارێزەران و لەبەرکەرانی فەرموودەدا ڕەحمەت دائەبەزێت) .

**٥٣٢ - عمرو بن أبي سلمة** ئەڵێت : گوێبیســـتی مـالـک بووم دەربـارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَ﴾ (الزُّخرُف : ٤٤) .

وتی : (ئەمە وتەی پیاوە کاتێک ئەڵێت : باوکم بۆی گێڕامەوە لە باپیرمەوە) .

---

**: مانای ئایەتەکە ئەوەیە کە ئەم قورئانە یادکردنەوەیەکە بۆ خۆت و قەومەکەت، مەبەسـت پێی رسـول الله ـــیە ﷺ، ئیمامی مالک بەوە لێکی داوەتەوە کاتێک منداڵ یان نەوەیەکی هاوەڵان شتێک لە باوکیان یان باپیریانەوە ئەگێڕنەوە .**

**٥٣٣ - سفيان بن عيينة** ئەڵێت : عبدالكريم الجزري وتی : (ئەی أبو عبدالله ئایا ئەزانیت حاطِب الليل چییە ؟) .

وتم : نەخێر .

وتی : (ئەوە پیاوە ئەڕواتە دەرەوە بە شـــەو بۆ دارکۆکردنەوە، جا دەســـتی لەســـەر مار دائەنێت، مارەکەش ئەیکوژێت، ئەمە نمونەیەکە بۆم هێنایەوە بۆ طالب علم، کاتێک زانســـتێک هەڵئەگرێت کە لە توانایدا نییە، زانســـتەکەی ئەیکوژێت وەک چۆن مار حاطب الليل ـەکەی کوشت) .

---

- **إبن أبي حاتم** لە **(آداب الشافعي ومناقبه)** ـدا لە الربيع ـەوە لە الشافعي ـەوە ئەگێڕێتەوە دەربارەی ئەو کەسەی زانست بە عەشوائی و هەڕەمەکی کۆئەکاتەوە ئەڵێت : (ئەمە وەکو حاطب الليل ــــە، کۆمەڵە دارێک ئەبڕێت و هەڵیئەگرێت، وە لەوانەیە مارێکی تێدا بێت پێوەی بدات لەکاتێکدا خۆی پێی نازانێت) .

الربيع ئەڵێت : (واتە ئەوانەی دەربارەی بەڵگە ناڵێن : لە کوێوە ؟) .

إبن أبي حاتم ئەڵێت : (ئەوەی زانســـت ئەنووســـێت بەبێ تێگەیشـــتن، وە لە درۆزنەوە ئەینووسێت، وە لە کەسی صدوق ـــەوە ئەنووسێت، وە لە بیدعەچی و جگە لەوەشـــەوە ئەینووســـێت، جا لە درۆزن و بیدعەچی فەرموودەی بەتاڵ ئەنووســـێتەوە، ئەوە ئەبێت بە نەقص یێک لە ئیمانەکەیدا لەکاتێکدا خۆی نازانێت) .

**٥٣٤ - إسحاق بن راهويه** ئەڵێت : ســـفيان بن عيينة بۆی گێڕاینەوە وتی : (الثوري بە الجُلّاب ناوی ئەهێنان) .

واتە : ئەوانەی هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە ئەدەن .

---

**: سفیان چواندوونی بە الجَلَب، ئەوانەی کە ئەوە ئەهێنن بۆ بازاڕی موسوڵمانان کە سوودیان پێ ئەگەیەنێت .**

**فەرمووده‌وانانیش کارێک ئەکەن کە سـوودی دنیا و قیامەتی خەڵکی تێدایە، ئەویش پاراستنی فەرمووده و فێرکردنی چۆنیەتی کارپێکردنیان بە شێوەیەکی ڕاست .**

**٥٣٥ - شعبة** ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هەوڵی بەدەستهێنانی فەرمووده بدات لەبەر الله هشام بن أبي عبدالله نەبێت .

وە ئەیوت : (هیواخوازم ئەوەندەم لێ بەدەستبهێنایە کە بەسم بوو[1]، نە بۆ من بووایە وە نە لەسەرم) .

ئەگەر هشام ئاوا بڵێت ئێمە چی!) .

---

**: (١) مەبەستی لەوەیە کە زۆر ئیخلاص ی هەبووە، وە وتەی هشام (ئاواتەخوازم بە کفاف ی لێی دەربچم، نە بۆ من بێت وە نە لەسەرم بێت)، واتە نە پاداشتم بدرێتەوە لەسەری نە سزا بدرێم، لە کوردەواریدا ئەوترێت بە مایە لێی دەربچم، واتە نە زەرەر بکەم لێی نە قازانج .**

**٥٣٦ - یزید بن زریع** ئەڵێت : (هەموو دینێک سوارچاکی هەیە، سوارچاکی ئەم دینەش هاوەڵانی خاوەن سەنەدەکانن) .

**٥٣٧ - همام بن یحیی** ئەڵێت : (من شەرم ئەکەم لە الله تەماشای کتێب بکەم فەرمووده لەبەر بکەم تا ئەوەی دواتر بۆ خەڵکیی بگێڕمەوە) .

**: واتە شـەرم ئەکەم سـوود نەبینم لەم فەرموودەیانەی لەبەری ئەکەم و کاری پێ نەکەم و خۆمی پێ نەڕازێنمەوە بە کـارکردن پێیـان، وە تەنهـا مەبەســتم ئەوە بێـت بیگێڕمەوە بۆ خەڵکی و لەلایان بە گەورەیی دەربکەوم .**

**٥٣٨ - مطر الوراق** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل | أَوۡ أَثَـٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ | **(الأحقاف : ٤)** .

ئەڵێت : (سەنەدی فەرموودە) .

---

| قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ | **(سُورَةُ الأَحقَاف : ٤)** .

**٥٣٩ - سـلام بن أبي مطيع** ئەڵێت : (أيوب الســختياني یەکێک لە خاوەن هەوا و ئارەزووەکانی بینی .

وتی : (من زەلیلی و ڕسـوایی بەدی ئەکەم لە ڕووخســاریدا، | إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ | **(الأَعْرَاف : ١٥٢)**، ئەمە بۆ هەموو درۆزنێکە) .

وە أيوب هەموو خـاوەن هەوا و ئارەزووەکـانی بە خەواریج نـاو ئەبرد، وە ئەیوت : (لە ناودا جیاوازن، وە لەسەر شمشێر کۆبوونەتەوە) .

وە پیاوێک لە خاوەن هەوا و ئارەزووەکان بە أيوب ـــــی وت : ئەی أبو بکر، پرسیارت لێ بکەم دەربارەی وشەیەک ؟

أيوب ـــيش پشتی تێکرد و بە دەستی ئاماژەی کرد (نەخێر نیو تەنانەت نیو وشەش) .

---

: وتەی ئیمام (ئەمە بۆ هەموو درۆزنێکە)، چونکە هەموو بیدعەچیەکان درۆزنن لەو ڕووەوەی شتێک ئەدەنە پاڵ دین کە لە دین نییە .

وە وتەی ئیمام (لە ناودا جیاوازن، وە لەســەر شــمشــێر کۆبوونەتەوە)، ئەمە عادەتی ئەهلی بیدعەعە کە شــتێک دائەهێنن و ئەیکەن بە دین، دواتر وای لێ دێت خەڵکی تەکفیر ئەکەن لەسەر ئەو شتەی خۆیان دایانهێناوە و کردوویانە بە دین ئەگەر خەڵکی بیدعە و گومڕاییەکەیان قبووڵ نەکەن، بەم شــێوەیە بە ناحەق بوون خوێنی خەڵکیان حەڵاڵ کردووە و بوون بە خەواریج .

- لە (البدع والنهي عنها) ـــدا أيوب السـختياني ئەڵێت : ڕۆژێک پیاوێک هاتە ماڵەوە بۆ لای محمد بن سیرین، وتی : ئەی أبو بكر، ئایەتێک لە کتێبی الله ـت بەسەردا ئەخوێنمەوە، لە خوێندنەوەی ئایەتەکە زیاتر ناکەم و ئەڕۆمە دەرەوە .

ئەویش پەنجەی لەســەر گوێیەکـانی دانـا وتی : (تکـات لێ ئەکەم ئەگەر موسوڵمانیت لە ماڵەکەم دەربچۆ) .

پیاوەکە وتی : ئەی أبو بكر لە خوێندنەوەی ئایەتەکە زیاتر ناکەم پاشـان ئەڕۆمە دەرەوە .

محمد بن سـيرين ـــيش بەدەم توندکردنەوەی بەشــی خوارەوەی جلەکانییەوە هەستا و خۆی ئامادەکرد بۆ وەستان .

پێمەش ڕوومان کردە پیاوەکە و وتمان : تکای لێ کردیت و لەســەری تەنگ کردیتەوە بڕۆیتە دەرەوە، ئایا بۆت حەڵاڵە پیاوێک لە ماڵەکەی خۆی بکەیتە دەرەوە ؟!

پیاوەکە چوویە دەرەوە .

وتمـان : ئەی أبو بكر، چی ئەبو لەســەرت ئایەتێکی بخوێنـدایەتەوە ئینجـا بڕۆشتایەتە دەرەوە ؟

وتی : (والله ئەگەر بمزانیایە دڵم جێگیر ئەبێت لەسەر ئەوەی لەسەریەتی ئەوەی گوێم نەئەدا بەوەی بیخوێنێتەوە، بەڵام ترسـام شـتێک بخاتە دڵمەوە هەوڵ بدەم دەریکەم لە دڵمدا و نەتوانم) .

**٥٤٠ - شعبة** ئەڵێت : (منصور بن معتمر چەند فەرموودەیەکی بۆ نووسیم و ناردی بۆم، منیش دواتر کە بینیم داوام لێ کرد .

ئەویش وتی : (ئایا بۆم نەنووسـیویت ؟ کاتێک کە بۆم نووسـیت ئەوە بۆم گێڕاویتەتەوە) .

وە داوام کرد لە أیوب السختیاني، ئەویش هەر وای وت) .

**: ئەمە بابەتێکە تایبەت بە زانستی فەرموودە، بۆ نمونە داوا لە شێخێک ئەکەیت، یان نامە بۆ شـێخێک ئەنێریت کە فەرموودەکانی فلانە کەسـت بۆ بنووسـێت و بۆت بنێرێـت، ئەمە وا هەژمـار ئەکرێـت خۆی ڕاسـتەوخۆ بۆی گێڕابێتیتەوە ئەگەرچی لە ڕاسـتیشـدا وا نەبێت، جا شـعبة بن الحجاج دوای ئەوەی کە فەرموودەکانیشـیان بۆ نووسـیوە ئەڕوات بۆ لایان تا گوێبیسـتی هەمان ئەو فەرموودەیانە ببێت کە بۆیان نووسیوە، منصور و أیوب ـیش لە وەڵامدا ئەڵێن کاتێک کە بۆمان نووسیت وەکو ئەوە وایە بۆمان گێڕابێتیتەوە .**

**٥٤١ - یحيى بن سعید** ئەڵێت : شـعبة پێی وتم : (هەرکەسـێک یەک فەرموودەی لێوە بنووسمەوە ئەوە من کۆیلەی ئەوم) .

**٥٤٢ - وكیع بن الجراح** ئەڵێت : (من هیواخوازم الله عز وجل شـعبة لە بەهەشتدا چەندین پلە بەرز بکاتەوە بەهۆی بەرگری کردنی لە سوننەتی رسول الله ﷺ) .

**٥٤٣ - أبو الوليد** ئەڵێت : داوای فەرموودەیەکم لە شعبة کرد، وتی : (والله بۆت ناگێڕمەوە، تەنها یەک جار بیستوومە) .

---

**:واتە ئەم فەرموودەیەم دوو سێ جار نەبیستووە لە هەمان شێخەوە بۆیە بۆتی ناگێڕمەوە .**

**شعبة یەکێکە لەو ئیمامە جێگیرانەی کە زیاتر لە جارێک لە هەمان شێخەوە گوێبیستی فەرموودە بووە ئینجا گێڕاویەتەوە، ئەمە بۆ تاقیکردنەوەی حفظ و ضبط ی خۆی و شێخەکەشی.**

**٥٤٤ - سفیان بن عیینة** ئەڵێت : (بەندە کاتێک شوێن هەوا و ئارەزوو کەوت الله عز وجل لەبیر ئەکات، | وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ | (ص : ٢٦) .

**٥٤٥ - یزید بن هارون** ئەڵێت : وتم بە حماد بن زید : ئایا الله عز وجل باسی هاوەڵانی فەرموودەی کردووە لە قورئاندا ؟

وتی : (بەڵێ، الله عز وجل ئەفەرمووێت : | وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ | (التَّوْبَة : ١٢٢) .

---

**لە (شرف أصحاب الحدیث) دا هاتووە بە لفظی : (بەڵێ، ئایا گوێبیستی فەرمایشتی : | لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ | .**

**ئەوە دەربارەی هەر کەسێک گەشت ئەکات بۆ بەدەستهێنانی زانست و فیقهـ، وە پێوەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پاش خۆی تا فێری بکات) .**

٥٤٦ - أحمد بن مهدي ئەڵێت : پرسیارم کرد لە أبو جعفر النفيلي دەربارەی ڕۆچوون لە الكلام دا، وتی : پرسیار کرا لە الأوزاعي دەربارەی .

وتی : (خۆت بەدوور بگرە لە زانستێک کاتێک گەیشتیتە ئەوپەڕەکەی بتدەنە پاڵ زەندیقیەت، پەیوەستبە بە شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوەوە) .

---

**: مەبەستی پێشەوایانەی ئەهلی سوننە و جەماعە لە لاسایی کردنەوە بریتیە لە شوێنکەوتنی سوننەت و ئاثارەکانی هاوەڵان و ئەوانەش کە شوێنیان کەوتوون، ئەوە بریتیە لە لاساییکردنەوەی ستایشکراو .**

**- البربهاري لە (شرح السنة) ـدا ئەڵێت : (پەیوەستبە بە ئەثەر و هاوەڵانی ئەثەر و لاسایی کردنەوەوە، چونکە دین بریتیە لە لاسایی کردنەوە - واتە هی پێغەمبەر ﷺ و - هاوەڵانی، ئەوانەی پێش ئێمە لە ناڕوونیدا بەجێیان نەهێشتووین، هەربۆیە لاساییان بکەرەوە و بحەوێرەوە، وە ئەثەر و ئەهلی ئەثەر تێمەپەڕێنە) .**

**- حرب الكرماني لە (السنة) ـــدا ئەڵێت : (وە ئەو کەسەی ئەڵێت کە پێی وایە لاساییکردنەوە نییە، وە لە دینەکەیدا لاسایی کەس ناکاتەوە، ئەوە وتەی فاسقێکی بیدعەچییە، دوژمنی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە دینەکەی و کتێبەکەی و سوونەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، بە ئەو شتە مەبەستی بەتاڵکردنەوەی ئەثەر و پەکخستنی زانست و کوژاندنەوەی سوننەتە، وە ئەوەیە خاوەن بۆچوونی خۆی بێت، وە مەبەستی قسەکردن لە دین و بیدعە و پێچەوانەکردنە .**

**جا لەعنەتی الله و مەلائیکەکان و خەڵکی هەمووی لەسەر ئەو کەسە بێت ئەم قسەیە ئەکات، چونکە ئەمە لە خراپترین و پیسترینی وتەی بیدعەچیەکانە، وە نزیکترینیانە لە گومڕایی، بەڵکو گومڕاییە) .**

٥٤٧ - عبدالله بن المبارك ئەڵێت : (هەرکەسێک کتێبی الحيل ـــی لەلا بێت و کار بکات بەوەی کە تیایدایەتی ئەوە کافرە) .

: کتێبی الحیل ی أبو حنیفة و هاوەڵە نزیکەکانیەتی .

هەمان ڕیوایەت لە (المجروحین) ی إبن حبان و (تاریخ بغداد) ی الخطیب ـدا هاتووە .

لە (المجروحین) ـدا تەواو کراوە بە وتەی : (وە خێزانەکەی لێی جیا بووەتەوە، وە حەجەکەی بەتاڵ بووەتەوە .

فڵانە کەس ئەڵێت (ئەگەر پیاوێک ظیهار بکات بەرامبەر ئافرەتەکەی و پاشان هەڵبگەڕێتەوە لە ئیسلام ئەوە کەفارەتی ظیهارەکەی لەسەر نامێنێت) .

خۆ ئەگەر کەسێک تاقی بکرێتەوە بە ظیهارکردن و پیاوێک پێی بڵێ : (ئاوا بکە بۆ ئەوەی کەفارەتی ظیهارەکەت لەسەر بکەوێت)، ئەوە کافرە، وە خێزانەکەی لێی جیا بووەتەوە، وە حەجەکەی بەتاڵ بووەتەوە) .

وە لە (تاریخ بغداد) ـدا بەم لفظ ـە هاتووە : (هەرکەسێک کتێبی حیل أبي حنیفة ی لەلا بێت و کاری پێ بکات، یان فتوای پێ بدات ئەوە خێزانەکەی لێی جیا بووەتەوە، وە حەجەکەی بەتاڵ بووەتەوە) .

مەولاکەی إبن المبارک وتی : ئەی أبو عبدالرحمن، پێم وایە کتێبی (الحیل) هەر شەیتان دایناوە .

إبن المبارک وتی : (ئەوەی کتێبی (الحیل) ی داناوە خراپترە لە شەیتان) .

- وە لە (تاریخ بغداد) ـدا إبن المبارک ئەڵێت : (هەرکەسێک تەماشای کتێبی (الحیل) ی أبو حنیفة بکات ئەوە حەڵاڵ ئەکات کە الله حەرامی کردووە، وە ئەوە حەرام ئەکات کە الله حەڵاڵی کردووە) .

- لە (أخبار الشیوخ وأخلاقهم لـ المروذي) ـدا أحمد بن الخلیل ئەڵێت : أبو علي وتی : ڕۆژێکیان دانیشتبووم لەگەڵ إبن المبارک ـدا حمزة البزاز هاتە ژوورەوە وتی : ئەی أبو عبدالرحمن، شتێکی گەورە ڕوویداوە .

وتی : (چی بووە ؟) .

وتی : کچەکەی أبي روح هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام، بۆ ئەوەی جیابێتەوە لە مێردەکەی !

إبن المبارک تووڕەبوونێک تووڕەبوو هەرگیز ئاوا تووڕە نەبووبوو .

پاشان وتی : (بێگومان الله هەموو کردەوە چاکەکانی تا ئەمڕۆ کردوویەتی بەتاڵی کردووەتەوە و تاوانەکەی ماوە) .

پاشان وترا : ئەوە کتێبی (الحيل) ە .

وتی : (حەزم ئەکرد ئەم کتێبە ببینم، جا بە نسیب نەبوو ببینم تا بزانم چی تیادا نووسراوە) .

پاشان وتی : (شایەتی ئەدەم لەسەر ئەوەی ئەم بابەتەی لەم کتێبەدا داناوە بۆ ئەوەی ئافرەتان فێڵ بکەن تا لە هاوسەرەکەی جیا ببێتەوە ئەگەر ویستی; ئەوە کافرە بە الله .

لەبەر ئەوە ئەگەر من فەرمان بکەم بە پیاوێک کوفر ئەنجام بدات، ئەویش کافر ببێت بەهۆی وتەکەی منەوە، ئەوە منیش ئەبمە کافر) هتد .

دانەری کتێبەکە فێڵێکی داناوە، ئەگەر ژنێک بیەوێت لە مێردەکەی جیا ببێتەوە ئەوە ئەبێت مێردەکەی ڕازی بێت و مارەییەکەی بداتەوە بە مێردەکەی .

دانەری کتێب ئەو فێڵەی داناوە بۆ ئەوەی ئەگەر ژنەکە ویستی جیا ببێتەوە و پیاوەکە ڕازی نەبوو، ئەوە کافر ببێتەوە و عەقدی هاوسەرگیریەکەیان نەمێنێت، دواتر بێتەوە ناو ئیسلام، بەوشێوەیە هەم لە مێردەکەی جیابووەتەوە وە هەم مارەییەکەی ماوە .

- لە (تاريخ بغداد) دا النضر بن شميل ئەڵێت : (لە کتاب (الحيل) دا ئەوەندە بابەتی تیایدا هەمووی کوفرە) .

- لە (طبقات الحنابلة) دا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (ئەو کەسەی کتێبی (الحيل) ی لەلابێت لەماڵەکەیدا فتوای پێ بدات ئەوە کافرە بەوەی الله دایبەزاندووە لەسەر محمد ﷺ) .

- إبن تيمية له (بيان الدليل على بطلان التحليل) ـــدا ئەڵێت : (ئەم فێڵكردن و هەڵخەڵەتاندنە یەكەمجار كە فتوادان پێی دەركەوت كۆتاییەكانی سەردەمی تابیعیەكان بوو، زانایانی ئەو كاتە ئینكاریان لێی كرد، وەكو : أيوب السـختياني و، حماد بن زيد و، مالك بن أنس و، سـفيان بن عيينة و، يزيد بن هارون و، عبدالرحمن بن مهدي و، عبدالله بن المبارك و، الفضـيل بن عياض و، وە قازیەكانی كوفە وەكو : شـريك بن عبدالله و، القاسم بن معن و، حفص بن غياث .

وە زانایانی ئەو سەردەمە قسەیان كرد وەكو : أيوب السختياني و، عبدالله بن عون و، القاسم بن مُخيمرة و، دوو سفيان ـەكە و دوو حماد ـەكە و، مالك و الأوزاعي و ئەوەی الله بیەوێت لە زانایان; دەربارەی ئەو كەسانەی كە فراوانیان لە الحيل ـدا كرد لە ئەهلی كوفە و جگە لەوان; بە قسـەكردنێكی توند كە ناوترێت تەنها لەكاتی دەركەوتنی بیدعەیەكدا نەبێت كە پێشتر شتی وا نەبووە و نەزانراوە، ئەوە نەبوو كە فتوای ئەدا بە شتێك كە هاوەڵان فتوایان پێدابوو، یان نزیك لەوە .

وە زانراوە ئەوانە چرای ئیسـلامن، ڕووناكی هیدایەت و ڕێنموینن، وە زانایانی دینن، وە ئەوان زاناترینی سـەردەمی خۆیان بوون، وە زاناتربوون لەوانەی پاش خۆیان بە سـوننەتە تێپەڕیوەكان، وە تێگەیشـتووتر بوون لە دیندا، وە خاوەن وەرعێكی زیاتر بوون لە قسـەكردندا، وە جیاوازیان ئەبوو لە بابەتی فیقهیدا، وە بە بۆچوون و ئیجتیهادیش قسەیان ئەكرد، وە ئینكاریان لەو كەسە نەئەكرد ئەو ڕێگەیە بگرێتەبەر .

جا مادەم ئینكاریان لەسـەر ئەهلی ڕەئی توند بوو; ئەوانەی كە بە بۆچوون فێڵكردنیان بە حەڵاڵ دانا; زانرا ئەو زانایانە زانیویانە ئەوە بیدعەیەكی تازەیە، وە لە وتەكانیاندا بەڵگەیانێك هەن بۆ ئەوە، وەكو (ئەوەی فتوا بە الحيل بدات ئیسـلام هەڵوەگێڕاو ئەكات)، وە (ئیسـلامیان كردووە بە هاوشـێوەی جلێكی زۆر تەنك)، وە (گرێ بە گرێ ئیسلام هەڵئەوەشێنێتەوە) هەتا هاوشێوەكانی دیكەی ئەم قسەیانە، وە گەورەترین شتێك ئینكاریان لێی كردبێت لەسەر ئەو كەسە بووە كە فراوانی كردووە لە فتوادان بە بۆچوون بە پێچەوانەی فەرمووده و فتوادان بە فێڵكردن، وە كاتێك كەسانێك كتێبێكیان دانا لە بابەتی فێڵكردندا ئینكاری سەلەف بۆ ئەوە زۆر توند بوو .

أحمد بن زهير بن مروان وتی : ئافرەتێك هەبوو لێرەوە ئەڕۆیشـت، وە ویستی لە مێردەكەی جیا ببێتەوە، هاوسەرەكەشی ڕێگەی پێ نەئەدا، بە ئافرەتەكە وترا

: ئەگەر لە ئیســلام هەڵبگەڕێیتەوە ئەوە جیائەبیتەوە لە مێردەکەت، ئافرەتەکەش ئەو کارەی کرد .

ئەمە باسکرا بۆ عبدالله بن المبارك و وترا : ئەمە کتێبی (الحیل) ـە .

إبن المبـارك وتی : (ئەوەی ئەم کتێبەی دانـابێـت ئەوە کـافرە، وە ئەوەی گوێبیستی بێت و پێی ڕازی بێت ئەوە کافرە، وە ئەوەی لە شـارێکەوە بیبات بۆ شـارێکی تر ئەوە کافرە، وە ئەو کەسەی لەلای بێت و پێی ڕازی بێت ئەوە کافرە) .

وە إسحاق بن راهویە گێڕایەوە لە شــفیق بن عبدالملك وتی : عبدالله بن المبارك دەربارەی ڕووداوی کچەکەی أبو روح کاتێک فەرمانی پێکرا بە مورتەدبوونەوە; بە تووڕەییەوە وتی : (شــتی تازەیان داهێنا لە ئیســلامدا، وە هەرکەســێک فەرمانی بەوە کردبێت ئەوە کافرە، وە ئەو کەســەی ئەم کتێبەی لەلابێت، یان لە ماڵەکەیدا بێت فەرمانی پێ بکات، یاخود پێی باش بێت و فەرمانیشی پێ نەکات; ئەوە کافرە .

وا نازانم شــەیتان شــتی ئاوای زانیبێت هەتا ئەمانە هاتن و لێیانەوە فێر بوو، یان شەیتان ئەیزانی بەس کەسی نەئەدۆزیەوە تا بۆی جێبەجێ بکات هەتا ئەمانە هاتن) .

وە إسحاق الطالقاني وتی : وترا : ئەی أبو عبدالرحمن، ئەم کتێبە ئیبلیس دایناوە - واتە کتێبی الحیل -

وتی : (ئیبلیسێک لە ئیبلیسەکان) .

وە النضر بن شمیل ئەڵێت : (لە کتێبی الحیل ــدا سێسەد و بیست یان سی بابەتی تێدایە هەمووی کوفرە) .

أبو حاتم الرازي وتی : شــریك - واتە : إبن عبدالله قـازی کوفە پێشــەوای بەناوبانگ، وە باسی کتێبی الحیل ــی بۆ کرا - وتی : (ئەوە هەوڵی خەڵەتاندنی الله بدات الله ئەیخەڵەتێنێت) .

وە حفص بن غیاث وتی : (پێویســتە لێی بنووســرێـت کتێبی فجور و خراپەکاری).

وە لە عبدالخالق بن منصور ــەوە وتی : گوێبیستی أحمد بن حنبل بووم وتی : (ئەو کەســەی کتێبی (الحیل) ـــــی لەلابێت لە ماڵەکەیدا فتوای پێ بدات ئەوە کافرە بەوەی الله دایبەزاندووە بەسەر محمد ـدا ﷺ) .

أبو عبدالله السدوسي ڕیوایەتی کردووە لە (مناقب الإمام أحمد) .

ئەو پێشەوایانە ئەم جۆرە قسەیانەیان کردووە دەربارەی الحیل چونکە فێڵکردنی تێدایە بۆ دواخســتنی ڕۆژووی ڕەمەزان و، کەواندنی زەکات و حەج و، حەڵاڵکردنی ڕیبا و، کەواندنی کەفارەت لە ڕۆژوو و ئیحرام و سوێند ـدا، وە پووچەڵکردنەوەی پەیمانەکان و، درۆ و شایەتیدان بە درۆ و، بەتاڵکردنەوەی حەقەکان و جگە لەوە .

وە لە ناشرینترینی ئەوەی تیایدایەتی بریتیە لە فێڵکردن بۆ ئەو ئافرەتەی ئەیەوێت لە مێردەکەی جیا ببێتەوە بەوەی هەڵبگەڕێتەوە لە ئیسلام، دواتر ئیسلامی پێ نیشان بدرێت و ئەویش نەیەتەوە ناوی، دواتر زیندانی بکرێت و زەواجەکەیان هەڵبوەشێتەوە، دواتر بێتەوە ناو ئیسلام، وە شتی تر) .

چەند نموونەیەک دەربارەی الحیل :

هەموومان ئەزانین کە لە ڕەمەزاندا مرۆڤ ئەتوانێت ســەفەر بکات، وە بەهۆی سەفەرەکەیەوە ئەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت و نوێژەکانی کورت بکاتەوە، جا کەسی وا هەیە بە ئەنقەســت ســەفەرەکانی ئەکاتە مانگی ڕەمەزانەوە، یان ڕەمەزان ســەفەر ئەکات بۆ ئەوەی ڕۆژووی درێژی ڕۆژی هاوینی ڕەمەزان نەگرێت و لەجیاتی ئەوە لە ڕۆژی کورتی ساردی زستاندا بیگرێتەوە، وە بۆ ئەوەی نوێژەکانی کورت بکاتەوە .

یان لە فەرموودەی سەحیحی رسول الله ـــدا ﷺ هاتووە کە کڕیار و فرۆشیان بۆیان هەیە لە مامەڵەکەیان پاشــگەزببنەوە هەتا لەیەک جیانەبووبێتنەوە، جا بۆ نموونە کڕیارەکە کە شــتەکە ئەفرۆشــێت بە فرۆشــیارەکە یەکســەر لەلای ئەڕوات و بەجێی ئەهێڵێت بۆ ئەوەی کڕیارەکە مەجالی پاشگەزبوونەوەی لە مامەڵەکەی نەبێت .

٥٤٨ - قتيبة بن سعيد ئەڵێت : گەیشتم بە کوفە، سفیان پێی وتم : (شعبة ی مامۆستامان چیی کرد ؟) .

**٥٤٩ - أبو داود الطيالسي** ئەڵێت : شــعبة بۆی گێڕاینەوە وتی : الثوري پێی وتم : (تۆ پێشەوای ئیماندارانیت لە فەرموودەدا) .

**٥٥٠ - سليمان بن المغيرة** ئەڵێت : (شعبة گەورەی فەرموودەوانانە) .

**٥٥١ - أبو داود الطيالسي** ئەڵێت : گوێبیســتی شــعبة بووم ئەیوت : (من بەندەی ئەو کەسەم دوو فەرموودەی لەلای بێت) .

**٥٥٢ - عبدالله بن المبارك** ئەڵێت : لەلای ســفيان بووم کاتێک هەواڵی وەفاتی شعبة هات، وتی : (فەرموودە مرد) .

**٥٥٣ - خصيف الجزري** ئەڵێت : (لە تەوراتدا نووسراوە : لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا دامەنیشە شتێک لەوە بخەنە دڵتەوە بەوهۆیەوە بتکاتە ئاگرەوە) .

## چینی پێنجەم

**٥٥٤ - أبو يوسف القاضي** ئەڵێت : (هەرکەسێک هەوڵی بەدەستهێنانی دین بدات بە الكلام ئەوە تووشی زەندەقە ئەبێت ) .

**٥٥٥ - أبو يوسف القاضي** ئەڵێت : (زانا بوون بە دەمەدەمە و الكلام; نەزانیە ، وە شارەزا نەبوون بە دەمەدەمە و الكلام; زانستە ) .

---

**- لە (تاريخ بغداد) ـــدا أبو يوسف القاضِي بە بشر المريسي ئەڵێت : (بەدەستهێنانی زانست بە الكلام جەهل و نەزانیە، وە نەزانی و جاهیل بوون بە الكلام زانستە، وە کاتێک بووبە سەرگەورە لە الكلام ــدا پێی ئەوترێت : زنديق، یاخود زەندەقە ئەدرێتە پاڵی ) .**

**٥٥٦ - حفص بن غياث** ئەڵێت : (پێویستە لەسەر کتێبی الحيل بنووسرێت : کتێبی خراپەکاری ) .

**٥٥٧ - طلق** ئەڵێت : باسی کتێبی الحيل کرا لەلای شریک ، وتی : (ئەوەی هەوڵی خەڵەتاندنی الله بدات ، الله ئەیخەڵەتێنێت ) .

---

**: الحيل واتە فێڵ، لەوانەیە کەم تا زۆر بیستبێتت لە بابەتێکدا بوترێت (حیلە شەرعیەکی بۆ بکە)، ئەم حیلە شەرعیە والعياذ بالله وەکو خەڵەتاندنی الله عز وجل**

وایە، بۆ نمونە کاتێک پیاوێک ژنەکەی سـێبەسـێ تەڵاق ئەدات، ئەبێت پیاوێکی تر بیهێنێت و ببێت بە ژنی، دواتر ئەگەر خۆی ویستی تەڵاقی دا ئینجا پیاوەکەی یەکەمجاری ئەتوانێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکاتەوە .

بەڵام لە کۆندا لە کوردستان مارەبەجاش باو بووە، ئەمەیان ناو ناوە حیلە شەرعی، کاتێک پیاوێک ژنەکەی سـێبەسـێ تەڵاق داوە، چوون مارەیان کردووە لە پیاوێکی تر و یەک شەو لەلای بووە، دواتر ئەو پیاوەی دیکە تەڵاقی داوە، ئینجا پیاوەکەی یەکەمجار هاوسەرگیری کردووەتەوە لەگەڵی .

**٥٥٨ - یحیی بن آدم** ئەڵێت : شـریک وتی : (گەیشـتین بە أبا حنیفة ، هەر خەریکی دەمەدەمێ کردن بوو) .

أبو بکر بن عیاش وتی : (گەیشـتین پێی هەر خەریکی دەمەدەمێ بوو، خۆی فێری فیقهـ نەئەکرد) .

الحسن بن صالح ئەڵێت : (پێیگەیشتین خەریکی دەمەدەمێ کردن بوو) .

---

- لە (السنة لـ عبدالله) ـدا يحي بن آدم ئەڵێت : سفیان و شریک و حسن بن صالح بۆیان گێڕاینەوە وتیان : (گەیشتین بە ئەبو حەنیفە و بە هیچ شتێک لە فیقهـدا ناسراو نەبوو، تەنها بە دەمە دەمێ و موناقەشەکردن ناسراو بوو) .

- لە (طبقات الفقهاء لـ الشيرازي) ـدا الشافعي ئەڵێت : (هەرکەسێک فەرموودەی صحيح ـی ئەوێت با پەیوەست بێت بە مالک ـەوە، وە ئەوەی موجالەدە و دەمەدەمێی ئەوێت پەیوەست بێت بە ئەبو حەنیفەوە) .

- لە (الإبانة الكبرى) ـدا فضيل بن عياض ئەڵێت : (سفیان کاتێک کەسێکی ببینیایە دەمەدەمە و موجادەلە ئەکات ئەیوت : ئەبو حەنیفەیە سـوێند بە پەروەردگاری کەعبە) .

- له (الأوسط لابن المنذر) ـــدا فضيل بن عياض ئەڵێت: (سفيان كاتێک كەسێكی دەمەدەمێكەری كەللـــەڕەقی ببینیایە، موناقەشەی لەگەڵ خەڵكیدا بكردایە بەبێ زانست; ئەیوت: (والله ئەبو حەنیفەیە).

**٥٥٩ - سلیمان الخواص** ئەڵێت: (هەر پیاوێک لەســەر هەر بارودۆخێک ببینم هیوا و ئومێدم پێی هەیە پێش ئەوەی فێری قورئان و ســوننەت بێت، خۆ ئەگەر فێریان ببێت و هەر واز نەهێنێت لەو دەمە دەمێیە ئەوە هیوا و ئومێدم پێی نییە).

**٥٦٠ - عبدالله بن المبارک** ئەڵێت: (ســەنەد لە دینە، ئەگەر ســەنەد نەبوویایە هەرکەسێک بیویستایە ئەوەی ئەوت کە خۆی ئەیەویت).

- له (شرف أصحاب الحديث) ـــدا محمد بن حاتم بن المظفر ئەڵێت: (الله عز وجل ئەم ڕێزی لەم ئوممەتە ناوە و پێگەی بەرزکردووەتەوە بە ســەنەد، وە ئوممەتەكانی پێشـوو كۆن و نوێیان ســەنەدیان نییە، بەڵكو تەنها نووسـراوانێكە لەبەردەسـتیاندا، وە هەواڵەكانی خۆیانیان تێكەڵ بە كتێبەكانیان كردووە، وە توانای جیاكردنەوەی ئەوەیان نییە كە لە تەورات و ئینجیل دابەزیوە لەوەی لە پێغەمبەرەكانیان پێی هاتوون، لەگەڵ ئەوەی لە كتێبەكانیاندا نووسیویانە لە هەواڵەكان كە لە كەسی متمانەپێكراوەوە وەریان نەگرتووە.

وە ئەم ئوممەتەش فەرمووده بە دەقەكەی خۆی ئەگێڕێتەوە لە كەســێكی ثقة ـــەوە لە سەردەمی خۆیدا، لە كەسێكی ناسراو بە ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی هاوشێوەی خۆیەوە، هەتا هەواڵەكانیان ئەگاتە كۆتایی، پاشـــان بە چڕوپڕی ئەگەڕێن هەتا حافظ ـــترین و ضابط ـــترین كەس; وە ئەو كەسەی زیاتر لەگەڵ شێخەكەیدا بووە لە كەسانی خوار خۆی ئەناسنەوە، پاشان فەرموودەكە بە بیست شێواز ئەنووسنەوە هەتا زاخاوی ئەكەن لە هەڵە، وە پیت بە پیت فەرموودەكە جێگیر ئەكەن.

ئەمە لە گەورەترین نیعمەتی الله تعالی ــــیە لەسەر ئەم ئوممەتە، داواکارین الله شــوکرانەبژێریمان بۆ ئەم نیعمەتە پێ ببەخشــێت، وە داوای جێگیربوون و ڕینمونی لێ ئەکەین بۆ ئەو شــتەی هۆکارە بۆ نزیکبوونەوە لە خۆی و، وامان لێ بکات بەردەوام گوێڕایەڵی بین، هیچ کەســێک لە ئەهلی حەدیث چاوپۆشــی لە فەرموودەی باوکی و، براکەی و منداڵەکەی ناکات، ئەوەش علي بن المديني ــــیە پێشــەوای فەرموودەیە لە ســەردەمی خۆیدا یەک پیتیش چییە لێوەی ناگێڕدرێتەوە دەربارەی بەهێزکردنی باوکی - واتە لە فەرموودەدا -، بەڵکو دژی ئەوەی لێ ئەگێڕدرێتەوە، هەربۆیە الحمدلله بۆ ئەو شتەی ڕێنمونی کردین بۆی).

- أبو المظفر الســمعاني لە (الإنتصــار لأصــحاب الحديث) ـــدا ئەڵێت: (هەموو کۆمەڵەیەک لە بیدعەچییەکان بانگەشە ئەکات ئەوەی باوەڕی پێیەتی ئەوەیە کە رسول الله ﷺ لەسـەری بووە، چونکە هەموویان بانگەشـەی شـەریعەتی ئیسـلام ئەکەن، لە ڕووکەشدا پەیوەست بە دروشمەکانیەوە، پێیان وایە ئەوەی کە محمد ﷺ پێی هاتووە ئەوە حەقە، ئەوە نەبێت پاش ئەوە ڕێچکەکان جیایانی کردەوە، وە لە دیندا ئەوەیان داهێنا کە الله و پێغەمبەرەکەی ڕێگەیان پێ نەدابوو، جا هەموو کۆمەڵەیەک وتی کە دەستگرتووە بە شـەریعەتی ئیسـلامەوە، وە ئەو ڕاستیەی رسـول الله ﷺ پێی هەستا ئەوەیە کە باوەڕی پێیەتی و خۆی ئەداتە پاڵی.

بەڵام الله تعالی وایداناوە کە حەق و عەقیدەی ڕاســت تەنها لەگەڵ هاوەڵانی فەرموودە و ئاثار بێت، لەبەر ئەوەی دین و عەقیدەی خۆیان لە سەلەف ـەوە وەرگرتووە قەرن بە قەرن هەتا ئەگاتە تابیعییەکان، وە تابیعییەکان ـــیش لە هاوەڵانی رسـول الله ﷺ وەریانگرتووە، وە هاوەڵانی رسـول الله ﷺ لە رسـول الله ﷺ وەریانگرتووە، وە هیچ ڕێگایەک نییە بۆ زانینی ئەو شــتەی کە رســول الله ﷺ بانگەوازی خەڵکی بۆ کردووە لە دین و ڕێگـای ڕاســت ئیللا بەو ڕێگەیە نەبێـت کە هـاوەڵانی فەرموودە گرتوویانەتەبەر.

بەڵام کۆمەڵەکـانی تر جگە لەم ڕێگـایەیـان گرتەبەر بۆ وەرگرتنی دین، چونکە ئەوان گەڕانەوە بۆ عەقڵ و وەسـوەســە و ڕەئەکانی خۆیان، جا لەڕێگەی ئەوانەوە دین فێربوون، ئەگەر شــتێکیان لە قورئان و ســوننەت گوێ لێ ببێت ئەیدەن لە پێوەری عەقڵی خۆیان، ئەگەر عەقڵیان بیگرێت وەریئەگرن، ئەگەر پێوانەی عەقڵیان نەیگرێت ڕەتی ئەکەنەوە، ئەگەر ناچار بن بە وەرگرتنیشــی ئەوە ماناکەی ئەگۆڕن بە تەئویلاتی

**دوور لە واتا ڕاســـتیەکەی، یـان بە واتـای مونکەر، جـا دژی حەق وەســـتـانەوە و و دوورکەوتنەوە لێی، وە دینیان وەلانا و خســـتە پشـــتیانەوە و ســـوننەتیان خســـتە ژێر پێیەکانیان) هتد .**

**ئێستا باسی گرنگی سەنەد ناکەین بەڵکو باسی ئەوە ئەکەین بۆچی خەڵکی درۆیان هەڵبەستووە بەدەم رسول الله ـەوە ﷺ ؟**

**بێگومان چەند هۆکارێکی هەیە، یەک هۆکاریان کە زۆربەی کەس بیری بۆی ناچێت ئەوەیە لەو سەردەمەدا لە بابەتە دینیەکاندا حسابیان بۆ قسەی هەموو کەسێک نەکردووە، بەڵکو حسابیان بۆ قسەی رسول الله ﷺ و هاوەڵان و پاش ئەوان کردووە .**

**جا کاتێک یەکێک ویستوویەتی شتێکی تازە بهێنێتە ناو موسوڵمانانەوە زانیویەتی کە گوێ بۆ خۆی ناگرن، هەستاوە وتە و عەقیدەکەی خۆی بە سەنەد داوەتە پاڵ رسول الله ﷺ یان هاوەڵان رضي الله عنهم بۆ ئەوەی شەرعیەت بدات بە وتەکەی .**

**وەکو چۆن خەڵکی جاهیلی ئێستا بۆ نمونە بڵێ توێژینەوەیەکی بەریتانی ئەڵێت پەتاتە ئاوا و ئاوا خراپە بۆ جەستە، ئەویش بێ یەک و دوو مادەم وتووتە (توێژینەوەیەکی بەریتانی) ناوێرێت ڕەتی بکاتەوە و باوەڕ ئەکات .**

**٥٦١ - عبدالله بن المبارك** ئەڵێت : (هەرکەســـێک هەوڵی بەدەســـتهێنانی فەرمووده بدات بەبێ ســەنەد وەکو ئەو کەســە وایە ســەرئەکەوێت بۆ ســەربان بەبێ پەیژە) .

**٥٦٢ - إبن المبارك** ئەڵێت : (درۆ بۆ ڕافیزەکانە، وە خراپی بەڕێوەبردن بۆ آل ی أبو طالب ـە **- واتە عەبباسیەکان -**، وە شەڕەقسە و ململانێ بۆ موعتەزیلەکانە، وە زوهد بۆ خەواریجەکانە، وە بەحەڵاڵدانانیش بۆ هاوەڵانی ڕەئی ـــیە، وە دین بۆ هاوەڵانی فەرموودەیە) .

- إبن تيمية لە (منهاج السـنة) ــــدا دەربارەی درۆزنیی ڕافیزەکان قسـە ئەکات و ئەڵێت : (ئەمەی کە باسمان کرد زانراوە لەلای زانایان لە کۆن و نوێدا، وەک چۆن باسی هەندێک وتەکانیانمان کرد .

هەتا ئیمام عبداللە بن المبارك وتوویەتی : (دین بۆ ئەهلی فەرموودەیە، وە درۆ بۆ ڕافیزەیە، وە الکلام بۆ موعتەزیلەیە، وە فێڵکردن بۆ ئەهلی ڕەئی و هاوەڵانی فلان ـە، وە خراپی بەڕێوەبردن بۆ آل ی أبي فلان ـە) .

**٥٦٣** - **سويد بن نصر** ئەڵێت : بیستم إبن المبارك پێی وترا : خەڵکی ڕۆژەکانیان تێپەڕین لە گوێبیستبوونی فەرموودەدا، ئەی کەی کار ئەکەن ؟

وتی : (هەتا لە گوێبیستبووندا بن ئەوە لە کارپێکردنیدان) .

---

: پرسیارکەر مەبەستی ئەوەیە ئەم طالب علم ـانە هەر خەریکی نووسینەوەی فەرموودەن، ئەی کەی کار ئەکەن بە ئەوەی ئەینووسنەوە .

ئەویش ئەڵێت هەتا لە نووسینەوەی فەرموودەدا بن ئەوە کاریان کردووە بەوەی کە نووسیویانەتەوە .

لەم حاڵەتانەدا ئەبێت ڕەچاوی ئەوەی بکرێت کەسەکە خەڵکی کوێیە، بۆ نمونە کەسێک لە ئەندەلوس (ئیسپانیا) وە دێت بۆ بەغداد و مەککە و مەدینە تا زانست فێر ببێت و فەرموودە بنووسێتەوە; وە ماڵ و منداڵی لە ئەندەلوس بەجێ هێشتووە، ئەیەوێت هەتا زووە ئەوەی ئەیەوێت بینووسێتەوە و بڕواتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی تا لەوێ بڵاوی بکاتەوە .

**٥٦٤** - **أبو وهب** ئەڵێت : وترا بە إبن المبارك : هەتا کەی هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە ئەدەیت ؟

وتی : (ئایا لە فەرموودەدا نەهاتووە کە (هەموو شتێک داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەکات تەنانەت ماسی لەناو ئاودا)؟ ئایا کەس هەیە واز لەمە بهێنێت) .

٥٦٥ - أبو وهب ئەڵێت : وتم بە إبن المبارک : کاتەکانمان چەندە لە بەدەستهێنانی زانستدا دائەنێین، ئەی کەی کاری پێ ئەکەین ؟

وتی : (ئەی أبو وهب، بەدەستهێنانی زانست کارپێکردنیەتی) .

پێم وت : خەڵکی خراپ بوون ئەی أبو عبدالرحمن .

وتی : (هێشتا بارودۆخ باشە هەتا لەناو خەڵکیدا کەسانێک هەبن هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە بدەن) .

٥٦٦ - أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (عبدالله بن المبارك رحمه الله لە کەسانێکی ئەنووسیەوە کە لەخوار خۆیەوە بوون - واتە لە پێگە و زانستدا -، وەکو رشدین بن سعد و جگە لە ئەو، جا پێیان وت : ئەی أبو عبدالرحمن چەندە ئەنووسیت!

وتی : (لەوانەیە ئەو وشەیەی ڕزگاربوونی منی تێدایە پێم نەگەیشتبێت) .

---

**- لە (روضة العقلاء) ـدا علي بن الحسن بن شقيق ئەڵێت : أبو الخراش پرسیاری کرد لە إبن المبارک لە المصيصة، وتی : ئەی أبو عبدالرحمن هەتا کەی فەرموودە ئەنووسیت ؟**

**وتی : (لەوانەیە ئەو وشەیەی سوودی لێ ئەبینم هێشتا نەمنوسیبێت) .**

٥٦٧ - عبدالله بن المبارک ئەڵێت : (خاوەن بیدعە تەپوتۆز لەسەر دەموچاویەتی ئەگەرچی لە هەر ڕۆژێکدا سێ جار دەموچاوی چەور بکات) .

٥٦٨ - عبدالله بن المبارک ئه‌ڵێت :

(ئه‌ی فێرخوازی زانست * بڕۆ بۆ لای حماد بن زيد .

زانست به‌ ژيری نه‌رمی وه‌ربگره‌ * پاشان بيبه‌سته‌ره‌وه‌ به‌ زنجير .

وه‌ واز له‌ بيدعه‌ بهێنه‌ له‌ * ئاثاره‌كانی عمرو بن عبيد) .

---

: عمرو بن عبيد پێشه‌وا و سه‌رگه‌وره‌ی موعته‌زيليه‌ قه‌ده‌ريه‌كان، ئه‌هلی سوننه‌ كۆكن له‌سه‌ر كوفر و زه‌نده‌قه‌كه‌ی .

- له‌ (تهذيب الكمال) ـدا هاتووه‌ الطبراني به‌ سه‌نه‌دی خۆی هه‌مان شيعر ئه‌گێڕێته‌وه‌ له‌ إبن المبارک له‌ تۆزێک جياوازيه‌وه‌ :

(ئه‌ی فێرخوازی زانست * بڕۆ بۆ لای حماد بن زيد .

زانستی لێ وه‌ربگرن * پاشان بيبه‌سته‌ره‌وه‌ به‌ زنجير .

نه‌ک وه‌كو ثور و وه‌كو جهم * وه‌ وه‌كو عمرو بن عبيد) .

الطبراني ئه‌ڵێت : (ثور بن يزيد الشامي قه‌ده‌ری بوو، جهم بن صفوان يش هاوه‌ڵی جه‌هميه‌كانه‌، وه‌ عمرو بن عبيد يش موعته‌زيلی بوو) .

٥٦٩ - عبدالله بن المبارك ئه‌ڵێت : (ئه‌وه‌ی ڕه‌زيل و به‌خيل بێت له‌ زانستدا به‌ سێ شت تاقی ئه‌كرێته‌وه‌ : يان ئه‌مرێت و زانسته‌كه‌ی ئه‌ڕوات، ياخود له‌بيری ئه‌چێته‌وه‌، يان شوێن ده‌سه‌ڵاتدار ئه‌كه‌وێت) .

٥٧٠ - وكيع ئه‌ڵێت : (ئه‌گه‌ر بمزانيايه‌ نوێژ چاكتره‌ له‌ فه‌رمووده‌، ئه‌وه‌ فه‌رمووده‌م نه‌ئه‌گێڕايه‌وه‌) .

---

: مەبەستی لە نوێژی سوننەتە، ئەو کەسەی زۆر خەریکی زانست و فەرمووده ببێت وەکو کەسێک کە کەمتر خەریکیەتی یان هەر خەریکی نییە کاتی کەمترە بۆ عیبادەتەکان، ئیمامیش ئەڵێت ئەگەر بمزانیایە فێربوون و گێڕانەوەی فەرمووده لە نوێژی سوننەت باشتر نییە ئەوە فەرموودەم نەئەگێڕایەوە بەڵکو ئەچوم لەجیاتی ئەوەی نوێژم ئەکرد .

- لە (شرف أصحاب الحديث لـ الخطيب البغدادي) ـدا إبن أبي الثلج ئەڵێت : پرسـیارم کرد لە أحمد بن حنبل وتم : ئەی أبو عبدالله، کامەیان بەلاتەوە باشـترە : پیاو فەرموودە بنووسێتەوە؟ یان نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێت؟

وتی : (فەرموودە بنووسێت) .

وتم : چۆن نووسینەوەی فەرموودەت بەباشتر زانی و پێشتخست بەسەر ڕۆژوو و نوێژدا؟

وتی : (بۆ ئەوەی کەس نەڵێت : من کۆمەڵەیەکم بینی لەســەر شــتێک منیش شوێنیان کەوتم) .

الخطيب ئەڵێت : (هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە باشـترە لە جۆرەکانی دیکەی ســوننەت لەبەر لەناوچوون و پشــتگوێخســتن و تەنکبوونەوەی ســوننەتەکان، وە دەرکەوتنی بیدعەکان و زاڵبوونی بیدعەچییەکان) .

٥٧١ - عفان بن مسـلم ئەڵێت : (لەلای إسـماعیل بن علیة بووم، پیاوێک فەرموودەیەکی گێڕایەوە .

وتم : (لێوەی مەگێڕەرەوە، چونکە کەسێکی جێگیر نییە) .

پیاوەکە وتی : ئەوە غەیبەتت کرد .

إسـماعیل وتی : (غەیبەتی نەکردووە، بەڵکو حوکمی دا بەوەی کە جێگیر نییە) .

٥٧٢ - عبدالله بن داود ئەڵێت : پرســیارم لە ســفیان الثوري کرد دەربارەی الکلام .

وتی : (واز لە باتڵ بهێنە) .

٥٧٣ - أبو عاصم ئەڵێت : (هەرکەسێک هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە بدات ئەوە باشترین و بەرزترین کاروبارەکانی دنیای بەدەستهێناوە، هەربۆیە ئەبێت چاکترینی خەڵکی بێت) .

---

**: واتە هەوڵ بدات ئەوەی لەناو فەرموودەکاندا هەیە کاری پێ بکات بە باشترین شێوە تا ببێت بە چاکترینی خەڵکی .**

٥٧٤ - عمر بن حفص بن غیاث ئەڵێت : گوێبیســتی باوکم بووم پێی وترا : ئایا تەماشای هاوەڵانی فەرموودە ناکەیت و ئەوەی تیایدان ؟

وتی : (ئەوان باشترینی خەڵکی دنیان) .

٥٧٥ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (واز لەوە ئەهێنم کە سەرگەورەیە لە بیدعەدا بانگەشەی بۆ ئەکات) .

---

**ئەو کەسەی خاوەنی بیدعەیە بیدعەکەی دوو جۆرە : یان ئەوەتا پێی کافر بووە، یان ئەوەتا پێی کافر نەبووەتەوە .**

**بێگومان ڕیوایەت ناکرێت لەوەوە کە کافر بووەتەوە .**

**ئەوەی کافر نەبووەتەوە تەماشا ئەکرێت ئایا درۆ ئەکات لە فەرموودەدا بۆ سەرخستنی مەزهەبەکەی ؟ بۆ نموونە وەکو ئەبو حەنیفە، یان درۆ ناکات ؟**

**ئه‌گه‌ر درۆی کرد بۆ سه‌رخستنی مه‌زهه‌به‌كه‌ی ئه‌وه ڕیوایه‌تی لێوه ناكرێت .**

**پاشان جیاكاریه‌كی تر ئه‌كرێت، ئایا ئه‌م كه‌سه ده‌عوه ئه‌كات بۆ بیدعه‌كه‌ی ؟ یان ده‌عوه‌ی خه‌ڵكی ناكات بۆلای ؟**

**ئه‌گه‌ر ده‌عوه‌ی كرد بۆلای ئه‌وه وازی لێ ئه‌هێندرێت .**

**واته ئه‌و بیدعه‌چیه ڕیوایه‌تی لێوه ئه‌كرێت كه به بیدعه‌كه‌ی كافر نه‌بووه‌ته‌وه و درۆ ناكات له گێڕانه‌وه‌ی فه‌رمووده‌دا بۆ سه‌رخستنی مه‌زهه‌به‌كه‌ی و ده‌عوه‌ی خه‌ڵكیش ناكات بۆ عه‌قیده‌كه‌ی، والله أعلم .**

**٥٧٦ - علي بن المديني** ئه‌ڵێت : (چوومه ماڵه‌وه بۆ لای خێزانی عبدالرحمن بن مهدي، ئه‌ڕۆیشتم بۆ لای پاش وه‌فاتی عبدالرحمن، شتێكی ڕه‌شم بینی له ڕووی قیبله .

وتم : ئه‌وه چییه ؟

وتی : (ئه‌وه شوێنی حه‌وانه‌وه‌ی عبدالرحمن ـــه، شه‌وانه شه‌ونوێژی ئه‌كرد، ئه‌گه‌ر خه‌و زۆری بۆ بهێنایه ناوچاوی ئه‌خسته‌سه‌ری ) .

**٥٧٧ - علي بن المديني** ئه‌ڵێت : (ئه‌گه‌ر له نێوان الركن و المقام دا سوێندم پێ بخورێت ئه‌وه سوێند ئه‌خۆم هیچ كه‌سێكم نه‌بینیوه زاناتر بێت له عبدالرحمن بن مهدي ) .

**٥٧٨ - عبدالرحمن بن مهدي** ئه‌ڵێت : (ئه‌وه‌ی هه‌وڵی فێربوونی عه‌ره‌بی بدات كۆتاییه‌كه‌ی بوون به مؤدب ـــــه، وه ئه‌وه‌ی هه‌وڵی فێربوونی شـــیعر بدات كۆتاییه‌كه‌ی بوون به شـــاعیرێكه كه هێرش ئه‌بات و ســـتایشـــی باتڵ ئه‌كات، وه هه‌ركه‌ســـێك هه‌وڵی فێربوونی الكلام بدات ئه‌وه كۆتاییه‌كه‌ی زه‌ندیق بوونه، وه

هەرکەسـێک هەوڵی بەدەسـتهێنانی فەرمووده بدات و تیایدا جێگیر ببێت ئەوه ئەبێت بە پێشەوایەک).

---

**: مەبەسـت لە (مؤدب) ئەو کەسـەیە کە وەکو مامۆسـتای تایبەتی ئێستا وایە کە منداڵی خەلیفە و خاوەن دەسەڵاتەکانی فێری ئیسلام و مێژوو و عەرەبی و ئەو زانستانە ئەکرد بەمەبەستی ئەوەی منداڵەکانیان چاوکراوە دەربچن .**

٥٧٩ - **أحمد بن يوسف** ئەڵێت : (ماوەیەکی زۆر ئەڕۆیشـتمە لای یحیی بن یحیی ئەمبینی کتێبێکی لەلایە تیایدا نووسـراوە : (وە پرسـیارم لێکرد دەربارەی فلان، وە پرسـیارم لێ کرد دەربارەی فلان)، منیش نەمئەوێرا پرسـیاری لێ بکەم، ڕۆژێکیان پێم وت : ئەمە کێ یە کە پرسیاری لێ ئەکەیت دەربارەی شێخەکان ؟

وتی : (گەنجێک لە بەسرە، پێی ئەوترا عبدالرحمن بن مهدي)) .

٥٨٠ - **أحمد بن حنبل** ئەڵێت : (بە چاوەکانم کەسـم نەبینیوە وەکو یحیی بن سعيد القطان بێت، وە عبدالرحمن پێشەوایە) .

٥٨١ - **زياد بن أيوب** ئەڵێت : (لە مەجلیسـی هشـیم هەسـتاین و أحمد بن حنبل و یحیی بن معين و هاوەڵەکانی دەستی کەسێکیان گرت و بردیانە مزگەوتەوە و لێمان نووسیەوە، ئەو کەسەش عبدالرحمن بن مهدي بوو) .

٥٨٢ - **شريك بن عبدالله** ئەڵێت : (ئەثەرێک کە شـتێک لە لاوازی تێدایە پێم خۆشتر و باشترە لە بۆچوونی ئەوان) .

٥٨٣ - **طلحة بن عمرو** ئەڵێت : (لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا دامەنیشن، چونکە پیسیەکیان هەیە وەکو پیسی نەخۆشی گەڕی) .

٥٨٤ - أبو سعيد الحداد ئەڵێت : (پێویستە پیاو کاتێک فەرموودەی لە کتێبەکەیدا نووسی بنووسێت : بسم الله الرحمن الرحیم، ﴿لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ﴾ (الحَدِيد : ٢٣) .

---

: مانای ئایەتەکە بریتیە لە : (بۆ ئەوەی دڵتەنگ نەبن و خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لەدەستان چووە) .

**والله أعلم مەبەستی لەوەیە ئەوەتا فەرموودەکانی رسول الله ﷺ ماوە و ئەیبیستن لە شێخەکان و ئەینووسنەوە، لەبەر ئەوە با دڵتەنگ نەبن بۆ ئەوەی لەگەڵ رسول الله دا ﷺ نەبوون .**

٥٨٥ - مسلمة بن قعنب ئەڵێت : (أیوب السختیاني ڕێزی لە گەنجێک ئەگرت کە شارەزای فەرموودە بێت) .

٥٨٦ - الفضیل بن عیاض ئەڵێت : (نانخواردنم لەلای یەهودی و نەسرانیەکان پێ خۆشترە لە نانخواردن لەلای بیدعەچی) .

---

**- لە (شرح أصول إعتقاد لـ اللالكائي) دا هەمان ئەثەر هاتووە لەگەڵ ڕوونکردنەوەیەک لەلایەن خاوەن وتەکەوە : (ئەگەر لەلای یەهودی و نەسرانیەکان بخۆم ئەوەی شوێنم ناکەون، وە ئەگەر لەلای خاوەن بیدعەیەک بخۆم ئەوە شوێنم ئەکەون) .**

**- لە (الآداب الشرعية) دا محمد بن أحمد المروزي وتی : ئایا پشت بە یەهودی و نەسرانیەکان ئەبەسترێت لەکاتێکدا موشریکن، وە پشت بە جەهمی نابەسترێت ؟**

أحمد وتی : (ئەی کوڕی خۆم، موسولمانان پێیان سەرسام ئەبن - واتە جەهمیەکان، لەبەر ئەوەی خۆیان بە موسوڵمان پیشان ئەدەن -، وە ئەوانە موسوڵمانان پێیان سەرسام نابن) .

- لە (السنة لـ الخلال) ـدا أبو ثابت الخطاب ئەڵێت : من و إسحاق بن أبي عمر دانیشتبووین، کەسێکی جەهمی بەلاماندا تێپەڕی، من ئەمزانی جەهمیە، سەلامی لێ کردین، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە، وە إسحاق بن أبي عمر وەڵامی نەدایەوە، إسحاق پێی وتم : (وەڵامی سەلامی جەهمیەک ئەدەیتەوە ؟!) .

وتم : (ئایا وەڵامی یەهودی و نەسڕانی نادەمەوە ؟) .

وتی : (ئایا ڕازیت بە أبو عبدالله ؟) .

وتم : (بەڵێ) .

جا بەیانیەکەی ڕۆیشتین بۆ لای أبو عبدالله، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە .

وتی : (سبحان الله، وەڵامی جەهمیەک ئەدەیتەوە ؟!) .

وتم : (ئەی وەڵامی یەهودی و نەسڕانی نادەمەوە ؟) .

وتی : (یەهودی و نەسڕانی بارودۆخیان ڕوون بووەتەوە) .

٥٨٧ - الفضيل بن عياض ئەڵێت : (بەڕۆژ گوێ ئەگرن، وە بە شەو ئەنووسن، ئەی کەی کار ئەکەن ؟) .

---

: مەبەستی لەوەیە ئەو کەسانەی ڕووایانکردووەتە نووسینەوەی فەرموودە بە ڕۆژ لەلای شێخەکانن بۆ بیستنی فەرموودە، وە بە شەویش ئەوە ئەنووسنەوە کە بیستوویانە، جا کەی کار ئەکەن بەوەی کە ئەینووسنەوە ؟

٥٨٨ - الفضيل بن عياض ئەڵێت : (لەگەڵ بیدعەچیدا دامەنیشە، لە تووڕەیی الله عز وجل ئەترسم لەسەرت) .

٥٨٩ - الفضيل بن عياض ئەڵێت : (ژیانی باش بریتیە لە ئیسلام و سوننەت) .

---

: والله أعلم مەبەستی لە | حَيَاةً طَيِّبَةً | ـی ئەم ئایەتەیە : | مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ | (النحل : ٩٧) .

٥٩٠ - يحيى بن سعيد القطان ئەڵێت : (هەرکەسێک درۆ بکات لە فەرموودەدا ئەوە تەوبەکەی وەرناگیرێت) .

٥٩١ - أبو الوليد ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە شارەزاتر بێت بە فەرموودە و پیاوانی فەرموودە لە یحیی بن سعید) .

٥٩٢ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (کەسم نەبینیوە بە چاوەکانم وەکو یحیی بن سعید وابێت) .

٥٩٣ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (هیچ شێخێکم نەبینیوە زیرەکتر و لێهاتووتر بێت لە یحیی بن سعید) .

٥٩٤ - يزيد بن هارون ئەڵێت : (کەوتوومەتە نێوان دوو شێرەوە، عبدالرحمن بن مهدي و یحیی القطان) .

٥٩٥ - عمرو بن علي الفلاس ئەڵێـت : (يحيى بن ســعيـد هەموو ڕۆژ و شــەوێک قورئانی خەتم ئەکرد، وە دوعای ئەکرد بۆ هەزار کەس، پاشــان لەدوای عەسر دەرئەچوو و فەرموودەی بۆ خەڵکی ئەگێڕایەوە) .

٥٩٦ - عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (کاتێک سفیان هات بۆ بەسرە وتی : (کەسێکم بۆ بهێنە با باسی فەرموودەی لەگەڵدا بکەم) .

منیش يحيى بن سعيد ــم بۆ هێنا، کاتێک چوویە دەرەوە سفیان وتی : (من وتم مرۆڤێکم بۆ بهێنە بەس تۆ شەیتانت بۆ هێنام!) .

---

: مەبەستی لە زیرەکی و وریایی و لێهاتوویی يحيى بن سعيد ە .

٥٩٧ - يحيى بن معين ئەڵێت : يحيى بن ســعيد پێی وتم : (ئەگەر تەنها لەوانە بگێڕمەوە کە خۆم لێیـان ڕازیم ئەوە نـاگێڕمەوە تەنهـا لە پێنج کەســەوە نەبێت).

٥٩٨ - علي بن الجارود ئەڵێت : (هشيم هاتە لای هاوەڵانی فەرموودە کاتێک حەڵقەی دانیشتنیان بەستبوو .

وتی : (لەسەر ڕووی زەوی هیچ کۆمەڵەیەک نییە لێیان باشتر بێت سەرەڕای ئەوەی کە تیایاندایە) .

وترا : بەهۆی چییەوە ئەی أبو معاوية ؟

وتی : (ئەی سوننەتەکان لە رسول الله ــەوە ﷺ ناپارێزن بۆ ئەوانەی پاش خۆیان ؟!) .

**٥٩٩ - أبو بكر بن أبي شيبة** ئەڵێت : وتم بە يحيى بن سعيد : حافظ ـــترين كەسەكان كێن تۆ بينيبێتت ؟

وتی : (الثوري، پاشان شعبة، دواتر هشيم) .

**٦٠٠ - أبو حمزة السكري** ئەڵێـت : (لە ڕۆژی قيـامەتـدا ئەهێنـدرێم، پێم ئەوترێت : کێ بۆی گێڕاوەتەوە ؟

ئەڵێم : الأعمش .

پرسيار لە الأعمش ئەكرێت، ئەڵێت : إبراهيم .

پرسيار لە إبراهيم ئەكرێت، ئەڵێت : علقمة .

پرسيار لە علقمة ئەكرێت : کێ بۆی گێڕاوەتەوە ؟

ئەڵێت : عبدالله بن مسعود .

هەتـا ئەگـاتە پێغەمبەر ﷺ، وە هەتـا جبريـل عليـه الســـلام، وە هەتـا پەروەردگار عز وجل) .

**٦٠١ - ثابت** ئەڵێت : (أنس رضي الله عنه پێی فەرمووم : ئەی ثابت، لە منەوە وەرگرە، وەرنەگريت لە كەسێكەوە جێگيرتر بێت لە من، من وەرمگرت لە رسـول الله ﷺ، رسول الله ـش ﷺ لە جبريل عليه السلام، وە جبريل ـيش وەريگرت لە الله عز وجل) .

**٦٠٢ - حميد بن محمد بن يزيد** ئەڵێت : بسطام العسكري الحافظ هات بۆ لام پرسياری لێ كردم دەربارەی فەرموودەيەک .

منيش وتم : چەندە بەپەرۆشيت بۆ فەرموودە .

وتی : (چەندە پێم خۆشە لەو كاروانەدا بم كە ئەگات بە رسول الله ﷺ) .

٦٠٣ - عبدالله بن داود الواسطي ئەڵێت : (پێویستە پیاو زۆر لە منداڵەکەی بکات بۆ فێربوون و بەدەستهێنانی فەرموودە) .

---

: ئێستاش نەک هەر زۆری لێ ناکات بۆ تەڵەبی عیلمی شەرعی، بگرە منداڵەکەی هەڵناستێنێت بۆ نوێژی بەیانی کەچی بۆ مەکتەب بە زۆر بەیانان زوو هەڵیئەستێنێت .

- لە (شرف أصحاب الحديث) ـدا سفيان الثوريِ ئەڵێت : (پێویستە پیاو زۆر بکات لە منداڵەکەی بۆ بەدەستهێنانی فەرموودە، چونکە بەرپرس و لێپرسراوە دەربارەی) .

٦٠٤ - أبو نعيم الفضل بن دكين ئەڵێت : (پێویستە ئەم بابەتە - واتە فەرموودە و ئەثەر - لە کەسێکەوە بنووسرێتەوە ئەو ڕۆژەی خۆی نووسیویەتیەوە زانیویەتی چی نووسیوە، ڕاستگۆ و ئەمین بێت تیادا، وە ئەو ڕۆژەی کە ئەیگێڕێتەوە بزانێت چی ئەگێڕێتەوە) .

٦٠٥ - محمد بن السماک ئەڵێت : (وەرگرتن و دەستگرتن بە بنچینەکان و وازهێنان لە فزوڵیەت لە کردەوەی خاوەن عەقڵەکانە) .

٦٠٦ - أبو بكر بن عياش ئەڵێت : (ئەگەر بزانم کەسێک ئەم زانستە لەپێناو الله داوا ئەکات ئەوە ئەچووم بۆ ماڵەکەی تا بۆی بگێڕمەوە) .

٦٠٧ - عبدالله بن إدريس ئەڵێت : (فەرموودە مەبیستە لە کەسێکەوە سەرخۆشکەر ئەخواتەوە، هیچ ڕێزێکی نییە) .

٦٠٨ - عمر بن هارون ئەڵێت : (تەماشای زانستم کرد بینیم قورئان و ئەثەرە، پاشان تەماشای ئەثەرم کرد بینیم بەگەورەدانانی پەروەردگار و باسکردنی

بەهەشت و جەهەننەم و حەڵاڵ و حەرام و فەرمانکردن و ڕێگری کردن و گەیاندنی ڕەحم و چەندین باشە و چاکەی جۆراوجۆرە .

پاشـــان تەماشـــای الرأي و بۆچوونم کرد بۆم دەرکەوت هەڵخەڵەتاندن و خیانەت و فێڵلێکردن و دڵ ڕەقبوون و چەندین شتی ترە لە خراپە، هەربۆیە ئەڤەرم وەرگرت و وازم لە الرأي و بۆچوون هێنا) .

---

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــدا ئەڵێت : (لەسـەر هەموو ئیمانداریێکە قسە نەکات لە شـــتێکی دیندا ئیللا بە شـــوێنکەوتن نەبێت بۆ ئەوەی کە رســـول الله ﷺ هێناویەتی، وە پێشـــی نەکەوێت، بەڵکو تەماشـــای وتەکەی خۆی بکات و؛ وتەکەی شوێنکەوتەی وتەکەی رسول الله ﷺ بێت، وە کردەوەکەی بەپێی فەرمانەکەی رسول الله بێت، هاوەڵان رضي الله عنهم بەوشێوەیە بوون، وە ئەوانەش کە شوێنی ڕێبازەکەیان کەوتن لەوانەی بەباشی شوێنیان کەوتن و لە پێشەواکانی موسوڵمانان .

هەربۆیە هیچکامێکیـان دەقەکـانی قورئان و ســـوننەتی نەئەپێوا بەوەی عەقڵی خۆی پێی ئەگـات، وە دینێکی دانەئەمەزرانـد لە غەیری ئەوەی رســـول الله ﷺ هێناویەتی، وە کاتێک بیویســـتایە شـــتێک بزانێت لە دین و چی بڵێت دەربارەی; ئەوە تەماشـــای ئەوەی ئەکرد الله تعالى و رســـول الله ﷺ فەرموویانە، جا ئیتر لەوەوە فێر ئەبوو، وە بەوە قسـەی ئەکرد، وە تەماشای ئەوەی ئەکرد و لێی ڕائەما، وە بەڵگەی بەوە ئەهێنایەوە، ئەوەش بنچینەی ئەهلی سوننەیە .

وە بیدعەچییەکان لە ناخدا پشـت نابەسـتن بەوەی کە وەریان گرتووە لە رسـول الله ـەوە ﷺ، بەڵکو پشت ئەبەستن بە بۆچوونی خۆیان و ئەوەی خۆیان پێیان باشە، پاشـان تەماشـا ئەکەن ئاخۆ سـوننەت لەگەڵی ئەگونجێت یان نا، وە ئەگەر نەشـگونجا لەگەڵی ئەوە گرنگی پێ نادەن، کاتێک بۆیان دەرکەوت ســـوننەت موخالەفەیەتی ئەوە پشت ئەکەنە سوننەت بە تفويض یان بە لێکدانەوە و گۆڕینی ماناکەی .

ئەمە جیاکەرەوەیە لەنێوان ئەهلی ئیمان و سوننەت، وە ئەهلی نیفاق و بیدعە) .

٦٠٩ - محمد بن الصباح العابد البصري ئەڵێت : حماد بن زيد ــم بينى لە خەودا .

پێم وت : ئەی أبو إسماعيل ، چيت کرد ؟

وتی : (هيچم نەبينيوە باش بێت هاوشێوەی سوننەت و پێشخستنی عثمان رضــي الله عنه ، وە بەهۆی ئەوەی عثمان ـــم پێشــخســت کۆشــکێکم پێ درا لە بەهەشـــت من و وهب بن جرير و ســـليمان بن حرب و يەکێک لە منداڵەکانم إسماعيل ی تێدايە) .

---

**: مەبەستی لە پێشخستنی ئيمامی عثمان ـــە بەسەر ئيمامی علي ـــدا رضي الله عنهما وەک چۆن لە عەقيدەی ئەهلی سوننە و جەماعەدا جێگير بووە .**

**- لە (شرح أصول إعتقاد لـ الالكائي) ــدا خالد بن خراش ئەڵێت : حماد بن زيد پێی وتم : (ئەگەر بڵێم علي باشترە لە عثمان ئەوە وتوومە هاوەڵانی رسـول الله ﷺ خيانەتيان کردووە) .**

**- لە (المنتظم) ــدا علي بن الحسين بن جداء العكبري ئەڵێت : (أبو القاسم الطبري اللالكائي م بينى لە خەودا ، پێم وت : الله چيی لێ کرديت ؟**

**وتی : (لێم خۆش بوو) .**

**وتم : بەهۆی چ شتێکەوە ؟**

**وەک بڵێيت بە دەنگی نزم وتی : (بە سوننەت) .**

٦١٠ - أبو عاصم ئەڵێت : (کاتێـک پيـاو رۆئەچێـت و قوڵ ئەبێتەوە لە فەرمووددا ئەوکات خەڵکی لەلای ئەو وەکو مانگايان لێ دێت) .

---

**: مەبەستی ئەوەیە کاتێک شارەزا بوو بە وتەی رسول الله ﷺ و هاوەڵان رضي الله عنهم ئیتر حساب بۆ قسەی هیچ کەسێک ناکات .**

٦١١ - یوسف بن أسباط ئەڵێت : (لە نیعمەتی الله تعالی بەسەر گەنجەوە ئەوەیە هاوەڵایەتی ئەهلی سوننە بکات هاوکار و یارمەتیدەری بێت لەسەر سوننەت ).

---

**- لە (الإبانة الكبرى) ـدا عمرو بن قيس الملائي ئەڵێت : (ئەگەر بینیت گەنج لو سەرەتای پێگەیشتنی لەگەڵ ئەهلی سوننە و جەماعتدایە ئەوە هیوات پێی هەبێت، وە ئەگەر بینیت لەگەڵ بیدعەچییەکاندا ئەوە لێی بێئومێد بە، چونکە گەنج لەسەر پێگەیشتنی یەکەمجاریەتی ) .**

**- لە (شرح أصول إعتقاد لـ اللالكائي) ـدا أیوب السختياني ئەڵێت : (لە خۆشبەختی کەسی تازەپێگەیشتوو و غەیرە عەرەب ئەوەیە الله ڕێنمونیان بکات بۆ لای زانایەکی ئەهلی سوننە ) .**

٦١٢ - أبو بكر بن خلاد ئەڵێت : وتم بە یحیی بن سعید : ئایا ناترسیت ئەوانەی کە وازت لە فەرموودەیان هێناوە لە ڕۆژی قیامەتدا دوژمنت بن لەلای الله ؟

وتی : (ئەگەر ئەوانە دوژمنم بن پێم خۆشترە لەوەی رسول الله ﷺ دوژمنم بێت بفەرمووێت : (بۆچی فەرموودەیەکت گێڕایەوە لە منەوە کە پێت وابوو درۆیە ؟!) .

٦١٣ - أبو بكر بن عياش ئەڵێت : (ئەهلی سوننە لەناو ئیسلام ـدا وەکو ئیسلام ـە لەناو دینەکانی تردا ) .

٦١٤ - إبراهيم بن أشعث ئەڵێت: گوێبیستی أبو أسامة حماد بن أسامة بووم وتی: (ئەکرێت پیاو نوێژی زۆر بێت، وە خاوەن ڕۆژووی زۆر بێت و، خاوەن وەرع بێت، شایەتیی وەربگیرێت، وە لە فەرموودەدا هێندەی ئەمە نەبێت)، شتێکی بەرز کردەوە و فڕێی دا.

٦١٥ - وکیع بن الجراح ئەڵێت: (زانایان ئەوەی لە بەرژەوەندی خۆیان بێت و ئەوەشــی لە بەرژەوەندیان نەبێت ئەینووســنەوە، وە ئەهلی هەوا و ئارەزوو تەنها ئەوە ئەنووسنەوە کە لە بەرژەوەندی خۆیانە).

٦١٦ - علي بن المديني ئەڵێت: (هیچ کەسێکم نەبینیوە حافظ ــتر بێت لە أبو داود الطيالسي).

٦١٧ - عروة الرقي ئەڵێت: (خۆشــەویســتی الله کارکردنە بە کتێبەکەی الله، وە خۆشویستنی رسول الله ﷺ کارکردنە بە سوننەتەکەی).

٦١٨ - خالد بن الحارث الهجيمي ئەڵێت: (ئاگاداری ئەو کەسانە بن و لێیان دوور بکەونەوە کە دەمەدەمە و جیدال ئەکەن، چونکە ئەوانە خراپترینی ئەهلی قیبلەن).

٦١٩ - سـليمان بن حرب ئەڵێت: (شــعبة فەرموودەی ئەگێڕایەوە، کاتێک هەڵبســتایە أبو داود الطيالســي دائەنیشــت و بە لەبەر ئەوەی دووبارە ئەکردەوە کە لە دانیشتنەکەدا وترابوو).

٦٢٠ - النضر بن شميل ئەڵێت: (إبن عون سەلامی نەئەکرد لە حماد).

---

: مەبەستی لە حماد بن أبي سليمان ی شێخە مورجیئەکەی ئەبو حەنیفە یە.

٦٢١ - علي بن المديني ئەڵێت : پرسیارم کرد لە جرير دەربارەی شقيق الضَّبِّي .

وتی : (ئەوە یەکەم کەس بوو ئەم ئیرجائەی دانا، وە هاوەڵی الكلام بوو) .

---

- لە (الإبانة الكبرى) ـدا عاصم ئەڵێت : أبو عبدالرحمن ئەيوت : (کەسێک لەلام دانەنیشێت کە لەلای شقيق الضبي دائەنیشێت) .

أبو عبدالله الإمام أحمد وتی : (دەمەدەمێی و ململانێی ئەکرد - واتە لەسەر بیدعەکەی - ) .

# چینی شەشەم

٦٢٢ - عثمان بن سعيد الدارمي ئەڵێت: (ڕۆژێکیان چووم بۆ لای یحیی بن یحیی بۆ ئەوەی هەندێک قسەی جەهمیەکانی بۆ بگێڕمەوە تا لە قسەکەی خۆیان ڕەد دەربکەم بەرامبەریان، وە لەو ڕۆژەدا لە دانیشتنەکەیدا الحسين بن عيسى البسطامي و أحمد بن الحريش القاضي و محمد بن رافع و أبو قدامة السرخسي و جگە لە ئەو لە شێخەکانی لێبوو، جا یحیی دانەیەکی لێدام و وتی: (بێدەنگ بە!).

وە ئەو شێخانەی لە دانیشتنەکەدا بوون ئینکاریان لەسەر کردم بەهۆی ئینکارکردن و بەگەورەزانینی ئەوەی من قسەی جەهمیەکان بگێڕمەوە).

---

- حرب الكرماني لە (السنة) دا ئەڵێت: (لەلای علي بن المديني دا باسی یەکێک لە قسەکانیانم کرد، وتم: کۆمەڵەیەک ئاوا و ئاوا ئەڵێن، ئایا پێت وایە ئەوانە موسوڵمان بن؟

وتی: (ئەگەر پیاوێک ئەمەی باس بکردایە - واتە ئەوەی حرب باسی کرد - لەلای حماد و جگە لەو لە شێخەکان ئەوە وەدەریان ئەنا، وە هیچیان نەئەگێڕایەوە بۆی، بێزراوە قسەکانیان بگێڕدرێتەوە بە توندترین بێزراوی).

وتم بە علي: وە بێزراوە پیاوێک باسی وتەی بیدعەچییەکان بکات؟

وتی: (بەڵێ، چونکە ئەترسم لەلای پیاوێکی دڵ لاواز باسی بکات شتێک بکەوێتە دڵیەوە).

- لە (رياض النفوس) ـدا یەکێک لە هاوەڵانی بهلول بن راشد وتی : ڕۆژێکیان لەلای دانیشتبووم و پیاوێکی لەلابوو جلێکی جوانی لەبەر بوو و کەشخە بوو، بهلول پێی وت : حەزەکەم باسی ئەوەم بۆ بکەیت کە قەدەریەکان بەڵگەی پێ ئەهێننەوە .

پیاوەکە بێدەنگ بوو هەتا خەڵکی ڕۆیشـــتن، پاشـــان وتی : (ئەی أبو عمرو، تۆ پرسیارت لێ کردم دەربارەی ئەوەی قەدەریەکان بەڵگەی پێ ئەهێننەوە، وە ئەو قسـەیە شـەیتانەکان هاوەڵایەتی ئەکەن، چونکە چەکێکە لە چەکەکانیان، ئەیڕازێنێتەوە لە دڵی خەڵکیدا، وە لە مەجلیسەکەی تۆدا کەسی وای تێدایە تێناگات لەوەی باسی ئەکەم، جا دڵنیا نابم ئەوەی دڵی شتێک بگرێتە خۆی) .

البهلول پێی وت : والله سەرت ماچ ئەکەم، منت ژیاندەوە الله بتژیەنێتەوە) .

٦٢٣ - محمد بن يحيى الذهلي ئەڵێت : گوێبیســـتی یحیی بن یحیی بووم ئەیوت : (بەرگری کردن لە سوننەت باشترە لە جیهاد لەپێناو الله) .

وتم بە یحیی : پیاو پارەی خۆی ســـەرف ئەکات و، خۆی هیلاک ئەکات و جیهاد ئەکات، ئایا ئەمە باشترە لێی ؟

وتی : (بەڵێ زۆریش) .

٦٢٤ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (خۆراســـان لە پاش إبن المبارك کەســـی دەرنەکردووە وەکو یحیی بن یحیی وابێت) .

٦٢٥ - محمد بن إسحاق السراج ئەڵێت : گوێبیســـتی أبو الطیب النبیل النیســـابوري بووم کە لەلای یحیی بن یحیی و إســـحاق بن إبراهیم الحنظلي دانیشتبوو ئەیوت : (إسحاق ڕۆژێکیان پێی وتم : یحیی بن یحیی بووە بە پێشەوای ئەهلی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا) .

٦٢٦ - محمد بن يحيى الذهلي ئەڵێت : گوێبیستـــی یحیى بن یحیى بووم ئەیوت بە إسـحاق بن راهویە : (خەڵکی هان بدە بۆ ســوننەت، لەلای من هیچ شتێک لەوە باشتر نییە) .

إسحاق وتی : (من زۆر هەوڵ ئەدەم لەوپێناوەدا) .

٦٢٧ - الحسين بن منصور ئەڵێت : (فاطمة ـی خێزانی یحیى بن یحیى وتی : بینیم یحیى ئەڕواتە ماڵێکەوە و إسحاق ی پێشخست .

وتم بە یحیى : تۆ بەتەمەنتریت یان إسحاق ؟

وتی : (من) .

وتم : بۆ پێشتخست ؟

وتی : (پێشم خست لەبەر زانست) .

---

: واتە لەبەر ئەوەی ئەو زاناترە لە من .

- لە (الجامع) ـــدا الحسین بن منصور ئەڵێت : (لەگەڵ یحیى بن یحیى و إسـحاق بن راهویە ـــدا بووم ڕۆژێک نەخۆشـێکمان بەسـەر ئەکردەوە، کاتێک نزیک بووینەوە لە دەرگاکە إسحاق دواکەوت و بە یحیى ی وت : پێشکەوە .

یحیى بە إسحاق ی وت : (تۆ پێش بکەوە) .

وتی : ئەی أبو زکریا، تۆ بەتەمەنتری لە من .

وتی : (بەڵێ من بەتەمەنترم لە تۆ، وە تۆ زاناتری لە من) .

جا إسحاق پێشکەوت) .

٦٢٨ - أبو عهد موسى بن محمد الموصلي ئەڵێت : (شێخەکانی نەیسابور بۆیان گێڕامەوە وتیان : یحیی بن یحیی کتێبی الموطأ ی خوێندەوە بەسەر مالک دا.

پاشان وتی : (لەوانەیە پیتێکم لابردبێت) .

هەربۆیە خوێندرایەوە بۆی بەسەر مالک دا .

پاشان ترسا ئەویش پیتێکی لابردبێت، ئیتر مالک خۆی بۆی خوێندەوە) .

وە پێی ئەوترا : (ڕەیحانەکەی خۆراسان) .

---

**: واتە توند بووە لە وەرگرتنی فەرموودەدا و ویستوویەتی بە هیچ شێوەیەک هەڵەی تێدا نەکات و بەباشی ببیستێت و ڕێک وەکو ئەوە بیگێڕێتەوە کە بیستوویەتی .**

٦٢٩ - أحمد بن يوسف السلمي ئەڵێت : ڕۆیشتم بۆ لای محمد بن یوسف الفریابي، پێم وت : ئامۆژگاریم بکە .

وتی : (پەیوەستبە بە تەقوای اللّه، وە بە سوننەت، وە دوورکەوتنەوە لە دەسەڵاتدار) .

٦٣٠ - عبدالوهاب بن الحكم الوراق ئەڵێت : پیاوێک بە الأسود بن سالم ی وت : چۆن بەیانیت کردەوە ؟

وتی : (بە خراپە، چاوم کەوتە سەر بیدعەچییەک) .

---

**- لە (تاریخ بغداد) ـدا لە أسود بن سالم ـەوە کە بینراوە دەموچاوی شۆردووە لە بەیانیەوە هەتا نیوەڕۆ .**

**پێی وترا : چیت بەسەر هاتووە .**

**وتی : (ئەمڕۆ بیدعەچیەکم بینی، منیش لەوکاتەوە دەموچاوم ئەشۆم کە بینیومە هەتا ئێستا، وە وا گومان ئەبەم پاک نابێتەوە) .**

**٦٣١ - أبو جعفر الحراني النفيلي** ئەڵێت : (ئەگەر کەسێک لەسەر زەوی ڕزگاری ببێت، ئەوە ئەوانە ڕزگاریان ئەبێت کە هەوڵی بەدەستهێنانی فەرموودە ئەدەن) .

**٦٣٢ - أبو سلمة التبوذكي** ئەڵێت : (دوو شت هەیە کە سواربوونی ئاژەڵ تیایدا باش نییە : بەدەستهێنانی فەرموودە و هاوسەرگیری کردن) .

---

**: واتە لەو دوو کاتەدا پیاو باش نییە لوت بەرز بێت، بەڵکو ئەبێت خاکی و هەوڵدەر بێت بۆیان، ئەگینا هیچیان بەدەست نایەن .**

**٦٣٣ - عبدالوهاب بن الحكم** ئەڵێت : (المأمون پرسیاری ئەکرد دەربارەی یزید بن هارون، ئەیوت : (ئەوە نەمرد ؟) .

وە خەڵکی تاقی نەکردەوە هەتا یزید وەفاتی کرد) .

---

**- لە (تاريخ بغداد) ـدا يحيى بن أكثم ئەڵێت : المأمون پێی وتین : ئەگەر لەبەر پێگە و شوێنی یزید بن هارون نەبوویایە ئاشکرا ئەکرد قورئان مخلوق ـە .**

**یەکێک لەوانەی کە دانیشتبوون وتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، جا یزید کێیە تا لێی بترسرێت ؟**

وتی : ويحک، من ناترسم لێی له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاتی هه‌يه، به‌ڵام ئه‌ترسم کاتێک ده‌رمخست ڕه‌ددم بداته‌وه، جا خه‌ڵکيش جياوازيان تێ بکه‌وێت و فيتنه دروست ببێت، وه منيش ڕقم له فيتنه‌يه .

**٦٣٤ - حفص بن غياث** ئه‌ڵێت : (ئه‌بو حه‌نيفه ـــم بينی له خه‌ودا وتم : (بارودۆخت چۆنه ؟) .

وتی : په‌يوه‌ست به به‌وه‌ی أبو بكر و عمر رضي الله عنهما له‌سه‌ری بوون .

وتم : (هه‌واڵم پێبده ده‌رباره‌ی بۆچوونی خۆت ؟) .

وتی : ئاگاداری ئه‌وه به، ئاگاداری ئه‌وه به) .

**٦٣٥ - أبو معاوية الضرير** ئه‌ڵێت : له‌لای هارون الرشيد بووم، باسی فه‌رمووده‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ : (آدم و موسى گه‌يشتن به يه‌ک) کرا، گه‌نجێک به هارون ی وت : له کوێ گه‌يشتن به‌يه‌ک ؟!

هارون وتی : (شمشێر و نِّطع م بۆ بهێنن) .

پێم وت : ئه‌ی پێشه‌وای ئيمانداران، ئه‌م گه‌نجه شتێک ئه‌ڵێت خۆشی نازانێت چييه .

هارون وتی : (ئه‌زانم ئه‌مه قسه‌ی خۆی نييه، به‌ڵام ئه‌بێت پێم بڵێت له چ زنديقێکه‌وه فێری بووه) .

منيش هه‌ر قسه‌م له‌گه‌ڵی کرد هه‌تا هێوربوويه‌وه .

---

- له (عقيدة أصحاب الحديث لـ أبو عثمان الصابوني) ـدا عمرو بن محمد ئه‌ڵێت : أبو معاوية فه‌رمووده‌ی ئه‌گێڕايه‌وه بۆ هارون الرشيد، فه‌رمووده‌که‌ی أبي هريرة ـــ رضي الله عنه (آدم و موسى به‌يه‌ک گه‌يشتن) ی بۆ گێڕايه‌وه .

عیســـی بن جعفر وتی: شـــتی وا چۆن ئەبێـت لەکـاتێکدا آدم و موســـی ئەو هەمووەیان لە نێواندایە؟!

جا هارون تێیسـرەواند و وتی: (لە رسـول الله ﷺ ـــەوە بۆت ئەگێڕێتەوە تۆش دژی ئەوەستیتەوە بە چۆن؟).

أبو عثمان الصـــابوني تەعلیق ئەدات دەربارەی ڕووداوەکە و ئەڵێت: (ئەبێت مرۆڤ ئاوا هەواڵەکانی رسـول الله ﷺ بە گەورە ڕابگرێت و قبووڵی بکات و تەسـلیم بێت پێی و بەڕاسـتیشـی بخاتەوە، وە بە توندترین ئینکاریلێکردن ئینکاری لەو کەسـە بکات کە جگە لەو ڕێگەیە ئەگرێتەبەر کە هارون الرشـید گرتویەتیەبەر لەبەرامبەر ئەو کەسەی ڕووبەڕووی فەرموودەی صحیح وەستاوەتەوە بە (چۆن؟) وەکو ئینکاریلێکردن و بەدوورزانینی ئەو شتە، وە قبووڵی نەکرد وەک چۆن پێویستە هەموو ئەوەی لە الرسول ﷺ ـەوە دێت قبووڵ بکرێت).

- إبن القيم لە (إعلام الموقعین) ـدا ئەڵێت: (سەلەفی چاک و پاک ئینکاری و تووڕەبوونیان زۆر ئەبوو لەسـەر ئەو کەسـەی ڕووبەڕووی فەرموودەی رسـول الله ﷺ ئەوەسـتێتەوە بە بۆچوون و قیاس و بەباشـزانین، یان وتەی یەکێک لە خەڵکی جا هەرکەسـێک بێت، وە هەجری ئەو کەسـەیان ئەکرد کە ئەو کارەی ئەنجام ئەدا، وە ئینکاریان لەو کەسە ئەکرد نموونەی بۆ فەرموودەکە ئەهێنایەوە، وە قبووڵیان نییە جگە لە پابەندبوون پێوەی و تەسـلیم بوون و وەرگرتنی بە گوێڕایەڵیەوە، وە دوودڵ نین لەوەی بوەسـتن لە قبووڵ کردنی هەتا کردەوەیەک یان قیاسـێک شـایەتی بۆ ئەدات، یاخود ئەگونجێت لەگەڵ وتەی فلان و فلان).

**٦٣٦ - نعیم بن حماد** ئەڵێت: (ئەوەی کە الله وەسـفی خۆیی پێ کردووە، وە ئەوەی رسول ـەکەی ﷺ وەسفی پێ کردووە تەشبیه نین).

---

- لە (شرح أصول إعتقاد اللالكائي) ـدا هاتووە: (ئەوەی الله بچوێنێت بە شتێک لە دروستکراوەکانی ئەوە کافرە بووە، وە ئەوەی ئینکاری ئەوە بکات الله وەسفی خۆیی

پێ کردووە ئەوە کافر بووە، وە لەوەدا کە چواندن نییە کە الله وەسفی خۆیی پێ کردووە وە پێغەمبەرەکەشی) .

## باسکردنی توندی الشافعي لەسەر ئەهلی الکلام و ئینکاریکردنی

٦٣٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (الله لە سەری هەموو سەد ساڵێکدا بۆ ئەم ئوممەتە کەسێک ئەنێرێت دینەکەی بۆ نوێ ئەکاتەوە) .

٦٣٨ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (ئەگێڕدرێتەوە لە فەرموودەدا لە رسول الله ـەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (الله لە سەری هەموو سەد ساڵێکدا منەت ئەکات بەسەر ئەهلی دینەکەیدا بە کەسێک لە ئەهلی بەیتەکەم دینەکەیان بۆ ڕوون ئەکاتەوە) .

وە منیش تەماشای سەد ساڵی یەکەمم کرد، بینیم کەسێکە لە آل ـی رسول الله ﷺ عمر بن عبدالعزيز، وە تەماشای سەد ساڵی دووەمم کرد بینیم محمد بن إدريس الشافعي یە) .

---

- لە (الكامل) ـدا محمد بن علي بن الحسين ئەڵێت : (گوێبیستی هەندێک لە هاوەڵانم بووم ئەیانوت : لە سەدەی یەکەمدا عمر بن عبدالعزيز بوو، وە لە سەدەی دووەمدا محمد بن إدريس الشافعي) .

ئەشعەریە جەهمیەکان ئەڵێن ئێمە لە فروع ـدا واتە بابەت فیقهیەکان لەسەر مەزهەبی الشافعي ـن، وە لە الأصول ـدا واتە عەقیدە لەسەر مەزهەبی أبو الحسن الأشعري ـن .

جا زانایانی ئەهلی حەدیث لە شافیعی مەزهەبەکان هەمیشە ئەوەیان ڕەتکردووەتەوە، وە وتوویانە چۆن لە فروع ـدا لەسەر مەزهەبی الشافعي ـیت ئەبێت لە

الأصول ــــيشدا لەسەر مەزهەبی الشافعي بيت، چونكە عەقيدەی الشافعي لە بابەتی الأصول ـدا زۆر جیاوازە و دژە لەگەڵ عەقیدەی أبو الحسن الأشعري .

- السمعاني الشافعي لە (الإنتصار) ـــدا ئەڵێت : (ئەمە وتەی الشافعي ـــیە دەربارەی زەمكردنی الكلام، وە هاندان بۆ سوننەت، وە ئەو پێشەوایەكە كە ڕكابەرایەتی ناكرێت، وە پیاوێكە ناتوانرێت ڕووبەڕووی ببیتەوە .

خۆ ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئەو و فێربوونی دین لەڕێگەی ئەوەوە ڕێگەپێدراو بێت، ئەوە هانی كەســە ئەدرێت بۆ ئەو شــتە نەوەک ڕێگری لێ بكرێت، جا بۆ هیچ كەسێک نییە مەزهەبی الشافعي لە فروع ـــدا سەربخات و پاشان واز لە ڕێبازەكەی بهێنێت لە الأصول ـدا) .

- أبو الحسن الكرجي الشافعي لە (الفصول في الأصول عن الأئمة الفحول) ـــدا ئەڵێت : (وە هەتا ئێستاش پێشەوایەكانی شافیعیەكان خۆیان ئەپارێزن و ڕەتی ئەكەنەوە لەوەی بدرێنە پاڵ الأشعري، وە حاشا ئەكەن لەوەی كە الأشعري مەزهەبەكەی خۆیی لەسەر بنیادناوە، وە ڕێگری لە هاوەڵان و خۆشەویستانیان ئەكەن لەوەی گرنگی پێ بدەن .

جا ئەوەی بڵێت : (من لە شەرعدا الشافعي ـم و لە عەقیدەدا ئەشعەریم) ئەڵێین : ئەوە لە دژبەیەكیە، بەڵكو لە مورتەدبوونەوەیە، چونكە الشـافعي خۆی لە عەقیدەدا ئەشعەری نەبووە) .

- الحافظ الرقاق لە (الرسالة) ـدا لە باسكردنی أبو منصور السمعاني ـدا ئەڵێت : (فەرمودە و مەزهەبی ئیمامی المطلبي أبو عبدالله محمد بن إدريس الشافعي القرشي رحمه الله وەرگرت، نەوەک مەزهەبی الأشعري، وە پەیوەست بوو بە كتێب و ئەثەر و سوننەت و فەرموودەوە) .

**٦٣٩ - الشافعي** ئەڵێت : (بەرامبەر الأصل ناوترێت : چۆن و بۆ ؟ بەڵكو تەسلیمبوون هەیە بۆی) .

- له (آداب الشافعي ومناقبه) دا هاتووه : (ئەسڵێک قیاس ناکرێتەسەر ئەسڵێک، وە قیاس ناکرێتەسەر خاص ێک، وە بە ئەسڵێک ناوترێت : (بۆ)، وە (چۆن) .

بەڵکو بە فرع ئەوترێت (چۆن)، جا ئەگەر قیاسەکەی لەسەر ئەسڵەکە ڕاست بوو ئەوە ڕاستە و بەڵگە پێی ئەچەسپێت) .

- وە کتێبی (الإعتقاد) ـــدا هاتووە ئەڵێت : (ئەسـڵ قورئانە، یان سـوننەت، یان یەکێک لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، یاخود کۆدەنگی خەڵکی) .

٦٤٠ - الشـافعي ئەڵێت : (شـــوێنکەوتنی فەرموودە وەک چۆن فەرموودەکە هاتووە) .

٦٤١ - الشـافعي ئەڵێت : (الأصـــل بریتین لە قورئان و فەرموودە، وە قیاس لەسەر ئەوانە ئەکرێت) .

---

- أبو بكر الأثرم لە (مناقب الإمام أحمد) ئەڵێت : (گوێبیستی أبو عبدالله أحمد بن حنبل بووم وتی : (بریتیە لە سوننەت و شوێنکەوتن، وە قیاسیش بریتیە لەوەی لەسەر بنچینە و ئەسڵێک قیاسەکە بکەیت، بەڵام ئەگەر بێیت ئەسڵەکە تێکبدەیت و پاشان بڵێیت ئەمە قیاسە، ئەم قیاسە لەسەر چ شتێک بووە ؟!) .

وترا بە أبو عبدالله : نابێت قیاس بکات مەگەر پیاوێکی زانای گەورە نەبێت بزانێت چۆن شتێک ئەچوێنێت بە شتێکی دیکە ؟

وتی : (بەڵێ، نابێت) .

وە بینیم أبو عبدالله لەوەدا کە بیستمان لێی لە پرسیار و وەڵامەکان ئەگەر لە بابەتەکەدا فەرموودەی رسول الله ﷺ هەبووبێت ئەوە نە وتەی یەکێک لە هاوەڵان، وە نە وتەی پاش ئەوانی وەرنەگرتووە ئەگەر پێچەوانەی فەرموودەکە بووبێت .

وە کاتێک لە بابەتەکەدا وتەی جیاواز لە هاوەڵانی رسول الله ـەوە ﷺ هەبووبێت ئەوە لە نێوان وتەکانیاندا دانەیەکی هەڵبژرادووە، وە لە وتەکانی ئەوان دەرنەچووە بۆ وتەیەکی تر .

وە کاتێک لە بابەتەکەدا نە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووده هەبووبێت، وە نە لە هاوەڵانەوە وتە هەبووبێت، ئەوە لە نێوان وتەی تابیعیەکان هەڵیبژرادووە .

وە جاری وا هەبوو فەرموودەیەکی رسول الله ﷺ هەبووە لە سەنەدەکەیدا شتێک هەبووە وەریگرتووە ئەگەر بە پێچەوانەیەوە لەو جێگیرتر نەهاتبێت، وەکو فەرموودەی عمرو بن شعیب، وە فەرموودەی إبراهیم الهجري .

وە جاری وا هەبووە فەرموودەی مرسل ی وەرگرتووە ئەگەر بەخیلافی هیچ شتێک نەهاتبێت) هتد .

لەم وتەیانەی الأثرم ـەوە دەرئەکەوێت کە ئیمام أحمد زۆر هەوڵی داوە قیاس نەکات و بە بۆچوونی خۆی قسە نەکات لە بابەتەکاندا .

ئەگەر لە بابەتەکەدا فەرموودەیەکی لاوازی محتمل یان مرسل هەبووبێت بەکاریهێناوە و ڕووی نەکردووەتە قیاس کردن و قسەکردن بە بۆچوون .

٦٤٢ - **الشافعي** ئەڵێت : (خوێندنەوەی فەرموودە باشترە لە نوێژی سوننەت) .

٦٤٣ - **الشافعي** ئەڵێت : (بەدەستهێنان زانست باشترە لە نوێژی سوننەت).

---

- إبن رجب لە (مجموع الرسائل) ـدا لەپاش باسکردنی ئەو فەرموودەیانەی هاتوون دەربارەی فەزڵی زانست بەسەر عیبادەتدا، ئەڵێت : (ئەم فەرموودەیە ئاماژەی داوە بە باشتربوونی زانست بە بەراورد لەگەڵ عیبادەت بە باشتربوونێکی دیار، وە بەڵگەیانێک کە ئاماژە بدەن بەوە زۆرن .

الله تعالى ئەفەرمووێت : ﴿قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ﴾ (الزُّمَر : ٩) .

وە ئەفەرمووێت : ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ (المُجَادلَة : ١١) .

وە ئاثارە موقوف ـەکان لە سەلەفەوە لەم بابەتەدا زۆرە :

ڕیوایەت کراوە لە أبو هريرة و أبو ذر رضي الله عنهما ئەفەرموون : (ئەو بابەتەی پیاو فێری ئەبێت خۆشەویستترە بە لامانەوە لە هەزار ڕکعاتی سوننەت) .

وە ڕیوایەت کراوە لە أبي الدرداء ـەوە رضي الله عنه فەرموویەتی : (ساتێک باسکردنی زانست خێرترە لە شەونوێژ) .

وە لە إبن عباس ـەوە رضي الله عنه فەرموویەتی : (باسکردنی زانست لە بەشێکی شەودا خۆشەویستترە لەلام لە زیندووکردنەوەی) .

وە الزهري وتی : (فێربوونی سوننەت باشترە لە عیبادەتی دووسەد ساڵ) .

الشافعي وتی : (بەدەستهێنانی زانست باشترە لە نوێژی سوننەت) .

وە مالک یەکێک لە هاوەڵانی بینی زانستی ئەنووسیەوە، پاشان وازی لێ هێنا و هەستا نوێژ بکات، مالک وتی : (عجباً لک! ئەوەی کە هەستایتەوە بۆی باشتر نییە لەوەی کە وازت لێی هێنا) .

وە پرسیار کرا لە أحمد : کامەیان بەلاتەوە خۆشەویسترە، شەونوێژ بکەم؟ یان زانست لەبەربگرمەوە؟

وتی : (ئەگەر بابەتی دینەکەت لەبەر بگریتەوە ئەوە خۆشەویستترە بەلامەوە) .

وە أحمد ئەڵێت : (هیچ شتێک هاوتای زانست نییە) .

وە لەوەی ئاماژەیە بۆ باشتربوونی زانست بەسەر عیبادەتدا چیرۆکی آدم ـە، چونکە الله تعالى فەزڵی دەرخست بەسەر مەلائیکەکاندا بە زانست کاتێک فێری ناوی

**هەموو شتەکانی کرد، وە فریشتەکان دانیان نا بە بێتوانایی لە زانینی ئەوە، جا کاتێک آدم ناوەکانی پێ وتن فەزڵی بەسەر ئەواندا دەرکەوت .**

**وە لەوەی ئاماژە ئەدات بە فەزڵی زانست ئەوەیە : جبریل علیه السلام فەزڵی درا بەسەر ئەو فریشتانەی تردا کە خەریکی عیبادەتن بەو زانستەی کە پێی تایبەتمەندکرا، چونکە ئەو هاوەڵی ئەو وەحیە بوو کە پێی دائەبەزێندرایە سەر پێغەمبەران علیهم السلام .**

**وە بە هەمان شێوە رسول ـەکان فەزڵیان درا بەسەر جگە لەخۆیان لە پێغەمبەران علیهم السلام بەهۆی ئەو زانستە زیادەیەوە کە پێویستیکەری زیاتر ناسینی الله و هەبوونی خەشیەتە بۆی .**

**وە کاتێک فەزڵی زانا بەسەر عیبادەتکاردا دەرکەوت، مەبەست بە باشتربوونی لە کەسی عیبادەتکار بە زانستە، هەرچی عیبادەتکاری بێ زانستە ئەوە زەمکراوە، وە سەلەف چواندوویانە بە کەسێک کە ڕێ ئەکات لەسەر ڕێگەیەکی هەڵە، وە ئەوە تێکی ئەدات زیاترە لەوەی چاکی ئەکات) .**

**٦٤٤ - الشافعي** ئەڵێت : (ڕۆژانە و شەوانە ئەڕۆیشتم لەپێناو بەدەستهێنانی فەرمووددا، چونکە هەوڵی بەدەستهێنانی فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێک) .

**٦٤٥ - یونس بن عبدالأعلی** ئەڵێت : وتم بە الشافعي : اللیث بن سعد ـی هاوەڵمان وتی : (ئەگەر ببینم خاوەن هەوا و ئارەزوو بەسەر ئاودا ئەڕوات قبووڵی ناکەم) .

الشافعي وتی : (کەمی وتووە، ئەگەر ببینم بە هەواشدا ئەفڕێت هەر قبووڵی ناکەم) .

: چونکە ئەو بەسەر ئاو و هەوادا ڕۆشتنە تەنها بۆ فیڵ و چاوبەستی خەڵکیە، هەربۆیە ئەبێت هەرکەسێک خاوەن هەر شتێکی باش بوو یەکەمجار عەقیدەی بپێورێت بە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئینجا بڕیار بدرێت ئاخۆ کەسێکی باشە یان نا .

- لە (الإبانة الكبرى) ـــدا یونس ئەڵێت : الشافعي پێی وتم : (ئەی أبو موسی بەڕاستی لە هاوەڵانی الكلام شتێکم بینی ئەگەر کەسێک ببینم هەموو ئەوەی الله نەهی لێ کردووە ئەنجامی بدات جگە لە شیرک پێم خۆشترە لەوەی هاوەڵایەتی الكلام بکات) .

وتم : ئەی أبو عبدالله ئایا ئەزانیت هاوەڵەکەمان ئەڵێت چی ؟

ئەڵێت : ئەگەر بینیت هاوەڵی الكلام بەسەر ئاودا ئەڕوات بێخەم مەبە لە نزیک بوونەوەی .

وتی : (کەمی وتووە، ئەگەر ببینم هاوەڵی الكلام لە هەوادا ئەڕوات ئەوە بێخەم نابم لە نزیک بوونەوەی) .

٦٤٦ - الشافعي ئەڵێت : (وە فەرموودە لەسەر ڕووکەشەکەیەتی .

وە کاتێک فەرموودەکە مانایانێک هەڵبگرێت ئەوەی کە لێکچووترە بە ڕووکەشەکەی ئەوەیان لەپێشترە) .

: ئەمە مەنهەجی هەموو ئەهلی حەدیث و سوننەیە لە هەموو سەردەمێکدا لە هەموو بابەتەکانی دیندا، نەوەک وەکو جەهمیەکان ڕووکەشی فەرموودەکانی سیفات بە کوفر و تەشبیه بزاندرێت .

٦٤٧ - الربيع ئەڵێت : (الشافعي بە یەکێک لە هاوەڵانی فەرموودەی وت : ئێوە دەرمانسازن و ئێمەش پزیشک) .

---

**- له (تاريخ دمشق) ـدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (فەقیهەکان پزیشک بوون، وە فەرمودەوانان دەرمانساز بوون، دواتر محمد بن إدريس وەکو پزیشکێکی دەرمانساز هات) .**

٦٤٨ - الشافعي ئەڵێت : (هەرکەسێک فێری قورئان ببێت بەهای گەورە ئەبێت .

وە هەرکەسێک قسە بکات لە فیقهدا پێگەی گەشە ئەکات .

وە هەرکەسێک فەرموودە بنووسێتەوە بەڵگەی بەهێز ئەبێت .

وە هەرکەسێک خوو بداتە زمان ئەوە سروشتی نەرم ئەبێت .

وە ئەوەی تەماشای حسابات بکات ئەوە بۆچوونی گەورە ئەبێت .

وە هەرکەسێکیش خۆی نەپارێزێت ئەوە زانستەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت) .

٦٤٩ - محمد بن داود ئەڵێت : (لە هەموو تەمەنی الشافعي ـدا نەزانراوە قسەی کردبێت لە هەوا و ئارەزووەکان، وە نەدراوەتە پاڵی و نەناسراوە پێی; لەگەڵ رِقی بۆ ئەهلی کەلام و بیدعەچییەکان) .

---

**: واتە لە هیچ بیدعەیەکەدا تێوە نەگلاوە .**

٦٥٠ - أحمد بن حنبل ئەڵێت : (ئەگەر الشافعي هەواڵێک لەلای جێگیر بوویایە ئەوە شوێنی ئەکەوت، وە باشترین تایبەتمەندی تیایدا بوو ئەوەبوو حەزی لە الكلام نەبوو، بەڵکو هەموو هەوڵ و گرنگیپێدانی بۆ فیقهـ بوو) .

٦٥١ - محمد بن عقيل بن الأزهر ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای المزني پرسیاری لێکرد دەربارەی شتێک لە الكلام .

المزني وتی : (من رِقم لێیەتی، بەڵکو نەهی لێ ئەکەم وەک چۆن الشـــافعي نەهی لێ کرد، چونکە گوێبیســـتی الشـــافعي بووم ئەیوت : پرســـیار کرا لە مالک دەربارەی الكلام و تەوحید .

مالک وتی : مەحاڵە گومان ببرێت بە پێغەمبەر ﷺ خۆپاکردنەوەی فێری ئوممەتەکەی کردبێـت بەڵام تەوحیـدی فێر نەکردبن، وە تەوحیـد ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (فەرمـانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیـدا هەتـا ئەڵێن لا إلـه إلا الله)، جـا ئەوەی خوێن و ســـامانی پێ بپـارێزرێـت حەقیقەتی تەوحیدە) .

---

: ئەهلی الكلام بە گشتی دان بەوەدا ئەنێن کە لە بابەتی ناو و سیفاتدا رسول الله تەوحیدی فێری ئوممەتەکەی نەکردووە، وە ڕووکەشی وتەکانی کوفر و تەشبیهە .

٦٥٢ - الشـافعي ئەڵێت : (هیچ کەسـێک خووی نەداوەتە الكلام و سـەرفراز بوو‌بێت) .

٦٥٣ - المزني ئەڵێت : پرسیارم کرد لە الشافعي دەربارەی شتێک لە الكلام .

وتی : (دەربارەی شـــتێک پرســـیارم لێ بکە ئەگەر هەڵەم تیادا کرد بڵێیت هەڵەت کرد، وە پرسیارم لێ مەکە دەربارەی شتێک کاتێک هەڵەم تیایدا کرد بڵێیت کافر بوویت) .

: چونكە موتەكەلیمەكان دێن بە هەوا و ئارەزوو و یاسـای دەسـتكردنی خۆیان دەربارەی الله عز وجل قسە ئەكەن هەربۆیە ئەكەونە كوفر و زەندەقەوە .

- السمعاني لە (الإنتصار) ـدا ئەڵێت : (الشافعي ئەڵێت : (ئاگاداری تەماشاكردنی الكلام بن، خۆ ئەگەر كەسێك پرسیاری لێ بكرێت دەربارەی بابەتێك لە فیقهـ ـدا هەڵە بكات، یان پرسیاری لێ بكرێت دەربارەی پیاوێك كە پیاوێكی دیكەی كوشتووە، ئەویش بڵێت : خوێنباییەكەی هێلكەیەكە .

زۆرەكەی ئەوەیە پێی پێبكەنن .

بەڵام ئەگەر پرسیاری لێ بكرێت دەربارەی بابەتێك لە الكلام ـدا و هەڵە بكات ئەوە ئەدرێتە پاڵ بیدعە) .

ئەمە وتەی الشافعي ـیە دەربارەی زەمكردنی الكلام، وە هاندان بۆ سوننەت، وە ئەو پێشەوایەكە كە ڕكابەرایەتی ناكرێت، وە پیاوێكە ناتوانرێت ڕووبەڕووی ببیتەوە .

خۆ ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئەو و فێربوونی دین لەڕێگەی ئەوەوە ڕێگەپێدراو بێت، ئەوە هانی كەسە ئەدرێت بۆ ئەو شتە نەوەك ڕێگری لێ بكرێت، جا بۆ هیچ كەسێك نییە مەزهەبی الشافعي لە فروع ـدا سەربخات و پاشان واز لە ڕێبازەكەی بهێنێت لە الأصول ـدا) هتد .

السمعاني ڕاستی كرد و پێكای، چونكە زۆربەی ئەوانەی خۆیان ئەدەنەپاڵی لە فیقهدا; لە عەقیدەدا لە دوورترین كەسەكان لێیەوە، وە واتای ئەو وتانەیان گۆڕی كە تیایدا الشافعي نەهی لە الكلام و ئەهلەكەی ئەكات وەك چۆن پێش ئەوەش كەلامی الله عز وجل و پێغەمبەرەكەیان ﷺ گۆڕی .

البیهقي الأشعري الجهمي لەو كەسانەیە كە زۆرترین وتەی ئیمامی الشافعي ـی كۆكردووەتەوە لە زەمكردنی الكلام و ئەهلەكەی، وە لەگەڵ ئەوەشـدا مانای وتەكانی ئیمام ئەگۆڕێت و لێكی ئەداتەوە بە لێكدانەوەك تا هاوەڵە ئەشعەریەكانی لەو زەمە دەربكات كە الشافعي كردوویەتی .

- إبن تیمیة لە (النبوات) ـدا ئەڵێت : (لفظ ـی الكلام لەبەر ئەوەی مجمل ـە، زۆربەی خەڵكی جیاوازی ئەو الكلام ـەیان نەزانی كە زەمیانكرد لەگەڵ جگە لەوەدا، لە خەڵكی هەیە وا ئەزانێت تەنها ئینكاریان لە وتەی قەدەریەكان كرد، وەكو چۆن البیهقي

و إبن عساكر باسيان كردووە لە لێكدانەوەی وتەكانی الشافعي ـــدا؛ بۆ دەركردنی هاوەڵەكانیان - واتە ئەشعەریەكان - لە زەم، بەڵام خۆی بەوجۆرە نییە، بەڵكو الشافعي ئینكاری لە الكلام ــی جەهمیەكان كرد، و وتەی حفص الفرد و هاوشێوەكانی، ئەوانەش ململانێ و ناكۆكیەكانیان لە سیفات و قورئان و بینینی الله عز وجل ـــدا بوو نەوەک قەدەر .

وە بە هەمان شێوە أحمد بن حنبل ـــیش دوژمنەكانی لە ئەهلی الكلام جەهمیەكان بوون ئەوانەی موناقەشەیان لەگەڵدا كرد لە قورئاندا، وەكو أبو عیسى برغوث هاوەڵی حسیب النجار و هاوشێوەكانی؛ قەدەری نەبوون، وە ناكۆكیەكەشیان لە بابەتی قەدەردا نەبوو، هەر لەبەر ئەمەش أحمد و هاوشێوەكانی بە ڕاشكاوی زەمی جەهمیەكانیان ئەكرد، بەڵكو تەكفیریان ئەكردن زیاتر لە كۆمەڵەكانی دیكە) .

- المعلمي اليماني لە (التنكيل) ـــدا ئەڵێت : (البیهقي قسە بێسەروبنەكانی مامۆستاكەی إبن فورک ــی جەهمی ترساندی، ئەوەی لە كتێبەكەیدا شوێن إبن الثلجي كەوت كە نووسی بۆ تەحریفكردنی فەرموودەكانی سیفات و تانەدان لێیان) .

هەر لە (التنكيل) ـــدا ئەڵێت : (من والله خەمبار نیم بۆ إبن فورک، بەڵكو خەمبارم بۆ ئەو البیهقي ـــیەی سیحری لێ كراوە لەلایەن ئەوەوە، ئەوەی كە بەهۆی ترساندنەكانی إبن فورک و جگە لە ئەو زەندەقی چوو، هەربۆیە تەسلیمیان بوو و پابەند بوو پێیانەوە و بوون بە بۆچوونی) .

- إبن القيم لە (الصواعق المرسلة) ـــدا دەربارەی ئەو یاسا كەلامیانەی موتەكەلیمەكان دایانناوە ئەڵێت : (سەیر نییە لە عەقڵانێک بۆ خۆی ڕازی بوو بەم وڕێنانە هەتا بیروباوەڕی گەیشت بەوەی ئەوە گەورەترین شتە عەقڵ پێی بگات، وە ئەوپەڕی ناسینی پەروەردگار و لێكۆڵینەوە ژیریەكانە، پاشان پێشی خست بەسەر دەقەكانی وەحی، چونكە ئەمە لە ئەسڵدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و بەرەنگاری پێغەمبەران دانراوە، وە بۆ ڕەتكردنەوەی ئەوەی هێناویانە .

بەڵكو سەیر لە كۆمەڵەیەک دێت پێغەمبەرانیان بەڕاست خستەوە، وە شایەتیان دا پێغەمبەر حەقە، وە بە شتە ڕوونەكان هاتووە بۆ لایان، وە زانیان ڕاستگۆی بەڕاستخراوەیە؛ ئەوەی كە بە هەوا و ئارەزووی خۆی قسە ناكات | إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ | (النَّجْم : ٤) .

پاشـــان ئه‌م وڕێنانه به‌ر گوێیان كه‌وت و چووه ناو دڵیانه‌وه و قبووڵیان كرد، وه هاوه‌ڵانی ئه‌م وڕێنانه‌یان به‌ گه‌وره ڕاگرت و ناویان نان لێكۆڵه‌ره‌وه‌كان، وه وته‌كانی ئه‌وانیان پێشخست به‌سه‌ر ده‌قه ڕوونه‌كانی وه‌حی، ئه‌وه جگه له‌وه‌ی پێشیان خستبوو به‌سه‌ر وته‌ی هاوه‌ڵان رضي الله عنهم و تابیعیه‌كان) هتد .

سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی البيهقي و هاوشێوه‌كانی چه‌نده خه‌ریكی فه‌رمووده و فیقهـ بوون به‌ڵام به‌رچاوڕۆشـــنیان پێ نه‌درا و یـاســـا كه‌لامیه كوفریه‌كـان كـاریـان تێكردن و پێشیانخست به‌سه‌ر هه‌ردوو وه‌حیه‌كه و تێگه‌یشتنی سه‌له‌ف و بگره عه‌قڵ یش .

**٦٥٤ - الشافعي** ئه‌ڵێت : (ده‌مه‌ده‌مێكردن له دیندا دڵ توند و ڕه‌ق ئه‌كات، وه ئه‌بێته هۆی ڕق و كینه) .

**٦٥٥ - المزني** ئه‌ڵێت : گوێبیستی الشافعي بووم وتی به الربيع : (ئه‌ی ربيع، سێ شـتم لێ وه‌ربگره، قسـه مه‌كه ده‌رباره‌ی هاوه‌ڵانی رسـول الله ﷺ و تیایاندا ڕۆمه‌چۆ، چونكه له ڕۆژی قیامه‌تدا دوژمنه‌كه‌ت پێغه‌مبه‌ره ﷺ .

وه سـه‌رقاڵ مه‌به به الكلام ـــه‌وه، چونكه من بینیم ئه‌هلی الكلام له‌سـه‌ر په‌ككه‌ستنن .

وه خه‌ریكی ئه‌ستێره‌كان مه‌به، چونكه سه‌رئه‌كێشێت بۆ په‌ككه‌ستن) .

---

: مه‌به‌ســـتی له ئه‌ســـتێره‌كان ئه‌و به‌ناو زانســـته‌یه ئه‌مڕۆ پێی ئه‌وترێت زانســـتی بورجه‌كان، وه ئه‌وه‌ی باوه‌ڕی به‌و بورجانه هه‌بێت قه‌ده‌ری الله عز وجل ی په‌ككه‌ستووه.

**٦٥٦ - إسماعيل بن يحيى** ئه‌ڵێت : (مه‌زهه‌بی الشـــافعي بریتی بوو له بێزراوێتی و كه‌راهیه‌ت له ڕۆچوون له الكلام دا) .

٦٥٧ - حسين ئەڵێت : (پرسیار لە الشافعي كرا دەربارەی شتێک لە الكلام، تووڕە بوو و وتی : پرسیاری ئەمە لە حفص الفرد و هاوەڵانی بکە الله ڕسوایان بکات).

- لە (الشريعة) ـدا الربيع بن سليمان ئەڵێت : - باسی مونازەرەکەی الشافعي ئەکات لەگەڵ حفص الفرد بە ئامادەبوونی والی مصـر - الشـافعي لە مونازەرەکەدا پێی وت : (کافر بوویت بە لا إله إلا هو) .

پاشان هەستان و ئەویان جێهێشت .

گوێم لێبوو حفص وتی : بە لا إله إلا هو ڕشتنی خوێنمی ئەوێت) .

- إبن تيمية لە (درء التعارض) ـــدا ئەڵێت : (حفص الفرد وەک چۆن ناسـراوە لەلای زانایان بە وتەی خەڵکی بە جێگیرکردنی قەدەر، لە نەفیکارەکانی سیفەتە .

وە بەڵگە ئەسڵیەکەیان لەو بابەتەدا الأعراض ـــە، قورئان وتەیە، وە وتە لەلایان وەکو سیفەت و کردەوەکانی دیکەیە، پێی هەڵناستێت ئیللا جسم نەبێت، وە جسم یش دروستکراوە، جا ئینکاریکردنی الشافعي لێی لەبەر ئەو الكلام ـە بوو کە بانگی کردن بۆ ئەمە) .

٦٥٨ - الشـافعي ئەڵێت : (بەندە بگاتەوە بە الله بە هەموو تاوانێکەوە جگە لە شیرک لەوە باشترە پێی بگاتەوە بە شتێک لە هەوا و ئارەزوو) .

٦٥٩ - الربيع بن سـليمان ئەڵێـت : گوێبیسـتی الشـافعي بووم وتی : (ئاواتەخوازم خەڵکی فێری ئەم زانسـتە - واتە : کتێبەکانی - ببن لێمەوە و هیچ شتێکی نەدەنە پاڵم) .

٦٦٠ - الشـافعي ئەڵێت : (مونازەرەم نەکردووە لەگەڵ کەسـێکدا زانیبێتم لەسەر بیدعەیەک ئەمێنێتەوە) .

٦٦١ - الشـافعي ئەڵێت : (حوكمی من دەربارەی ئەهلی الكلام ئەوەیە بە پەلی دارخورما لێیان بدرێت بخرێنە سـەر حوشـتر و لەناو هۆز و قەبیلەكاندا بگەڕێنرێن و بە دەنگی بەرز دەربارەیان بوترێت : ئەمە سزای ئەو كەسەیە كە وازی كە قورئان و سوننەت هێناوە و ڕووی كردووەتە الكلام) .

٦٦٢ - الشـافعي ئەڵێت : (موناقەشـەم نەكردووە لەگەڵ هیچ كەسـێكدا مەگەر لەبەر دڵسۆزی و ئامۆژگاریكردن نەبێت) .

٦٦٣ - الشـافعي ئەڵێت : (موناقەشـەم نەكردووە لەگەڵ هیچ كەسـێكدا لە الكلام ـدا تەنها یەک كەس نەبێت ، وە من داوای لێخۆشبوون ئەكەم لە الله بۆی).

٦٦٤ - الشـافعي ئەڵێت : (كاتێک گوێت لە پیاو بوو وتی (الإسـم غیر المسمی)، و(الشيء غیر الشيء) شایەتی لەسەر بدە بە زەندەقە) .

---

: بابەتی (الإسـم = ناو) وە (المُسـمَّى = ناولێنراو) تازەیە و جەهمیە دایانهێنا بۆ بە مخلوق دانانی ناوەكانی الله عز وجل، ئەیانوت (الإسـم غیر المُسـمَّى = ناو; ناولێنراو نییە)، مەبەستیان لە الإسم ناوەكانی الله عز وجل ـــە، مەبەستیان لە المُسمَّى الله عز وجل خۆیەتی .

جا ئەوان ئەڵێن : مادەم ناو ناولێنراو نییە كەواتە ناوەكان مخلوق ـن .

وە لە بەرامبەر سـەلەف نەیانوتووە (الإسم هو المسمى = ناو ناولێنراوە)، چونكە مەرج نییە هەموو جـارێک عەكسـی وتەی جەهمیەكـان بوترێت، بەڵكو إبن تیمیة وتوویەتی هەڵبژاردەی زۆربەی ئەهلی سوننە لە هاوەڵانی ئیمام أحمد ئەوەیە ئەگەر قسە كرا لە بابەتەكەدا بوترێت (الإسـم للمسـمى = ناو بۆ ناولێنراوە)، واتە ناوەكانی الله عز وجل بۆ الله عز وجل ـە .

- إبن جریر الطبري دەربارەی بابەتی (الإسم والمسمى) لە (صریح السنة) ـــدا ئەڵێت : (وە دەربارەی قسەكردن لە بابەتی الإسم، ئایا المسمى ــیە یان المسمى نییە،

ئەمە لەو گەوجێتیە داهێنراوانەیە کە ئەثەرێکی تێدا نییە تا شــوێنی بکەوین، وە وتەی ئیمامێکیش نییە تا گوێی بۆ بگرین، جا بۆیە ڕۆچوون تیایدا شتێکی قەبیح و ناشرینە، وە بێدەنگ بوون لێی جوانیە .

وە مرۆڤ ئەوەی لە زانســت و قســەکردن دەربارەی بەســە وتەی الله عز وجل بلێتەوە : ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَـٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ (الإسْرَاء : ١١٠).

وە فەرمایشتی الله تعالی : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ﴾ (الأَعْرَاف : ١٨٠) .

وە بزانێـت پەروەردگـاری ئەوەیە کە لەســەر عەرش بەرز بووەتەوە، ئەوەی لە ئاســمانەکان و زەوی و نێوانیان و ژێر زەویە هی خۆیەتی، جا ئەوەی ئەمە تێبپەڕێنێت ئەوە دۆڕاندوویەتی و گومڕابووە و بەهیلاکچووە) .

- لە (السیر) ـدا أبو طاهر المخلّص ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم وتی : إبراهیم الحربي بەڵێنی پێ داین بـابەتێکمـان بۆ بـاس بکـات لە (الإســم والمســمی)، وە لە مەجلیسەکەدا سی هەزار نووسەر کۆئەبوونەوە، وە ژوورێکی هەبوو ئەڕۆشتە سەرەوە بۆ ناوی لە ئاسـت خەڵکی بەرز ئەبوویەوە، پەنجەرەیەکی تێدا بوو ئەیڕوانیە سـەر شـەقام، کاتێک خەڵکی کۆبوونەوە چوویە ژوورەکە و پێی وتن : (بەڵێنم پێ دابوون باسـی بابەتی الأسم والمسمی ــتان بۆ بکەم، پاشان تەماشام کرد بینیم لە قسەکردن تیایدا ئیمامێک پێشم نەکەوتووە شوێنپێی هەڵبگیرێت، هەربۆیە بینیم قسەکردن تیایدا بیدعەیە) .

خەڵکی هەستان و ڕۆیشتن، کاتێک ڕۆژی جومعە هات پیاوێک هات بۆ لای، وە إبراهیم هەمیشە بە تەنها دائەنیشت، پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو بابەتە .

إبراهیم وتی : (ئایا دوێنێ ئامادەی مەجلیسەکەمان نەبوویت ؟) .

وتی : بەڵێ .

إبراهیم وتی : (ئایا زانست هەمووی ئەزانیت ؟) .

وتی : نەخێر .

إبراهیم وتی : (دەی ئەمەش - واتە بابەتی الإســم والمســمی - بخە ڕیزی ئەوانەی کە نازانیت) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــــدا ئەڵێت: (بەشـــێک: دەربارەی الإســـم والمسمى

ئايا الإسم المسمى يە؟ يان الإسم المسمى نييە؟

يان ناوترێت: الإسم المسمى يە؟ وە ناوترێت الإسم المسمى نييە؟ يان الإسم بۆ المسمى يە؟ يان بەوردی باسی ئەکات و تفصيل ئەدات؟

خەڵکی لەم بـابەتەدا نـاکۆکیـان تێکەوت، وە ئەم نـاکۆکیە دەرکەوت لەپـاش پێشەواکان، لەپاش أحمد و جگە لە ئەو.

ئەوەی زانراوە لە پێشـــەوایانی ســـوننەت أحمد و جگە لە ئەو: ئینکاری کردن لە جەهمیەکان ئەوانەی ئەڵێن: ناوەکانی الله مخلوق ـە.

جا ئەو جەهمیانە ئەڵێن: (ناو ناولێنراو نییە؛ وە ناوەکانی الله جگە لە خۆین، جا هەرشتێک جگە لە الله بێت ئەوە دروستکراوە).

ئەمانە ئەوانەن کە سـەلەف زەمیان کردوون و قسـەی توونديان لەسـەر کردوون، چونکە ناوەکانی الله لە وتەکەین، وە وتەی الله مخلوق نییە، بەڵکو خۆی قســـەی پێ کردووە، وە ناوی لەخۆی ناوە بەوەی کە تیایەتی لە ناوەکان).

پاشان ڕوونی کردەوە ئەوانەی ئەڵێن (ناو ناولێنراو نییە) جەهمیەکانن کە ئەڵێن: ناوەکانی الله مخلوق ـە.

وە ئەڵێت: (وە هەر لەبەر ئەمەشـــە لە الشـــافعي و الأصـــمعي و جگە لەوەوە ئەگێڕدرێتەوە ئەڵێن: ئەگەر بينيت کەســێک ئەڵێت (ناو ناولێنراو نییە) ئەوە شـــايەتی بدە لەسەری بە زەندەقە.

وە لە هيچ يەکێک لە سەلەفەوە نەزاندراوە وتبێتی (ناو ناولێنراوە)، بەڵکو زۆرێک لەوانەی خۆيان ئەدەنە پاڵ ســـوننەت وتيان لە پاش پێشـــەواکان، وە زۆربەی ئەهلی سوننەش ئینکاری ئەوەيان لێ کردن.

پاشان هەيانە خۆی گرتووەتەوە لە قسەکردن لەم بابەتەدا بە جێگیرکردن ياخود نەفی کردن، چونکە وتنی هەردوو شتەکە بە گشتی بيدعەيە وەکو چۆن الخلال ڕيوايەتی

**کردووە لە إبراهيم الحربي و جگە ئەوەوە، وە لەو جوزئەدا کە الطبري ناوی ناوە صـــريح السنة) .**

**پاشـــان إبن تيمية ئاماژە ئەدات بەوەی هەڵبژاردەی زۆربەی ئەهلی ســـوننە لە هاوەڵانی ئیمام أحمد ئەوەیە ئەگەر قســـە کرا لە بوترێت (الإســـم للمســـمى = ناو بۆ ناولێنراوە)، واتە ناوەکانی الله عز وجل بۆ الله عز وجل ـە .**

٦٦٥ - الشـــافعي ئەڵێـت : (ئەگەر پیـاوێـک وەســـیەت بکـات بە کتێبە زانستیەکانی وە کتێبی کەلامیشی تێدا بێت ئەوە ناچنە ناو وەسیەتەکەوە، چونکە کەلام زانست نییە) .

---

**: واتە بۆ نمونە وەسیەت بکات لەپاش وەفاتی خۆی کتێبە زانستیەکانی شتێکیان لێ بکرێت .**

**- لە (جامع بيان العلم وفضـــله) إبن خويز منداد المالكي ئەڵێت : (ئەهلی هەوا و ئارەزوو لەلای مـالـک و هـاوەڵەکـانی ترمـان بریتین لە ئەهلی کەلام، هەربۆیە هەموو موتەکەلیمێک لە ئەهلی هەوا و بیدعە ئەگەر ئەشـــعەری بێت یان غەیری ئەشـــعەری، وە لە ئیســـلامدا شـــایەتیدانی قبووڵ ناکرێت و هەجر ئەکرێت و تەمبێ ئەکرێت لەســـەر بیدعەکەی، ئەگەر هەر بەردەوام بوو ئەوە تۆبەی پێ ئەکرێت لەسەری) .**

٦٦٦ - الربيع بن سـليمان ئەڵێت : (الشـــافعي شـــەوی کردبوو بە ســـێ بەشـەوە، بەشێکیان فەرموودەی ئەنووسیەوە، وە دووەم بەشی نوێژی ئەکرد، وە سێیەمیشیان ئەخەوت) .

٦٦٧ - الربيع بن سـليمان ئەڵێت : (گوێبیســـتی الشـــافعي بووم لەســـەر قادرمەکان هاتە خوارەوە و کۆمەڵەیەک لە الكلام ـــــدا قســـەیان ئەکرد، ئەویش

هاواری بەســـەردا کردن و وتی : (یان ئەوەتا بە باشـــی و چاکی لە تەنیشـــتمان ئەمێننەوە، یاخود هەڵئەستن لەلامان) .

**٦٦٨ - أبو ثور** ئەڵێت : وتم بە الشافعي : لە الكلام دا شتێک دابنێ .

وتی : (هەرکەسێک خووبداتە الكلام سەرفراز نابێت) .

**٦٦٩ - الشـافعي** ئەڵێت : (هەر شـــتێک من وتبێتم و لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکی صـــحیح هەبێت بە پێچەوانەی وتەکەی من، ئەوە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەولاتر و لەپێشترە) .

**٦٧٠ - الربيع بن سـليمان** ئەڵێت : کاتێک الشـــافعي قســـە لەگەڵ حفص الفرد دا کرد حفص وتی : قورئان مخلوق ە .

الشافعي پێی وت : (کافر بوویت بە الله ی العظیم) .

---

**- لە (الشريعة) ـــدا الربيع بن ســـليمان ئەڵێت : گوێم لە الشافعي بوو باسی قورئانی کرد، وە باســـی ئەوەی کرد حفص الفرد ئەیڵێت، وە الشـــافعي رحمه الله پێی ئەوت حفص المنفرد، وە موناقەشـــەی لەگەڵ کرد بە ئامادەبوونی والیەک لە مصـــر، الشافعي لە موناقەشەکەدا پێی وت : (سوێند بەو پەرستراوەی کە هیچ پەرستراوێک بە حەق شایەنی پەرستن نییە بێجگە لە ئەو کافر بوویت) .**

**پاشان هەستان و ڕۆیشتن، گوێم لە حفص بوو وتی : (سوێند بەو پەرستراوەی کە هیچ پەرستراوێک بە حەق شایەنی پەرستن نییە بێجگە لە ئەو ویستی بمکوژێت) .**

**- لە (مناقب الشـــافعي) ـــــدا أبو شـــعيب المصـــري ئەڵێت : لەلای الشـــافعي ئامادەبووم و یوسف بن عمرو بن یزید و عبدالله بن عبدالحكم ـــی لەلا بوو لە ماڵەکەی، حفص هاتە ژوورەوە بۆ لایان، وە کەسێکی متکلم و دەمەدەمێکار بوو، بە یوسف ی وت : چی ئەڵێیت دەربارەی قورئان ؟**

**وتی : (کەلامی الله یە، لەلای من جگە لەوە نییە) .**

وە ئاماژەیان ئەكرد بۆ الشافعي، حفص الفرد ڕووی كردە الشافعي و وتی : ئەوانە ئاماژە ئەكەن بۆ تۆ .

الشافعي پێی وت : (وازی لێ بهێنە) .

بەردەوام بوو لەگەڵی هەتا الشافعي پێی وت : (تۆ چی ئەڵێیت لە قورئاندا ؟) .

وتی : ئەڵێم مخلوق ـە .

الشافعي وتی : (لەكوێوە وتت ؟) .

ئیتر حفص الفرد بەڵگەی بۆ ئەهێنایەوە بەوەی كە مخلوق ـە، وە الشافعي ـیش رحمه الله بەڵگەی ئەهێنایەوە بەوەی غیر مخلوق ـــە هەتا الشـافعي بە كافری زانی و هەجری كرد) .

**٦٧١ - الزعفراني** ئەڵێت : (الشـافعي ڕقی لە الكلام بوو و ڕێگری و نەهی لێ ئەكرد) .

**٦٧٢ - المزني** ئەڵێت : (الشـافعي ڕێگری و نەهی ئەكرد لە ڕۆچوون لە الكلام ـدا) .

**٦٧٣ - الشافعي** ئەڵێت : (ئەگەر خەڵكی بیانزانیبایە چی لە الكلام و هەوا و ئارەزووەكاندا هەیە ئەوە ڕایان ئەكرد لێی وەک چۆن لە شێر هەڵدێن) .

**٦٧٤ - الشـافعي** ئەڵێت : (دەســتبڵاوی و ڕێزگرتن عەیبوعارەكانی دنیا و قیامەت دائەپۆشن دوای ئەوەی خاوەنەكەی شوێن بیدعە نەكەوێت) .

---

**: واتە بەخشــین و ڕێزگرتن عەیبی پیاو دائەپۆشــن ئەگەر كەسـەكە خوو نەداتە بیدعە، ئەگەر خوی دایە بیدعە ئەوە ســوود لە بەخشــین و ڕێزگرتنەكەی نابینێت بۆ داپۆشینی بیدعەكەی و ئاگاداری لەبارەوە ئەدرێت .**

**٦٧٥ - الشافعي** ئەڵێت : (دایکی المریسي پێی وتم : قسە بکە لەگەڵ بشردا و پێی بڵێ واز لە الکلام بهێنێت .

جا منی بانگ کرد بۆ الکلام) .

---

**: واتە پاش ئەوەی الشافعي قسەی دایکی المریسي نەشکاندووە و بە المریسي وتووە واز لە الکلام بهێنێت هێشتا بانگی کردووە بۆ الکلام، والله أعلم .**

**٦٧٦ - الربیع** ئەڵێت : گوێبیستی الشافعي بووم پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی بابەتێک .

الشافعي پێی وت : (ئەوە سەرئەکێشێت بۆ الکلام، وە ئێمەش وەڵام نادەینەوە لە هیچ شتێکی کەلامیدا) .

**٦٧٧ - یونس بن عبدالأعلی** ئەڵێت : چووم بۆ لای الشافعي پاش ئەوەی قسەی لەگەڵ حفص الفرد دا کرد .

وتی : (ئەی أبو موسی بەڕاستی شتێکی ئەهلی الکلام م بۆ دەرکەوت کە والله هەرگیز بە مێشکمدا نەهاتووە، وە الله بەندە بە هەر شتێک تاقی بکاتەوە کە نەهی لێ کردووە جگە لە شەریک دانان بۆ الله باشترە لەوەی تاقی بکاتەوە بە الکلام) .

---

**- لە (السنة لعبدالله) ــدا عبدالله بن المبارک ئەڵێت : (ئێمە ڕێگە ئەدەین وتەی یەهودی و نەسڕانیەکان بگێڕینەوە، وە ڕێگە نادەین وتەی جەهمیەکان بگێڕینەوە) .**

**- الدارمي لە (الرد علی الجهمیة) ــدا ئەڵێت : (إبن المبارک ڕاستی کرد، لە وتەکانیاندا دەربارەی پەکخستنی سیفەتەکانی الله تعالی تیایدایەتی لەوە نامۆتر و ناشرینترە لە وتەی یەهودی و نەسڕانیەکان) .**

- إبن بطـة لە (الإبانة الكبرى) ـــــدا ئەڵێت : (عبدالله ڕاســتی کرد، ئەوەی ئەم کۆمەڵە گومڕایە موجادەلەی لەســـەر ئەکەن، وە ئەیڵێن لە وتە قەبیح و ناشـــرینەکان دەربارەی الله عز وجل; یەهودی و نەسڕانی و مەجوسیەکان ئەترسن لەوەی کە بیڵێن) .

- لە (الإبانة الكبرى) ـــــدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (نەمبینیوە هیچ کەســێک هەوڵی بەدەستهێنانی الكلام ـــی دابنێت و حەزی لێ بووبێت ئیللا سەری لە بابەتێکی گەورەوە پێ دەرکردووە، بەڕاستی قسەیەکیان کرد و بە شتێک بەڵگەیان هێنایەوە دڵم هێندە بەهێز نییە وە زمانم گۆ ناکات بیگێڕمەوە، ئەو کۆمەڵەیە ئەگەڕێنەوە بۆ پەکخستن لە وتەکانیاندا، وە بینی الله عز وجل لە بەهەشت و ئاثارەکان هەمووی ڕەت ئەکەنەوە، وا گومانم نەبرد ئاوا بێت هەتا گوێبیستی وتەکانیان بووم) .

٦٧٨ - الربيع ئەگێڕێتەوە لە الشـافعي کە بەلایەوە بێزراو بووە نوێژ لەدوای قەدەریەکەوە بکرێت .

- لە (السنة لـ حرب الكرماني) ــدا أحمد بن يونس ئەڵێت : گوێبیستی پیاوێک بووم ئەیوت بە سفیان الثوري : پیاوێک قەدەر بەدرۆ ئەخاتەوە، نوێژ لەپشتیەوە بکەم؟

وتی : (پێشی مەخەن) .

- لە (السنة لـــ حرب الكرماني) ـــدا مروان ئەڵێت : پرسیارم کرد لە مالک : ئایا نوێژ ئەکرێت لە پشتی قەدەریەوە؟

وتی : (نەخێر) .

- لە (السنة لـ الخلال) ــدا إبراهيم بن الحارث ئەڵێت : وترا بە أبو عبدالله : ئایا نوێژ لەسەر قەدەری بکەم؟

وەڵامی نەدایەوە، منیش وەڵامم دایەوە و أبو عبدالله ـــــش گوێی لێ بوو : ئەگەر بیدعەچی بێت ئەوە قسەی لەگەڵ ناکرێت، وە سەلامی لێ ناکرێت، وە نوێژی لە پشت و لەسەر ناکرێت .

أبو عبدالله وتی : (الله بتپارێزێت ئەی أبا إسحاق، وە پاداشتت بداتەوە)، وەک بڵێیت سەرسام بووبێت بە قسەکەم .

**٦٧٩ - البويطي** ئەڵێت : پرسیارم کرد لە الشافعي : ئایا نوێژ بکەم بە پشتی ڕافیضیەک ؟

وتی : (نوێژ مەکە نە لە پشتی ڕافیضی، وە قەدەری، وە مورجیئە ) .

وتم : وەسفیانمان بۆ بکە .

وتی : (هەرکەسێک بڵێت ئیمان وتەیە ئەوە مورجیئەیە .

وە هەرکەسێک بڵێت أبو بکر و عمر رضي الله عنهم پێشەوا نین ئەوە ڕافیضیە .

وە هەرکەسێک ویستی بۆ خۆی دانا ئەوە قەدەریە ) .

---

**: لە (وە هەرکەسێک ویستی بۆ خۆی دانا ئەوە قەدەریە) مەبەستی ئەوەیە قەدەریەکان تەنها ویست بۆ خۆیان دائەنێن و ئەڵێن الله عز وجل خێر و شەڕی بۆمان نەویستووە و حەقی نییە بەسەرمانەوە ئێمە خۆمان چیمان بوویت ئەوە ئەنجام ئەدەین.**

**بەڵام لەڕاستیدا لە سەرو ویستی مرۆڤەوە ویستی الله عز وجل هەیە و مرۆڤ ناتوانێت هیچ کارێک ئەنجام بدات هەتا الله عز وجل ڕێگەی پێ نەدات، وە الله عز وجل هەموو شتێکی بە قەدەر داناوە .**

**- لە (السنة لحرب الكرماني ) ـدا أبو عبيد القاسم بن سلام ئەڵێت : (بەلامەوە گرنگ نییە ئاخۆ لەپشتی جەهمیە و ڕافیزیەکەوە نوێژ بکەم، یان لە پشت یەهوودی و نەسڕانیەکەوە بیکەم - واتە هەردووکیان وەک یەکن کافرن -**

**وە نوێژ ناکرێت لە پشتی ئەو کەسەی أبو بکر پێشناخات بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا لەپاش رسول الله ﷺ .**

وە نوێژکردن لەپشـــت قەدەری و خـاریجی و مورجیئە پێم خۆش نییە، وە پێم وانییە) .

- لە (شرح أصول إعتقاد لـــ اللالكائي) ـــدا سـفيان بن عيينة ئەڵێت : (نوێژ مەکەن لەپشـــت ڕافیزی، وە لە پشـــتی قەدەری، وە لە پشـــتی جەهمی، وە لە پشـــتی مورجیئە) .

- لە (شرح أصول إعتقاد لــ اللالكائي) ــدا إبراهيم بن المغيرة ئەڵێت : پرسیارم کرد لە ســفيان الثوري : ئایا نوێژ بکەم لەپشـــتی ئەوەی ئەڵێت : ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە ؟

وتی : (نەخێر، وە کەرامەتی نییە) .

٦٨٠ - محفوظ بن أبي توبة ئەڵێت : الشـــافعي پێی وتم : (خەڵکی وا ئەزانن کـاتێـک من ڕەددیـان ئەدەمەوە لەبەر بەدەســـتهێنـانی دنیـایە، خۆ لەبەر ئەو موخـالەفەکـردنەیـان بـۆ ســـوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەبوویـایە ئەوە دژیـان نەئەوەستامەوە).

٦٨١ - الربيع بن سـليمان ئەڵێـت : الشـــافعي پێی وتم : (خۆ ئەگەر بمویســـتبایە لەســـەر هەر موخالیفێک کتێبێکی گەورە دابنێم ئەوە ئەمکرد، بەڵام الكلام ئیشی من نییە و حەز ناکەم هیچ شتێک لێی بدرێتە پاڵم) .

٦٨٢ - الزعفراني ئەڵێت : (الشـافعي عەمامەیەکی گەورەی ئەکردە ســەری ئەتوت دەشـتەکیە و گۆچانێکی سـەر گەورەی بە دەسـتەوە بوو، وە زمانپاراوترینی خەڵکی بوو، وە ئەگەر لە مەجلیســـەکەیدا باســـی الكلام بکرایە ڕێگری لێ ئەکرد و ئەیوت : ئێمە هاوەڵی الكلام نین) .

٦٨٣ - **محمد بن عبدالله الحافظ** ئەڵێت : أحمد بن حنبل وتی بە محمد بن محمد بن إدريس الشافعي : (تۆم خۆشئەوێت لەبەر سێ شت :

لەبەر ئەوەی قورەیشیت .

وە لەبەر ئەوەی کوڕی أبو عبدالله یت .

وە لەبەر ئەوەی ئەهلی سوننەیت) .

٦٨٤ - **عبدالرحمن بن أبي حاتم** ئەڵێت : یەکێک لە هاوەڵانی الشـــافعي وتی : (لەلای الشـــافعي بووم، وە پیاوێک قســـەی لەگەڵدا کرد لە مزگەوتی الجامع دەربارەی بابەتێک، موناقەشـــەکەی درێژەی کێشـــا، جا پیاوە باســـی شـــتێک لە الکلام ی کرد .

الشافعي پێی وت : (واز لەوە بهێنە، ئەوە لە الکلام ە) .

٦٨٥ - **الربيع** ئەڵێت : الشافعي دەربارەی زەمکردنی الکلام ئەم هۆنراوەیەی وت :

(خەڵکی نەسرەوتن تا بیدعەیانێکیان داهێنا * بە بۆچوونی خۆیان و پێغەمبەران پێی نەنێردرابوون .

هەتا وای لێهات زۆربەیان دینی الله یان بە کەم تەماشاکرد * وە ئەوەی پێیان سپێردرابوو فەرامۆشیان کرد) .

٦٨٦ - **عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت : باوکم نووســـی بۆ عبيدالله بن يحيى بن خاقان : (من هاوەڵی الکلام نیم، وە قســـەکردن لە هیچ شـــتێک لەمانەدا بەباش نابینم تەنها بەوە نەبێت کە لە کتێبی الله عز وجل یاخود لە فەرموودەی رسول الله دا ﷺ هاتووە، بەڵام بە جگە لەوە قسەکردن تیایدا ستایشکراو نییە) .

الهروي ئەڵێت : (باسی توندی ڕقلێبوونەوەی أحمد بن حنبل ــم رحمه الله کردووە بۆ الکلام و ڕەئی؛ وە ئینکاریکردن لە ئەهلەکانیان لە کتێبی (المناقب) دا).

---

- لە (الإبانة الکبری) ــدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (پەیوەست بن بە سوننەت و فەرمووده‌وە، وە ئەوەی الله ســوودمەندتان ئەکات پێی، وە ئاگاداری ڕۆچوون و جیدال و دەمەدەمێ بن، چونکە ئەو کەســە ســەرفراز نابێت کە حەزی لە الکلام ــــە، وە هەرکەســێک وتەیەک دابهێنێت کۆتاییەکەی هەر ســەرئەکێشــێت بۆ بیدعە، چونکە الکلام بانگەشــە ناکات بۆ لای شــتێکی باش، وە من حەزم لە الکلام و ڕۆچوون و جیدالکردن نییە، وە پەیوەست بن بەو سوننەت و ئاثار و فیقهەی سوودی لێ ئەبێنن، وە واز بهێنن لە دەمەدەمێ و وتەی ئەهلی لادان و دەمەقاڵێ، گەیشــتن بە خەڵکی و ئەم شــتانەیان نەئەزانی، وە خۆیان بەدوور ئەگرت لە ئەهلی الکلام، وە چارەنووســی الکلام ســەرناکێشــێت بۆ خێر، الله ئێمە و ئێوە بەدوور بگرێت لە فیتنەکان، وە ئێمە و ئێوەش سەلامەت بکات لە هەموو لەناوچوونێک).

وە ئەڵێت : (ئەوەی حەزی لە الکلام بێت ســەرفراز نابێت، بارودۆخیان بەرەو باشی ناچێت).

وە ئەڵێت : (ئەوەی حەزی لە الکلام بێت لە دڵی دەرناچێت، وە نابینیت هاوەڵی الکلام سەرفراز بێت).

وە ئەڵێت : (کاتێک بینیت کەسێک حەزی لە الکلام ـە ئاگاداربە لێی).

وە ئەڵێت : (هاوەڵانی الکلام خۆشــەویســتی الکلام لە دڵی دەرناچێت، ســەرفراز نابێت، هەرکاتێک شتێکی تازە و داهێنراو بڵێت وا لە خۆی ئەکات بەرگری لێ بکات).

وە ئەڵێت : (دامەنیشە لەگەڵ هاوەڵی الکلام ــدا، چونکە بارودۆخی بەرەو خێر چاکە ناچێت).

- لە (السنة لــ الخلال) ــدا أبو الحارث ئەڵێت : پرسیارم کرد لە أبو عبدالله وتم : لێرە کەســانێکی لێیە موناقەشــە ئەکەن لەگەڵ جەهمیەکاندا و ئەچنە ناو وردەکاری بابەتەکانەوە لەگەڵیاندا، بۆچوونت چییە ؟

وتی : (قسەکردنم پێ باش نییە لە هیچ یەکێک لەم هەوا و ئارەزووویانەدا، وە پێم باش نییە هیچ کەسێک دەمەدەمێیان موناقەشەیان لەگەڵدا بکات، ئایا معاوية بن قرة ناڵێت : (دەمەدەمێکردن کاروکردەوە پووچەڵ ئەکاتەوە ؟) .

الكلام خراپ و پیسە، سەرناکێشێت بۆ شتێکی باش، خۆتان بەدوور بگرن لە ئەهلی جیدال و الكلام، وە دەست بگرن بە سوننەت و ئەوەی زانایانی پێش خۆتان لەسەری بوون، ئەوان ڕقیان لە الكلام و ڕۆچوون لەگەڵ بیدعەچیەکاندا بوو، بەڕاستی سەلامەتی لە وازهێنانیدایە، فەرمانمان پێ نەکراوە بە دەمە دەمە و جیدال، ئەگەر کەسێکتان بینی حەزی لە الكلام بوو ئاگاداری بن) .

وە کاتێک الكرابيسي وتی (لفظـم بە قورئان مخلوقـە)، ئیمام أحمد وتی : (دانانی کتێب لەناوی بردن، وازیان لە ئاثارەکانی رسـول الله ﷺ هێنا و ڕوویان کردە الكلام) .

- لە (تهذيب الكمال) ـدا عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەڵێت : باوکم باسی أبو بكر الأعين ی کرد کاتێک وەفاتی کرد; وتی : (رحمه الله، غیبتەی پێ ئەبەم، مرد و تەنها فەرموودەی ئەزانی، هاوەڵی الكلام نەبوو، بەڵکو فەرموودەی ئەنووسیەوە) .

٦٨٧ - بشر الحافي ئەڵێت : (نیشـانەی گوێڕایەڵی الله عز وجل بریتیە لە تەسلیمکردنی کاروبار بۆ گوێڕایەڵی الله[1] .

وە نیشـانەی خۆشـەویسـتی رسـول الله ﷺ بریتیە لە خۆتەسـلیمکردن بۆ ئاثارەکانی و کارکردن لەسەر سوننەتەکەی و ئاوڕنەدانەوە بۆ هیچ کەسێکی تر) .

---

: (١) واتە لە کاروبارەکاندا گوێڕایەڵی الله عز وجل بێت .

٦٨٨ - محمد بن المثنى ئەڵێت : (گوێبیستی بشر الحافي بووم نەهی ئەكرد لە قسەكردن و موناقەشەكردن لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو هەموویاندا) .

٦٨٩ - بشر بن حارث الحافي ئەڵێت : (تەماشـاكردنی ئەهلی هەوا و ئارەزوو ئەبێتە هۆی دڵرەقی، وە تەماشاكردنی فاسق نوری ئیمان ئەكوژێنێتەوە) .

٦٩٠ - قتيبة بن سـعيد ئەڵێت : (ئەگەر پیاو وتی : (المشــبهة)، ئەوە ئاگاداری بن، چونكە بۆچوونی جەهم ی هەیە) .

---

**: جەهمیەكانی سـەرەتا و ئەشـعەریە جەهمیەكان لەپاش ئەوان بە ئەو عەقیدەی رسول الله و تەواوی هاوەڵان و تابیعین و سـەلەفی سالحی ئوممەتی لەسـەر بووە ئەڵێن عەقیدەی موشـەبیهە و موجەسیمەكان، لەكاتێكدا شوێنكەوتەكانی رسول الله ﷺ ئەو سیفەتانەی لە قورئان و سـوننەتدا هاتوون جێگیری ئەكەن لەسـەر رووكەشـەكەی بەبێ دانانی چۆنیەتی بۆ سیفەتەكە .**

**بەڵام جەهمیەكان لە كۆن و نوێدا تانە لەو عەقیدە ڕاستە ئەدەن و بە تەشبیهــو تەجسیم ناوی ئەهێنن .**

**لێرەدا هەنـدێـك وتەی ســەلەف و ئەوانەی لەپـاش ئەوان هـاتوون دائەنێین دەربارەی نەهیكردنی سەلەف لە تەشبیهـو، وە تیایدا ڕوونی ئەكەوە موشەبیهەكان كێن.**

## مانای تەشبیه لای ئەهلی سوننە و جەماعە:

**- لە (درء التعارض) ـــــدا حنبل ئەڵێت پرســیارم كرد لە أحمد دەربارەی وتەی موشەبیهە ئایا چی ئەڵێن ؟**

**وتی : (هەركەس بڵێت چاوی وەك چاوم وایە، وە دەســتی وەك دەســتم وایە، ئەوە الله ی شوبهاندووە بە درووستكراوەكانیەوە) .**

- له (سنن الترمذي) ـدا إسحاق بن راهويہ ئەڵێت : (تەشبیهـ بەوە ڕوودەدات کاتێک بوترێت دەستی وەک دەستم وایە یان بیستنی وەک بیستنم وایە، کاتێک وای وت ئەوە تەشبیهە.

ئەمما ئەوە بوترێت وەک الله تعالى فەرموویەتی، دەست و بیستن و بینین، وە نەڵێت چۆن چۆنیە، وە نەڵێت بەوێنەی بیستنی من، ئەوە نابێتە تەشبیهـ، وەک چۆن الله فەرموویەتی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ (الشورى : ١١) .

- له (طبقات الحنابلة) ـدا هاتووە بە إبراهيم بن أحمد بن شاقلا وترا ئێوە موشەبیهەن .

وتی : (حاشا لله، موشەبیهە ئەڵێن ڕووی وەک ڕووی من وایە، وە دەستی وەک دەستی من وایە .

بەڵام ئێمە ئەڵێین : ڕووی هەیە وەک چۆن خۆی بۆ خۆی جێگیرکردووە، وە دەستی هەیە وەک چۆن خۆی بۆ خۆی جێگیر کردووە : ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ (الشورى : ١١)، وە هەرکەس وا بڵێت ئەوە سەلامەت بووە) هتد .

واتای قسەکەی إبن شاقلا رحمه الله ئەوەیە ئێمە الله تعالى وە رسول الله ﷺ بەڕاست ئەخەینەوە لەوەی کە فەرموویانە، وە ئەشعەریە جەهمیەکان ئەوە بە کوفر و زەندەقە ئەزانن!

## مانای تەشبیهـ لای جەهمی و ئەشعەریەکان:

- أحمد بن حنبل لە (الرد على الجهمية) ـدا ئەڵێت : (وە بانگەشەی ئەوەی کرد - واتە جهم بن صفوان - کە هەرکەس وەصفی الله بکات بە شتێک لەوەی کە خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە کیتابەکەی، یان رسول ـەکەی گێڕاویەتیەوە، ئەوە کافرە، وە موشەبیهەیە، بەم قسەیەی زۆرێک لە خەڵکی گومڕا کرد) هتد .

کەواتە جەهمیەکان قورئان و سوننەت بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم ئەزانن و بە مایەی هیدایەتی نازانن، وە لە بەرامبەردا کوفری کەلام بە سەرچاوەی هیدایەت و ناسینی الله تعالى ئەزانن .

وتەی چەند کەسێکی کەم لەوانەی کە بە ڕاشکاوی ئەڵێن هەرکەس صیفەتەکان جێگیر بکات وەکو چۆن سەلەف جێگیریان کردووە موشەبیهە و موجەسیمەیە :

- لە (مجموع الفتاوى : ٥/١١٠) دا ثمامة بن أشرس یەکێک لە سەرە زلەکانی جەهمیەکان ئەڵێتت : (سیان لە پێغەمبەران موشەبیهەن :

موسى کاتێک وتی: | إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ | (الأعراف : ١٥٥) .

وە عیسـى کاتێک وتی: | تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ | (المائدة : ١١٦).

وە محمد کاتێک وتی: (پەروەردگارمان دائەبەزێت) .

- ابن حجر العسقلاني الأشعري یەکخەر لە شەرحەکەی بۆ صحيح البخاري - فتح الباري - وتەی زۆرێک لەو یەکخەری صیفەتانە نقڵ ئەکات کە ئەهلی سوننە ناوئەنێن بە موشەبیهە و موجەسیمە وە لەوانەش:

ابن بطال کە ئەڵێت : وە موجەسیمەکان وتیان مانای الاستواء واتە جێگیربوون).

- القرطبي الأشعري لە (المفهم : ٦/٦٧٠) ـدا ئەڵێت : (موجەسیمە ئەوانەن کە ئەوەی لە کیتاب و سوننەت ڕووکەشەکەی جیسمی تیایە کۆیان کردۆتەوە، بگرە بیروباوەڕیان وایە کە الله جیسمە، وە وێنەی هەیە، ڕووی هەیە، چاو و دەست و لا و پێ و پەنجەی هەیە) هتد .

ئەم جەهمیە سەلەف و ئەهلی سوننە تۆمەتبار ئەکات بە دانانی جسم بۆ الله تعالى، بەڵام سەلەف رحمهم الله هەموو ئەو سیفەتانەی لە قورئان و فەرموودە و ئاثارەکاندا هەیە جێگیریان کردووە بۆ الله لەسەر مانای حەقیقی و ڕووکەشی سیفەتەکە، وە هەرگیز باسی جسم ـیان نەکردووە، واتە لەبارەی جسم ـەوە نە جێگیریان کردووە، نە نەفیان کردووە، بەڵکو هیچ قسەیەکیان تێدا نەکردووە چونکە بابەتێکی داهێنراوە .

- الشوكاني الجهمي لە (إرشاد الفحول : ٢/٢٣) ـدا دەربارەی صیفەتەکانی الله ئەڵێت : (لەم بەشەدا سێ مەزهەب هەن، یەکەمیان: هیچ ڕێگایەک نیە بۆ تەئویل کردن تێیدا بەڵکو لەسەر ڕووکەشەی بەڕێ ئەکرێت و هیچ شتێکی لێ تەئویل ناکرێت، وە ئەمە وتەی موشەبیهەکانە) هتد .

جەهمی و ئەشـعەریە جەهمیەکان بەوە نەوەسـتاون بگرە هەسـتاون بە دانانی کتێب کە تیایا صـیفەتەکانی الله تعالى یان پەکخسـتووە وە ڕەددی ئەهلی سـوننەیان پێداوەتەوە، کەمێک لەوانەش :

١ - التوحيد وكفر المشبهة ى بشر المريسي الجهمي ٢١٨ هـ

٢ - الرد على المشبهة ى محمد بن شجاع الثلجي الجهمي ٢٦٧ هـ

٣ - دفع شبه التشبيه بأكف التنزيه ى ابن الجوزي الجهمي ٥٩٨ هـ

٤ - مشكل الحديث ى ابن فورك الجهمي ٤١٠ هـ

٥ - الرد على المشبهة ى ابن عساكر الجهمي ٥٧١ هـ

٦ - تأويل الأحاديث الموهمة للتشبيه ى السيوطي الجهمي ٩١١ هـ

بزانە ڕەحمەتی الله ـــت لێ بێت، ئەهلی سـوننە وەک چۆن ئاگاداریان داوە لە تەئویلکەر و پەکخەرەکـانی صــیفەتەکـان ئاواش ئاگـاداریـان داوە لە موشــەبیهە و موجەســیمەکان، وە حاڵی ئەوان و پیســی وتەکانیان بۆ خەڵک ڕوونکردووەتەوە، وە زەمی سـەلەف بۆ تەشـبیهـــو تەجسـیم زۆرە وەک لە عبدالرحمن بن مهدي و يزيد بن هارون و أحمد و إسحاق و نعيم بن حماد و جگە ئەوانیش ئەگێڕدرێتەوە کە مەبەستیان لەو کەسانەیە کە زیادەڕۆیان کرد لە جێگیرکردنی صیفەتەکان تا وای لێهات صیفەتەکانی الله یان چواند بە صیفەتی درووستکراوەکانی .

ئەو دەقـانەی هـاتوون بۆ جێگیرکردنی بوونی صــیفەتەکـانە نەک دیـاریکردنی چۆنێتیەکەیان، تەکلیف کردن لە عەقڵ بۆ تێڕامان لە چۆنێتیەکەی بیدعەیەکی محرمە لە دیندا، الله تەکلیفی ئەوەی لە خەڵک نەکردووە بۆ ئەوەی بەرەو تەشبیهـــو تەجسیم نەچن، وە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە تـێڕامـان لە الله تـعـالـی، فەرموویەتی: (تێڕابمێنن لە درووســتکراوەکـانی الله، تێڕامەمێنن لە الله)، وە نەبوونی عیلم بە چۆنێتیەکانیان هیچ درزێک ناخاتە ئیمان بە صیفەتەکان و زانینی ماناکانیان .

### وتەی سەلەف دەربارەی نەهی کردن لە تەشبیه و تەمثیل :

- لە (النقض لـ الدارمي) ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (هیچ نمونەیەک بۆ الله نیە) .

- لە (تفسیر الطبري) ـدا ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی : | هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا | (مريم : ٦٥) ئەفەرمووێت : (ئایا هیچ نمونەیەک یان هاوشێوەیەک شک ئەبەیت بۆ پەروەردگار ؟) .

- لە (السنة لعبدالله) ـدا هاتووە الحسن البصري ـەوە کە پرسیاری لێکراوە ئایا وەصفی پەروەردگارت ئەکەیت ؟

وتی: (بەڵێ، وەصفی ئەکەم بەبێ نمونە بۆدانان) هتد .

واتە بەڵێ الله تعالی وەسف ئەکەم بەوەی کە لە قورئان و فەرمودە و ئاثاردا هاتووە، وە ناڵێم فلانە سیفەتی الله تعالی وەکو فلانە سیفەتی دروستکراوەکانیەتی.

- لە (السنة للخلال) ـدا الفضیل بن عیاض ئەڵێت : (بۆ ئێمە نیە خۆمان سەرقاڵ بکەین بەوەی الله چۆنە و چۆن نیە، لەبەرئەوەی الله وەصفی خۆی کردووە و گەیاندوویەتی، ئەفەرمووێت : | قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ (٢) لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ (٣) وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ (٤) | (الإخلاص) .

هیچ صیفەتێک لەوە ڕوونتر نیە کە الله وەصفی خۆی پێکردووە، وەکو دابەزین، وە پێکەنین) .

- لە (أصول السنة لابن أبي زمنين) ـدا عبدالرحمن بن القاسم ئەڵێت : (بۆ هیچ کەسێک نیە کە وەصفی الله بکات جگە لەوەی خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە قورئاندا، وە دەستی لە هیچ شتێک ناچێت، وە ڕووی لە هیچ شتێک ناچێت، بەڵکو ئەوتریێت دوو دەستی هەیە وەک چۆن خۆی وەصفی کردووە لە قورئاندا، وە ڕووی هەیە وەک چۆن خۆی وەصفی کردووە، لەویا ئەوەستین کە وەصفی خۆی پێکردووە لە کیتابەکەی، لەبەرئەوەی الله نمونەی نیە، وە هاوشێوەی نیە، بەڵکو ئەو الله یە کە هیچ خوایەک نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لەو وەک چۆن خۆی وەصفی کردووە، وە دەستەکانی بڵاون وەک چۆن وەصفی کردووە) هتد .

بەڵام بە پێچەوانەوە ئەشـــعەریە جەهمیە پەکخەرەکان ئایەتەکانی ســیفات لە قورئان وە فەرمووەدەکانی سیفات بە کوفر و تەشبیهـــو تەجسیم ئەزانن، لەبەرامبەردا دێن بە کوفری کەلام وەســفی اللە تعالی ئەکەن، هەربۆیە تووشـــی چەندین کوفر و پەکخستن بوون .

- لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي) دا وكيع بن الجراح ئەڵێت :

(داود الجواربي وەصــفی پەروەردگاری کرد، کافر بوو بە وەصـــف کردنەکەی، المريسي ڕەددی دایەوە، المريسي کافر بوو بە ڕەددانەوەکەی لەسەری، کاتێک وتی: ئەو لە هەموو شوێنێکە) .

- لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي) ـدا علي بن عاصم ئەڵێت :
(داود الجواربي قسـەی کرد لە تەشبیهدا، فەقیهەکانی واسط کۆبوونەوە لەوانە: محمد بن يزيد و خالد الطّحان و هشـیم و جگە ئەوانیش، چوونە لای ئەمیر، وە هەواڵیان پێدا بە وتەکانی، هەموویان کۆکبوون لەسەر خوێن ڕشتنی، مرد لەو ڕۆژانە، هیچ کەسێک لە زانایانی واسط نوێژی لەسەر نەکرد) هتد .

داود الجواربي زەندیق بەجۆرێک ڕۆچوو بوو لە تەشبیهدا کە ئەیوت اللە لە هەموو شتێکدا لە پیاوێکی کامڵ ئەچێت تەنها ئەوەیە اللە ڕیش و داوێنی نیە .

وە لێرەوە تێئەگەین کە هەر لە ســـەردەمی ســـەلەفدا رحمهم اللە وەک چۆن جەهمیە پەکخەرەکان هەبوون بە هەمان شـێوە موشـــبیهە کافرەکانیش هەبوون، هەربۆیە ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ لای سەلەف بزانین چۆن و بە چ شتێک وەسفی جەهمی و موشبیهەکان کردووە .

- لە (اعتقاد الإمام الشافعي للهكّاري) ـــدا الشافعي ئەڵێت: (وە ئەم صیفەتانە جێگیر ئەکەین، وە تەشبیهی لێ نەفی ئەکەین وەک چۆن اللە نەفی تەشبیهی لە نەفسی خۆی کردووە فەرموویەتی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ (الشورى : ١١) .

- لە (الأسماء والصفات) ـــدا أبو داود الطيالسي ئەڵێت: (سفيان الثوري و شعبة و حماد بن زيد و حماد بن سلمة و أبو عوانة تەشبیهیان نەئەکرد، وە نموونەیان دانەئەنا لە فەرموودەکاندا، وە نەیان ئەوت چۆن؟ کاتێکیش پرســیاریان لێبکرایە بە ئەثەر وەڵامیان ئەدایەوە) .

- (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـــ اللالكائي) ـــدا نعيم بن حماد ئه‌ڵێت : (هه‌ركه‌س الله بچوێنێت به شـتێک له درووسـتكراوه‌كانی كوفری كردووه، وه هه‌ركه‌س نكۆڵی له‌وه بكات كه الله وه‌صـفی خۆی پێكردووه كوفری كردووه، ئه‌وه‌ی الله وه‌صـفی خۆی پێ كردووه وه رسول ـه‌كه‌ی ته‌شبیهـ نیه) .

- له (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي) ـدا شاذ بن يحي الواسطي ئه‌ڵێت : (لای يزيد بن هارون دانیشتبووم، پیاوێک هات وتی : ئه‌ی أبا خالد چی ئه‌ڵێیت ده‌رباره‌ی جه‌همیه‌كان ؟

وتی : (ته‌وبه‌یان پێ ئه‌كرێت، جه‌همیه‌كان زیاده‌ڕۆیان كرد تا ئه‌وه‌ی نه‌فیان كرد.

وه موشه‌بیهه‌كان زیاده‌ڕۆیان كرد تا نمونه‌یان بۆ دانا .

جه‌همیه‌كان ته‌وبه‌یان پێ ئه‌كرێت، موشه‌بیهه‌كانیش به‌هه‌مان شێوه، تۆمه‌تباری كردن به شتێكی زۆر گه‌وره) .

- له (الحجة في بيان المحجة) ـدا أحمد بن حنبل ئه‌ڵێت : (الله مه‌شوبهێنن به درووستكراوه‌كانی | لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ | (الشورى : ١١) .

- له (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي) ـدا إسحاق بن راهويه ئه‌ڵێت : (هه‌ركه‌س وه‌صفی الله بكات وه صیفه‌ته‌كانی بشوبهێنێت به صیفه‌تی هه‌ر یه‌كێک له درووسـتكراوه‌كانی الله ئه‌وه كافر بووه به الله ـــــی مه‌زن، له‌به‌رئه‌وه‌ی خۆی وه‌صـفی صیفه‌ته‌كانی كردووه، به‌ڵكو ته‌سلیم بوون بۆ فه‌رمانی الله وه بۆ ئه‌وه‌ی رسول دایناوه) .

- محمد بن إسماعيل البخاري له (خلق أفعال العباد) ـدا ئه‌ڵێت : (الله تعالى ئه‌فه‌رمووێت : | فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا | (البقرة : ٢٢) بۆ الله هاوتا نیه، وه نمونه‌ی نیه، وه هیچ شتێک له صیفه‌ته‌كانی له درووستكراوه‌كاندا نیه) .

- له (الحجة في بيان المحجة) ـــــدا أحمد بن ســــنان القطان ئه‌ڵێت : (موشـه‌بیهه ئه‌وانه‌ن كه زیاده‌ڕۆیان كرد و لایاندا له فه‌رمووده‌كان، به‌ڵام ئه‌وانه‌ی قسـه به فه‌رمووده‌كه ئه‌كه‌ن و هیچ زیاده‌یه‌ک ناخه‌نه ســـه‌ر ئه‌وه‌ی كه بیســـتوویانه ئه‌وانه ئه‌هلی سوننه‌ن و ده‌ستگرتوون به ڕاستیه‌كه‌وه، وه ئه‌وانه موشـه‌بیهه نین، ته‌شبیهیان

نەکردووە، بەڵکو ئیمانیان هێناوە بەوەی فەرموودەکە هێناویەتی، ئەوانە ئیماندارانی بەڕاستخەرەوەن بەوەی پێغەمبەر و کیتاب و سوننەت هێناویانە).

- لە (التوحيد لابن منده) ــدا محمد بن سعيد المروزي ئەڵێت: پرسیار کرا لە أبو زرعة الرازي دەربارەی وتەی عیسى عليه السلام بۆ الله: ﴿تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَۚ﴾ (المائدة: ١١٦).

وتی: (ناوترێت نەفسی وەک نەفسی من وایە، لەبەرئەوەی کوفرە.

وە ئەفەرموویت: ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّۖ﴾ (ص: ٧٥) الله عز وجل ئادەمی درووستکردووە بە دەستی خۆی، وە ناوترێت دەستی بەوێنەی دەستی من وایە یان وەک دەستی من وایە لەبەرئەوەی کوفرە، بەڵکو ئیمان ئەهێنین بە هەموو ئەوانە).

- إبن قتيبة الدينوري لە (تأويل مختلف الحديث) دا ئەڵێت: (ناڵێین پەنجەی وەک پەنجەمان وایە، وە دەستی وەک دەستمان وایە، وە مشتی وەک مشتمان وایە، لەبەرئەوەی هەر شتێک لەوانەی ئەو لە هیچ شتێکی ئێمە ناچێت).

- عثمان بن سعيد الدارمي لە (النقض) ــدا ئەڵێت: (بەڵام وتەکەت کە ئەڵێی چۆنیەتی بۆدانانی ئەم صیفەتانە و تەشبیهـکردنیان لەوەی لە درووستکراوەکانیدا هەیە هەڵەیە، ئێمە ناڵێین هەڵەیە وەک ئەوەی تۆ وتت، بەڵکو لای ئێمە کوفرە، وە ئێمە بۆ چۆنیەتی دانان و تەشبیهــکردن بەوەی هەیە لە درووستکراوەکاندا لە ئێوە توندترین، جگە لەوەی ئێمە تەشبیهــناکەین و چۆنێتی بۆ دانانێین و بێباوەڕ نابین پێی و بەدرۆی ناخەینەوە و بەطالی ناکەینەوە بە تەئویلێکی گومڕایانە).

وە دەربارەی ئەثەرەکەی ابن عباس رضي الله عنهما (هیچ نمونەیەک بۆ الله نیە) ئەڵێت:

(وە ئێمەش ئەوە ئەڵێین وەک چۆن ابن عباس وتوویەتی هیچ نمونەیەک بۆ الله نیە، وە هاوشێوەی نیە، وە لە هیچ شتێک ناچێت، وە هیچ شتێک صیفەتێکی نیە وەک صیفەتەکانی ئەو، هیچ شتێک لە ئەو ناچێت، ئەو شتە گەورەترین شتە، وە درووستکاری شتەکانە، وە باشترینی شتەکانە، نوری ئاسمانەکان و زەویە).

- ابن جرير الطبري لە (تفسير الطبري) ـدا دەربارەی فەرمایشتی : ﴿ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ ﴾ (النحل : ٧٤) .

ئەڵێت : (نمونە دامەنێن بۆ الله، وە هیچ مەچوێنن پێی، لەبەرئەوەی وێنەی نیە و هاوشێوەی نیە) .

- إبن منده لە (كتاب التوحيد) ـدا ئەڵێت : (بەهەمان شێوە وەک لەسەرەتادا دەربارەی ئەم هەواڵانە لە صـــيفەتەكان لەم كتێبەماندا وتمان ئەڵێین بەڕێی ئەكەین بەبێ تەمثیل و بەبێ تەشـــبیهـــــ و بەبێ چۆنیەتی بۆدانان و بەبێ قیاس و بەبێ تەئویل، لەســـەر ئەوەی ســـەلەفی ڕاســـتگۆ بۆیان گواســـتووینەتەوە لە هاوەڵانی پاكەوە لە هەڵبـژێـردراوەوە ﷺ، وە بە جـاهـیـلـی دائەنـێـیـن هەركەس قـســه بـكـات بەبـێ ڕوونكردنەوەیەک لە ڕســول یان هەواڵێک لە هاوەڵانی ئامادەبوو لە دابەزین، وە بەرین لەلای الله لەوەی پێچەوانەی قورئان و كەلامی رسول ئەكات) .

- إبن أبي زمنين لە (أصول السنة) ئەڵێت : (ئەم صیفەتانەی پەروەردگارمان كە خۆی وەصـفی خۆی پێكردووە لە كتێبەكەی، وە پێغەمبەرەكەی وەصـفی پێكردووە، لە هیچ شـــتێكیاندا دیاریكردن و تەشـــبیهـــــ و ئەندازەگیری نیە، پاكوبێگەردی بۆ ئەو كەســـەی كە هیچ شـتێک لەو ناچێت وە ئەو بیســـەر و بینەرە، چاوەكان نەیانبینیوە كە چۆنە، بەڵكو دڵەكان لە حەقیقەتی ئیمان پێهێنانی بینیویانە) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ــــــدا ئەڵێت : (هەركەس بڵێت عیلمی الله وەک عیلمی من وایە، یان قودرەتی وەک قودرەتی من وایە، یان كەلامەكەی وەک كەلامی من وایە، یـان ویســـــت و خۆشـــەویســـتی و ڕازیبوون و توڕەبوونەكەی وەک ویســـــت و خۆشـــەویســـتی و ڕازیبوون و توڕەبوونی من وایە، یان بەرزبوونەوەكەی لەســـەر عەڕش وەک بەرزبوونەوەی من وایە، یان دابەزینەكەی وەک دابەزینی من وایە، یان هاتنەكەی وەک هاتنی من وایە، وە نمونەی ئەوانە، ئەوە الله ــــــی چواندووە و دایناوە بە نمونەی درووســـتكراوەكانی، پاک و بێگەردی بۆ الله لەوەی ئەیڵێن، وە ئەوە گومڕایەكی پیســـه بەڵكو كافریشە.

وە هەركەس بڵێت الله عیلمی نیە و قودرەتی نیە و كەلامی نیە و ویســـتی نیە و بیســـتنی نیە و بینینی نیە و خۆشـــەویســـتی نیە و ڕازیبوونی نیە و توڕەبوونی نیە و

بەرزبوونەوەی نیە و هـاتنی نیە و دابەزینی نیە ئەوا نـاوە جوانەکـانی الله و صـــیفەتە بەرزەکانی پەکخســتووە، وە ئیلحادی کردووە لە ناوەکانی الله ـــــو ئایەتەکانی، وە ئەوە گومڕایەکی پیسە، بەڵکو کافریشە.

مەزهەبی پێشـــەوایـان و ســـەلەف جێگیرکردنی صــیفەتەکـانە، وە نەفیکردنی تەشـــبیهە بە درووســتکراوەکـان، جێگیرکردن بەبێ تەشـــبیهـــــ، وە پاکڕاگرتن بەبێ پەکخستن) هتد .

ئەشعەریە جەهمیەکان بە بیانووی پاکڕاگرتنی الله لە تەشبیهـ دێن تەواوی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات تەحریف ئەکەن، چونکە لەڕاستیدا مانای ڕووکەش و حەقیقی ئایەتەکانی سیفات بە کوفر و تەشبیهـ ئەزانن، ئەگینا بۆ تەحریفی ئەکەن ؟

- لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي) ـدا علي بن المديني ئەڵێت : (هەرکەس وتی فلان کەس موشەبیهەیە بزانن ئەوە جەهمیە) .

- لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي) ـدا إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (نیشـــانەی جەهم و هاوەڵەکانی بانگەشـــەیانە لەســـەر ئەهلی جەماعەت کە گوایە موشەبیهەن، بەڵکو خۆیان موعەطیلەن، ئەگەر درووست بێت پێیان بوترێت موشەبیهە ئەوە هەڵی ئەگرێت، وە ئەوان ئەڵێن پەروەردگار لە هەموو شوێنێکە لە نزمترین زەوی و بەرزترین ئاســـمانەکـان هەر یەک واتـایە، وە درۆیـان کرد لەمەدا وە پـابەنـدئەبن بە کوفرەوە) هتد .

(ئەگەر درووســـت بێت پێیـان بوترێت موشـــەبیهە ئەوە هەڵی ئەگرێت) واتە جەهمیەکان خۆیان موشـــبیهەن، چونکە هاتن تەماشـــای قورئان و فەرموودەیان کرد و تەشبیهیان کرد بۆ سیفاتەکان لە مێشکی خۆیاندا ئینجا هاتن سیفاتەکانیان پەکخست .

- لە (إبطال التأويلات) ـــــدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (بینیم ئەهلی ئەهواء و بیدەع و پێچەوانەکاران ناوانێکی ناشـــرین لە ئەهلی ســـوننە ئەنێن، ئەیانەوێت بەمە عەیبداریان بکەن، وە تانەیان لێ بدەن، وە غەیبەتیان بکەن، وە ســـوکیان بکەن لای گەمژە و جاهیلەکان، ئەمما جەهمیەکان ئەوانە ناوی ئەهلی سوننە ئەنێن: المشبهة، وە درۆیان کرد جەهمیەکانی دوژمنی الله، بەڵکو خۆیان ئەولاترن بە تەشـبیهـــــ، سوپاس بۆ

ئەو الله یەی هیدایەتی داین بۆ ئەمە، وە ئێمە ناتوانین هیدایەتی خۆمان بدەین ئەگەر الله هیدایەتمان نەدات، نێردراوانی پەروەردگارمان بە حەق ـەوە هاتوون) .

- لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة لــ اللالكائي) ـــدا أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (نیشانەی ئەهلی بیدەع، قسە وتنە بە ئەهلی ئەثەر، وە نیشانەی جەهمیەکان ناونانی ئەهلی سوننەیە بە موشەبیهە) .

- لە (الحجة في بيان المحجة) ـــدا أبو زرعة الرازي ئەڵێت : (هەرکەس وەصفەکەرانی پەروەردگاریان بەوەی خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە کیتابەکەی، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی وە بەبێ تەشبیهـ و تەمثیل دایە پاڵ موشەبیهە، ئەوە پەکخەرە، نەفیکەرە، وە بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوان بە دانەپاڵیان بۆ لای تەشبیهـ ئەوە ئەوانە پەکخەری نەفیکەرن، بەهەمان شێوە ئەهلی عیلم وایان ئەوت وەک عبدالله بن المبارك و وكيع بن جراح) هتد.

هەمیشە ئەشعەریە جەهمیە ئیماندارەکان بە کوفری کەلام بەڕاستخەرەوەکانی قورئان و فەرموودەیان تۆمەتبارکردووە بە تەشبیهـ و تەجسیم .

- حرب الكرماني لە (السنة) ـــدا ئەڵێت : (بینیم ئەهلی ئەهواء و بیدەع و پێچەوانیکاران ناوانێکی ناشرین لە ئەهلی سوننە ئەنێن، ئەیانەوێت بەمە عەیبداریان بکەن، وە تانەیان لێ بدەن، وە غەیبەتیان بکەن، وە سوکیان بکەن لای گەمژە و جاهیلەکان، ئەمما جەهمیەکان ئەوانە ناوی ئەهلی سوننە ئەنێن: المشبهة) .

- ابن خزيمة لە (كتاب التوحيد) ـــدا ئەڵێت : (هەرکەس ئەهلی ئەثەر کە بە کیتابی پەروەردگاریان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان قسە ئەکەن تۆمەتبار بکات بە تەشبیهـ، ئەوە بەتاڵ و درۆ و بوهتانی وتووە، وە پێچەوانەی کیتاب و سوننەتی کردووە، وە دەرچووە لە زمانی عەرەب) .

وە ئەڵێت : (گوێگرن ئەی خاوەن پێویستیەکان لەوەی ئەیلێین لەم بابەدا، وە باسی بوهتانی جەهمیەکان ئەکەین، وە درۆ و بوهاتنیان لەسەر زانایانی ئەهلی ئەثەر، وە تۆمەتبارکردنی باشترین درووستکراوان دوای پێغەمبەران لەوەی الله یان پاک ڕاگرتووە بە تەزویری جەهمیەکان لەسەر زانایانمان ئەوانە موشەبیهەن) .

- البربهاري لە (شرح السنة) ــدا ئەڵێت : (ئەگەر گوێت لێبوو پیاوێک وتی فلان کەس موبەشیهەیە وە فلان کەس لە تەشبیها قسە ئەکات، بزانە ئەوە جەهمیە) .

- إبن بطە لە (الإبانة الكبرى) ـــــدا ئەڵێت : (هەنێک لە موعتەزیەکان کاتێک ڕاستی ڕیوایەت و ئاثارەکانیان لا ڕوون بووەوە کە ناشتوانن گومانی تیا درووست بکەن و بیگۆڕن ئەوا ئەڵێن پێغەمبەر وای فەرمووە، بەڵام پێغەمبەر موشـــەبیهەیە، وە موشەبیهەش لای ئەوان کافر و مولحیدە) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــــدا ئەڵێت : (ئەوان  کاتێک بیاندیایە پیاوێک ڕۆچووە لە نەفیکردنی تەشبیهـ بەبێ جێگیرکردنی صیفەتەکان ئەیانوت ئەوە جەهمیەکی پەکخەرە، وە ئەمە لە قسەکانیاندا زۆر هەیە، جەهمی و موعتەزیلەکان تا ئەمڕۆ هەرکەس شـــتێک لە صـــیفەتەکان جێگیر بکات ناوی ئەنێن موشـــبیهە بە درۆ و بوهتانێک لێیانەوە، وە بگرە موعتەزیلە پێشەوایانی وەک: مالك و هاوەڵانی، وە الثوري و هاوەڵانی، وە الأوزاعي و هاوەڵانی، وە الشـــافعي و هاوەڵانی، وە أحمد و هاوەڵانی، وە إســـحاق بن راهويە، وە أبي عبيد و جگە لەوانیش ئەخەنە ڕیزی موشەبیهەکانەوە) هتد .

جەهمیەکانی سەردەمی إبن تيمية ئەشعەریەکانن، وە ئەو قسەیەی کە بە تۆخی دیاری کراوە سەد لە سەد جێبەجێ ئەبێت بەسەر ئەشعەریە جەهمیەکاندا .

- إبن قيم لە (الصواعق المرسلة) ـدا ئەڵێت : (وە ئەمە پیشەی هەموو موبتەدیع و مولیحدێکە، وە ئەمە میراتە لە ناونانی کافرانی قورەیش لە رســـول الله و هاوەڵانی بە (الصـــبأة) - الصـــبأة واتا کەســـانێک شـــوێن گەمە و ڕابواردن کەوتوون یان لایانداوە لە دینێکەوە بۆ دینێکی تر والله أعلم - ، وە ئەم میراتیەیـان لێوە هـاتووە بۆ هەموو بەتاڵکەرەوە - بەتاڵکەرەوەی حەق - و مولحید و موبتەدیعێک ناوی ئەهلی حەق ئەنێن بە ناوانێکی ناشرین و خەڵک ڕاونەر .

وە کاتێک کەسێک کە صیفەتەکان جێگیر ئەکات پێیان وت ئەوە موشەبیهەیە، لە مێشـــکی خەڵکانێک وا وێنای ئەکەن و ئەڵێن الله نمونەی ئەوانە، وە ڕووی هەیە وەک ڕووی ئەوان، وە بیســـتنی هەیە وەک بیســـتنی ئەوان، وە دوو دەســـتی هەیە وەک دەستی ئەوان، وە دائەبەزێت وەک دابەزینی ئەوان .

**وە کاتێک وتیان حەشـــەویە، لە مێشـــکی گوێگردا وا وێنای ئەکەن ئەو کەســـە تەزویری کردووە لە دینـدا کە لێی نەبووە، وە خســـتوویەتە نـاوی، وە ئەوە تەزویرە و ئەصلی نیە) هتد .**

**موعەطیلە خۆیان لە صـــیفەتەکان تێناگەن جگە لەســـەر ئەو شـــێوەیەی کە شـایستـەیە بە درووسـتکراوەکان، سـەرەتا ئەکەونە تەشـبیهەوە دواتر ئەیانەوێت ڕزگار ببن لەو تەشبیهە لێی ڕائەکەن و ئەڕۆن بۆ پەکخستنی، جارێکی تر ئەکەونە تەشبیهەوە بەوەی الله ئەشوبهێنن بە شتێکی کەموکوڕ وەک چۆن البخاري لە (خلق أفعال العباد) ـــــدا ئەڵێت : (هەنێک لە ئەهلی عیلم ئەڵێن جەهمیەکان موشـــەبیهەن، لەبەرئەوەی پەروەردگاریان چواند بە لاڵ و کەڕ و کوێر وە بەوەی قسە ناکات، وە جەهمیەکان ئەڵێن قسە ناکات و هیچ نابینێت وە ئەڵێن ناوی الله مەخلوقە) هتد .**

**جەهمی و ئەشـعەریەکان کەسـێک کە صـیفەتەکانی الله تعالی جێگیر بکات پێی ئەڵێن یەهودی موجەسـیمە بۆ ئەوەی خەڵک لێی ڕابکەن و وەک تانەلێدانێکیش بەڵام سـەریان دای لەبەرد ئەوان هێندەی یەهود کە خراپترین درووسـتکراوی الله ـــــن پەوەردگاری خۆیان نەناسیوە .**

٦٩١ - أحمد بن الوزير القاضي ئەڵێت : وتم بە أبو عمر الضرير : پیاو شتێک لە الكلام فێر ببێت ڕەددی نەزانەکانی پێ بداتەوە ؟

وتی : (الكلام هەمووی نەزانیە، وە تۆ هەتا زیاتر زانا بیت بە نەزانی؛ ئەوە نەزانتری بە زانست) .

---

**: واتە هەتا زیاتر لە الكلام ـــــدا ڕۆبچیت و زانابیت پێی ئەو نەزانتری بە قورئان و سوننەت .**

**٦٩٢ - علي بن خشرم** ئەڵێت : بشــر بن الحارث بە نووســین بۆی ناردم : (موخالەفەی پێشەواکان مەکە، چونکە هەرگیز هاوەڵی الكلام سەرفراز نەبووە) .

**٦٩٣ - علي بن المديني** ئەڵێت : (هاوەڵی فەرمووده پێویستی بە سێ شتە :

خاوەنی سوننەت بێت .

وە ڕاستگۆ بێت .

وە بناسرێت بە هەوڵی بەدەستهێنانی[(١)]) .

---

: (١) واتە ئەوەندە هەوڵی بەدەســتهێنانی بدات هەتا پێی بوترێت تەڵەبکاری فەرموودە و پێی بناسرێتەوە، نەوەک ڕۆژێک هەوڵی بۆ بدات و دە ڕۆژ فەرامۆشی بکات .

**٦٩٤ - علي بن جعفر الصفار** ئەڵێت : أبو موسى محمد بن المثنى م بینی لە خەودا .

پێم وت : ئەی أبو موسى، الله چی لەگەڵ کردیت ؟

وتی : (جارێ نەگەیشــتووم بە الله، بەڵام من و محمد بن بشــار و نصــر بن علي ) وە فلان و فلان، کۆمەڵەیەکی ژمارد (پێغەمبەر ﷺ ئەبینین هەموو ڕۆژێک، وە پێغەمبەر پێمانی فەرموو : ئێوە خۆتان ماندوو کرد لە کۆکردنەوەی سوننەتەکەمدا؛ ئەمرۆ چێژ لە بینینم ببینن) .

**٦٩٥ - علي بن جعفر الصفار** ئەڵێت : أبو موسى محمد بن المثنى م بینی لە خەودا .

پێم وت : ئەی أبو موسى، الله چی لەگەڵ کردیت ؟

وتی : (جارێ نەگەیشتووم بە الله ، بەڵام من و محمد بن بشار و نصر بن علي) وە فلان و فلان، کۆمەڵەیەکی ژمارد (پێغەمبەر ﷺ ئەبینین هەموو ڕۆژێک ، وە پێغەمبەر ﷺ پێمانی فەرموو : ئێوە خۆتان ماندوو کرد لە کۆکردنەوەی سوننەتەکەمدا؛ ئەمڕۆ چێژ لە بینینم ببینن) .

**٦٩٦ - أبوبكر الأعين** ئەڵێـت : (پێغەمبەرم بینی ﷺ **- واتە لە خەودا -** وەک بڵێیت خەوتبێت، بە پۆشاکەکەی داپۆشرابوو لە مزگەوتی مەدینە، وە يحيى بن معين باوەشـێنێکی بەدەسـتەوە بوو پارێزگاری ئەکرد لە سـەری، جا زانیم درۆی لێ دوور ئەخاتەوە) .

**٦٩٧ - عبدالرحمن بن أبي حاتم** ئەڵێت : (باوکم نامەیەکی پێدا ناردم کە نووسی بووی بۆ محمد بن عزيز الأيلي، وە داوای لێ کرد پەڕاوی (سلامة بن روح له عقيل له الزهري) ــم بۆ بخوێنێتەوە، منیش نامەکەم پێ گەیاند لە الأيلة، وە ڕۆژی جومعە بوو، ئەو ڕۆژە تەنها شـەش ڕکعات نوێژی کرد، دوو ڕکعاتی نوێژی جومعە و چوار ڕکعاتی عەسر لەوە زیاتری نەکرد، وە سـەرقاڵ بوو بە خوێندنەوەی فەرمووده هەتا تەواوی کرد، وە پێی وابوو ئەوە باشترە لە نوێژی سوننەت) .

**٦٩٨ - أحمد بن الحسين العازلي** ئەڵێت : گوێبیسـتی أبو عبيد القاسـم بن سـلام بووم پیاوێک پرسـیاری لێ کرد : چی ئەڵێیت دەربارەی بۆچوونی ئەهلی الكلام ؟

وتی : (بەڕاسـتی پەروەردگـارت ڕێنوێنی کردوویـت بۆ ڕێبـازی هیـدایەت و ڕێگەی حەق .

فەرموویەتی : ﴿فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ (النِّسَاء : ٥٩) .

ئایا لەوەدا کە پەروەردگارت ڕێنوێنی بۆ کردوویت لە وتەکەی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوەی تێدا نییە بێپێویستت بکات لە گەڕانەوە بۆ بۆچوون و عەقڵت ؟

وە لەکاتێکدا الله ڕێگری لێ کردوویت لە قسەکردن دەربارەی ذات و سیفاتەکانی تەنها ئەوەندە نەبێت کە بۆی دەرخستوویت ؟!

فەرموویەتی : | وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ | (الأَنْعَام : ٦٨) .

وە فەرموویەتی : | وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِيٓ أَسْمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ | (الأَعْرَاف : ١٨٠) .

## باسکردنی ئینکاریکردنی إسحاق بن راهويه لەسەریان

٦٩٩ - عبدالله بن العباس الطيالسي ئەڵێت : بیستم أحمد بن العباس ــی برام وتی : پێم گەیشــــت کە أحمد بن حنبل و إســـحاق بن إبراهيم کۆبوونەوە لە مەککە .

أحمد بە إسحاق ــی وت : حەز ئەکەیت کەسێکی بەڕێز و خاوەن پێگەت پێ پیشان بدەم ؟

دواتر هێنای بۆ لای الشــافعي ، وە باســی موناقەشــەکەی نێوانیانی کرد کە تیایدا إسحاق وتی : سفيان بن عيينة بۆی گێڕاینەوە لە الزهري لە علي بن الحسين لە أسـامة بن زيد رضـي الله عنه وتی : وتم بە پێغەمبەر ﷺ : ســبەینێ شــوێنی مانەوەمان کوێیە ؟

فەرمووی : (بۆ عقیل هیچ ماڵێکی هێشتووەتەوە ؟) .

الشافعي وتی : (ئەی گەنج ڕازی بووم ، ئەم فەرموودەیە نەگەیشتووە پێمان).

جا إسحاق لەم مەسەلەیەدا سەرکەوت و الشافعي لێوەی نووسیەوە) .

٧٠٠ - إسحاق بن راهويه ئەڵێت : عبدالله بن طاهر پێی وتم : ئەی أبو يعقوب ، ئەم فەرموودەیانەی ئەیگێڕنەوە دەربارەی دابەزین[1] چین ؟

وتم : (ئەی ئەمیر ، ئەم فەرموودانە لە هەمان ڕێگەی حوکمەکان و حەڵاڵ و حەرامەوە هاتوون ، وە زانایان نقلیان کردووە ، وە ڕێگەپێدراو نییە ڕەت بکرێنەوە ، بەو شێوەیەیە کە هاتووە بەبێ زانینی چۆنیەتی) .

: (١) واتە دابەزینی الله عز وجل بۆ ئاسمانی دنیا لە سێیەکی کۆتایی شەودا .

ئەو کەســە تانەی داوە لەو فەرموودەیە کە دەربارەی ســیفاتێکی الله عز وجل هاتووە و ویســتوویەتی ڕەتی بکاتەوە، ئیمامیش پێی ئەڵێت چۆن فەرموودەکانی حەڵاڵ و حەرام و ئەحکامەکـان هـاتوون ئەمەش هەر وا هـاتووە، ئەوانەی کە فەرموودەی ئەحکامەکانیان گێڕاوەتەوە هەر ئەوانن کە ئەم فەرموودانەیان گێڕاوەتەوە، هەربۆیە ئەگەر تانە بدەیت لەم فەرموودەیانەوە لەڕووی قبووڵکردنەوە ئەبێت تانە بدەیت لە فەرموودەکانی دیکەش، بەڵکو قبووڵ ئەکرێن لەسەر ڕووکەش بەبێ زانینی چۆنیەتی .

- لە (الإبانة الکبری) ـــدا إسحاق بن راهویه ئەڵێت: (چوومە لای عبدالله بن طاهر .

وتی: ئەم فەرموودەیانە چییە ئەیگێڕنەوە؟

وتم: (کامە؟ الله ئەمیر باش بکات) .

وتی: ئەگێڕنەوە الله دائەبەزێتە ئاسمانی دنیا .

وتم: (بەڵێ، خاوەن ثقة ـەکان گێڕاویانەتەوە کە الأحکام ـەکانیان گێڕاوەتەوە) .

وتی: ئایا دائەبەزێت و واز لە عەرش ئەهێنێت؟

وتم: (ئایا ئەتوانێت دابەزێت بێ ئەوەی عەرش لێی خاڵی ببێت؟) .

وتی: بەڵێ .

وتم: ئەی جا بۆ قسە لەمەدا ئەکەیت؟)) .

- لە (عقیدة الســلف وأصـحاب الحدیث) ـــدا أحمد بن ســعید بن إبراهیم الرباطي ئەڵێت: ڕۆژێک لە مەجلیســی ئەمیر عبدالله بن طاهر بووم، إســحاق ـــی کوڕی إبراهیم ـــیشی لێبوو پرسیاری لێ کرد دەربارەی فەرموودەی هاتنەخوارەوەی الله لە سێیەکی شەودا پێیان وت: ئایا صحیح ـە؟

وتی: (بەڵێ) .

یەکێک لەوانەی کە لەلای ئەمیر عبدالله بوو لێی پرسی - لە ئیمام إسحاق -: ئەی باوکی یعقوب تۆ پێت وایە هەموو شەوێک الله دێتە خوارەوە؟

وتی : (بەڵێ) .

وتیان : چۆن دێتە خوارەوە ؟

إسحاق وتی : (تۆ دان بەوەدا بنێ کە لەسەر عەرشە هەتا وەسفی هاتنە خوارەوەیت بۆ بکەم) .

وتی : دان بەوەدا دەنێم - جێگیری ئەکەم - کە لەسەر عەرشە.

إسحاق وتی : (الله عز وجل ئەفەرمووێت: | وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا | .

ئەمیر عبدالله وتی : ئەی باوکی یعقوب ئەوە مەبەستی لە ڕۆژی قیامەتە!

إسحاق : (ئەی کێ ئەمڕۆ ڕێگری لە هاتنی دەکات ئەگەر لە ڕۆژی قیامەت بێت ؟).

- إبن تيمية لە (شرح حديث النزول) ـدا ئەڵێت : (عبدالله بن طاهر، کە یەکێکە لە باشترین ئەوانەی کاربەدەستی خۆراسان بوون، ئەیزانی کە الله تعالى لەسەر عەرشە، وە کێشەی لەوەدا بۆ دروست بوو الله عز وجل دابەزێت، لەبەر ئەوەی وای بیر ئەکردەوە ئەوە پێویستیکارە عەرش لە الله خاڵی ببێت، جا ئیمام إسحاق دانی پێدانا و هاوڕای بوو لەوەدا کە لەسەر عەرشە، پێی وت : (ئایا ئەتوانێت دابەزێت بەبێ ئەوەی عەرش لێی خاڵی ببێت ؟) .

ئەمیرەکە پێی وت : بەڵێ .

إسحاق یش پێی وت : (جا بۆچی قسە ئەکەیت لەمەدا ؟!) هتد .

مەبەستی ئەوەیە مادەم توانای ئەوە هەیە ئەوکات دابەزینی ئەوە پێویست ناکات عەرش لێی بەتاڵ بێت، هەربۆیە نابێت بەرامبەر دابەزینی الله عز وجل بوەستڕێتەوە لەبەر ئەوەی دابەزینەکە وا پێویست ئەکات عەرش لێی خاڵی بێت .

هاوشێوەکەشی بریتیە لەوەی أبو بكر الأثرم گێڕاویەتیەوە لە (السنة) ـدا، وتی : إبراهيم بن الحارث العبادي بۆی گێڕامەوە وتی : الليث بن يحيى بۆی گێڕامەوە وتی : گوێبیستی إسماعيل بن الأشعث بووم ئەیوت : گوێبیستی الفضيل بن عياض بووم ئەیوت : (کاتێک جەهمیەک پێی وتیت من کافرم بە پەروەردگارێک لە شوێنی خۆی لائەچێت، تۆش بڵێ من ئیماندارم بە پەروەردگارێک ئەوە ئەکات کە ئەیەوێت) .

**الفضـيل بن عياض رحمه الله ويسـتى موخالەفەی جەهمیەكە بكات كە ئەیوت : (كردەوە ئیختیاریەكان پێوەی پەیوەست نییە، هەربۆیە هاتن ى لێ چاوەڕێ ناكرێت، وە نە دابەزین و نە بەرزبوونەوە و جگە لەوە لە كردەوە ئیختیاریەكان پەیوەست بە خۆیەوە لێی چاوەڕێ ناكرێت) .**

**جا الفضـــيل وتی : كاتێک جەهمیەک پێی وتیت من كافرم بە پەروەردگارێک لە شوێنی خۆی لائەچێت، تۆ بڵێ من ئیمانم هەیە بە پەروەردگارێک ئەوە ئەكات كە خۆی ئەیەوێت .**

**جا فەرمانی پێ كرد ئیمان بهێنێت بەو پەروەردگارەی ئەوە كارە ئەكات كە خۆی بیەوێت لەو كردەوەیانەی پەیوەستە بە خۆیەوە، مەبەستی لەو مفعول ـــاتانە نەبوو كە جیایە لە خۆی) .**

**٧٠١ - إسـحاق بن إبراهيم** ئەڵێت : (ڕۆچوون لە فەرمانەكانی الله عز وجل ـدا ڕێگەپێدراو نییە وەک چۆن ڕۆچوون ڕێگەپێدراوە لە كردەوەی دروستكراوەكاندا، لەبەر فەرمایشتی الله تعالى : ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴾ (الأنبياء : ٢٣) .

وە ڕێگەپێدراو نییە هیچ كەسێک بیربكاتەوە لە سیفات و كردەوەكانی الله عز وجـل بە تێگەیشـــتنێک؛ وەک چۆن ڕێگەپێـدراوە بیركردنەوە و تەماشـــاكردنی دروســتكراوەكان، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەكرێت الله عز وجل وەســف كرابێت بە دابەزین هەموو شـــەوێک كاتێک ســـێیەكی تێئەپەڕێت بۆ ئاســـمانی دنیا چۆن ئەیەوێت، وە پرسیار ناكرێت دابەزینەكەی چۆنە، چونكە دروستكەر ئەوە ئەكات كە ئەیەوێت بەو چۆنیەتیەی كە ئەیەوێت) .

**٧٠٢ - أبو عمر بن موسى بن معمر** ئەڵێت : پرسیارم كرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی بابەتێک، وتی : (خەڵكی كوێیت ؟) .

وتم : خۆراسان .

وتی : (فأين أنت عن إسحاق بن راهويه[1] ؟! پەيوەستبه بە إسحاق ـەوە) .

وە وەڵامی نەدامەوە .

---

: (١) نەمتوانی بە کوردی مانايەکی ڕێکی بۆ بکەم .

**٧٠٣ - قتيبة بن سعيد** ئەڵێت : (کاتێک بينيت پياو سفيان و مالک و إبن المبارک و يحيى بن يحيى و أحمد بن حنبل و إسحاق بن إبراهيم ی خۆش ئەوێت؛ ئەوە بزانە لەسەر ڕێگەکەيە) .

---

- أبو عثمان الصابوني لە **(عقيدة السلف وأصحاب الحديث)** ـــدا ئەڵێت : **(وە نيشـانەکانی ئەهلی سـوننە بريتيە لە خۆشـەويسـتييان بۆ پێشـەواکانی سـوننە، وە زاناکانيان، وە سـەرخەرانيان، وە دۆسـتەکانيان، وە ڕق لێبوونەوەيان بەرامبەر ئەهلی بيدە ع، ئەوانەی بانگەشە بۆ ئاگری دۆزە خ ئەکەن، وە هاوەڵەکانيان ئاڕاستەی تياچوون ئەکەن، الله عز وجل دڵەکانی ئەهلی سـوننەی ڕۆشـن کردەوە، وە ڕوناکی کردەوە بە خۆشەويستيی زانايانی سوننە بە فەزڵێک لێوەی) .**

**پاشان ئەم ڕيوايەتەی قتيبة بن سعيد ئەهێنێت و ئەڵێت : (وە منيش بۆ زياد کرد بەوانەی قتيبة باسـی کرد کە ئەوەی خۆشـيانی بوێت خاوەنی سـوننەيە لە ئيمامەکانی ئەهلی حەديث ئەوانەی شـوێنپێيان هەڵئەگيردرێت، وە بە هيدايەتی ئەوان هيدايەت ئەدرێن، وە لە شـوێنکەوتووان و دڵسـۆزانيـان ئەژمێردرێن، وە لە شـوێنکەوتنی ئاثارەکانيان، لەوانەش : محمد بن إدريس الشـافعي المطلبي ئيمام و گەورە و منەتکاری گەورە بەسـەر ئەهلی ئيسـلام و سـوننە، ئەوەی کە کاری کرد لە دينی الله عز وجل و سـوننەتی نێردراوەکەی ﷺ لە سـەرکەوتن بۆيان، کەس کرداری نەکردووە لە زانايانی سەردەمی خۆی وە لەدوای خۆی وەک الإمام الشافعي .**

وە ئەوانەی لە پێش الإمام الشافعي ـەوە هاتوون وەک : سعيد بن جبير و الزهري و الشعبي و التيمي و دوای ئەوانیش وەک الليث بن سعد و الأوزاعي و الثوري و سفيان بن عيينة و حماد بن سـلمة و حماد بن زيد و يونس بن عبيد و أيوب السـختياني و ابن عون .

دوای ئەوانیش وەک يزيد بن هارون و عبد الرزاق الصـنعاني و جرير بن عبد الحميد الضبي .

دوای ئەوانیش وەک محمد بن يحيى الذهلي و محمد بن إسـماعيل البخاري و مسلم بن الحجاج القشيري و أبي داود السجستاني و أبي زرعة الرازي و أبي حاتم الرازي و کوڕەکەی ابن أبي حاتم و محمد بن مسلم بن وارة الرازي و محمد بن أسلم الطوسي و أبي سـعيد عثمان بن سـعيد الدارمي و جگە لەمانیش لە پێشـەوایانی سـوننەو دەستگرتووان پێوەی و سەرخەران و بانگخوازان و دۆستەکانی .

من بە فەزڵی الله جل جلاله شـوێنکەوتەی ئەثەرەکانیانم، وە ڕوناک بووەوەم بە نورەکانیان، ئامۆژگاریی برایان و هاوەڵانم ئەکەم مەشـخەڵی کەس بەرز نەکەنەوە جگە لەوان، شـوێن وتەکانی ئەوان نەبێت نەکەون، وە سـەرقاڵ نەبن بەو شـتە تازانەی بیدعەیە کە بەناوبانگ بووە لەنێو موسـڵمانان، وە ئەو شـتە خراپانەی دەرکەوتووە و بڵاوبۆتەوە، ئەگەر بێتو بهاتبایە بە زمانی کەسـێکدا لە سـەردەمی ئەو پێشـەوایانە ئەوە هەجر ئەکرا و تەبدیع ئەکرا و بەدرۆ ئەخرایەوە، برایـانم زۆریی ئەهلی بیدەع فریوتـان نەدات، وە زۆریی ژمارەیان، زۆریی ئەهلی باطل و کەمیی ئەهلی حەق لە نیشـانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی حەقە - قیامەت - ، لەبەر ئەوەی ئەوە لە کاروبارەکانی نزیک بوونەوەی قیامەتە، چونکە رسـول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (لە نیشـانەکانی قیامەت و نزیک بوونەوەی کەم بوونەوەی عیلم و زۆربوونی جەهلە) .

عیلم بریتییە لە سوننەت و جەهلیش بریتییە لە بیدعە .

هەرکەس ئەمرۆ دەسـت بە سـوننەتی رسـول الله ـــەوە ﷺ بگرێت و کاری پێ بکات و بەردەوام بێت لەسـەری و بانگی بۆ بکات، ئەوە ئەجرەکەی فراوانتر و زیاترە لە پاداشـتی ئەو کەسـانەی کە لە سـەرەتای ئیسـلامەوە لەسـەر ئەوە ڕۆشـتوون، چونکە رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەجری پەنجا کەسیان بۆ هەیە) .

وتیان : لە خۆیان ؟

فەرمووی : (بەڵکو لە ئێوە) .

وە ئەمەی بۆ ئەو کەسانە فەرموو کە کار بە سوننەتەکەی ئەکەن لەکاتی فەسادی ئوممەتەکەیدا) .

٧٠٤ - عبيدالله بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري ئەڵێت : (ئەگەر بينيت خۆراسـانيەک إبن المبارک و، يحيى بن يحيى و، إسـحاق بن إبراهيم و، محمد بن يحيى الذهلي ی خۆش ئەوێت ئەوە بزانە ئەهلی سوننەیە) .

٧٠٥ - إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (حەفتا هەزار فەرموودەم لەبەرکردووە بە لەبەرکردنێکی چەسپاو، پێویستم بە کتێب نییە تیایدا) .

٧٠٦ - إسحاق بن إبراهيم ئەڵێت : (لە النُّزول دا وەسفێک نییە) .

---

: مەبەسـتی ئەوەیە وەسـفی چۆنیەتی دابەزینی الله عز وجل بۆ ئاسـمانی دنیا ناکرێت، ناوترێت بەوشێوە و بەوشێوە دائەبەزێت .

- لە (شـرح أصـول إعتقاد لـ اللالكائي) ـدا إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (هەرکەسـێک وەسـفی الله بکات سـيفەتەکانی بچوێنێت لە سـيفەتی یەکێک لە دروستکراوەکانی ئەوە کافرە بە الله ی العظيم، چونکە ئەوە وەسفێکە بۆ سيفەتەکەی، بەڵکو تەسليمبوون هەیە بۆ کەلامی الله و ئەوەی رسول الله ﷺ دایناوە) .

- لە (الصفات لابن المحب) ـدا أبو حاتم ئەڵێت : (هەرکەسێک بڵێت دابەزین دابەزین نییە، وە هاوشێوەی ئەوە؛ ئەوە جەهمیەکی کافرە) هتد .

واتە ئێمە ڕاستە ئەڵێین چۆنيەتی دانانێین بۆ سيفەتی النزول ـی الله عز وجل چونکە ناتوانین بیر لە چۆنیەتیەکەی بکەینەوە؛ بەڵام لە هەمان کاتیشـدا ئەزانین دابەزین واتە دابەزین، جا کاتێک کەسـێل دێت ئەڵێت دابەزین بەواتای دابەزینی ڕەحمەت دێت نەوەک دابەزینی الله عز وجل، ئەوە جەهمیە، واتە ئەبێت ئێمە

حەقیقەتی سیفەتەکە جێگیر بکەین بەوشێوەیەی کە شایستەیە بە الله عز وجل، وە نابێت لێکی بدەینەوە بە شتێک کە ئەسڵی سیفەتەکە پەک ئەخات، ئەم مانایە لە وتەکەی خوارەوەدا باشتر دەرئەکەوێت .

- عبدالغنيِ المقدسيِ ئەڵێت : (هەواڵەکان بەزۆری هاتوون و ئاثارەکان صحیح ببوون دەربارەی ئەوەی الله عز وجل هەموو شەوێک دائەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیا، جا واجبە ئیمان پێ هەبوونی و تەسلیم بوون بۆی، وە وازهێنان لە پەڵپ لێ گرتنی، وە بەڕێکردنی بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان و نمونە بۆ هێنانەوە، وە بەبێ تەئویل، وە بەبێ پاکڕاگرتنێک حەقیقەتی دابەزین ی لێ دابماڵێت) .

٧٠٧ - الفضل بن محمد المروزي ئەڵێت : گوێبیستی إسحاق بن إبراهيم الحنظلي بووم دەربارەی فەرموودەی : (لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێت لە وێنەی پیاوێکی گەنجی ڕەنگزەردهەڵگەڕاو) وتی : (پاداشتی کاروکردەوەکەی دێت، بە خەیاڵ وەکو پیاوێک; نەوەک وەک شتێکی دروستکراو .

وە لە فەرموودەدا هاتووە : (بەردە ڕەشەکە لە ڕۆژی قیامەتدا دوو چاو و زمانێکی هەیە)، وە بۆمان هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کاتێک پیاوچاک ئەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوە کاروکردەوە چاکەکەی دێت بۆ لای لە باشترین وێنەدا، وە ئەڵێت : (من کاروکردەوە چاکەکەتم) .

پاداشتی کاروکردەوە چاکەکەی دێت و ئەمەش بە خەیاڵە، چۆن سیفەت و چۆنیەتی ئەمە بە عەقڵ پێی ئەگەیرێت لەکاتێکدا نەهیمان لێکراوە لە زۆرلەخۆکردن بۆ لە زانینیدا ؟ بەڵکو ئەوەی لەسەرمانە تەسلیمبوون و عیبادەتە) .

٧٠٨ - علي بن خشرم ئەڵێت : وتم بە إسحاق بن إبراهيم : إبن الفضيل بۆی گێڕانەوە لە إبن شبرمة وتی : الشعبي وتی : (هەرگیز ڕەشاییەکم نەنووسیەوە لەسەر سپیاییەک، وە هیچ پیاوێک فەرموودەیەکی بۆ نەگێڕاومەتەوە حەزم لێ بوبێت دووبارەی بکاتەوە بۆم) .

إسحاق پێی وتم : (ئایا عاجبایەتیت لەوە دێت ئەی إبن خشرم ؟) .

وتم : بەڵێ .

وتی : (تەنها باسی خۆمت بۆ ئەکەم، هیچ شتێکم نەئەنووسیەوە ئیللا لەبەرم ئەکرد، وە من ئەمڕۆ وەکو ئەوە وایە تەماشای حەفتا هەزار فەرموودە بکەم) .

**٧٠٩ - محمد بن عبدالرحمن السامي** ئەڵێت : پرسیار لە أحمد بن حنبل کرا دەربارەی إسحاق ؟

وتی : (جا کێ وەکو إسحاق ـــە، جا کەسی وەکو إسحاق پرسیاری لەبارەوە ئەکرێت ؟!) .

**٧١٠ - إسحاق بن راهویه** ئەڵێت : (عبدالله بن طاهر پێی وتم : ناتچوێنم ئیللا بە باخێك نەبێت پیاو دێتە ژوورەوە و ئەوە ئەبات کە ئەیەوێت) .

**٧١١ - أبو یزید محمد بن یحیی بن خالد** ئەڵێت : گوێبیستی إسحاق بن إبراهیم بووم ئەیوت : (شوێنی سەد هەزار فەرموودە ئەزانم وەک بڵێیت تەماشایان ئەکەم، وە حەفتا هەزاری صحیح م لەبەرە، وە چوار هەزاری ناڕاست) .

پێی وترا : واتای : لەبەرکردنی ناڕاست چییە ؟

وتی : (ئەگەر بەسەر فەرموودەیەک لەوانەدا بڕۆم لە فەرموودە صحیحەکاندا ئەیناسمەوە) .

**٧١٢ - یوسف بن عیسی** ئەڵێت : وتم بە إسحاق بن إبراهیم : تۆ زیاترت لەبەرە یان وکیع ؟

وتی : (وکیع لە من بەتەمەنترە، وە من لەو زیاترم لەبەرە) .

**الهروي** ئەڵێت : (وە پێگە و بەرزیەکانی إسحاق ـــم باسکردووە لە کتێبی (مناقب أحمد بن حنبل) دا ڕەحمەتی الله یان لێبێت بە بەشێکی باش) .

**٧١٣ - حرب بن إسماعيل الكرماني** ئەڵێت : وتم بە إسحاق بن إبراهيم : چی ئەڵێیت دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی : ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَـٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (المُجَادلَة : ٧) .

وتی : (لە هەرکوێیەک بیت ئەو لێت نزیکترە لە شادەماری ملت، وە ئەو جیایە لە دروستکراوەکانی) .

وتم بە إسحاق : لەسەر عەرش بە سنوور ؟

وتی : (بەڵێ بە سنوور) .

**٧١٤ - عبدالله بن المبارك** ئەڵێت : (ئەو لەسەر عەرشەکەیەتی جیایە لە دروستکراوەکانی بە سنوور) .

---

: سەلەف و ئەهلی سوننە مەبەستیان لە سنوور و جیایی (الحد والبينونة) جێگیرکردنی حەقیقەتی سیفەتی بەرزی الله عز وجل ـە بەسەر دروستکراوەکانیدا لە سەرو ئاسمانەکانی، وە بەرزبوونەوەی لەسەر عەرشەکەی، جا ئەوکەسەی نەفی سنوور و جیایی بکات بەم مەبەستە ئەوە نەفی بەرزی الله عز وجل ـی کردووە، هەربۆیە توندبوون لەسەر إبن حبان و دەریانکرد لە سجستان کاتێک سنووری ڕەتکردەوە .

وە جەهمیەکانی سەرەتا و ئەشعەریە جەهمیەکان کافرن بەوەی الله عز وجل لەسەر عەرش بێت بە ذاتی خۆی، بۆیە سنوور ڕەتئەکەنەوە بۆی .

- إبن تيمية له (بيان تلبيس الجهمية) ـــــدا ئەڵێت : (کاتێک جەهمیەکان قســەیەکیان کرد ئەمە ناوەڕۆکەکەی بوو : (دروســتکەر جیا ناکرێتەوە لە دروســتکراو، دواتر نکۆڵیان لەو ســیفەتانە کرد کە پێی جیابووبوویەوە، هەتا موعتەزیلەکان ئەڵێن ئەگەر بزانن الله عز وجل ئەژی و زانایە و بەتوانایە ئەوە حەقیقەت و چییەتی الله عز وجل یان زانیوە، وە ئەڵێن : (لە جگە لە خۆی جیانابێتەوە) .

جا ئەوکاتە یان ئەبێت وەســفی بکەن بە وەســفی شــتێکی نەبوو و بڵێن : نە لە ناوەوەی جیهانە وە نە لە دەرەوەی، وە نە ئاوا و نە ئاوایە .

یـاخود ئەبێـت بڵێن تواوەتەوە لە دروســـتکراوەکـانـدا، یـاخود بوونیەتی دروستکراوەکاندا .

هەربۆیە إبن المبارک ڕوونی کردەوە کە پەروەردگار ســبحانە وتعالی لەســەر عەرشــەکەیەتی جیایە لە دروســتکراوەکانی، وە باســی ســنوور (الحد) ـــی کرد، چونکە جەهمیەکان ئەیانوت (ســـنوور ــــی نییە، وە هەرشـــتێک ســـنووری نەبێت ئەوە لە دروســـتکراوەکان جیا نییە، وە لە ســـەرەوەی جیهان نییە چونکە ئەوە پێویســـتیکاری سنوورە) .

جا کاتێک پرسـیاریان کرد لە پێشــەوای ئیمانداران لە هەموو شـتێکدا عبدالله بن المبارک : بەچی بیناسین ؟ - واته الله عز وجل -

وتی : (بەوەی لەســـەروو ئاســـمـانەکـانیەوەیەتی لەســـەر عەرش، جیـایە لە دروستکراوەکانی) .

بـاســی ئەنجـامی ئەوەیـان بۆ کرد کە جەهمیەکـان ڕەتی ئەکەنەوە، وە بە ڕەتکردنەوەی ئەو ئەنجامە ئەســڵی شـــتەکە ڕەت ئەکەنەوە کە بریتیە لەوەی لەســـەر عەرشە و جیایە لە دروستکراوەکانی، پێیان وت : بە سنوور ؟

ئەویش وتی : (بە سنوور) .

وە ئەمەش هەموو ئەوانە لێی تێئەگەن کە جیـاوازی نێوان وتەی ئیمـانـدارانی ئەهلی سوننە و جەماعە، وە جەهمیە مولحیدەکان ئەزانن) هتد .

مەبەســتی إبن تیمیة ئەوەیە کاتێک ئەهلی ســوننە ئەڵێن الله عز وجل لەســەر عەرشە، ئەمە ئەسڵە (ملزوم)، پاشان ئەڵێن بە سنوور، ئەمە ئەنجامە (لازم)، جا کاتێک

**جەهمیەکان هاتن وتیان سنوور ــی نییە ئەوە ئەنجامەکەیان ڕەتکردووەتەوە، وە لەبەر ئەوە ئەنجامەکەیان ڕەتکردووەتەوە چونکە لە ڕاســتیدا باوەڕیان بە ئەســڵەکە نییە کە بریتیە لەوەی الله عز وجل لەسەر عەرشە .**

**وە ئەڵێت : (جێگیر بووە لە پێشــەوایانی ســەلەفەوە وتوویایە (الله ســنوور ـــــی هەیە)، وە ئەو ســـنوورە کەس نازانێت جگە لە خۆی، وە لەوبارەیەوە ئەهلی حەدیث و سوننەت نووسراوانێکیان هەیە) .**

**٧١٥ - الحسن السلمي** ئەڵێت : هشــام بن عبیدالله کەســێکی زیندانی کرد لەسەر جەهمیەت، کەسەکە تۆبەی کرد، دواتر هێنرا بۆ لای هشام تا تاقی بکاتەوە.

هشـام وتی : (سـوپاس بۆ الله لەسـەر تەوبەکە، ئایا شـایەتی ئەدەیت بەوەی الله لەسەر عەرشەکەیەتی جیایە لە دروستکراوەکانی ؟) .

وتی : شــــایەتی ئەدەم بەوەی لەســـەر عەرشـــە، بەس نـازانم (جیـایە لە دروستکراوەکانی) چییە .

هشام وتی : (بیگێڕنەوە بۆ زیندان چونکە ئەمە تۆبەی نەکردووە) .

الهروي ئەڵێت : (وە بۆ بابەتی ســـنووری جیایی لە کتێبی (الفاروق) ــــــدا بەشێک هەیە کە پێویست ناکات لێرە دووبارە بکرێتەوە) .

**٧١٦ - عبدالله بن شِيرُويه** ئەڵێت : (شتێک لە المسند ـــم لەکیس چوو، ڕۆژی جومعە هاتم بۆ لای إســحاق لە حەمام بوو، کاتێک هاتە دەرەوە پێی وتم : (هی چ شوێنێکە ؟ **- واتە ئەوەی کە لە بیرت چووە -** ) .

منیش هەواڵم پێدا، ئەویش بە پێوە شـانی دادا لەسـەر مێزێک، وە بە لەبەر بۆی خوێندمەوە) .

**- له (تاريخ الإسلام) ــدا إبراهيم بن أبي طالب ئەڵێت : (إسحاق بن راهويه بۆ کەسی دووبارە نەئەکردەوە، وە من عاجبایەتیم لێ دێت چۆن عبدالله بن شيرويه هیچی لەدەســت نەچووە لە المســند، بینیم پێگە و پلەی هەیە لەلای إســحاق لەبەر پێگە و پلەی باوکی) .**

**٧١٧ - عبدالله بن محمد المروزي** ئەڵێت : (إســحاق بن إبراهيم خەڵکی گوندێکی ئێمە بوو لە مَرو، وە کتێبەکانی ئەهلی ڕەئی ـــی لەبەر بوو، پاشان چوویە ناو بواری فەرموودەوە، فەرموودەی نووســی و لەبەریانی کرد و کتێبی نووســی، وە کوفیەکان **- واتە وتەی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی -** هەڵئەوەشــاندەوە، وە کەســێکی ڕەوشــت بەرز بوو، گەشــتی زۆر کردبوو، تووشــی ســی هەزار درهەم قەرز بوو، وە ئەوکـات إبراهيم بن أبي صـــالح قـازی مَرو بوو، جەهمیەکی پیس بوو، إبراهيم خاوەنقەرزەکانی ئەناردەســەر إســحاق، وە پێی ئەوتن لەســەری تووند بن، جا إســحاق ترسـا لەوەی ببردرێت بۆ لای إبراهيم، هەربۆیە شــەو دەرچوو تا گەیشــتە نیسابور .

إبراهيم بۆ عبدالله بن طاهر **- دەسەڵاتداری نیسابور -** ـــی نووسی کە إسحاق هەڵهاتووە لە حوکم، وە داوای لێکرد بیگەڕێنێتەوە بۆلای، هەواڵەکەش گەیشــت بە يحيى بن يحيى و محمد بن أســلم، جا محمد بن أســلم هات بۆ لای يحيى بن يحيى و وتی : (موخالیفەکان بڕیاریان داوە إسحاق بچووک بکەنەوە، جا پێویسـتە نامەیەک بنووسیت بۆ عبدالله بن طاهر دەربارەی) .

وە يحيى ـــــيش نەئەچووە لەلای دەســەڵاتدارەکان، وە قســەی لەگەڵ نەئەکردن، وە قبووڵی نەبوو مووچەیان لێ وەربگرێت، وە نامەی بۆ نەئەنووسین، جا ساتێک بیری کردەوە و وتی : (موسوڵمانان نابێت إسحاق فەرامۆش بکەن) .

پاشان نووسی بۆ عبدالله بن طاهر : (بسم الله الرحمن الرحيم، له يحيى بن يحيى ـــەوە بۆ عبدالله بن طاهر، الله ئێمە و ئێوەش ڕێنمونی بکات بۆ گوێڕایەڵیی

خۆی، وە بە ڕەحمەتی خۆی یارمەتیمان بدات، یەکێکی وەکو إسحاق بن إبراهیم خراپە ناکرێت بەرامبەری، والسلام).

کاتێک عبدالله بن طاهر خوێندیەوە قبووڵی کرد، وە داینا لەسەر هەردوو چاوەکانی، وە بانگی إسحاق ـی کرد و سی هەزار قەرزەکەی بۆ دایەوە، وە سی هەزاری دیکەی پێدا، وە فەرمانی پێکرد کتێبێکی تەفسیری بۆ بنووسێت، ئەویش بۆی نووسی، وە لە نیسابور نیشتەجێ بوو هەتا عبدالله وەفاتی کرد.

وە إسحاق ـیش ساڵی **٢٣٧** وەفاتی کرد، وە گۆڕەکەی لە شەقامی شاذیاخ ە).

---

**- إبن قتيبة الدينوري لە (التأويل مختلف الحديث) ـدا ئەڵێت: (کەسم نەبینی زۆر بە گەرمی خەریکی باسکردنی ئەهلی ڕەئی بێت و لە پلەیان کەمبکاتەوە و بەدوای وتە ناشرینەکانیان بگەڕێت و ئاگادارکردنەوەیان لێ بدات وەکو إسحاق بن إبراهیم الحنظلي.**

**ئەو ئەیوت: ئەهلی ڕەئی کتێبی الله و سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیان فڕێ دا، دەستیان کرد بە قیاس، وە کۆمەڵێکی لەمانە دەژمارد) هتد.**

**إسحاق بن راهویە ئەو کەسە بوو کە یەکەمجار لەسەر مەزهەبی ئەبو حەنیفە بوو، پێی وابوو کەس جورئەت ناکات موخالەفەی ئەبو حەنیفە بکات، بەڵام کاتێک بینی لە دەرەوەی ناوچەی خۆراسان دنیا بە جۆرێکی ترە و ئەهلی حەدیث چەندە دژی ئەبو حەنیفە و مەزهەب و ڕەئی و بیدعەکانین، ئیتر ئەم کەسەی لێ دەرچوو کە ئیمام أحمد لە ئاستیدا ئەڵێت: إسحاق لای ئێمە ئیمامە. هاوشانی ئیمام أحمد ئیمامی ئەهلی سوننە و جەماعەیە و موسنەد و مەزهەبیشی هەیە.**

## چینی حەوتەم، وە لەناویاندا کوللابیەکان دەرکەوتن

کوللابیەکان (الكُلاَّبيّة) ئەدرێنە پاڵ أبو محمد عبدالله بن سـعید بن کلاب ـــی المتكلم، نەسڕانیەکی ئەهلی بەسرە بوو، پاشان موسوڵمان بوو، دواتر کوفر و گومڕایی هێنایە ناو عەقیدەی موسـوڵمانانەوە، وە دژی ئەهلی حەدیث بووە و کتێبی نووسـیوە لەسەریان بەناوی (الرد على الحشوية) .

وە کوللابیەکـان بـاوکی ڕۆحی ئەشـعەریەکـانن وەک چۆن دواتر ئاماژەی پێ ئەدەین إن شاء الله .

- الذهبي دەربارەی ئەڵێت : (سـەرگەورەی موتەکەلیمەکان بوو لە بەسـرە لە سەردەمی خۆیدا) .

پێشـتر باسـی زەمی سـەلەفمان کردووە بۆ بەناو زانسـتی الكلام، وە ئیمام أحمد ئاگاداری ئەدا لەبارەی إبن الكلاب و حارث المحاسبي ی هاوەڵی .

وە إبن خزيمة زۆر بە توندی بەرامبەریان ئەوەستایەوە و ئاگاداری لەبارەوە ئەدان و بە لەعنەتی ئەکردن وەک چۆن لە دواتردا دێت إن شاء الله .

- لە (تذكرة الحفاظ) ـــدا إبن خزيمة ئەڵێت : (أحمد بن حنبل زۆر توند بوو لەسەر عبدالله بن سعيد (إبن كلاب) و هاوەڵەکانی وەکو حارث) .

إبن کلاب بڕوای بە کەلامی نەفسـی هەبوو و یەکەم کەس بوو ئەمەی داهێنا و نەفی حەرف و صـەوتی کرد، ئەیوت الله بە دەنگ و بە پیت قسـە ناکات، بەڵکو کەلامی نەفسـی هەیە نە دەنگە و نە پیتە، ئەو قورئانەی دابەزیوە حیکایەتە لە کەلامی نەفسـی الله بە دەنگ و پیتی ئێمە، سـەلەف لەسـەر ئەم تەکفیریان کرد و ئەشـعەریەکانیش بە ملیم لایان نەداوە عەقیدەی إبن کلاب لەم بابەتەدا .

- سـعد الزنجاني لە (شرح المنظومة الرائية في السنة) ـــدا دەربارەی إبن کلاب ئەڵێت : (بڕوای وایە کە الله هیچ کەلامێکی نیە ببیسـترێت لێیەوە، وە جبريل هیچی نەبیستووە لە الله عز وجل لەو شتانەی کە گەیاندوویەتی بە پێغەمبەرانی عليهم السلام،

وه ئەوەی كە دابەزیوەتەســـەر پێغەمبەران حیكایەتی كەلامی الله بووە، كەلامی الله نە فرمانە نە نەهیە نە خەبەرە نە پرسیارە، وە ئەم شتانە لە الله ـوە ئەزانرێ بە ڕێگای تر، وە الله وشـــەی نیە و هیچ زمانێكی نیە، جا ئەم ئایەتانەی قورئانی بە درۆ دانا | قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا |.

وە فەرمایشتی : | وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٞ وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ مَّا نَفِدَتۡ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ | .

وە تەحەددا كردن و ئیعجازی بەتاڵ كردەوە لە فەرمایشـــتی الله عز وجل : | أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ|، وە | أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ | .

موخـالەفەی هەموو ئوممەتی كرد بەوەی كەلامی الله و كتێبی الله بوونی نیە لە زەوی، وە ئەو و الأشـــعري و جگە لەوانیش لە لەفزییەكان بڕوایان وایە كەلامی الله لە حەقیقەتدا نە عەرەبیە و نە نەصـرانیە و نە عیبرانیە و نە سـریانیە، وە بە هیچ زمانێك لە زمانەكان نیە، وە ناكرێت ســـورەت و ئایەت بێت و جوزء و ژماردنی هەبێت، وە ناكرێت دابەزێت بۆ هیچ كام لە پێغەمبەران لە حەقیقەتدا، وە بوونی نیە لە هیچ شـــوێنێك، نە لە دڵدا نە لە زماندا و نە لە موصحەفدا) .

- إبن تيمية لە (الإستقامة) ـدا لەبارەی كەلامی نەفسی و حیكایەت ـەوە ئەڵێت : (هیچ جیاوازیەك نییە لەوەی یەكەم كەس كە ئەم وتەیەی داهێنا بریتی بوو لە أبو محمد عبدالله بن سعید بن كلاب، وە أبو حسن الأشعري لەوەدا شوێنی كەوت) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــدا ئەڵێت : (ئەوەی كوللابی و ئەشـعەریەكان تێیدا موخالەفەی ئەهلی سوننەیان كرد ئەوە بوو كە وتیان : ئەو قورئانەی كە دابەزیوەتە سەر زەوی كەلامی الله نیە، نە پیتەكانی و نە ماناكانی، بەڵكو لەلای ئەوان مەخلوقە، وە ئەڵێن عیبارەتە لە مانایەك لە زاتی الله ـدا) .

- إبن أبي الخير العمراني لە (الانتصـــار في الرد على المعتزلة القدرية) ئەڵێت : (كوللابی و ئەشـــعەریەكان وتیان : ئەو كەلامەی الله كە مەخلوق نیە بریتیە لە مانایەك

له زاتی الله دا، له زاتی الله جیـا نـابێتەوە، بەڵام ئەم قورئانەی کە ئەخوێنـدرێتەوە و ئەبیســـترێت عیبارەت و حیکایەتە لە کەلامی نەفســـی الله، وە ئەشـــعەریەکان موافقی موعتەزیلەن لەوەی کە ئەم قورئانەی ئەخوێندرێتەوە و ئەبیسترێ مەخلوقە) .

- أبو نصر السـجزي له (رســالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت) ــدا پاشان ئەهلی سوننە تاقیکرانەوە دوای ئەمانە - واتا دوای موعتەزیلە - بە کەسـانێک کە بانگەشـەی ئەوەیان ئەکرد شـوێنی قورئان و سـوننەت کەوتوون، بەڵام زیانیان لە زیانی موعتەزیلە و غەیری موعتەزیلە زیاتر بوو، ئەوانیش بریتی بوون لە : (ابو محمد ابن كلاب و ابو العباس القلانسي و ابو الحسن الاشعري) دوای ئەوانیش : (محمد بن ابي ترید لە سـجسـتان و ابو عبدالله ابن مجاهد لە بەصـرە) لە سـەردەمی ئێمەشـدا : (ابو بكر ابن الباقلاني لە بغداد و ابو اسـحاق الاسـفراييني و ابو بكر ابن فورك لە خوراســان)، جا ئەمانە ڕەددی هەندێک وتەی موعتەزیلە ئەدەنەوە، وە ڕەدی ئەهلی سوننە ئەدەنەوە زۆر لەوە زیاتر کە ڕەددی موعتەزیلە ئەدەنەوە) .

- قوام السنة الأصبهاني الشافعي له (الحجة في بيان المحجة) ــــدا دەربارەی سـەلەفی ئەشـعەریەکان کە کوللابیەکانن ئەڵێت : (موعتەزیلەکان دەرکەوتن و تانەیان دا لە کتێبی الله عز وجل، وتیان قورئان مخلوق ـە .

وە تانەیان دا لە فەرموودەکانی رسول الله ﷺ، وە وتیان : صحیح نییە .

وە ناویان لە هاوەڵانی فەرموودە نا الحشوية .

وە وتیان : هەواڵەکان ڕاســتی و درۆ تێکەڵیان ئەبن، وە هەموو شــتێک لە نێوان ڕاســتی و درۆدا بێت ئەوە گومانە - هەربۆیە عەقڵیان پێشــخســت بەســەر قورئان و سوننەتدا - .

وە تەئویلی ناو و سیفاتەکانی الله یان کرد .

وە وتیان الله ویستی نییە سەرپێچی بکرێت، وە لەسەر بەندەکان دایانێت .

وە نەفی فەرموودەی النزول ـــــیان کرد، وە فەرموودەی پێ، وە پەنجەکان، وە مەبەستیان هەڵوەشاندنەوەی ئەسڵ و بنچینەکانی دین بوو .

جا دوای ئەوەی ئەوەیان بۆ نەچووسەر کە مەبەستیان بوو الكلابي شوێنیان کەوت، قسەیەکی کرد ڕووکەشەکەی جوان و سەرنجڕاکێش بوو، وە ناوانەکەی بەڵا و وێرانکەر بوو.

وتی: (من ناڵێم قورئان دروستکراوە، بەڵکو ئەڵێم ئەوەی لەناو موسحەفەکاندایە کەلامی الله نییە، بەڵکو عیبارەتێکە لە کەلامەکەی، وە کەلامەکەی کۆنە پەیوەستە بە خۆیەوە.

وە نەفی بەرزبوونەوە ناکەم - واتە بۆسەر عەرش -، بەڵام ناڵێم بە ذاتی خۆی بەرز بووەتەوە.

وە نەفی دەست و ڕوو ناکەم، بەڵکو تەئویلی ئەکەم).

جا بە شێوەیەک تەئویلی کرد ئەوەی نەهێڵا کە هاوەڵان رضي الله عنهم و تابعیەکان لەسەر بوون).

- لە (ذم الكلام وأهله) دا إبن منده ئەڵێت: (مرۆڤ تەقوای الله بکات و عیبرەت وەرگرێ لە پێشینی خۆی لەوانەی کە لەفز مەزهەب و ووتەیان بووە، کە چۆن دەرچوو لە دونیا بە هەجر کراوی و زەم کراوی و دەرکراوی لە مەجلیسەکان و شارەکان بەهۆی عەقیدە ناشرینەکەی و وتە خراپەکەی کە موخالفی دینی الله یە، وەک: الكرابيسي و ابن الشواط و ابن كلاب و ابن الأشعري و هاوشێوەکانیان ئەوانەی کە جیدال کردن و کەلام ڕێبازیان بووە لە دینی الله عز وجل).

- إبن بطة لە (الإبانة الصغرى) دا باسی زەندیقەکان ئەکات و ئەڵێت: (وە لە پیس و گڵاوەکانیان; لەوانەی لە ڕووکەشی قسەکەیدا بەرگری کردن لە سوننەت و سەرخستنی دەرئەکەوێت; وە لە هەمان کاتدا پیسترین وتەیە: إبن كلاب و ...).

ئەشعەریە جەهمیەکان وا خۆیان دەرئەخەن الله عز وجل بە گەورە و پاک ڕابگرن، وە بەرگری لە سوننەتی رسول الله بکەن، وە هەندێک دەستەواژەی مُجمَل بەکارئەهێنن بۆ گەیاندنی مەبەستەکانیان کە کەسانێک لێیان تێئەگەن ئاگاداری عەقیدەی پاکی سەلەف و عەقیدەی گڵاوی ئەوان بێت.

ئەم هونەری خۆڵکردنەچاوە ئەشعەریە جەهمیەکان لە کوللابیەکانی سەلەفیانەوە بۆیان ماوەتەوە.

وە نووسەر لەپێشدا باسی کوللابیەکان ئەکات وتەی زانایان ئەهێنێت لەسەریان بۆ ئەوەی بزانرێت ئەشعەریە زندیقەکان شوێنکەوتەی چ جۆرە زندیقێکن .

٧١٨ - عثمان بن سعيد الدارمي ئەڵێت : (چۆنیەتی دانانێین بۆ ئەم سیفەتانە، وە بەدرۆی ناخەینەوە، وە لێکدانەوەشی بۆ ناکەین) .

: واتە سیفەتەکانی الله عز وجل وەک چۆن هاتووە لەسەر ڕووکەشەکەی قبووڵی ئەکەین بەبێ ئەوەی مانای دیکەی بۆ لێک بدەینەوە یاخود چۆنیەتی بۆ دابنێین) .

- لە (النقض) وتەیەکی لەم شێوەیە هاتووە بە لفظ ی (وەک چۆن ئێمە چۆنیەتی دانانێین بۆ ئەم سیفەتانە، بەدرۆی ناخەینەوە وەکو بەدرۆخستنەوەی ئێوە، وە تەفسیری ناکەین بە تەفسیرە باتڵەکان) .

مەبەستی لە (تەفسیرکردنی بە تەفسیرە باتڵەکان) لێکدانەوەی جەهمیە پەکخەرەکانە کە ئەڵێن بۆ نمونە دەست واتە نیعمەت یان قودرەت .

وە بۆیە ئەهلی سوننە تەفسیری ئایەتەکانی سیفات ناکەن چوونە خۆی ماناکەی دیار و ڕوونە، نەوەک وەکو گومڕاکان ئەڵێن لە مانای ئایەتەکان تێ نەگەیشتوون !

- الدارمي لە (النقض) ــــدا ئەڵێت : (لە ســەرەتای ئەم کتێبەدا ئایەتانێکمان گێڕایەوە دەربارەی بیستن و بینین و چاو لە سەرەتای ئەم کتێبەدا بە سەنەد و دەربڕینەکانی لە رسول الله ــەوە ﷺ، وە ئێمەش ئەوە ئەڵێین کە ئەو فەرموویەتی، وە مەبەستمان پێی ئەوەیە کە ئەو مەبەستی بووە، وە چۆنیەتیدانان لەسەر ئێمە هەڵگیراوە، وە باسکردنی (الجوارح و الأعضاء) زۆرلەخۆکردن و خراپنیشاندانێکە لە خۆتەوە) .

وتەی ئیمام (ئێمەش ئەوە ئەڵێین کە ئەو فەرموویەتی، وە مەبەستمان پێی ئەوەیە کە ئەو مەبەستی بووە) واتە پەیوەست ئەبین بەو دەربڕینانەی کە لە رسول الله ـەوە ﷺ هاتووە، زیاد و کەمی ناکەن و لێکی نادەنەوە چونکە خۆی ماناکەی ڕوونە .

وە لێی تێئەگەن بەوشـــێوەیەی پێغەمبەر ﷺ مەبەســـتی بووە، وە بێگومان مەبەســـتی ڕووکەشـــی فەرموودەکان بووە، خۆ ئەگەر مەبەســـتی ڕووکەش نەبوویایە ئەوکات بۆی ڕوون ئەکردنەوە مەبەستی ڕووکەش نییە .

وە ئەڵێت : (ئەڵێین وەک چۆن الله تعالى ئەفەرمووێت : | كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٍ * وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ | (الرَّحۡمَٰن : ٢٦ - ٢٧) .

مەبەســـتی لە ڕوو ئەو ڕووەیە کە ئیمانداران ئەیزانن، نەوەک کردەوە چاکەکان، یاخود قیبلە، وە نە ئەو خورافاتانەش کە باســـت کردووە وەکو کەســـێک یاری بکات بە ڕووی الله عز وجل) .

وە ئەڵێت : ( فەرموویەتی : | بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ | (المَائِدَة : ٦٤) .

زانیمان ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە ئێوە بانگەشـەی ئەکەن، وە بینیمانەوە زانایان لەوانەی کە تێپەڕیون لێکدانەوەی بۆ ئەکەن بە پێچەوانەی ئەوەی ئێوە بۆی ئەکەن) .

پاشان لە عکرمة ـــەوە بە سەنەدی خۆی ئەیهێنێت لە تەفسیری ئایەتی | بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ | دا ئەڵێت : (دوو دەستەکە) .

وە لە نافع بن عمر الجمحي ـەوە ئەڵێت : پرسیارم کرد لە إبن أبي مليكة دەربارەی دەستی الله عز وجل، ئایا یەک دانەیە یان دووان ؟

وتی : (بەڵکو دووان) .

وە لە عاصم الجحدري ـــەوە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : | قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ | (ص : ٧٥) .

ئەڵێت : (بە دوو دەستەکەی) .

پاشـان ئەڵێت : (جا کێ پاش ئەمانە ئەکاتەوە بۆ تەئویلاتەکانی المريسي و واز لە لێکدانەوەکانی ئیمامەکان ئەهێنێت ؟!) .

**٧١٩ - عثمان بن سعيد الدارمي** ئەڵێت : (گەیشتین بە شێخەکانمان لەسەر باوەڕپێبوون و بەڕاستخستنەوەی، نەئەکردەوە لە گێڕانەوەی نەئەکرد، هەتا ئەم کۆمەڵەیە دەرچوون و ڕووبەڕووی ئاثارەکانی رسول الله ﷺ وەستانەوە بە ڕەتکردنەوە، وە بە جددی هەوڵیان ئەدا دژی بووەستنەوە، جا وتیان : چۆن ؟ - واتە سیفەتەکانی الله عز وجل چۆنە -

وتمان : (چۆنیەتیەکەی لە دینەکەماندا لەسەرمان دانەنراوە، وە دڵەکانمان پەی پێ نابەن، وە لە دروستکراوەکانی هیچ شتێک لە ئەو ناچێت هەتا کردەوەیەکی یان سیفەتێکی الله لە کردەوە و سیفەتەکانی دروستکراوەکانی بچێت).

**٧٢٠ - یعقوب بن إسحاق** ئەڵێت : گوێبیستی عثمان بن سعيد الدارمي بووم ئەیوت : (هیچ کەسێک لەم بابەتانەدا ڕۆنەچووە لەوانەی کە باس ئەکران ئیللا کەوت) وە باسی الكرابيسي کرد، (کەوت، تا وای لێهات هیچ باس نەئەکرا، وە کەسێکی حافظ و بەرچاوڕۆشنمان لەگەڵدا بوو، وە سلیمان بن حرب و شێخەکانی بەسرە ڕێزیان لێ ئەگرت، وە هاوڕێم بوو، - واتە : قسە دەربارەی کرا - جا کەوت) .

---

**- السجزي لە (الرسالة إلى أهل زبيد) دا ئەڵێت : (لە سەردەمی ئەواندا زانایانێک هەبوون پێشکەوتوو بوون لە زانستانێکدا، وە شوێنکەوتوویان هەبوو، بەڵام کەوتنە ناو شتێک لە بیدعەوە، یان قەدەر، یاخود تەشەیوع یان ئیرجاء، بەوە ناسران و ئیتر پێگە و پلەیان لەلای ئەهلی حەق دابەزی و کەوتن) .**

**- الصابوني لە (عقيدة السلف وأصحاب الحديث) دا ئەڵێت : (وە خۆیان سەرقاڵ نەئەکرد بەم شتە تازانە لە بیدعەکان کە لەناو موسوڵماناندا دەرکەوتووە و بڵاوبووەتەوە، وە ئەگەر یەکێک لەو بیدعەیانە دەربکەوێت لەسەر زمانی یەکێک لە سەردەمی ئەو پێشەوایانەدا ئەوە هەجریان ئەکرد و بە بیدعەچییان دائەنا و بە درۆیان ئەخستەوە و هەموو خراپەیەک ڕووبەڕووی ئەبوونەوە) .**

**- إبن تيمية له (الإستقامة) دا ئه‌ڵێت : (ئه‌وه‌ی بیدعه‌یه ده‌ربخات واجبه ئینكاری لێ بكرێت، به خیلافی ئه‌و كه‌سه‌ی بیدعه‌كه‌ی ئه‌شارێته‌وه و نایڵێت، وه كاتێک ئینكاریكردن لێی واجب بوو له ئینكاریه‌كه ئه‌وه‌یه هه‌جر بكرێت هه‌تا وازئه‌هێنێت له ده‌رخستنی بیدعه‌كه‌ی**

٧٢١ - يحيى بن أحمد بن زياد ئه‌ڵێت : (له خه‌ودا بینیم وه‌ک بڵێیت كه‌سێک بڵێت : (عثمان خاوه‌ن به‌شێكی گه‌وره‌یه)) .

٧٢٢ - قتادة له ته‌فسیری ئایه‌تی : ﴿ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ (القَصَص : ٧٩) .

ئه‌ڵێت : (ئه‌وه‌ی به‌هه‌شتی بۆ هه‌یه) .

٧٢٣ - الحسن بن صاحب الشاشي ئه‌ڵێت : پرسیارم كرد له أبو داود السجستاني ده‌رباره‌ی عثمان بن سعيد .

وتی : (له ئه‌وه‌وه فێری فه‌رمووده بووین) .

٧٢٤ - محمد بن المنذر ئه‌ڵێت : پرسیارم كرد له أبو زرعة الرازي ده‌رباره‌ی عثمان بن سعيد .

وتی : (ئه‌و پیاوێكه باشی و چاكی له نووسیندا پێدراوه) .

---

**: واته كتێبه‌كانی باش و چاكن و له نووسیندا لێهاتووه .**

٧٢٥ - أبو الفضل الجارودي ئه‌ڵێت : (عثمان بن سعيد پێشه‌وایه‌ک بوو كه شوێنپێی هه‌ڵئه‌گیردرێت له ژیان و پاش وه‌فاتی) .

: خاوەنی دوو هەرە بەناوبانگترین و بەپێزترین کتێبە لە ڕەددانەوەی پەکخەرانی سیفات و جەهمیەکان .

- أبو الفضـل يعقوب بن إسحاق القراب ئەڵێت : (کەسـمان نەبینیوە وەکو عثمان بن سعید بێت، وە ئەویش کەسی نەبینیوە وەکو خۆی بێت .

ئەدەبی وەرگرت لە إبن الأعرابي و، فیقهـ لە أبو يعقوب البويطي و فەرموودەش لە يحيى بن معين و علي بن المديني، وە لەو زانستانەدا پێشکەوت رحمه الله) .

- أبو حامد الأعمشـــي ئەڵێت : (لە فەرموودەواناندا هیچ کەسێکم نەبینیوە هاوشێوەی محمد بن يحيى الذهلي و عثمان بن سعيد و يعقوب الفسوي) .

- أبو عبدالله بن أبي ذهل ئەڵێت : وتم بە أبو الفضـــل القراب : ئایا کەســت بینیوە باشتر بێت لە عثمان بن سعيد الدارمي ؟

کەمێک سەری داخست و وتی : (بەڵێ، إبراهيم الحربي، جارێکیان لە مەجلیسی الدارمي دا بووین عمرو بن الليث ی دەسەڵاتدار بەلایدا تێپەڕی و سەلامی کرد .

الدارمي ـیش وتی : (وعليكم، مسدد بۆی گێڕاینەوە . . . ) .

جگە لە وەڵامدانەوەی سەلامەکە هیچی تری نەوت) .

- السـجزي ئەڵێت : (جا هەرکەسـێک بەدوای ڕزگاربوونە لەو کۆمەڵەیە و، سـەلامەت بوونە کە هەوا و ئارەزووەکان; ئەوە با پێوانەکەی بریتی بێت لە قورئان و ئەثەر لە هەموو ئەو شتانەدا کە ئەیبیستێت و ئەیبینێت، ئەگەر زانا بێت پێیان ئەوە بەراوردی بکات پێیان، وە زۆر تەماشـای کتێبەکانی سـوننەت ـــی ئەوانە بکات کە تێپەڕیون، وەکو أبو داود السجستاني و، عبدالله بن أحمد بن حنبل و، أبو بكر الأثرم و، حرب بن إسماعيل السيرجاني و، خشيش بن أصرم النسائي و، عروة بن مروان الرقي و عثمان بن سعيد الدارمي السجستاني) .

- أبو يعلى الخليلي دەربارەی ئەڵێت : (زۆر بەڕێزە، زانایە بە ئەم بووارە - واتە فەرموودە -، بەراورد ئەکرێت بە البخاري و أبو زرعة و أبو حاتم الرازي) .

- قوام السنة الأصبهاني دەربارەی ئەڵێت : (یەكێكە لە پێشەوایانی دنیا، جێگیرە لە سوننەتدا) .

- إبن تيمية لە باسی وتەی زانایان دەربارەی تەئویلاتی جەهمیەكان بۆ سیفەتەكان ئەڵێت : (وە عثمان بن سعید بە وتەیەک ڕەددی داوەتەوە ئەگەر كەسێكی عاقڵی زیرەک تەماشای بكات حەقیقەتی ئەوەی بۆ دەرئەكەوێت كە سەلەف لەسەری بوون، وە بەهێزی بەڵگەی ئەوان و لاوازی بەڵگەی موخالیفەكانیانی بۆ دەرئەكەوێت) .

- إبن القيم دەربارەی ئەڵێت : (وە دوو كتێبەكەی لە باشترین و بەسوودترینی ئەو كتێبانەیە كە نووسراوە لە سوننەتدا، وە هەموو كەسێک كە بەدوای سووننەتدا ئەگەڕێت و مەبەستی ئەوەیە ئەوە بزانێت هاوەڵان رضي الله عنهم و تابیعیەكان و پێشەوایان لەسەری بوون پێویستە هەردوو كتێبەكەی بخوێنێتەوە .

وە إبن تيمية ئامۆژگاری و وەسیەتی ئەكرد بەو دوو كتێبە بە توندترین ئامۆژگاری و وەسیەت، وە زۆر بە گەورەی ئەزانین، وە لە كتێبەكاندا جێگیركردن و ڕوونكردنەوەی تەوحیدی الأسماء و الصفات ی تێدایە بە عەقڵ و نەقڵ كە لە كتێبەكانی تردا نییە) .

- إبن عبدالهادي دەربارەی ئەڵێت : (یەكێكە لە پێشەواكانی دین و زانایانی موسوڵمانان، پرسیاری لە یحیی بن معین كردووە دەربارەی بارودۆخی پیاوان، وە ئەم زانستەی لێوەی وەرگرت، وە كە ئیمام أحمد و علي بن المديني و جگە لەوانیش لە زانایانەوە، وە كتێبێكی زۆر بەپێز و باشی نووسیوە لە ڕەددی بشر المريسي و شوێنكەوتووە جەهمیەكانی، وە لەم كتێبەدا پەردەی لەسەر جەهمیەكان ڕاماڵی و پیسی و خراپیەكانیانی ڕوون كردەوە، وە وا نازانم لە سەلەفدا هیچ كەسێک كتێبێكی هەبێت لەو بابەتەدا لە كتێبەكەی ئەو باشتر بێت، وە لە كتێبێكی تریشی دەربارەی ڕەددانەوەی هەموو جەهمیەكان، وە كتاب التوحيد ی پێشەوای پێشەوایان محمد بن إسحاق بن خزيمة ئەگەر چی كتێبێكی ناوازەیە لەم بابەتەدا، وە نووسەرەكەی لە پێشەوا گەورەكانی موسوڵمانانە، بەڵام كتێبەكەی الدارمي بەسوودترە لە هەندێک گومانی جەهمیەكاندا، وە الدارمي زیرەكتر و لێهاتووترە لە زانینی مەبەست و وتە و ڕەددانەوەی جەهمیەكاندا) .

وە لە وەسفیدا ئەڵێت : (شيخ الإسلام) .

**- إسحاق بن عبدالرحمن ئەڵێت : (وە هەر کەسێک گەشە بکات بە کتێبەکانی موتەخیرەکان بەبێ لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنە کتێبە بەناوبانگەکانی ئەهلی ســوننە وەکو کتێبی السنة ی عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمد و، السنة ی الخلال و السنة ی اللالكائي و الدارمي و جگە لە ئەوان؛ ئەوە لە سەرلێشێواوی و گومڕاییدا ئەمێنێتەوە) .**

**٧٢٦ - أبو عبدالله محمد بن إبراهيم البوشَنجي** دەربارەی بابەتی (ئیمان هێنـان و تەســلیم بووم بۆ فەرمـان و کەلامی الله و نەهیکردن لە لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتیەکەی) ئەڵێت : (ئەوەی واجبە لەسەر زانایان و موسوڵمانان پەیوەستبوونە بە شوێنکەوتنێکی مامناوەندەوە .

وە ئەو بنچینەیانەی قورئان پێی دابەزیوە و؛ سوننەت پێی هاتووە بکەن بە ئامانج و کۆتـاییەک بـۆ عەقڵەکـان، وە عەقڵەکـان نەکەن بە ئامـانج و کۆتـاییەک بۆ بنچینەکان).

---

**: وتەی (ئەو بنچینەیانەی قورئان پێی دابەزیوە و؛ ســوننەت پێی هاتووە بکەن بە ئامانج و کۆتاییەک بۆ عەقڵەکان) واتە قورئان و ســوننەت بکەن بە ئامانج و کۆتاییەک بۆ عەقڵیان، واتە قورئان و ســوننەت پێش بخەن بەســەر عەقڵدا، وە ئامانجی عەقڵەکە گەیشتن بە قورئان و سوننەت بێت نەوەک شتی پاش ئەوە .**

**(عەقڵەکـان نەکەن بە ئامـانج و کۆتـاییەک بۆ بنچینەکـان) واتە عەقڵی خۆیـان نەکەن بە ئامـانجێک و کۆتـاییەک بۆ ئەوەی قورئان و ســوننەت پێی بگەن، ئەوکات قورئان و ســوننەت ئەکات بە شــوێنکەوتەی عەقڵی خۆی؛ لەجیـاتی ئەوەی خۆی و عەقڵیشی شوێن قورئان و سوننەت بکەون وەکو کۆتاییەک بۆ خۆیان حسابی بۆ بکەن .**

وە ئەڵێت : (لەبەر ئەوەی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ لەوانەیە دوو شــتی لێکچوو جیا بکەنەوە، وە جیاوازی بکەن لە نێوان دوو شــتی کۆکراوە بەپێی عەقڵ لەبەر پەرستش و تاقیکردنەوە) .

---

**: واتە شـــەرت نییە بگەیت بە حیکمەتی هەموو کارەکانی الله عز وجل، ڕاســـتە هەندێک حیکمەتەکەی ڕوونە، بەڵام هەندێکی تر لە ئێمە نادیارە، وە هەندێکیان لە ڕووکەشـــدا تەنها بۆ ئەوە کراوە ببن بە تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان بۆ لەبێژنگدانیان بۆ ئەوەی دەربکەوێت کێ بەڕاستی الله عز وجل ئەپرستێت، هەربۆیە هەرشتێک هات لە قورئان و ســـوننەت بە فەهمێکی صـــحیح مەیدە لە قالبی عەقڵت، وە مەڵێ ئیللا هەر ئەبێت حیکمەتەکەی بزانم، چونکە هەندێک شـــت ڕووکەشـــەکەی تەنها بۆ ئەوەیە ئێمەی پێ تاقی بکرێینەوە، جا لەم حاڵەتانەدا لەجیاتی ئەوەی ســەرسام بین بە عەقڵی پووچی خۆمان؛ ئەبێت بەبیرمان بێتەوە ئێمە بەندەی الله عز وجل ـــین، حەقمان نییە بەســـەر ئەوەی ئاخۆ فەرمانەکانی الله عز وجل چییە و بە عەقڵ پێی بگەین، بەڵکو شوێنکەوتن و جێبەجێکردنی لەسەر ئێمەیە .**

**- البربهاريِ لە (شرح السنة) ـدا ئەڵێت : (وە بزانە رحمک الله، دین لەلایەن الله عز وجل ـەوە هاتووە، لەسەر عەقڵ و بۆچوونی پیاوان دانەنراوە، وە زانستەکەی لەلای الله عز وجل ـــە، وە لەلای پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، هەربۆیە شوێن شتێک مەکەوە بە هەوا و ئارەزووی خۆت لە دین دەربچیت، بەوهۆیەوە لە ئیســـلام دەربچیت، چونکە بەڵگەت نییە، بەڕاســتی رسـول الله ﷺ سـوننەتی بۆ ئوممەتەکەی ڕوون کردووەتەوە، وە ڕوونی کردووەتەوە بۆ هاوەڵانی، وە هەر ئەوان الجماعة ـن) .**

وە **البوشنجي** ئەڵێت : (وە هەرکاتێک شتێک هات بەسەر پیاودا لە جۆرێکی زانست عەقڵی پێی نەگەیشت، یاخود نەفسی لێی هەڵهات، وە تێگەیشتن و زانینی لێی دوورکەوتەوە؛ ئەوە لەویادا ئەوەستێت، وە دان ئەنێت بە بێتوانایی لە پەیبردن بە زانســـتەکەی، وە لە خـۆهـیلاککـردن بـۆ بەدواداچوون بەدوای چیەتـی و زانینەکەیدا.

وە بزانێت الله عز وجل و رسـول الله ﷺ ئەگەر هۆكاری ئەو ڕووداوە دەربخەن و، سەبەبەكەی ڕوون بكەنەوە، وە مەبەستەكەی لە شوێنی خۆیەوە ڕوون بكەنەوە ئەوە عەقڵەكانمان پێی ئەگەیشت).

- لە **(المصنف لابن أبي شيبة)** ـدا عبدالرحمن بن أبزیٰ ئەڵێت: **باوكم وتی: (لە كتێبی الله ئەوەی ڕوون بوویەوە بۆت ئەوە كاری پێ بكە، وە ئەوەش كە لێی تێنەگەیشتیت ئیمانی پێ بهێنە و بیسپێرە بەوەی كە ئەزانێت).**

وە **البوشنجي** ئەڵێت: (خۆ ئەگەر هەموو ئەو حوكمانەی لەلایەن الله عز وجل ـەوە هاتوون، وە ئەوانەی هاتوون دەربارەی فەرمانكردن بە پەرستنی; بە ڕوونكراوەیی بهاتنایە و هۆكارەكانیان ڕوونكراوەبوویایە ئەوە نەئەبوون بە تاقیكردنەوە بۆ بەندەكان، بەڵكو تاقیكردەوە قورسەكان و بەڵا توندەكان لەو فەرمان و فەرزانەدایە كە هۆكارەكانی ناتوانرێت بزانرێت; بۆ ئەوەی بەندەكان تەسلیم بن پێی و لەوێدا بەهۆی ئیمان هەبوون پێیەوە بوەستن.

خۆ ئەگەر بەو شێوەیە نەبوویایە كە باسمان كرد ئەوەی كە مێشك و فیكرمان بۆی ئەچوو ئەوەبوو واجبە لە هەموو ئەوەدا كە رسول الله ﷺ پرسیاری لە پەروەردگاری عز وجل ئەكات وەڵامی بداتەوە، وە دەوای خۆی دابەزێنێتەسەری بۆ ئەوەی خەڵكی زانستیان پێی زیاد بكات، وە دروستكراوانی تێگەشتنیان پێی زیاد بكات، وە پێمان وا نەئەبوو شتەكە بەو جۆرە بێت **- واتە بەو جۆرەی كە لە سەرەتای قسەكانیدا ئاماژەی پێدا -**

پرسیاریان كرد لە رسول الله ﷺ، رسول الله ـش ﷺ پرسیاری كرد لە پەروەردگاری دەربارەی ڕۆح، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، الله عز وجل فەرمووی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ **(الإسراء: ٨٥)**.

وه هەر لەســەر ئەوە پەروەردگارمان ســبحانه وتعالى جیاوازی كردووه له شــەریعەت و; نیشــانەی دین و فەرز و عیبادەتەكانی ئوممەتەكانی پێشــووتردا، ئەوەی لەسـەر ئوممەتێک حەرامی كردووه لەسـەر ئوممەتێكی تر حەڵاڵی كردووه، وه ئەوەی لەســەر ئوممەتێک حەرامی كردووه بۆ ئوممەتێكی تری حەڵاڵ كردووه، وه ئەو شتەی بە مەكروهـ داناوه كه ڕێگەی پێداوه بۆ جگە لە ئەوان .

بابەتەكە بە هەمان شــێوەیە لەوەدا كە دایبەزاندووه لە كتێبەكانیدا، وه جیاوازی كردووه لە نێوان حوكمەكانیدا وەكو التوراة و الإنجیل و الزبور و الفرقان و صحف ـــی ئەو پێغەمبەرانەی تێپەڕین علیهم السلام، بۆ ئەوەی ئەو كەسەیان كە ڕێنمونی كراوه تەســلیم ببێـت بە فەرمـان و نەهیەكەی، وه ئەو كەســەیـان كە شكستخواردووه پشتی تێ بكات لەبەر جیاكردنەوەی دوو شتی پێكەوە كۆبووەوە، وه لەبەر كۆكردنەوەی دوو شتی جیاواز .

وه بزانن ســەلامەتی و پارێزراوی لەوەدا كە لەســەریان دابەزیوە بریتیە لە شــوێنكەوتن و لاســایی كردنەوە لەوەدا كە فەرمانیان پێ كراوه، وه پشــتكردنە هەوڵدان بۆ زانینی چۆنیەتی ئەو شتەی بۆیان دەرنەخراوە، وه لە زیادەڕۆییكردن و خۆهیلاككردن بۆ بەدەســتهێنانی كۆتایی و مەبەســتەكانیان لەپێناو گەیشــتن بە نزیكترین خاڵی هاتنەژوورەوە، لەكاتێكدا ئەوە هەرگیز پێی ناگەیرێت و، چونكە لەژێر هەموو ڕوونكردنەوەیەک ڕوونكردنەوەیەكی دیكە هەیە، وه لە سەروو هەموو هەڵواسراوێكی ناڕوونەوە هەڵواسراوێكی لەو ناڕوونتر هەیە .

جا مادەم بابەتەكە بەو جۆرەیە واجب بریتیە لە وەســتان لەو شــتەیدا كە نادیارە .

وه لەبەر ئەوەشە الله عز وجل ستایشی ڕۆچوانی لە زانستدا كردووه بەوەی كاتێک بابەتەكە گەیشت بە شتێک كە نایزانن ئەوە ئیمانی پێ ئەهێنن و ئەیسپێرن بە الله عز وجل .

وه لەبەر ئەو هۆكارە الله جل جلاله تانەی لەو كەســانە داوە كە زیادەڕەوی ئەكەن لەو شــتەدا كە زانینی شــتەكەیـان لێ گیراوەتەوە، وه هەواڵەكەیـان لێ

هەڵگێراوە، فەرموویەتی : | هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ | (آلِ عِمرَان : ٧) .

وە لەبەر هەندێک لەوانەی باســمان کرد خەلیفە هیدایەتدراوەکان توونـد بوون لەســەر کەســانێکی خاوەن دەمەدەمێ و جیدالکردن لە دیندا، وە لەســەر ئەوانەی خاوەن ململانێ و ناکۆکی بوون لە ئیســلام و ئیماندا، وە لە هەرکاتێکدا دانەیەک لێیان دەرکەوتبێت سەرکوتیان کردووە و باسوخواسیان کپ کردووەتەوە و ســزای خۆیان داوە، جا هەیانبوو - ئەو شــتانەی پێیان کرا - گەیاندنیە کۆتایی و وازلێهێنان، وە هەیانبوو تووشــی کونجی زیندانی کرد، لەبەر ترســان بەرامبەر دین لە فیتنەکەی، وە بۆ ئاگادارکردنەوەی موسوڵمانان لە فێڵی گومانەکانی .

وەک چۆن ئیمامی ڕێمونی کراو عمر بن الخطاب رضــي الله عنه کاتێک صبیغ پرسیاری لێکرد دەربارەی : | وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا | (الذَّارِيَات : ١) و هاوشێوەکانی، بەڕێی کرد بۆ شــام - صــواب ئەوەیە ناردیەوە بۆ بەســڕە - و لە خەڵکی قەدەغە کرد دابنیشن لەگەڵی ) .

**- لە (الشريعة) دا السائب بن يزيد ئەڵێت : هاتن بۆ لای عمر بن الخطاب رضي الله عنه وتیان : ئەی پێشــەوای ئیمانداران، ئێمە پیاوێکمان بینی پرســیاری ئەکرد دەربارەی لێکدانەوەی قورئان .**

**ئەویش فەرمووی : (ئەی پەروەردگارم بیخە ژێر دەستم) .**

**ڕۆژێک عمر رضـي الله عنه خواردنی بەیانی ئەدا بە خەڵکی پیاوێک هات پۆشـاک و عەمامەیەکی لەبەردا بوو، نانی بەیانی خوارد و کاتێک تەواو بوو وتی : ئەی پێشــەوای ئیمانداران | وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا * فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا | (الذَّارِيَات : ١ - ٢) چییە ؟**

**عمر فەرمووی : (تۆ ئەو کەسەیت ؟!) .**

هەســـتا بۆی و قۆڵی بۆ هەڵماڵی و لێیدا هەتا عەمامەکەی کەوت و فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی عمر ـــی بەدەستە بەس بمبینیایە سەرت تاشیوە ئەوە ئەمدا لە ملت، جلەکانی بکەنەوە بەری و بیخەنە ســەر ئاژەڵێک و پـاشـــان بیبەن هەتـا ئەیگەیەننەوە شــارەکەی خۆی، پاشــان با کەســێک وتار بدات بڵێت : صــبیغ هەوڵی بەدەستهێنانی زانستی دا و هەڵەی کرد) .

صبیغ گەورەی قەومەکەی بوو، جا بە بێڕێزی مایەوە لەناو قەومەکەیدا هەتا مرد.

- لە (شرح أصول إعتقاد لــ اللالكائي) ــدا قطن بن كعب ئەڵێت : گوێبیستی پیاوێک بووم لە بني عجل پێی ئەوترا فلانی کوڕی زرعـة ئەیگێڕایەوە لە بـاوکی وتی : (صــبیغ بن عسـل ـــم بینی لە بەسرە وەکو ئاژەڵی گەڕ وابوو، ئەهات بۆ لای حەلقەی دانیشتنەکان، هەرکاتێک دابنیشتایە لەلای حەلقەیەک هەڵئەستان و بەجێیان ئەهێڵا، خۆ ئەگەر دابنیشـتایە لەلای کۆمەڵەیەکدا کە نایناسـن ئەوە کەسـانی حەلقەکەی دیکە هاواریان لێ ئەکردن : فەرمانی پێشەوای ئیمانداران) .

- نصر المقدسي لە (مختصر الحجة) ــدا ئەڵێت : (ئەم توندبوونە لە هاوەڵانەوە رضــي الله عنهم، وە قەدەغەکردنی قســەکردن لەم بابەتانە و هاوشــێوەکانیدا ئەگەرچی وەڵامەکانیشی لەلای خۆیان زانراوە و لە حوکمەکانی تێگەیشتوون; بۆ یەکلاییکردنەوەی بابەتەکە و بڕینی پرسیارە، بۆ ئەوەی سەرنەکێشێت بۆ شتێک کە فەرمانی پێ نەکراوە لە شـــەریعەتدا، وە شـــتەکە فراوان نەبێت بڕواتە ناو ئەو شـــتانەش کە موخالەفەی ئەوە ئەکات الله عز وجل و رسول الله ﷺ فەرمانیان پێ کردووە .

رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (دەمەدەمەکردن لە قورئاندا کوفرە) .

ئەوەش - واتە ئەوەی هاوەڵان کردیان بەرامبەر صبیغ - بنبڕکەرترە بۆ ئەو شتەی ترس هەیە لێی لە پاش ئەوە، وە بەڕاســتی کەوتینە ناو ئەوەی کە لێی ئەترســان، وە لە ناوەندی ئەوەداین کە ئاگاداریان دەربارەی دا، چونکە زۆربەی ئەو کەســانەی ڕاوی خەڵکی ئەکەن و قاڵ ئەبنەوە لە ســەرگەورەیی و پێشــەوایەتی لە دیندا قســە ئەکات لەوەدا کە ئینکاریان لێ کردووە، وە پرســیار ئەکات دەربارەی ئەوەی ترســاون لێی و توندبوون لەسەری و ئاگاداریان داوە دەربارەی، بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی تووشی هەوا و ئارەزووی ئەکات و هەڵی ئەدات - ـــە ناو جەهەننەم -، وە وازهێنان لە شـــتێک کە لەپێشـتره، وە موخالەفەکردنی شـەریعەت، وە بۆ چوونە ناو شـتێک کە ڕێخۆشـکەرە بۆ

**باتڵ و وازهێنان لە حەق، وە بەهۆی خۆسەرقاڵكردنیان بەوەی پەیوەندی نییە بەوانەوە ئەوەیان لەدەست چوو كە پەیوەندی هەیە پێیانەوە، فإنا لله وإنا إليه راجعون) .**

وە **البوشنجي** ئەڵێت : (وە ئەوەی علي بن أبي طالب رضي الله عنه كردی بە عبدالله بن سبأ، ناردی بۆ المدائن .

وە پیاوێک لە ئەهلی الكلام هات بۆ لای محمد بن سیرین وتی : ڕێگەم بدە فەرموودەیەكت بۆ بگێڕمەوە .

وتی : (نایكەم) .

وتی : ئایەتێكت بۆ ئەخوێنمەوە لە كتێبی الله .

وتی : (ئەوەش نا) .

دەربارەی ئەوە بە محمد بن سیرین وترا، ئەویش وتی : (دڵنیا و بێخەم نەبووم لەوەی باسی شتێكم بۆ بكات زیان لە دڵم نەدات) .

بەڕاستی الله عز وجل ڕوونی كردووەتەوە بۆ بەندەكان ئەوەی پێویستیانە لە دنیا و ئاخیرەتیاندا، وە ڕێبازی ڕزگاری و لەناوچوونی بۆ ڕوون كردوونەتەوە، فەرمانی كردووە و نەهی كردووە، حەڵاڵی كردووە و حەرامی كردووە، فەرزی كردووە و بە سوننەتی داناوە، جا ئەوەی فەرمان بە بەندەكان كراوە تەسلیمی ئەبن بە بەجێگەیاندنی فەرمانەكە و كاركردن پێی، وە ئەوەی نەهیان لێ كراوە تەسلیم ئەبن بە وازهێنان لە ئەنجامدانی .

جا هەركاتێک دەرچوون لە ڕووكەشی ئەوەی فەرمانیان پێكراوە و نەهیان لێكراوە تا بگەن بە ئەوپەڕی زانستی ئەمر و نەهیەكەی; ئەوە دڵنیایی و بێخەمی نییە بۆیان لە سەرلێشێواوی و زاڵبوونی گومان بەسەر دڵ و تێگەیشتنیدا .

وە لەبەر ئەوەی عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرموویەتی : (تۆ وتەیەک بۆ کۆمەڵەیەک ناگێڕیتەوە کە عەقڵیان پێی ناگات ئیللا بۆ هەندێکیان ئەبێت بە فیتنە) .

وە پرسیارکەرێک پرسیاری کرد لە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەربارەی ئایەتێک لە کتێبی الله .

فەرمووی : (چ شتێک بێخەمت ئەکات لەوەی هەواڵت پێ بدەم دەربارەی و کافر ببیت) .

وە أیوب السـختیاني ئەڵێت : (شـتێک بۆ خەڵکی مەگێڕنەوە نەیزانن بەو هۆیەوە زیانیان پێ بگەیەنن) .

وە ئەوەی الله عز وجـل گرتوویەتیەوە لە پێغەمبەرەکەی محمـد ﷺ لە ڕوونکردنەوە دەربارەی هەندێک لەو شـتانەی پرسـیاری لێ کردووە ئیللا زانیویەتی ئەو لێگرتنەوەیە بەخشـین و پێـدانە، وە زانیویەتی لێگرتنەوەکە بەسـوودتر و سەلامەتترە بۆ ئوممەت بۆ دینەکەیان و عاقیبەتیان .

خۆ ئەگەر وا نەبوویایە ئەوکات ئەو موشـریک و ئوممەتە کافرانەی داوای نیشانە و شتە عەجیبەکانیان کردووە لە پێغەمبەرەکانیان خاوەن عوذر ئەبوون، وە پێغەمبەران زەمکراو ئەبوون لەبەر وازهێنانیـان لە فریاکەوتن و بەدەمەوەچوونی ئوممەتەکـانیـان، بەڵام داوای هەر نیشـانەیەکیـان کردبێـت لە سـەرو ئەوەوە نیشـانەیەکی تر هەیە، هەتا هی وایان تێدا بوو گەیشـتن بەوەی داوای ئەوە بکەن پەروەردگاریان ببینن .

وە هەنـدێکیـان داوایـان لە پێغەمبەرمـان کرد لە بەڵگە بۆ ئاینەکەی لە هەڵقوڵانی کانی و ڕووبارەکان، وتیان : ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا﴾ (الإسراء : ٩٠) .

خۆ ئەگەر ئەو بابەتە بەپێی مێشـکی مرۆڤەکان بوویایە ئەوەی وایان ئەبینی گرتنەوەی بەڵگە لێیان دەربارەی ڕاسـتگۆیی ئەوەی پێغەمبەرانیان پێی هاتوون لە

ســـوود و مەســـڵەحەتی ئەوان نییە، چونکە ڕوونکردنەوەی زیاتر بۆ ڕوونکردنەوە بریتیە لە هێورکردنەوەی نەفس لە هەڵهاتنی، وە ئارامی دڵەکان و باشـــتربوونی ئیمان .

بەڵام الله ئەوەی لێ گرتنەوە کە داوایان کرد، چونکە لەسەرو ئەوەی داوایان کردووە ئایەتانێک هەن ناگەن بە کۆتاییەکەی و لێی تێناگەن، خۆ ئەگەر وابوویایە ئەوە ئیمان لەســـەر هیچ کەســـێک واجب نەئەبوو هەتا زانیاریی دەربارەی الله عز وجل ئەگەیشت بەوەی کە الله خۆی ئەیزانێت .

بەڵام الله عز وجل لەوەی کە ڕێنمونی ئەکات و گومڕای ئەکات، وە لەوەی کە ڕوونی ئەکاتەوە و دایئەشـــارێت، وە لەوەی کە ڕێگەی پێ ئەدات و قەدەغەی ئەکات; هیچ بەندەیەک عوزری نییە پرســـیاری دەربارە بکات، بەڵکو هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ الله عز وجل خۆی، بۆ ئەوەی بەندەکان لە هەموو کاتێکدا تەسلیمی حوکمەکانی ببن، وە بەدواداچوونی بۆ نەکەن بە پرســـیارکردن دەربارەی چۆنیەتیەکەی، وە پرسیار نەکەن دەربارەی مەبەست و ئامانجی تیایدا .

یونس بن عبدالأعلى ئەگێڕێتەوە لە الشـــافعي رحمە الله وتوویەتی : (هیچ تاوانێک نییە بەندە پێی بگاتەوە بە الله لە پاش شـــیرک گەورەتر بێت لە ئەم الکلام ە) .

یونس بن عبدالأعلى ئەڵێت : وتم بە الشافعي : اللیث بن سعد ـــی هاوەڵمان وتی : (ئەگەر ببینم خاوەن هەوا و ئارەزوو بەســـەر ئاودا ئەڕوات ئەوە لێی نزیک مەبەرەوە) .

الشـــافعي وتی : (کەمی وتووە، ئەگەر ببینم بە هەواشـــدا ئەفڕێت هەر لێی نزیک نابمەوە) .

وە یونس لە الشافعي ـــەوە باس ئەکات وتوویەتی : (مەزهەبی من دەربارەی ئەهلی الکلام مەزهەبی عمر ـ رضي الله عنه دەربارەی صبیغ، بدرێت لە سەریان و بەناو شاردا بگەڕێندرێن) .

٧٢٧ - محمد بن إسحاق بن خزيمة ئەڵێت : (هەتا محمد بن إبراهيم البوسنجي لەسەر ڕووی زەوی بێت فتوا نادەم) .

٧٢٨ - محمد بن عقيل بن الأزهر ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای المزني، پرسیاری لێکرد دەربارەی شتێک لە الكلام .

وتی : (من ڕقم لەمەیە، بەڵکو ڕێگری لێ ئەکەم) .

٧٢٩ - المزني ئەڵێت : (قورئان وتەی الله عز وجل ــە و غير مخلوق ــە، وە هەرگیز نزیک نەبوومەتەوە لە الله بە جگە لەمە، وە هەرکەسێک بڵێت مخلوق ــە ئەوە کافرە، وە الشافعي ڕێگری ئەکرد لە الكلام) .

٧٣٠ - أحمد بن محمد بن عمر المنكدري ئەڵێت : گوێبیســتی أبو إبراهيم إســماعيل بن يحيى المزني بووم لەو نەخۆشــیەی کە تیایدا وەفاتی کرد وتی : (گەردنی هەموو خەڵکیم ئازاد کردووە تەنها ئەوە نەبێت باســی ئەوەی کردووە من قسەم کردبێت دەربارەی شتێک لە قورئان بە لفظ و وقف) .

٧٣١ - عبدالرحمن بن أبي حاتم ئەڵێت : (باوکم و أبو زرعة نەهیان ئەکرد لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی الكلام و تەماشاکردنی کتێبی ئەهلی الكلام، وە ئەیانوت : (هەرگیز هاوەڵی الكلام ســەرفراز نابێت)، وە ئەهلی گومان و بیدعەیان هەجر ئەکرد، وە توند بوون دەربارەیان بە توندیەکی زۆر، وە ڕێگریان ئەکرد لە دانانی کتێب بە ڕەئی بەبێ ئاثار، وە فەرمانیان ئەکرد بە هەجر کردنیان) .

٧٣٢ - إبراهيم الحربي ئەڵێت : (ئەگەر لەلای پیاو (فڵانە کەس لە فڵانە کەسەوە) نەبوو ئەوە هەردوو دەستی لێ بشۆ) .

**:واتە ئێمە تەنها شوێنکەوتەی ئەثەری پێش خۆمانین و حساب بۆ بۆچوون و ڕەئی داهێندراو ناکەین .**

**٧٣٣ - الحسن بن شجاع المكي** ئەڵێت : (گەیشت بە یەکێکە لە زەندیقەکان کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (فریشتە باڵی بۆ فێرخوازی زانست ڕائەخات بەهۆی ڕازیبوونی بەوەی کە ئەنجامی ئەدات) .

زەندیقەکە وتی : پێ ئەنێم بە باڵی فریشتەکاندا .

ناعلەکانی هێنا و بزماری ئاسنینی پیادا چەقاند، وە بەیانی ڕۆیشت بۆ مەجلیسی مالک بن أنس، وە پێی بە هێزەوە ئەنا بە زەویدا و ئەیوت : باڵی فریشتەکان ئەشکێنم .

سەرسمێکی دا و کەوت، نەیتوانی هەڵبستێتەوە، جا هەڵگیرا و برایەوە بۆ ماڵەوەی، قاچی تووشی ئازار بوو تا وای لێ هات بڕدرانەوە) .

سفیان ئەڵێت : (من بینیم وەکو ئاسک ڕێی ئەکرد، دواتر لەجێگەدا کەوت هەتا مرد) .

**٧٣٤ - أبو جعفر الترمذي** ئەڵێت : (پێغەمبەرم بینی لە خەودا وتم : ئەی رسول الله بۆچوونی ئەبو حەنیفە وەربگرین ؟

فەرمووی : (نەخێر) .

**٧٣٥ - أبو علي محمد بن طاهر** ئەڵێت : (لە خەودا أبو حامد الشرقي م بینی بەسوار ئاژەڵێکەوە، وتم : ئەی أبو حامد، بە چ شتێک بەرز کرایتەوە ؟

وتی : (بە فەرموودە بەرزکرامەوە، وە سوودم لەوە بینی) .

- له (المنامات لإبن أبي الدنيا) ـــدا عبدالوهاب بن يزيد الكندي ئەڵێت : أبو عمر الضرير م بینی له خەودا وتم : الله چی لێ کردیت ؟

وتی : (لێم خۆش بوو و ڕەحمی پێ کردم) .

وتم : کام کردەوە بینیتەوە باشترینە ؟

وتی : (ئەوەی ئێوە لەسەرینی له سوننەت و زانست) .

وتم : کام کردەوە بینیتەوە خراپترینە ؟

وتی : (ئاگاداری ناوەکان بە) .

وتم : ناوەکان چین ؟

وتی : (قەدەری و موعتەزیلی و مورجیئە)، وە هاوەڵانی هەوا و ئارەزووی ژمارد .

**٧٣٦ - الحسن البصري** ئەڵێت : (ئەو کەسەی فەرموودە بەدەستبهێنێت مەبەستی پێی ڕەزامەندی الله بێت ئەوە باشترە لەوەی کە خۆر بەسەریدا هەڵهاتووە) .

**٧٣٧ - محمد بن إسحاق بن خزيمة** ئەڵێت : (هەتا أبو حامد الشرقي لەژیاندا بێت هیچ کەسێک ناتوانێت درۆ هەڵبەستێت بۆ رسول الله ﷺ) .

---

- الخطيب البغدادي له (تاريخ بغداد) دەربارەی ئەڵێت : (أحمد بن محمد بن الحسن، أبو حامد ناسراو به إبن الشرقي، ثقة و ثبت و حافظ و مُتقِن بوو .

وە إبن خزيمة تەماشای أبو حامد إبن الشرقي ـــی کرد و وتی : (ژیانی أبو حامد ڕێگری ئەکات له خەڵکی و درۆکردن بەدەم رسول الله ـەوە ﷺ) .

٧٣٨ - جعفر بن محمد بن مغلس ئەڵێت : (بۆچوونی ئەبو حەنیفە ـــــم نەچواندووە ئیللا بە پەتی ســـحارة نەبێت، ئاوا درێژ ئەکرێت زەردە، دواتر دێتەوە شوێنی خۆی ئەبێتەوە بە سەوز).

---

: سحارة جۆرە یاریەکە چەند پەتێکی هەیە، وە ڕووی لێکچوونی نێوان ئەو یاریە و بۆچوونی ئەبو حەنیفە ئەوەیە کە بۆچوونی ئەبو حەنیفە جێگیر نییە و ئەســڵێکی نییە، وە بەردەوام ئەگۆڕێت .

٧٣٩ - الجنيد بن محمد ئەڵێت : (کەمترینی ئەوەی لە الکلام ـدایە کەوتن و نەمانی گەورەیی پەروەردگارە لە دڵدا، وە دڵ کاتێک داماڵدرا لە گەورەیی و ترسی الله عز وجل ئەوە داماڵدراوە لە ئیمان).

٧٤٠ - أبو علي الكرجي ئەڵێت : (برایەکم هەبوو هـاوەڵایەتی ئەکردم لە خوێندنەوەی قورئان، وە فەرموودەیانێکی زۆری نووســی، پاشـــان مرد، بینیم لە شوێنێکی تاریکی ڕەشدایە، ڕووخساری ڕەش بوو .

پێم وت : پەروەردگارت چی لەگەڵ کردیت ؟

وتی : (وەستاندمی لەپێش خۆی و وتی : لە دنیا دەرچوویت و منت نەناسی).

---

**: ئەکرێت مەبەست لە (منت نەناسی) بریتی بێت لە نەبوونی ئیخلاص بۆ الله عز وجل .**

**وە ئەکرێت مەبەست لەوە بێت الله عز وجل ـــی نەناسیبێت بە ئەو سیفاتانەی کە لە قورئان و ســوننەتدا هاتوون، بەڵکو ماناکانی گۆڕیوە و تەحریف و تەئویلی کردووە باوەڕی بە حەقیقەتی ســیفەتەکانی نەبووە، هەربۆیە بەم شـێوەیە پەروەردگارێکی تر ئەپەرســتێت جگە لە الله عز وجل، چونکە الله عز وجل خاوەنی چەندین ســیفەتی**

تایبەت بە خۆیەتی، وە پەرسـتراوی موتەکەلیمەکانیش خاوەنی چەندین تایبەتمەندی خۆیەتی .

- أبو سعيد الدارمي لە (الرد على الجهمية) ـدا لە وەسفی پەرستراوی سەلەفی سالّح و شوێنکەوتووەکانیاندا ئەڵێت : (جا ئەو الله ـی الرحمن و الرحیم ـە، نزیك و وەڵامدەرەوە و قسەکەرە، وە خاوەن ویست و ئیرادەیە و هەرچی بویێت ئەیکات، یەکەمە لە پێش هەموو شتێکەوە و کۆتایە لە دوای هەموو شتێکەوە، کاروبارەکە هەر بۆ خۆیەتی لە پێشدا و لە دواتریش، وە دروستکراوەکان و کاروباریش هەر هی خۆیەتی، موبارەکە الله ی پەروەردگاری جیهانیان .

وە ناوی جوانی هەیە، هەموو ئەوەی ناو ئاسمانەکان و زەوی بە پاك و بێگەرد ڕایئەگردن وە ئەو دەسەڵاتدار و دانایە، دائەخات و ئەکاتەوە، وە قسە ئەکات و ڕازی ئەبێت و، تووڕە و بە کینیش ئەبێت، وە خۆشی ئەوێت و لێ بە بوغز و ڕق ئەبێت، وە پێئەکەنێت، وە فەرمان و نەهی ئەکات، خاوەن ڕووخساری بەڕێز، وە بیستنی بیسەر، وە بینینی بینەر و، قسەی ڕوون و ئاشکرا و، دوو دەست و دوو مشت و، قودرەت و دەسەڵات و، مەزنی و زانستێکی ئەزەلّی یە .

هەر ئاوا بووە و هەر ئاواش ئەبێت، بەرز بووەتەوە بۆ سەر عەرشەکەی جا جودابووەتەوە لە دروستکراوەکانی، هیچ شاراوەیەکی ئەوان لای ئەو ناشاردرێتەوە، زانستەکەی چواردەوریانی گرتووە وە بینینەکەی لەسەریان جێبەجێ بووە، هیچ شتێك وەکو ئەو نییە وە ئەو بیسەر و بینەرە .

جا ئێمە بەم پەروەردگارە ئیمانمان هێناوە، وە ئەو ئەپەرستین و نوێژی بۆ ئەکەین و سوجدەی بۆ ئەبەین، جا هەر کەس بەندایەتیەکەی بۆ پەرستراوێک بێت کە جیاواز لەم سیفاتانەی هەیە، ئەوا ئەو کەسە بێجگە لە الله ئەپەرستێت، وە پەرستراوەکەی خوا نییە کوفری پێ ئەکەین) .

هەربۆیە پێشەوایانی سوننەت ئەڵێن تەحریفکاران و پەکخەرانی سیفەت هیچ ناپەرستن، بەڵکو وەسفی ئەکەن بە وەسفانێک کە تەنها وەسفی نەبوو و هیچی پێ ئەکرێت، بۆنمونە ئەوترێت نە لە ناوەوەی جیهانە وە نە لە دەرەوەی جیهانە!

- لە (خلق أفعال العباد) ـدا عبدالله بن المبارک ئەڵێت : (جەهمیەکان هیچ ناپەرستن، هەموو قەومێک ئەزانن چی ئەپەرستن تەنها جەهمیەکان نەبێت) .

- لە **(الإبانة الكبرى)** ـــــدا يزيد بن هارون ئەڵێت : **(ئەوانە كافرن هيچ ناپەرستن) .**

- إبن تيمية لە **(منهاج السنة)** ـــدا ئەڵێت : **(وە بە هەمان شێوە جەهميەكان و موعتەزيلەكانى ديكەش نەفيكارى سـيفەتەكان بەهۆى ئەوەى شـتێكيان جێگير كرد - واتە وەكو پەرستراو - كە وەسـف ناكرێت بە شـتێك لە سيفەتەكان; لەلاى پێشـەوايان ئەوانەى كە حەقيقەتى وتەكەيانيان ئەزانى تەوحيدەكەيان بريتيە لە (پێويســتيكارى نەفيكردنى دروســتكەر)، خۆ ئەگەر جێگيريشــى بكەن ئەوە ئەوان لە دژبەيەكيدان، چونكە دوو شــتيان پێكەوە كۆكردووەتەوە كە يەكيان پێويســتيكارى نەفيكردنيەتى، ئەوى ديكەش پێويستيكارى جێگيركردنى .**

**لەبەر ئەمە پێشەوايانى ئيسلام وەسفيان كردن بە پەككخستن، وە وەسفيان كردن بەوەى كە فێڵ ئەكەن و هيچ جێگير ناكەن، وە هيچ ناپەرستن، وە نزيك لەو وەسـفانە كە هەيە لە وتەى زياتر لە يەكێك لە پێشەوايانى ئيسلام) .**

- إبن تيمية لە **(مجموع الفتاوى)** ـــدا ئەڵێت : **(ئەوەى كە ناسراو و بەناوبانگە لە مەزهەبى ئيمـام أحمـد و پێشـــەوايـانى ســوننەت بە گشــتى بريتيە لە تەكفيركردنى جەهميەكان، ئەوانەش پەككخەرانى سيفەتەكانى الرحمن ـــن، وتەكەيان بە ڕاشكاوە لە دژيەتى ئەوەى كە پێغەمبەران پێى هاتووە لە كتێبەكان، وە ڕاســتى وتەكەيان بريتيە لە نكۆڵيكردنى دروســتكار، تيايدايەتى لە نكۆڵيكردنى پەروەردگار، وە نكۆڵيكردنى ئەوەى دەربارەى خۆى هەواڵى داوە لەسەر زمانى پێغەمبەرانى عليهم السلام) .**

- إبن القيم لە **(مدارج الســالكين)** ـــــدا ئەڵێت : **(پەككخســتن خراپترە لە شـەريكدانان، چونكە پەككخەر نكۆڵيكارە لە ذات ـــى الله، ياخود لە كەماڵێتيەكەى، وە ئەوەش بريتيە لە نكۆڵيكردن لە حەقيقەتى پەرستراوێتى .**

**چونكە ئەو ذات ـــە نە ئەبيستێت و، نە ئەبينێت و، نە قسـە ئەكات و، نە ڕازى ئەبێت و، نە تووڕە ئەبێت و، هيچ كارێك ناكات، وە نە لە ناوەوەى جيهانە وە نە لە دەرەوەيەتى، وە نە پەيوەستە بە جيهانەوە وە نە جيايە لێى، وە نە لە سەرەوەى عەرشە وە نە لە خوارەوەى، وە نە لە دواوەيەوەيەتى وە نە لە پێشيەوە، وە نە لە لاى ڕاستيەتى وە نە لەلاى چەپ; يەكسانە لەگەڵ هيچێتى و نەبووندا .**

وە کەسێک کە هاوەڵی داناوە بۆ الله دانی ناوە بە الله و سیفەتەکانیدا، بەڵام لەگەڵیدا کەسی تری پەرستووە، جا لە ڕووی ذات و سیفەتەکانەوە باشترە لە پەکخەر) .

پەکخەرەکان ئەگەرچی بە دەمیشیان کەلیمەی تەوحید (لا إله إلا الله) بڵێن؛ ئەوە پێچەوانە و موخالیفی ئەهلی تەوحیدن لەو پەرستراوەی کە ئەیپەرستن، وەک چۆن لە (مناقب الشافعي) ـدا ئیمامی الشافعي کاتێک باسی جەهمیەکی وەکو إبراهيم بن إسماعيل بن علية ـی کرد وتی : (من موخالیفی ئەوم لە هەموو شتێکدا، وە لە ئەو وتەیەیدا کە ئەڵێت لا إله إلا الله، من بەو شێوەیە ناڵێم کە ئەو ئەڵێت، من ئەڵێم : هیچ پەرستراوێک نییە جگە لەو الله ـیە نەبێت کە لە پشت پەردەوە قسەی کردووە لەگەڵ موسى ـدا، وە ئەویش ئەڵێت : ئەو الله ـیەی وتەیەکی دروست کردووە وای کردووە لە موسى بیبیستێت لە پشت پەردەوە) .

ئێمەش پەروەردگارێک ئەپەرستین جیاوازە لەوەی ئەشعەریە جەهمیەکان، الله عز وجل ـی ئێمە لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی، پەرستراوەکەی ئەوانیش نە لە دەرەوەی جیهانە نە لە ناوەوەی، نە لەسەر عەرشە نە لە خوارەوەی .

٧٤١ - محمد بن إسحاق بن خزيمة ئەڵێت : (هەرکەسێک نەڵێت الله لە ئاسمانە لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە، ئەوە ئەدرێت لە ملی، وە کەلاکەکەی فڕێئەدرێتە زبڵخانەیەکی دوور لە شار؛ بۆ ئەوەی هیچ کەسێک لە موسوڵمانان و پەیمانپێدراوان ئازار نەچێژن بە پیسی بۆنەکەی) .

---

- الدارمي لە (الرد على الجهمية) ـــدا لە درێژەی باسکردنی هۆکارەکانی تەکفیرکردنی جەهمیەکاندا ئەڵێت : (وە بە کافریان ئەزانین لەبەر ئەوەی نازانن (الله لە کوێیە ؟)، وە وەسفی ناکەن بە (الله لە کوێیە ؟)، وە الله ـــش وەسفی خۆیی کردووە بەوەی لە کوێیە، وە پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی کردووە .

الله عز وجل ئەفەرمووێت : | ٱلرَّحۡمَـٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | (طه : ٥) .

وە ئەفەرمووێت : | وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ | (الأنعام : ١٨) .

وە ئەفەرموویت : ﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ (آلِ عِمْرَان : ٥٥) .

وە ئەفەرموویت : ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ﴾ (المُلْك : ١٦)، وە هاوشێوەی ئەو ئایەتانە .

ئەمانە هەمووی وەسفکردنیەتی بەوەی کە لە شوێنێکە، وە پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی کردووە بە شوێن، بە بەندە ڕەشەکەی فەرموو : (الله لە کوێیە ؟) .

وتی : لە ئاسمان .

فەرمووی : (من کێم ؟) .

وتی : تۆ پێغەمبەری الله یت .

فەرمووی : (ئازادی بکە چونکە ئیماندارە) .

وە جەهمیەکان کافرن پێی، وە ئەمەش لە کوفرە ڕووکانیانە) .

٧٤٢ - سهل بن عبدالله ئەڵێت : (بەردەوام بن و ڕەشـایی بپارێزن لەسـەر سـپیایەتی - واتە حبیر لەسـەر وەرەقە -، چونکە هیچ کەسـێک وازی لە ڕووکەش نەهێناوە ئیللا دەرچووە بۆ زەندیقبوون) .

٧٤٣ - سهل بن عبدالله التستري ئەڵێت : (هەرکەسـێک دنیا و قیامەتی ئەوێت با فەرمووده بنووسێت، چونکە سوودی دنیا و قیامەتیشی تێدایە) .

٧٤٤ - أحمد بن محمد بن الليث ئەڵێت : (سهل بن عبدالله التستري هات بۆ لای أبو داود السجستاني .

وترا : ئەی أبو داود ئەوە سهل بن عبدالله التستري ـە بۆ سەردان هاتووە .

ئەویش پێشوازی لێ کرد و داینیشاند .

سهل پێی وت : (ئەی أبو داود، من پێویستیەکم پێتە).

وتی : (چییە ؟).

وتی : (ئایا بۆم جێبەجێ ئەکەیت ؟).

وتی : (بەپێی توانا جێبەجێی ئەکەم).

وتی : (زمانتم بۆ دەرکە کە فەرموودەکانی رسول الله ــ ﷺ پێ گێڕاوەتەوە تا ماچی بکەم).

ئەویش زمانی بۆ دەرکرد و ماچی کرد).

**٧٤٥ - سهل بن عبدالله** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾ (المائدة : ٢).

ئەڵێت : (لەسەر ئیمان و سوننەت).

وە دەربارەی : ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ﴾ .

ئەڵێت : (کوفر و بیدعە).

**٧٤٦ - أبو عمرو بن نجيد** ئەڵێت : گوێبیستی أبو عثمان الصابوني بووم وتی : (هەرکەسێک سوننەت بکات بە خاوەن دەسەڵات بەسەر خۆیەوە؛ ئەوە بە حیکمەت ئەدوێت و ئەنجامی ئەدات، وە هەرکەسێک بیدعە بکات بە خاوەن دەسەڵات بەسەر خۆیەوە، ئەوە بیدعە ئەڵێت).

وە ئەمەی خوێندەوە : ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ﴾ (النُّور : ٥٤).

**٧٤٧ - أبو محمد المرتعش** ئەڵێت : پرسیار کرا لە أبو حفص النيسابوري : بیدعە چییە ؟

وتی : (سنووربەزاندن لە حوکمەکان و، کەمتەرخەمی و بەکەمتەماشاکردنی سوننەتەکان و، شوێنکەوتنی بۆچوون و هەواوئارەزووەکان و، وازهێنان لە شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوە).

٧٤٨ - **محمد بن الحسين** ئەڵێت : پێم گەیشتووە یەکێک لە هاوەڵانی أبو علي الجوزجاني پرسیاری لێ کردووە : ڕێگا بۆلای الله کامەیە ؟

وتی : (ڕاسترین و ئاوەدانترین و دوورترین ڕێگا لە گومان بریتیە لە قورئان و سوننەت وتە و کردەوە و ویست و دڵ و نیەت، چونکە الله تعالى فەرموویەتی : ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ﴾ (النُّور : ٥٤).

وە پرسیاری لێکرد : ڕێگەی شوێنکەوتنی سوننەت چۆنە ؟

وتی : (دوورکەوتنەوە لە بیدعەچییەکان و، شوێنکەوتنی ئەوەی کە سەدەی یەکەم لەسەری ڕێککەوتوون لە زانایانی ئیسلام و ئەهلەکەی، وە دوورکەوتنەوە لە مەجلیسەکانی الكلام و ئەهلەکەی، وە گرتنەبەری ڕێگای شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوە، هەر بەمە فەرمانکراوە بە پێغەمبەر ﷺ بە فەرمایشتی : ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (النَّحل : ١٢٣).

٧٤٩ - **أبو بكر بن أبي عثمان الصابوني** ئەڵێت : کۆتا وتە باوکم کە وتی ئەوەبوو بیستم وتی : (موخالەفەکردنی سوننەت لە ڕووکەشدا بەهۆی دووڕووییەکی پەنهانەوەیە لە دڵدا).

---

: أبو عثمان الصابوني (٤٤٩ هـ)، خاوەنی (عقيدة السلف وأصحاب الحديث).

٧٥٠ - عبدالرحمن بن أبي حاتم ئەڵێت : (باوكم و أبو زرعة ئەیانوت : هەركەسێک هەوڵی فێربوون و بەدەستهێنانی دین بدات بە الكلام ئەوە گومڕا ئەبێت) .

٧٥١ - إسحاق بن عبدالله الزعفراني ئەڵێت : (گوێبیستی سهل بن عبدالله بووم و پێی وترا : هەتا كەی پیاو فەرمووده ئەنووسێت ؟

وتی : (هەتا ئەمرێت و ئەوەی ماویەتی لە حیبرەكەی ئەكرێت بەسەر گۆڕەكەیدا) .

---

- له (مناقب الإمام أحمد) ـدا صالح بن أحمد بن حنبل ئەڵێت : پیاوێک بینی باوكم مِحبَرَة - ئەوەی حیبری تیادا هەڵئەگیرێت - ی پێیە، پێی وت : ئەی أبو عبدالله تۆ گەیشتوویت بەوەی ئێستا پێی گەیشتوویت، وە پێشەوا موسوڵمانانیت!

وتی : (لەگەڵ محبرة هەتا ناو گۆڕ) .

- له (شعب الإيمان) ـدا أبو بكر البصري ئەڵێت : چوومە لای سهل بن عبدالله و محبرة م پێبوو، پێی وتم : (ئایا ئەنووسیتپ ؟) .

وتم : بەڵێ .

وتی : (بنووسە، ئەگەر توانیت بگەیتەوە بە الله عز وجل و محبرة ـت لەگەڵدا بێت ئەوە بیكە) .

٧٥٢ - سهل بن عبدالله ئەڵێت : (نموونەی سوننەت لە دنیادا وەكو بەهەشتە لە ئاخیرەتدا، ئەوەی لە ئاخیرەتدا بڕواتە بەهەشتەوە پارێزراو بووە، وە ئەوەی بڕواتە ناو سوننەتەوە لە دنیادا پارێزراو بووە) .

٧٥٣ - أبو الحسين الطبسي ئه‌ڵێت : (پیاوێک هات بۆ لای أبو سعید الإصطخري پرسیاری کرد وتی : ئایا خۆپاکردنه‌وه به ئێسقان ڕێگه‌پێدراوه ؟

أبو سعید وتی : (نه‌خێر) .

پیاوه‌که وتی : بۆچی .

وتی : (له‌به‌ر ئه‌وه‌ی رسول الله ﷺ فه‌رموویه‌تی : (ئه‌وه خۆراکی براکانتانه له جنۆکه)) .

پیاوه‌که وتی : مرۆڤه‌کان باشترن یاخود جنۆکه‌کان ؟

وتی : (مرۆڤه‌کان) .

پیاوه‌که وتی : ئه‌ی باشه بۆچی خۆپاکردنه‌وه به ئاو ڕێگه‌پێدراوه له‌کاتێکدا مرۆڤ ئه‌یخواته‌وه ؟

أبو سعید پڕی دایه و ده‌ستی خسته بینی و وتی : (ئه‌ی زندیق، دژی سوننه‌تی رسول الله ﷺ ئه‌وه‌ستیته‌وه ؟!!) .

وه خه‌ریک بوو بیخنکێنێت، ئه‌گه‌ر من نه‌گه‌یشتمایه پێی ئه‌یخنکاند) .

---

**- الخطيب البغدادي له (تاريخ بغداد) دا ده‌رباره‌ی أبو سعيد الإصطخري ئه‌ڵێت : (قازی قُم، یه‌کێکه له پێشه‌وا ناسراوه‌کان، وه له شێخه فه‌قیهه‌کانی شافیعیه‌کانه، خاوه‌ن وه‌رع و زاهید بوو .**

**الطبري ده‌رباره‌ی ئه‌ڵێت : (نووسراوی زۆرن) .**

**له‌وانه (أدب القضاء) که هیچ که‌سێک هاوشێوه‌یی نییه) .**

**- له (الفقيه والمتفقه) دا الزهري ئه‌ڵێت : (ته‌سلیمی سوننه‌ت ببن و دژی مه‌وه‌ستنه‌وه) .**

٧٥٤ - أبو عثمان الصابوني ئەڵێت : (پیاو بە هاوەڵایەتیکردنی سوننەت ئەگات بە پلە بەرز و پێگە گەورەکان) .

٧٥٥ - محمد بن حامد السجزي ئەڵێت : وتم بە أبو العباس بن سریج : تەوحید چییە ؟

وتی : (تەوحیدی زانایان و کۆمەڵەی موسوڵمانان بریتیە لە : شایەتی ئەدەم بە لا إله إلا الله، وە محمد رسول الله ﷺ .

وە تەوحیدی ئەهلی باتڵ بریتیە لە ڕۆچوون لە الأعراض و الأجسام، وە پێغەمبەر ﷺ نێردرا بە ئینکاریکردن لەوە) .

---

**: وەکو تەوحیدە کوفریەکەی ئەشعەریە جەهمیەکان .**

**- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) دا ئەڵێت : (مەبەستی ئینکاریکردن لە ئەو شتانەیە کە مەبەستیان پێیەتی لە مانا باتڵەکان، چونکە یەکەم کەس ئەوانەی داهێنا جەهمی و موعتەزیلەکان بوون، وە مەبەستیان لەوە نکوڵیکردن بوو لە سیفاتەکانی الله تعالى، یان بیبندرێت، یاخود وتەیەکی هەبێت وەسفی پێ بکرێت) .**

٧٥٦ - أحمد بن محمد بن أبي سعدان ئەڵێت : (هەرکەسێک دابنیشێت بۆ موناقەشەکردن لەسەر غەفڵەت ئەوە سێ عەیب لەگەڵیدا ئەبن :

- سەرەتاکەی دەمەدەمێ و هاوارکردن .

- وە ناوەڕاستەکەی حەزی بەرزبوونەوە بەسەر خەڵکیدا .

- وە کۆتاییەکەی ڕق و کینە .

وە هەرکەسێکیش دابنیشێت بۆ ئامۆژگاریکردن :

- سەرەتای قسەکەی ئامۆژگاریە .

- وە ناوەڕاستەکەی ئاڕاستەکردن و ڕێگەپیشاندانە .

- وە کۆتاییەکەشی بەرەکەتە ) .

---

- إبن بطـة لە (الإبانة الكبرى) ـدا ئەڵێت : (ئەوەی دەرئەکەوێت لەم کەسانەی سەردەمی ئێمە مونازەرە ئەکەن بۆ زاڵ بوون نەوەک بۆ موناقەشە، وە بۆ فێڵڵێکردن و پاشقول لێگرتن نەوە دڵسۆزی و ئامۆژگاری، وە جاری وا هەیە لە کردەوەکانیان دەرئەکەوێت لەوەی کە بڵاوبووەتەوە و زیادی کردووە لە شاران .

لەوەی دەرئەکەوێت لە کارە خراپەکانیان، وە لەوەی ئەیانگەیەنێت بە حەزی زاڵبوون و سەرخستنی هەڵە : سوورهەڵگەڕانی ڕووخساریانە، وە دەرکەوتنی دەماریانە، وە هەستانی دەماری ملیانە، وە لیک هاتنەخوارەوە بە دەمیانە، وە هێرشکردنیانەسەر یەکتری، وە جاری وا هەیە یەکیان دەستی درێژ ئەکات بۆ ڕیشی ئەوەی دیکەیان .

کەسێک ئامادەبوو لە حەلقەی دانیشتنی کەسێک لە جامع المنصور، ئەوانەی کە لە دانیشتنەکە بوون مونازەرەیان کرد بە ئامادەبوونی ئەو، جا توورەیی مونازەرە و موخالەفەکە وای کرد یەکێکتان تۆمەتی زینا بداتە پاڵ ژن و دایکی کەسی بەرامبەری .

وە مونازەرەکەرەکانم بینیوە لە کۆن و نوێدا، نەمبینیوە وە بۆم نەگێڕدراوەتەوە و پێم نەگەیشتووە دوو کەس کە ئیختیلافیان هەیە مونازەرەیان کردبێت لە شتێکدا و کەسێکیان بەڵگەکەی زاڵ بووبێت و ڕاستیەکەی دەرکەوتبێت وە هەڵەی بەرامبەری دەرخستبێت; ئەو کەسەی لەسەر هەڵە بووە گەڕابێتەوە لە هەڵەکەی، وە چووبێتە سەر ڕاستی هاوەڵەکەی، وە یەکتریان بەجێ نەهێشتووە ئیللا لەسەر ڕاجیاوازی و جیایی نەبێت، وە هەرکەسێک لەوان دەستی گرتووە بەوەی کە لەسەری بووە، وە جاری وا هەیە ئەزانێت هەڵەیە و کۆشش ئەکات بۆ سەرخستنی هەڵەکەی .

ئەمجۆرە خورەوشتە موخالەفەی قورئان و سوننەت ئەکات، وە ئەوەش کە سەلەفی ساڵح لەسەری بوون لە زانایانی ئوممەت .

گوێبیستی یەکێک لە شێخەکانمان بووم ئەیوت : (دانیشتن بۆ ئامۆژگاری کردنەوەی دەرگای سوودە، وە دانیشتن بۆ مونازەرە داخستنی دەرگای سوودە ) .

**ئەم وتەیەت بەســـە وەکو بنچینەیەک بگەڕێیتەوە بۆی، وە هەموو کـاروبـارتی لەسەر دابمەزرێنیت .**

**وە ئەوەی بۆم گێڕایەتەوە لە کردەوەی مونازەرەچیەکان و خراپی بۆچوونەکانیان بەسە بۆت تا خۆتی لێ بەدوور بگریت و شەرمی لێ بکەیت) .**

**٧٥٧ - محمد بن عبدالله بن محمد بن بشر الفسوي** ئەڵێت : (پێغەمبەرم ﷺ بینی لە خەودا وتم : ئەی رســـول الله، لە حەفتا و ســێ کۆمەڵەکە کامەیان کۆمەڵەی ڕزگاربووە ؟

فەرمووی : ئێوە ئەی هاوەڵانی فەرموودە) .

**٧٥٨ - أبو بكر بن بســطام** ئەڵێت : پرســیارم کرد لە أبو بكر بن ســیار دەربارەی خۆخەریککردن بە الکلام ـەوە .

جا ڕێگری لێ کردم بە ڕێگریەکی زۆر توند، وە وتی : (پەیوەستبە بە قورئان و ســوننەتەوە، وە ئەوەی لەســەری بوون لە هاوەڵان و تابیعین و ئەتباعی تابیعین، چونکە من بینیومە موســوڵمـانـان لە شـــاران نەهی و ڕێگریـان لێ کردووە، وە فەرمانیان ئەکرد بە قورئان و سوننەت) .

**٧٥٩ - محمد بن إسحاق بن خزيمة** ئەڵێت : (ئەوەی تەماشـــای کتێبە نووســـراوەکانی من بکات لە زانســـتدا، بۆی دەرئەکەوێت و ڕوون ئەبێتەوە کە کوللابیەکان لەعنەتی الله ـیان لێبێت درۆزنن لەو شتاندا کە لێمەوە ئەیگێڕنەوە کە پێچەوانەی بنچینە و دینی منە، ئەهلی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا زانیویانە هیچ کەســێک دەربارەی تەوحید و بنچینەکانی زانســت نەینووســیەوە هاوشــێوەی نووســینەکانی من، جا ئەو کەســەی لێمەوە ئەیگێڕێتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی لە کتێبەکانمدایە؛ ئەوەی کە گواستراوەتەوە بۆ ئاسۆکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا؛ ئەوە درۆزن و فاسقن).

: إبن خزيمة (٣١١ هـ) زۆر توند بووه له‌سه‌ر كوللابيه‌كان، وه‌ک پێشتر باسكراوه كوللابيه‌كان له‌فزيه‌كانيش سه‌له‌فی ئه‌شعه‌ريه جه‌هميه‌كانن له بابه‌تی خه‌لقی قورئاندا، إبن خزيمة كتێبێكی به‌پێزی نووسيوه ده‌رباره‌ی ته‌وحيدی الأسماء والصفات، هێنده له‌سه‌ر په‌كخه‌ره جه‌هميه جه‌هه‌ننه‌ميه‌كان قورسه يه‌كێكی وه‌كو فخر الرازي الأشعري پێی ئه‌ڵێت كتێبی شيرک !

- أبو عاصم العبادي له (طبقات الفقهاء) له باسی ژياننامه‌ی أبو بكر بن إسحاق الصبغي ـــدا (٣٤٢ هـ) ئه‌ڵێت : (ئه‌و و الثقفي ئه‌يانخوێنده‌وه به‌سه‌ر أبو بكر بن خزيمة ـــدا، وه الكلام ـــيان خوێند له‌لای أبو الحسن الأشعري، جا ڕێگری كرد لێيان ڕيوايه‌تی لێوه بكه‌ن .

وه أبو علي الثقفي وتی : چ شتێكت پێ باش نييه له بۆچوونه‌كانمان ئه‌ی ئيمام تا لێی پاشگه‌ز ببينه‌وه ؟

وتی : (مه‌يلتان بۆ بۆچوونی كوللابيه‌كان، أحمد بن حنبل له توندترين كه‌سه‌كان بوو له‌سه‌ر عبدالله بن سعيد بن كلاب و هاوه‌ڵه‌كانی) .

٧٦٠ - عبدالرحمن بن أبي حاتم ئه‌ڵێت : (نيشانه‌ی بيدعه‌چييه‌كان بريتيه له تانه‌دان له ئه‌هلی ئه‌ثه‌ر .

وه نيشانه‌ی زنديقه‌كان ئه‌وه‌يه ناوی ئه‌هلی سوننه ئه‌نێن حشوية، ئه‌يانه‌وێت ئه‌ثه‌ر به‌تاڵ بكه‌نه‌وه .

وه نيشانه‌ی جه‌هميه‌كان ئه‌وه‌يه به ئه‌هلی سوننه ئه‌ڵێن موشه‌بيهه) .

---

- أبو عثمان الصابوني له (عقيدة السلف وأصحاب الحديث) ـــدا ئه‌ڵێت : (أبا حاتم محمد بن إدريس الحنظلي الرازي ئه‌ڵێت : (نيشانه‌ی ئه‌هلی بيده‌ع تانه‌دان له ئه‌هلی ئه‌ثه‌ره .

وە نیشـــانەی زەندیقەکان ناوبردنی ئەهلی ئەثەرە بە حەشـــەوییە[1]، ئەیانەوێت ئەثەرەکان بەطال بکەنەوە .

وە نیشانەی قەدەریی ناوبردنی ئەهلی سوننەیە بە موجەبیرە .

وە نیشانەی جەهمی ناوبردنی ئەهلی سوننەیە بە موشەبیهە .

وە نیشانەی ڕافیضە ناوبردنی ئەهلی ئەثەرە بە نابیتە و ناصیبە[2]) .

هەموو ئەمانە دەمارگیرییە، هیچ ناوێک نالکێندرێت بە ئەهلی ســوننەوە جگە لە یەک ناو ئەویش هاوەڵانی حەدیثە .

من ئەهلی بیدەعم لەم ناوانە بینیوە کە ئەینێن لە ئەهلی سوننە، وە هیچ شتێک نالکێت پێوەیان لە فەزڵ و منەتی الله عز وجل، ڕێگای موشــریکینیان گرتووەتە بەر بەرامبەر رســول الله ﷺ کە دابەش بووبوون لە وتەکانیان دەربارەی : هەندێکیان ناویان نابوو بە ساحیر، وە هەندێکی تریان بە کاهین، وە هەندێکی تریان بە شاعیر، وە هەندێکی تریان بە شــێت، وە هەندێکی تریان بە هۆکاری فیتنە، وە هەندێکی تریان بە درۆهەڵبەســەر و درۆزن، وە پێغەمبەر ﷺ بەری بووە و دوور بووە لەم عەیبانە، هیچ نەبووە جگە لە نێردراوێکی هەڵبژێردراو .

الله عز وجل ئەفەرموێت : | انْظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا | (الإسراء : ٤٨) .

وە بەم شــێوەیەش موبتەدیعەکان الله عز وجل ســەرشــۆڕیان بکات وتەکانیان دابەشــبووە دەربارەی هەڵگرانی هەواڵەکانی، وە نقڵکەرانی ئەثەرەکانی، وە گێڕەرەوەی حەدیثەکانی، ئەوانەی ئیقتیدایان پێوە کردووە و هیدایەت دراون بە ســوننەتەکەی، ناسراون بە هاوەڵانی حەدیث، هەندێکیان ناویان ناون حەشەوییە، وە هەندێکی تریان موشــەبیهە، وە هەندێکی تریان نابیتە، وە هەندێکی تریان ناصــیبە، وە هەندێکی تریان جەبرییە، وە هاوەڵانی حەدیث پارێزراون لەم عەیبانە و بەرین لێیان و پاکن، هیچ نین جگە لە ئەهلی سوننەی پێشوو و ڕێگای میانڕەویی، وە خاوەنی بەڵگەی بەهێزن، الله عز وجل تەوفیقی داون بۆ شــوێنکەوتنی کیتابەکەی و وەحییەکەی و خیطابەکەی، وە شــوێنکەوتنی نزیکترین دۆســتەکانی، وە ئیقتیدا بە نێردراوەکەی ﷺ لەو هەواڵانەی فەرمانی تێدایە بە چاکە بۆ ئوممەتەکەی لە وتە و کردار، وە ترســاندیان لەوەی خراپەی

تێدایە، وە پارمەتیی دانیان لەســەر دەســتگرتن بە ڕێگاکەی، وە هیدایەتدانیان بە شــوێنکەوتنی ســوننەتەکەی، وە ڕێزی لێ ناون و بەعیززەتی کردوون، وە دڵەکانیانی فراوان کردووە بۆ خۆشەویستیی ئەو، وە خۆشەویستیی پێشەوایانی شەریعەتەکەی، وە زانایانی ئوممەتەکەی، وە هەرکەس کەسانێکی خۆش بوێت ئەوە لەگەڵ ئەواندایە لە ڕۆژی قیامەت بەپێی فەرمایشتی رسول الله ﷺ: (**پیاو لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی ئەوێت**)) هتد .

**(١)** نشوان اليمني ئەڵێت : (بۆیە ناونراون حەشەوییە لەبەر زۆریی ڕیوایەتکردنی هەواڵەکان، وە قبوڵ کردنیان لەسەر ئەو شێوەی هاتووە بەبێ نکۆڵیی کردن لێیان) .

**(٢)** نابتة : واتە منداڵانی بچوکی هەرزەکار .

ناصبة : ئەوانەن دوژمنایەتی علي بن أبي طالب رضي الله عنه و نەوەکانی ئەکەن.

- إبن القيم لە (الصواعق المرسلة) ــدا ئەڵێت : (ئەمە حاڵی هەموو بیدعەچی و مولحیدێکە، وە ئەمە میراتی ناونانی کافرانی قوڕەیشــە لە رســول الله ﷺ و هاوەڵانی رضي الله عنهم، وە بوو بە میراتێک بۆ هەموو بەتاڵکەرەوە و لادەر و بیدعەچییەک نازناو ئەنێت لە ئەهلی حەق بە نازناوانێکی ناشرین و دوورخەرەوە) .

موتەکەلیمەکان بە جەهمی و موعتەزیلی و ئەشــعەری و ماتوریدیەکانەوە لەبەر ڕقی زۆریان بۆ قورئان و فەرموودە و سوننەتی رسول الله ﷺ ناوی ئەو کەسانەیان ناوە الحشــوية لە بۆچوون و عەقڵی خۆیان ناخەنەپێش قورئان و ســوننەتەوە، وە وایان لە عەقڵی خۆیان کردووە شوێنکەوتەی ئەوە بێت کە رسول الله ﷺ پێی هاتووە، نەوەک ئەوەی رسول الله ﷺ پێی هاتووە شوێنکەوتەی بۆچوون و بیرکردنەوەکانی ئەوان بن، وە بەتایبەتی ئەشعەریەکان شــوێنکەوتەکانی ســەلەف عەیبدار ئەکەن بەو ناوە و بگرە ئەمڕۆش هەر وایان پێ ئەوترێت .

وە ئەوەی تەماشــای کتێبەکانی پێشــەوا ئەشــعەریە جەهمیەکانیان بکات لە الباقلاني و البغدادي و الجويني و الغزالي و الشــهرســتاني و الرازي و الآمدي و الإيجي و التفتازاني و النووي و عز بن عبدالسلام و إبن حجر العسقلاني و الهيتمي ئەبینێت ئەو

وشــەیە وەکو تانە بەکارئەهێنن بۆ تانەدان لە شــوێنکەوتە ڕاســتەقینەکانی رســول الله ﷺ و هاوەڵانی رضي الله عنهم .

وە هەر لە کاتی دروســتبوونیانەوە هەتا ئێســتا موخالیفەکانیان ئەدەنە پاڵ قســەوتن بە زانایان و ڕووخاندنی پایەی دین وەک چۆن أبو نصــر السـجزي دەربارەیان ئەڵێت : (هەموو ئەوانەی کە موخالەفەیان ئەکەن ئەیاندەنە پاڵ قســەوتن بە زانایان بۆ ئەوەی دڵی خەڵکی ئاسایی و نەزان لێیان هەڵبێت) .

- لە (الحجة في بيـان المحجة) ـــــدا أبو زرعـة الرازي ئەڵێـت : (پەکخەرە نەفیکەرەکان ئەوانەن کە ســیفەتەکانی الله عز وجل ڕەت ئەکەنەوە کە وەســفی پێ کردووە لە کتێبەکەیدا وە لەســەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە ئەو فەرموودە صـحیح ـانە بەدرۆ ئەخەنەوە کە لە رسول الله ــەوە ﷺ هاتووە دەربارەی سیفەتەکانی الله عز وجـل، وە تەئویلی ئەکەن بە بۆچوونە هەڵەوگێڕاو و لەفیـترەت دەرچووەکـانیـان بەشــێوەیەک بگونجێـت لەگەڵ ئەوەی کە بـاوەڕیـان پێیەتی و ئارەزووی ئەکەن لە گومڕایـی، وە ڕیوایەتکەرانی ئەدەنە پاش تەشبیهـ، جا ئەو کەسەی ئەو کەسانە بداتە پاڵ تەشبیهــــ کە وەسفی پەروەردگاریان ئەکەن تبارک وتعالى بەوەی کە وەسفی خۆیی پێ کردووە لە کتێبەکەیدا وە لەســـەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ بەبێ نمونە بۆ هێنانەوە و چواندن ئەوە پەکخەرێکی نەفیکەرە، وە بە دانەپاڵی ئەوان بۆ لای تەشــبیهـــــ بەڵگە ئەهێنرێتەوە بەســـەریاندا بەوەی ئەوان پەکخەر و نەفیکەرن، زانایان بەو شــێوەیەیان ئەوت، لەوانە عبدالله بن المبارك و وكيع بن الجراح) .

## چینی هەشتەم وە تیایاندا ئەشعەریەکان دەرکەوتن

نووسەر لەم بەشەدا بەشێکی زۆری وتەی زانایان ئەهێنێت لە زەمکردنی ئەشعەریەکان لەبەر موخالەفەکردنیان بۆ قورئان و و سوننەت و ئەوەی سەلەف لەسەری کۆک بوون لە زۆربەی بابەتە عەقیدەییەکان .

- العمراني الشافعي لە (الإنتصار في الرد على المعتزلة الأشرار) دا ئەڵێت :

(موعتەزیلەکان و قەدەریەکان چەندین گومان و شوبهەیان خستە ناو ئیسلام و ئەهلەکەیەوە تا سەر لە خەڵکی ئاسایی و ئەوانە بشێوێنن کە ئەو بنچینەیانە نازانن ئەوان وتەکانیان لەسەر دامەزراندووە، جا شوێن موتەشابیهی قورئان کەوتن و قورئانیان لێکدایەوە بە خیلافی ئەوەی نقڵ کراوە لە هاوەڵان و تابیعیە ناودارەکان بە تەفسیر; بۆ ئەوەی پشتی وتەکانی خۆیان بگرن، جا ئەوانە زیانبەخشترین و بەهێزترین کۆمەڵەن بە هاوەڵانی فەرمووده، وە پاش ئەوانیش ئەشعەریەکان، چونکە ئەوان وایان دەرئەخست ڕەددی موعتەزیلەکان ئەدەنەوە لەکاتێکدا هەمان وتەی ئەوان ئەڵێنەوە .

ئەشعەریەکان پێیەکیان خستە ناو ئیعتیزالەوە، وە لەو شوێنەیان پێیان دانا کە موعتەزیلەکان دایاننا، وە پێیەکیپێئەکەین تریان درێژ کرد بۆ ئەو شوێنەی کە ئەهلی حەدیث درێژی کرد .

ئەمەش نموونەیەکی ژیریە ئەو کەسە لێی تێئەگات کە لە وتەکانیان تێئەگات) هتد .

ئەشعەریە جەهمیەکان لە ڕووکەشدا موافەقەی ئەهلی سوننە ئەکەن، وە لە ئەسڵ و ناخدا موافەقەی موعتەزیلە و جەهمیەکان ئەکەن .

بۆ نمونە موعتەزیلەکان ئەڵێن فەرموودەی ئیسراء و میعراج لاوازە، لەبەر ئەوەی فەرموودەکە ئەوە جێگیر ئەکات الله عز وجل لەسەر عەرش بێت، وە ئەوانیش کافرن بەوەی الله عز وجل لەسەر عەرش بێت، جا لەملاوە ئەشعەریەکان ئەڵێن ئێمە ئەڵێین فەرموودەکە صحیحە و لە ڕووکەشدا موافەقەی ئەهلی سوننە ئەکەن، بەڵام بە خەو

بووە نەوەک بە ڕاستی، ئەمەش هەمان وتەی موعتەزیلەکانە، هەردوولا هەمان پێشەکی و هەمان ئەنجامیان هەیە بەڵام بە دوو ڕێگەی جیاواز .

بۆ نمونە موعتەزیلەکان ئەڵێن الله عز وجل لە بەهەشتدا نابینرێت، ئەشعەریەکان ئەڵێن ئەبینرێت، لە ڕووکەشدا موافەقەی وتەی ئەهلی سوننە ئەکەن، بەڵام ئەڕۆنەوە سەر وتەی موعتەزیلەکان بەوەی ئەڵێن ئەبینرێت بەڵام چاو نا وە لە هیچ شوێنێک نا !

ئەمان هەمان وتەی موعتەزیلەکانە بەڵام تۆزێک بە ترش و خوێوە، نمونەی دیکەش هەیە ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ کتێبی الرسالة إلى أهل الزبيد ی السجزي .

- أبو نصر السجزي لە (الرسالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت) ـدا ئەڵێت : (پاشان ئەهلی سوننە تاقیکرانەوە دوای ئەمانە - واتا دوای موعتەزیلە - بە کەسانێک کە بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد شوێنی قورئان و سوننەت کەوتوون، بەڵام زیانیان لە زیانی موعتەزیلە و غەیری موعتەزیلە زیاتر بوو، ئەوانیش بریتی بوون لە : (ابو محمد ابن كلاب و ابو العباس القلانسي و ابو الحسن الاشعري) دوای ئەوانیش : (محمد بن ابي تريد لە سجستان و ابو عبدالله ابن مجاهد لە بەصرە) لە سەردەمی ئێمەشدا : (ابو بكر ابن الباقلاني لە بغداد و ابو اسحاق الاسفراييني و ابو بكر ابن فورك لە خوراسان)، جا ئەمانە ڕەددی هەندێک ووتەی موعتەزیلە ئەدەنەوە، وە ڕەددی ئەهلی سوننە ئەدەنەوە زۆر لەوە زیاتر کە ڕەددی موعتەزیلە ئەدەنەوە) .

وە دەروازەیەکی داناوە بەناوی (باسکردنی شتێک لە وتەکانیان تا خەڵکی ئاسایی بیزانن و لێیان دووربکەونەوە و نەکەونە ناو تۆڕەکانیانەوە) .

وە هەر لەو دەروازەیەدا ئەڵێت : (زیاتر لە یەکێک لە موتەلیمەکان لە موعتەزیلە و کەرامیەکان نووسیویانە دەربارەی شەرمەزاریەکانی ئەشعەری و کوللابیەکان، وەک چۆن ئەوانیش دەربارەی شەرمەزاری ئەوانی دیکە نووسیویانە .

وە هەموو موخالیفێکی سوننەت و ڕێبازی ئەهلی ئەثەر شەرمەزاری هەیە کاتێک بیری لێ ئەکرێتەوە، وە ئەهلی ئەثەر هیچ شەرمەزاریەکیان نییە، چونکە هیچ شتێکیان دانەهێناوە بەڵکو شوێن ئاثارەکان کەوتوون، وە ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە بکات لە ئەثەردا شەرمەزاری هەیە پاش حوکمدان دەربارەی بە صەحیح بوون ئەوە موسوڵمان نییە) .

**- إبن تيمية له (التسعينية) له وه‌ڵامی ئه‌شعه‌ریه‌كاندا ئه‌ڵێت : (به‌ گشتی ئه‌وه‌ی سه‌له‌ف زه‌میان كردووه‌ و موعته‌زیله‌كانیان پێ عه‌یبدار كردووه‌ له‌ ئه‌و وته‌یانه‌ی كه‌ موخالەفەی قورئان و سوننەت و ئیجماعی سه‌ره‌تایه‌ ئه‌وه‌ ئێوه‌ زۆرترین پشكتان هه‌یه‌ تیایدا، به‌ڵكو جاری وا هه‌یه‌ موخالەفه‌كه‌تان له‌ هی موعته‌زیله‌كان زیاتره‌ .**

**به‌ڕاستی هاوبه‌شیانن له‌ بنچینه‌كانی گومڕایه‌تیه‌كه‌یان كه‌ به‌هۆیه‌وه‌ جیابوونه‌وه‌ له‌ سه‌ه‌فی ئومه‌ت و پێشه‌واكانیان، به‌هۆیه‌وه‌ كتێبی الله‌ یان پشتگوێ خست) .**

٧٦١ - الهروي ئەڵێت : أبو يعقوب الحافظ بۆی گێڕاینه‌وه‌ ده‌رباره‌ی تاقیكردنه‌وه‌كه‌ی أبو الفضل الشهيد محمد بن أبي الحسين الحافظ وتوویه‌تی : (وازهێنان له‌ ده‌مه‌ده‌مێ و ململانێ له‌ دینه‌) .

وه‌ أبو الفضل الشهيد هاوتا ئەكرا به‌ يحيى بن معين) .

---

**: أبو الفضل الهروي الشهيد (٣٢٧ هـ)، ئیمامێكی گه‌وره‌یه‌، زانایه‌ به‌ علل ی فه‌رمووده‌كان .**

٧٦٢ - أبو زيد الفقيه المروزي ئەڵێت : (ڕۆیشتم بۆ لای أبو الحسن الأشعري له‌ به‌سره‌، شتێكم لێ وه‌رگرت له‌ الكلام، دواتر شه‌و له‌ خه‌ومدا بینیم وه‌ك بڵێیت كوێر بووبم، گێڕامه‌وه‌ بۆ خه‌ون لێكده‌ره‌وه‌، ئەویش وتی : (زانستێك وه‌رئەگریت كه‌ پێی گومڕا ئەبیت) .

منیش نه‌چوومه‌وه‌ بۆ لای الأشعري، دوای ئەوه‌ ڕۆژێك له‌سه‌ر ڕێگه‌ بینیمی پێی وتم : ئەی أبو زيد ئایا په‌شیمان نابیته‌وه‌ له‌وه‌ی بگه‌ڕێیته‌وه‌ بۆ خۆراسان و زانا بیت به‌ فه‌رعه‌كان و نه‌زان بیت به‌ ئەسڵه‌كان ؟

منيش خەونەکەم بۆ گێڕایەوە .

وتی : هەر لێرە لەسەرم دایبپۆشە - **واتە لای کەس باسی مەکە** - ) .

**٧٦٣ - أبو الأشعث أحمد بن الحسن** ئەڵێت : پیاوێک بە أبو سهل بشر بن أحمد الإسفراييني وت : الكلام فێر ئەبم بۆ ئەوەی شارەزای دین ببم .

بشر تووڕە بوو و وتی : (بۆ مەگەر زانایانی پێش خۆمان کافر بوون ؟!) .

---

**: أحمد بن أبي سهل الأسفراييني (٣٧٠ هـ)، پێشەوا و فەرموودەوان، وەسفکراوە بە ئازایەتی و چاونەترسی .**

**٧٦٤ - الهروي** ئەڵێت : گوێبیستی يحيى بن عمار بووم ئەیوت : گوێبیستی زاهر بن أحمد بووم کە پێشەوای موسوڵمانان بوو ئەیوت : (لە سووچێکی دەرگاکەوە تەماشام کرد بینیم أبو الحسن الأشعري میزی ئەکردە شوێنی میزکردنەوە، دواتر ڕۆشتمە ژوورەوە بۆ لای، کاتی نوێژ هات و هەستا نوێژی کرد و نە خۆی پاک کردەوە وە نە مەسحی کرد وە نە دەستنوێژی گرت .

منیش دەستنوێژم بیرخستەوە، وتی : (بێدەستنوێژ نیم)) .

---

**: زاهر بن أحمد السرخسي (٣٩٨ هـ)، پێشەوا و زانا و فەقیهـ و گەورە قورئانخوێنی خۆراسان .**

**- الأهوازي لە (مثالب إبن أبي بشر) ـــدا نقڵ ئەکات لە سهل الصُعلوكي لە نیسابور کە چووەتەلای پاش ئەوەی أبو الحسن الأشعري میزی کردووە و دەستنوێژی نەگرتووە و نوێژی کردووە، سهل ئەڵێت : (بەجێمهێڵا و هەموو ئەوەم دڕاند کە لێەوە نووسیبووم، وە نەگەڕامەوە بۆ لای) .**

وه الأهوازي ئه‌ڵێت : (جێگیر بووه لێیه‌وه به نقڵی که‌سه خاوه‌ن پێگه و فه‌زڵه‌کان که خاوه‌نی دین نه‌بووه و شه‌ریعه‌تی پشتگوێ خستووه، وه سه‌رپێچی و فاحیشه‌کانی ئه‌نجام داوه و وازی له فه‌رزکراوه‌کان هێناوه) .

٧٦٥ - زاهد بن أحمد ئه‌ڵێت : (کاتێک الأشعري خه‌وتبوو بازنه‌یه‌کم کێشا له بنه‌پێیدا، پاش شه‌ش ڕۆژ ئه‌و ڕه‌شاییه‌م بینی نه‌یشۆردبوو) .

---

: واته ده‌ستنوێژی نه‌گرتووه .

ئه‌مه‌ی که وتراوه ده‌رباره‌ی أبو الحسن الأشعري شتێک نییه که لێی چاوه‌ڕێ نه‌کرێت، چونکه ئیمامه گه‌وره‌که‌ی جهم بن صفوان چل ڕۆژ نوێژی نه‌کردووه و وازی لێ هێناوه، وه أبو الحسن یش شوێنکه‌وته‌ی بنچینه‌کانی جهم ـه .

وه ئه‌م که‌مته‌رخه‌میه له نوێژ و ده‌ستنوێژدا شتێکی ناسراوه له موعته‌زیله‌کانه‌وه، وه‌کو چۆن گێڕدراوه‌ته‌وه له ثمامة بن الأشرس و جاحظ ی المعتزلي، وه زانراوه أبو الحسن الأشعري چل دانه ساڵ موعته‌زیله بووه و سه‌رگه‌وره‌یان بووه، هه‌ربۆیه ئه‌وه‌ی به میراتی بۆ ماوه‌ته‌وه وه‌ک چۆن جه‌همیه‌تی بۆ ماوه‌ته‌وه لێیانه‌وه .

ئه‌مه شتێکی باوه له‌ناو ئه‌و که‌سانه‌ی خویان داوه‌ته به‌ناو زانستی الكلام، چونکه ئه‌وان له قورئان و سوننه‌ت لایانداوه، وه هه‌میشه خه‌ریکی جیدال و ده‌مه‌ده‌مێ بوون ده‌رباره‌ی الله عز وجل به‌به‌کارهێنانی جه‌هلی که‌لام و فه‌لسه‌فه، وه ئه‌و که‌سه‌ی هه‌میشه خه‌ریکی ئه‌وانه بێت دووره له خشوع و له‌خواترسان، هه‌ربۆیه الله عز وجل فه‌رموویه‌تی : ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾ (البَقَرَة : ٤٥) .

ئه‌وه‌ی هه‌میشه خه‌ریکی وته کوفریه‌کانی مولحید و فه‌یله‌سوفه‌کان بێت و له قورئان و سوننه‌ت لابدات چێژ له نوێژدا نابینێته‌وه هه‌ربۆیه قورس ئه‌بێت له‌سه‌ری، ئه‌مه‌ش بۆخۆی گه‌وره‌ترین فیتنه‌یه‌که تووشیان بووه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی موخالەفه‌ی فه‌رمانی الله عز وجل یان کردووه و ده‌مه‌ده‌مێیان کردووه له ئایه‌ته‌کانیدا، وه مانای ئایه‌ته‌کانیان

**گۆڕیوە بۆ ئەوەی لەگەڵ بنچینە خراپ و کوفرلەخۆگرتووەکانیاندا بگونجێت، وە سوننەتەکانی پێغەمبەریان ڕەتکردەوە بە چەندین بیاوی جۆراوجۆر، هەربۆیە الله عز وجل لەم دنیایە توشی ئەو فیتنەیەی کردن و لە قیامەتیش تووشی ئەوە ئەبن کە فەرموویەتی : ﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النُّور : ٦٣) .**

**٧٦٦ - الهروي** ئەڵێت : (وە گوێبیستی بشر بن عبدالله الأيبوردي الخطيب بووم لە قاضي جرجان ـەوە هەندێک شتی ئەگێڕایەوە لە الأشعري ـەوە کە بەلامەوە گەورەیە باسی بکەم) .

---

**: واتە شتەکان ئەوەندە خراپ و پیسە .**

**٧٦٧ - أبو محمد الحسن بن أحمد البغدادي** ئەڵێت : (دانیشتن بۆ موزاکەرە و باسکردنی زانست کردنەوەی دەرگای سوودە، وە دانیشتن بۆ دەمەدەمێ داختنی دەرگای سوودە) .

**٧٦٨ - محمد بن العباس بن محمد** ئەیوت : گوێبیستی أبو علي الرفاء بووم ئەیوت : (الله لەعنەت بکات لە کوللابیەکان) .

**٧٦٩ - الأزهري** ئەڵێت : (فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (لە بەدەستهێنانی زانستدا نەزانینێک هەیە) .

واتە : الكلام و زانستی ئەستێرەکان) .

٧٧٠ - الحسين بن محمد الباساني ئەڵێت : ئامادەبووم لەلای علي بن عيسى، باسی قسەيەكی كەراميەكان كرا، وتی : (بێدەنگ بن، مزگەوتەكەم پيس مەكەن) .

---

: فيرقەی كەراميەكان ئەدرێنە پاڵ محمد بن كرام (٢٥٥ هـ)، وە خۆی و شوێنەوتووەكانی ئەهلی كەلام ن .

لە وتەكانيان بريتيە لە : (الله جسم ـە وەک جسم ـەكانی ديكە نييە) .

وە : (ئيمان بريتيە تەنها لە وتەی زمان، وە بريتی نييە لە ناسينی دڵ و بەڕاستخستنەوەی، وە كردەوەی پەلەكان، هەربۆيە مولزەم كران بەوەی بڵێن مونافيقەكانيش موسوڵمانن، وە ئەو كەسەی شيرک ئەنجام بدات و كوفر بكات؛ ياخود لە دڵيدا عەقيدەيەكی كوفری هەبێت ئەوە هەر ئيمانداره بەس لەبەر ئەوەی بە زمان ئيمانی هێناوە، ئەمەش لە پيسترين و گەمژانەترين وتەيە) .

- لە (الأباطيل والمناكير والصحاح والمشاهير لـ الجورقاني) ـدا محمد بن أسلم الطوسي ئەڵێت : (وتەيەک بەرز نەبووەتەوە بۆ ئاسمان گەورەتر و پيستر بێت لە سێ دانە :

- يەكەميان وتەی فيرعەون كاتێک وتی من پەروەردگاری هەرە بڵندتانم .

- دووەم وتەی بشر المريسي كاتێک وتی قورئان مخلوق ـە .

- سێيەم وتەی محمد بن كرام كاتێک وتی ناسين لە ئيمان نييە) .

- وە لە (الأباطيل والمناكير والصحاح والمشاهير لـ الجورقاني) ـدا أبو بكر محمد بن عبدالله ئەڵێت : گوێبيستی باپيرم العباس بن حمزة و، محمد بن إسحاق بن خزيمة و، الحسين بن الفضل البجلي بووم ئەيانوت : (كەراميەكان كافرن، تۆبەيان پێ ئەكرێت، ئەگەر تۆبەيان نەكرد لە مليان ئەدرێت) .

- إبن حزم الجهمي لە (الفصل في الملل والأهواء والنحل) ـدا ئەڵێت : (كۆمەڵەيەک چوون بۆ ئەوەی ئيمان بريتيە لە دانپێدانانی زمان بە الله تعالى ئەگەرچی

**لە دڵیدا بیروباوەڕی کوفریشــی هەبێت، ئەگەر دانپێدانانی زمانی هەبێت ئەوە ئیماندارە لە ئەهلی بەهەشت، ئەمەش وتەی محمد بن کرام و هاوەڵانیەتی) .**

**٧٧١ - أبو يعقوب بن زوران الفقيه الفارسي** ئەڵێـت : (وەڵامم دایەوە دەربارەی بابەتێک لە الكلام ـدا، گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و لە دڵمدا هیچ شتێک نەبوو لە هەموو ئەوەی الله بە منەتی خۆی ئەیدا بە ئیمانداران هەتا هەستام و خۆم شۆرد و سوجدەم برد و مکلەچیم پیشان دا و تۆبەم کرد و گریام تا بۆم گەڕێندرایەوە) .

**٧٧٢ - أبو عبدالله محمد بن أحمد البلخي** ئەڵێت : (لەگەڵ إبن أبي شـریح ـدا بووم لە ڕێگەی عور، کەسێک لەو چیایانەوە هات بۆ لای و پێی وت : خێزانەکەم لە شەش مانگیدا منداڵی بووە .

إبن أبي شـریح پێی وت : (ئەوە منداڵی خۆتە، ڕسـول الله ﷺ فەرموویەتی : (الولد للفراش)) .

دووبارە پرسیاری لێکردەوە و ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە .

پیاوەکە وتی : ئەوە بۆچوونی من نییە .

إبن أبي شریح وتی : (ئەمە جەنگانە!)، وە شمشێرەکەی لێ هەڵکێشا .

ئێمەش بەرمان لێ گرت و وتمان : (نەزانە نازانێت چی ئەڵێت)) .

---

**: مەبەســـت لە (الولد للفراش) ئەوەیە کاتێک ئافرەتێک منداڵی ئەبێت ئەسـڵ ئەوەیە لە هاوسەرەکەی خۆیەتی .**

**٧٧٣ - أحمد بن أبي عمران** ئەڵێت : پرســیار کرا لە إسـماعیل بن نجید : چ شتێک بەندە هەمیشە ئەبێت هەبێت ؟

وتی : (پەیوەستبوون بە بەندایەتی و چاودێریکردنێکی بەردەوام) .

---

: واتە هەمیشە ئەو هەستەت هەبێت الله عز وجل چاودێریت ئەکات .

**٧٧٤ - إبراهيم الخواص** ئەڵێت : (زەندەقە و کوفر و بیدعە و بوێری لە دیندا نەبووە ئیللا لەرێگەی الكلام و دەمەدەمێ و جیدال و سەرسامبوون بە خۆوە نەبێت، چۆن پیاو بوێری ئەوەی هەیە جیدال و دەمەدەمێ بکات لەکاتێکدا الله تعالی ئەفەرموویێت : ﴿مَا يُجَـٰدِلُ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ (غافر : ٤) .

---

**: أبو إسحاق إبراهيم بن أحمد الخواص الزاهد، شێخی سۆفیەکان لە الرِّي .**

**- البربهاري لە (شرح السنة) ـدا ئەڵێت : (وە بزانە رحمک الله زەندەقە و کوفر و گومان و بیدعە و گومڕایی و سەرێشێواوی نەبووە لە دیندا ئیللا لە الكلام و هاوەڵانی الكلام ـەوە نەبێت، وە هاوەڵانی دەمەدەمێ و جیدال و ململانێوە .**

**وە مایەی سەرسوورمانە چۆن پیاو بوێری هەیە دەمەمەێ و دەمەقاڵێ و ململانێ بکات لەکاتێکدا الله تعالی ئەفەرموویێت : ﴿مَا يُجَـٰدِلُ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ .**

**هەربۆیە پەیوەستبە بە تەسلیم بوون و، ڕازیبوون بە ئاثارەکان و ئەهلی ئاثارەکان، وە وازهێنان و بێدەنگ بوون) .**

**٧٧٥ - محمد بن عثمان النجيمي** ئەڵێت : (الحسين بن الشماخ الحافظ نەیئەهێڵا هیچ کەسێک لە ئەهلی ڕەئی لێوەی بنووسێتەوە، پیاوێکی ئەهلی مەغریب سوێندی دا بە الله عز وجل و باسی درێژی گەشتەکەی بۆ کرد، ئەویش شتێک لە خراپیەکانی ئەبو حەنیفەی بۆ گێڕایەوە و هیچ فەرموودەی بۆ نەگێڕایەوە).

٧٧٦ - يحيى بن عمار ئەڵێت : (حامد بن محمد الرفاء نەیئەهێڵا ئەهلی ڕەئی ڕیوایەتی لێوە بکەن، وە ڕێگەی نەئەدا لە ماڵەکەیدا لێوەی ببیستن، کەسێک لە گەورەکانی بەلخ هات بۆ لای، زۆر داوایان لێ کرد و ئەویش ڕێگەی دا بێتە ژوورەوە.

کاتێک مۆڵەتی دا و هاتە ژوورەوە سەری بۆ بەرز نەکردەوە و وتی : (لە کوێوە هاتوویت ؟) .

وتی : لە بلخ ـەوە .

وتی : (شوێنی مورجیئەکان!) .

پاشان الرفاء بە منی وت : (ڕەددەکەی الحمیدي بخوێنەرەوە) .

منیش شتێکی زۆرم لێی خوێندەوە) .

---

: واتە کتێبی الرد علی أبي حنیفة ی الحمیدي (٢١٩ هـ) .

- لە (المجروحین) ـدا محمد بن منصور الجوار ئەڵێت : بینیم الحمیدي کتێبی (الرد علی أبي حنیفة) ی ئەیخوێندەوە لە مسجد الحرام، ئەیوت : (یەکێک ئاوای وتووە).

پێم وت : بۆچی ناوی ناهێنیت ؟

وتی : (حەزم لێ نییە لە مسجد الحرام ناوی بهێنم) .

- لە (سؤالات البرذعي لأبي زرعة) ـدا أبو زرعة الرازي ئەڵێت : (خەڵکی الري توشی فیتنە ببون بەهۆی أبوحنیفة ـەوە، ئێمەش گەنج بووین لەگەڵ ئەو خەڵکە دەڕۆیشتین، وە من خەریکی کۆکردنەوەی فەرموودەکانی أبو حنیفة بووم، پرسیاری ئەم کارەم لە أبو نعیم کرد، وە پێم وابوو کارێکی چاک دەکەم، الحمیدي کتێبی (الرد علی أبي حنیفة) ی دەخوێندەوە منیش خەریک بوو پەلاماری بدەم، تاکو الله منەتی بەسەردا کردین گومڕایی ئەوانمان زانی) .

- الدارمي لە (النقض) ـدا باسی ئەو فەرموودەیانەی ئەکات کە ڕەتیان کردووەتەوە، ئەڵێت : (وە هاوشێوەی ئەمانە هەتا أبو حنیفة ـیان تیایدا دایە پاڵ

ڕەتکردنەوەی فەرموودەی رسول الله ﷺ، وە بەرپەچیان دایەوە و کتێبیان نووسی دەربارەی) .

لەو زانایانەی کتێبیان نووسیوە دەربارەی ڕەددانەوەی أبو حنيفة :

- الأوزاعي، وەک چۆن لە السنة لـ عبدالله ـدا (**٢٣٥**) هاتووە .

- إبن أبي شيبة لە المصنف ـەکەیدا بەناوی (كتاب الرد على أبي حنيفة) .

- عبدالله بن أحمد بن حنبل لە کتێبەکەیدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی (ئەوەی لە باوکمەوە رحمه الله و جگە لەوەوە پاراستوومە دەربارەی أبو حنيفة) .

- محمد بن عبدالله الحضرمي ناسراو بە مطين کتێبێکی هەیە بەناوی (الرد على أبي حنيفة) .

- نعيم بن حماد شێخی البخاري کتێبێکی هەیە بەناوی (الرد على أبي حنيفة) .

- وە إبن مندة کتێبێکی هەیە بەناوی (نبذة في نقد أبي حنيفة) .

وە سەلەف رحمهم الله زۆر ڕەددی ئەهلی ڕەئی و مورجیئەکانیان داوەتەوە کە سەرگەورەکەیان أبو حنيفة یە، الشافعي زۆربەی ڕەددەکانی بەرامبەر ئەهلی ڕەئی یە .

وە أحمد بن حنبل دوو کتێبی بەناوی (الأشربة) و (الإيمان) لەدژیان نووسیوە .

وە البخاري لە الصحيح ـەکەیدا چەند کتێبێکی داناوە بۆ ڕەددیان وەکو (الأشربة) و (الإيمان) و (الحيل)، وە چەندین زانای دیکەش بە هەمان شێوە .

**٧٧٧ - يحيى بن عمار** ئەڵێت : (شێخەکانمان ڕێگریان لێ ئەکردین لە ڕۆیشتن بۆ لای الإسماعيلي، وە هەر لە منداڵیمەوە گوێبیستی شێخەکانم بووم باسی توندی أبو إسحاق القراب ـیان ئەکرد لەسەریان، تا وای لێهات بەهۆی ئەوەوە گیانی خۆی دانا رحمه الله) .

: مەبەستی لە أبو بكر الإسماعيلي ـــە (٣٧١ هــ)، خاوەنی کتێبی (عقيدة أهل السنة)، لەبەر ئەوەی تێکەڵی الکلام و ئەهلەکەی بووە ئاوا ئاگاداریان لەبارەوە داوە .

أبو إسحاق إبراهيم بن محمد بن سهل القراب (٣٥٤ هــ)، لەلایەن باتنیەکانەوە کوژرا بەهۆی ئینکاریکردنی لە خراپە .

٧٧٨ - الهروي ئەڵێت : وە پرســیارم کرد لە يحيى بن عمار دەربارەی أبي حاتم بن حبان البستي، وتم : (ئایا بینیوتە ؟) .

وتی : (ئەیچۆن نەمبینیوە لەکاتێکدا خۆمان دەرمانکرد لە ســجســتان ؟! زانســتێکی زۆری هەبوو، وە دینێکی گەورە و باشــی نەبوو، هاتە لامان و ئینکاری حەدد ی کرد بۆ الله عز وجل، ئێمەش دەرمانکرد لە سجستان) .

---

: إبن حبان (٣٥٤ هــ) خاوەنی (المجروحين) و (الصحيح) و (الثقات)، خاوەنی چەندین تەحریفە لە تەحریفاتی جەهمیەکان لە کتێبی (الصحيح) ـەکەیدا کە ناوی ناوە (الأنواع والتقاسيم) .

٧٧٩ - محمد بن محمد بن صالح ئەڵێت : (ئینکاری ئەم وتەیەی إبن حبان یان کرد لەسەری (پێغەمبەرایەتی بریتیە لە زانست و کردەوە) .

جا حوکمیان بەســەردا دا بە زەندەقە و هەجر کرا و لەبارەیەوە نووســرا بۆ خەلیفە، ئەویش نووسی بکوژرێت) .

---

: لە ڕاســتیدا پێغەمبەرایەتی بریتیە لە دیاریکردن و هەڵبژاردنێک لەلایەن الله عز وجل ـەوە بۆ ئەو کەسەی کە خۆی ئەیەوێت، نەوەک شتێک بێت بە زانست و کردەوە

بەدەست بهێنرێت وەک چۆن فەیلەسوفەکان ئەیڵێن، هەربۆیە لەلای فەیلەسوفەکان پێغەمبەرایەتی نەپچڕاوە بەڵکو مرۆڤ ئەکرێت بەدەستی بهێنێت .

٧٨٠ - الهروي ئەڵێت : (گوێبیستی أحمد بن حمزة و أبو علي الحداد بووم وتیان : (أبو العباس أحمد بن محمد النهاوندي ـمان بینیەوە لەسەر ئینكاریكردن لە ئەهلی الكلام و تەكفیری ئەشعەریەكان ) .

وە باسی ئەو ئینكاریە گەورە و هەجرەیان كرد كە كردی لەسەر أبو الفوارس القرماسيني لەسەر یەک وشە ) .

٧٨١ - أحمد بن حمزة ئەڵێت : (کاتێک هەجرکردن توند بوو لە نێوان النهاوندي و أبو الفوارس ـــــــدا پرسیاریان كرد لە أبو عبدالله الدينوري، وتی : (گەیشتووم بە هەزار شێخ لەسەر ئەوە بوون كە النهاوندي لەسەریەتی ) .

---

: مەزهەبی سەلەف و ئەهلی سوننە هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی أبو الحسن الأشعري ـەوە بریتیبووە لە تانەدان لێی بە توونترین تانەکان و هەژمارکردنی لە ڕیزی زەندیق و جەهمی و گۆڕەرانی ئەو دینەی کە الله عز وجل پێی ڕازیە و رسول الله ﷺ پێی هاتووە .

لێرەدا وتەی کەسانێک ئەهێنین کە بە ناو باسی أبو الحسن الأشعري یان کردووە و حوکمیان لەسەر داوە، وە کەسانێک باسی عەقیدەکەیان کردووە و ناوی خۆیان نەهێناوە و حوکمیان لەسەر ئەو عەقیدەیە داوە کە الأشعري خاوەنیەتی .

### ئەوانەی کە ناوی أبو الحسن الأشعري یان ئەشعەریەکانیان هێناوە لە وتەکانیاندا :

- أبو عبدالله ابن منده (٣٩٥ هـ) لە (مجلس في الرد على الزنادقة) دا بە ئاشكرا وەسفیان ئەكات بە زەندیق : (ئەمە سیفەتی زەندیقە ئەشعەریەكانە، ئەوانەی

دەرکەوتوون لەم سەردەمەدا، پشتیان کرد لە کیتاب و سوننەت، پشتیان بەست بە قیاس، وە قسەیان کرد بە عەقڵە بێ بایەخەکانیان لەوەی کە پێچەوانەی ئەثەرە) .

وە ئەڵێت : (بە پێچەوانەی ئەوەی زەندیقە ئەشعەریەکان بانگەشەی بۆ دەکەن لەدژی هەڵگرانی عیلمی شوێنکەوتەی کیتاب و سوننەت) .

وە ئەڵێت : (ئەڵێین: هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات کە پیتێک لە کیتابی الله لە پیتە بڕاوەکان وەک الم و حم عسق وە هاوشێوەکانیان غەیری کەلامی الله یە، وە کەلامی الله پیتەکانی تیا نیە، وە ئەوە وتەی جبریلە، ئەوە قسەی بە خەلقی قورئان کردووە، وە ڕێگاکەی ڕێگای بەندەی بتەکانە .

وە ئەمە سیفەتی ئەشعەریەکانە، ئەڵێن لەفظمان بە قورئان مەخلوقە، وە ئەوەی دەخوێنرێتەوە و تیلاوە دەکرێت گێڕانەوەیە لە کەلامی الله، وە ئەوەی لەنێوان دوو بەرگەکەدا هەیە و نوسراوە پیتەکانی مەخلوقە، ئەوان قسە بە خەلقی قورئان دەکەن بە ناڕاستەوخۆیی) هتد .

ئەشعەریەکانی سەردەمی ابن مندە کوفرەکانیان سوکتر بوو لەمانەی دوایی، جا ئەگەر ابن مندە ئەوانەی سەردەمی خۆی بە کافر دانابێت لەبەر ئەو کوفرانەی هەیانبووە چی بۆ ئەمانەی دوایی کە شەرحی صحیحی البخاري و مسلم ـیان پڕ کردووە لە جەهمیەت و جۆرەها گومڕایی .

- ابن المبرد لە (جمع الجيوش والدساكر على ابن عساكر) ـدا ئەڵێت : (أبو العباس أحمد بن محمد النهاوندي (٣٨٧ هـ) پێشەوایەکی قەدرگران بووە، أبو علي الحداد باسی کردووە، شکۆی بەرز ڕاگرتووە، وە ئەو نکۆڵیکار بووە لەسەر ئەهلی کەلام، وە ئەشعەریەکانی بە کافر داناوە) .

- أبو نصر السجزي (٤٤٤ هـ) لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ـدا ئەڵێت : (أبو محمد بن كلاب و الأشعري و جگە ئەوانیش وتیان : (قورئان غەیر مەخلوقە، وە هەرکەس قسە بە خەلقی قورئان بکات کافرە جگە لەوەی کە الله بە عەرەبی قسە ناکات، وە بە غەیری ئەوە لە زمانەکان، وە گەیاندنی وشەکان و دانان و بەدوایەکداهاتن داخڵی کەلامەکەی نابێت، وە نابێت پیت و دەنگ بێت) وە ڕوونە ئەوانە چیان وتووە کە ئەو قورئانەی نەفی مەخلوقیەتیان کردووە عەرەبی نیە، وە سەرەتا و کۆتایی نیە، وە نکۆڵیکار لە

قورئانی عه‌ره‌بی و ئه‌وه‌ی كه‌لامی الله ـیه كافره به كۆده‌نگی فه‌قیهه‌كان، وه جێگیركه‌ری قورئانی بێ سه‌ره‌تا و بێ كۆتایی كافره به كۆده‌نگیان) .

- الدشـــتي له (إثبات الحد لله) ـــدا وته‌ی أبو طاهر مطيار بن أحمد الرسـتمي الأصبهاني (٤٦٩ هــ) نقڵ ئه‌كات كه ئه‌ڵێت : (ئه‌شعه‌ریه‌كان گومڕا و زه‌ندیقن برای ... ئه‌وانه‌ن كه عوززا و لات ئه‌په‌رستن .

به په‌روه‌ردگاریان كافر بوون به ئاشــكرا وته‌كه‌یان ... خراپترین وته‌یه ئه‌گه‌ر لێی ورد بیته‌وه) .

الحافظ محمد بن عبدالواحد الدقاق له ده‌رباره‌ی أبو طاهر مطيار بن أحمد الرستمي الأصبهاني ئه‌ڵێت : (هیچ پیاوێكم نه‌بینیوه هه‌رگیز له‌و باشتر بێت له داشۆرینی ئه‌هلی بیده‌ع) .

- ابن حزم الأندلســـي (٤٥٦ هــ) كه خۆشی جه‌همیه له سه‌ری له ئاستی زه‌نده‌قه‌ی ئه‌شعه‌ریه‌كان ئه‌سوڕمێت و به‌م وه‌سفانه وه‌سفیان ئه‌كات له (الملل والنحل : ٤/١٥٥) ــــدا فه‌صـلێكی داناوه و ده‌ســت ئه‌كات به قسـه‌كردن له‌سـه‌ریان ئه‌ڵێت : (هه‌رچی ده‌رباره‌ی ئه‌شعه‌ریه‌كان هه‌یه، ئه‌وانه‌ی له به‌غداد و به‌صره بوون)

پاشان كۆمه‌ڵێك وته ده‌گوازێته‌وه كه به كافریان دائه‌نێت چه‌ندین جار، ئه‌مه‌ش گوزارشته‌كانیه‌تی :

له (الملل والنحل : ٤/١٥٦) ــــــدا : (وه ئه‌مه‌ش كوفرێكی ڕاســت و ڕوونه و پێچه‌وانه‌ی الله تعالى و هه‌موو ئه‌هلی ئیسلامه) .

له (الملل والنحل : ٤/١٥٧) ــــدا : (والله ئه‌مه گه‌وره‌تره له وته‌ی گاوره‌كان و داخڵی كوفر و شیرك ئه‌بێت)

له (الملل والنحل : ٤/١٥٨) ــــدا : (وه السـمناني له شـێخه ئه‌شـعه‌ریه‌كانیه‌وه ئه‌ڵێت . . . ئه‌مه ده‌قی وته‌كه‌یه‌تی پیت به پیت كه كوفری ڕاشــكاو و شــیركی ڕوونه، پاشـــان ئه‌و مه‌لعونه كوفری زیاد كرد له‌ســه‌ر كوفر، وه ئه‌مه‌ش شــیركێكه كه هیچ شاراوه‌ییه‌كی تێدا نیه) .

له (الملل والنحل : ١٥٨/٤) ـدا : (وه ئەمەش دەقی وتەی السمناني و محمد بن الحسن بن فورک ــــه له سەرەتای وتەکەیدا له کتاب الأصول، پاک و بڵندی بۆ الله له کوفری ئەم هیچ و پوچه) .

له (الملل والنحل : ١٥٩/٤) ـــــدا : (وه الباقلاني ئەڵێت . . . ئەمەش کوفرێکی سەربەخۆیه) .

له (الملل والنحل : ١٥٩/٤) ـدا : (لەگەڵ ئەوەی وتەکەیان دەربارەی الله تعالى هیچ نیه جگه له قسەی ئەحمەق و بێ عەقڵێک . . . وه پێیان ئەوترێت : قورئان له دوو شت زیاتر نیه، یان کەلامی الله یه یان کەلامی الله نیه، ئەگەر وتیان کەلامی الله نیه ئەوه کافر بوون، چۆن ئەو ئەحمەقانه دەڵێن الله تعالى یەک کەلامی هەیه، ئەمه له کوفرێکی قێزەونه،وه هەموویان دەڵێن هەرگیز جبریل قورئانی دانەبەزاندووه بۆ ســەر دڵی محمد، بەڵکو شــتێکی تری بۆ دابەزاندووه که گوزارشــته له کەلامی الله، وه قورئان هەرگیز لای ئێمه نیه جگه لەم شێوازه مەجازیه نەبێت، وه ئەوەی دەیبینین لەناو موصحەفەکان و دەیبیســتین له قورئانخوێنەکـان و دەیخوێنینەوه لەنـاو نوێژدا و لەبەری دەکەین له ســنگەکانماندا ئەوه هەرگیز قورئان نیه و بەشــێک نیه له کەلامی الله، بەڵکو شــتێکی دیکەیه، وه کەلامی الله جیانابێتەوه له الله تعالى ئەمه له گەورەترین کوفرەکانه) .

له (الملل والنحل : ١٦٠/٤) ـــــدا : (بەڕاســتی وتەی ئەم تاقمه لەم بابەتەدا ئەوپەڕی کوفره به الله تعالى و پێچەوانەی قورئان و پێغەمبەری خوایه، وه پێچەوانەی هەموو ئەهلی ئیسلام و موسڵمانانه پێش دەرکەوتنی ئەم تاقمه مەلعونەش) .

له (الملل والنحل : ١٦١/٤) ـــدا : (السمناني ئەڵێت . . . ئەمه وتەی ئەم فاسقه مولحیدەیه پیت به پیت که ئەمه کوفرێکی تەواوه و بێ عەقڵیه . . . وه هەروەها یەکێکی تر له کوفره ئاشکراکانی ئەم مەلعونه بریتیه له وتەکەی) .

له (الملل والنحل : ١٦٢/٤) ـــــدا : (وه لەســەر ئەم بابەته پێشــەوا محمود بن سبکتکین مەولای پێشەوای ئیمانداران و هاوەڵی خوراسان ڕەحمەتی الله ی لێ بێ ابن فورک ـــی شێخی ئەشعەریەکانی کوشت، الله تعالى بەباشترین شێوه پاداشتی بداتەوه لەســەر ئەو کارەی، وه لەعنەتی الله له ابن فورک و لایەنگران و شــوێنکەوتووانی بێت، لەبەرئەوەی ئەوانی بەرەو کوفرێکی قێزەون برد که وتەیەک بوو بۆ ئەوان لەوپەڕی گومڕایی و هەڵوەشاندنەوەی ئیسلامدا) .

- له (الذيل طبقات الحنابلة) ـدا الشريف أبو جعفر عبدالخالق بن عيسى الهاشمي (٤٧٠ هـ) له مه‌جليسێكدا ئاماژه‌ى كرد بۆ القشيري و ئه‌وانه‌ى له‌گه‌ڵيدا بوون و وتى: (چ سولْحێك له‌نێوان ئێمه‌دا هه‌يه ؟ له‌كاتێكدا سولْح له‌نێوان دوو لايه‌ندا ئه‌بێت له‌سه‌ر ويلايه‌ت يان دونيا يان كێشه‌ى مولْكدارى، به‌ڵام ئه‌و كه‌سانه بانگه‌شه‌ى ئه‌وه ئه‌كه‌ن كه ئێمه كافرين، وه ئێمه‌ش بانگه‌شه‌ى ئه‌وه ئه‌كه‌ين ئه‌وه‌ى باوه‌ڕى به‌وه نه‌بێت كه ئێمه باوه‌ڕمان پێيه‌تى ئه‌وه كافره، جا ئيتر چ سولْحێك له‌نێوانماندا ئه‌كرێت ؟) .

- عبدالوهاب بن عبدالواحد ناسراو به ابن الحنبلي (٥٣٦ هـ) له (الرسالة الواضحة في الرد على الأشعرية) ـدا ئه‌ڵێت : (كۆتا بيدعه كه ده‌ركه‌وت مه‌زهه‌بى الأشعري بوو، وه خاوه‌ن تاريكى و دونياكان دۆستايه‌تيان كرد و سه‌ريان خست، وه قسه‌كه‌ران له‌وه‌ى پێچه‌وانه‌ى شه‌رعه له ئه‌ستێره‌ناسى و فه‌لسه‌فه و مانه‌وه له‌سه‌ر تاريكى و فيسق، وه بزانه ئه‌م بيدعه‌يه خراپترين بيدعه‌يه به ده‌ركه‌وتنى له كۆتا سه‌رده‌مدا، وه بڵاوبوونه‌وه‌ى له ولاته فاسده‌كاندا، وه هه‌ڵگرتنى بانگخوازه‌كانيان به خۆدزينه‌وه و قسه‌ى ڕازاوه، له ناوه‌ڕۆكيدا كوفر گومڕايى هه‌يه، سه‌رده‌مى ئه‌م بيدعه پيسترين سه‌رده‌مه وه شوێنكه‌وتووه‌كانيشى پيسترين ئوممه‌تن وه بانگه‌شه‌كارانى كه‌مترين دينيان هه‌يه له‌م ميلله‌يه) .

- محمد بن عبدالملك الكرجي الشافعي (٥٣٢ هـ) له (الفصول في الأصول عن الأئمة الفحول إلزاما لإهل البدع والفضول) ـدا ئه‌ڵێت : (هه‌ركه‌س بڵێ من له شه‌رعدا شافيعيم و له بيروباوه‌ڕدا ئه‌شعه‌ريم، پێى ده‌ڵێين ئه‌مه له دژيه‌كييه‌وه‌يه نه‌ك ئه‌وه‌ش به‌ڵكو له مورته‌د بوونه‌وه‌وه‌يه، چونكه الشافعي بيروباوه‌ڕى ئه‌شعه‌رى نه‌بووه، وه هه‌ركه‌س بڵێ من حه‌نبه‌ليم له فروعدا و موعته‌زيليم له ئه‌صلدا، ده‌ڵێين گومڕا بوويت له‌و ڕێگايه ڕاسته‌ى بانگه‌شه‌ى بۆ ده‌كه‌ى، چونكه أحمد موعته‌زيلى نه‌بووه نه له دين و نه له ئيجتيهاديشدا) .

وه ئه‌ڵێت : (وه هه‌تا ئێستاش پێشه‌وايه‌كانى شافيعيه‌كان خۆيان ئه‌پارێزن و ڕه‌تى ئه‌كه‌نه‌وه له‌وه‌ى بدرێنه پاڵ الأشعري، وه حاشا ئه‌كه‌ن له‌وه‌ى كه الأشعري مه‌زهه‌به‌كه‌ى خۆيى له‌سه‌ر بنيادناوه، وه ڕێگرى له هاوه‌ڵان و خۆشه‌ويستانيان ئه‌كه‌ن له‌وه‌ى گرنگى پێ بده‌ن) .

- ابن المبرد له (جمع الجيوش والدساكر على ابن عساكر) ــدا ئەڵێت : (الحسن بن محمد الخطيب (٥٣٨ هـــ) پێشەوا بووە، وە شاهیدی دەدا لەسەر الأشعري بە زەندەقە) .

- إبن قدامة المقدسي (٦٢٠ هـ) ـدا لەبارەی هۆکاری زەندەقەی ئەشعەریەکان ئەدوێت و لە کتێبی (حكاية المناظرة في القرآن) ــــدا کە موناقەشەی نێوان خۆی و ئەشعەریەکانی ئەو سەردەمەیە لەدوای باسکردنی جیاوازی نێوان وتەی ئەهلی سوننە و ئەشعەریەکان; وە باسکردنی ئەوەی حەقیقەتی بۆچوونەکەیان ئەوەیە قورئان مخلوق ــە بەڵام ئەیشارنەوە و بە ئاشکرا نایڵێن; ئەڵێت : (ئەم کۆمەڵەیە لەسەر خولگەی وتنی قورئان مخلوق ــە و موافەقەکردنی موعتەزیلەکانن، بەڵام حەزیان کرد پێیان نەزاندرێت هەربۆیە تووشی خۆبەگەورەزانین بەرامبەر شتە ڕوونەکان و، نکۆڵیکردنی ڕاستیەکان و موخالەفەکردنی ئیجماع بوونەوە، وە قورئان و سوننەتیان پشتگوێخست، وە شتێکیان وت کە هیچ موسوڵمان و کافرێک پێش ئەوان نەیوتووە .

وە لە شتە عەجیبەکانیان ئەوەیە ناوێرن وتەکەیان دەربخەن و بە ڕاشکاوی بیڵێن مەگەر لە تەنهاییەکاندا نەبێت، خۆ ئەگەر ئەوانە خاوەن دەسەڵات و دەوڵەت بن; وە ئەو وتەیەیان لێوە بگێڕیتەوە کە باوەڕیان پێیەتی ئەوە ڕقیان لێی ئەبێتەوە و ئینکاری لێ ئەکەن، وە خۆیان دەرناخەن ئیللا بە گەورەڕاگرتنی قورئان و ڕێزگرتن لە موسحەفەکان و هەستان لەبەری نەبێت کاتێک ئەیبینن، وە کاتێک بەس خۆیان ئەبن و تەنها ئەبن ئەڵێن : (تەنها کاغەز و حیبری تێدایە، بۆ چیی تێدایە ؟!)، ئەمەش کاری زەندیقەکانە .

وە وا نازانین لە بیدعەچییەکاندا کۆمەڵەیەک هەبێت وتەکانیان بشارنەوە و نەوێرن بە دەریبخەن ئیللا زەندیق و ئەشعەریەکان نەبن .

وە عەجیب ئەوەیە ئەو ئیمامەیان کە ئەم بیدعەیەی داهێناوە پیاوێکە نەناسراوە نە بە دینداری وە نە بە وەرع وە نە بە هیچ شتێکی تر لە زانستەکانی شەریعەت، وە هیچ زانستێکی نادرێتە پاڵ تەنها زانستی الكلام ی زەمکراو نەبێت .

وە هەر خۆیان دان بەوەدا ئەنێن کە چل ساڵ لەسەر ئیعتیزال بووە پاشان وا دەریخستووە لێی پاشگەز بووەتەوە، وە پاش تەوبەکەی هیچی لێ دەرنەکەوتووە تەنها ئەم بیدعەیە نەبێت، جا چۆن ئەتوانن بیر لەوە بکەنەوە الله هیدایەتی کەس نادات

تەنها دوژمنەکەی خۆی نەبێت، وە هیدایەت دابنێت لەگەڵ کەسێکدا کە نە لە زانستەکانی ئیسلام; وە نە لە دیندا بەشی هەیە .

وە وتەکەی وتەی موعتەزیلەکانە بێگومان، تەنها ئەوە نەبێت ئەیەوێت فێڵ بکات، لە ڕووکەشدا وتەیەک ئەڵێت موافقی وتەی ئەهلی حەق بێت، پاشان لێکی ئەداتەوە بە وتەی موعتەزیلەکان .

خۆ ئەگەر وا بیر بکەنەوە لە مێشکی خۆیاندا کە حەق شاراوە بووە لە رسول الله ﷺ، وە هاوەڵانی و تابیعیەکان پاش ئەوان; وە لە ئەو پێشەوایانەی کە ڕێی دینیان خۆشکرد و شوێن سەلەفی خۆیان کەوتن، وە ڕاستیان لێ شاراوە بووە و بۆیان دەرنەکەوتووە هەتا أبو الحسن الأشعري هاتووە ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە شاراوە بووە لە رسول الله ﷺ و ئوممەتەکەی، ئەوە خاوەن عەقڵگەلێکی هیچ و پووچ و بۆچوونانێکی نزم و لاوازن، چونکە وا بیر ئەکەنەوە حەق و ڕاستی لە دەستی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتووە و هەموو ئوممەت لێی غافڵ بووە و أبو الحسن الأشعري دۆزیویەتیەوە و خەڵکی لێ ئاگادار کردووەتەوە .

خۆ ئەگەر ئەمەیان بۆ بچێتەسەر، ئەوە بۆ کافرەکانی دیکەش ئەچێتەسەر ئەوە بدەنە پاڵ پێغەمبەرەکەمان ﷺ و ئوممەتەکەی کە حەقیان لەلا نەبووە و گومڕا بوون .

وە ئەبێت ئەوانە - **واتە ئەشعەریەکان** - شەریعەتەکەیان شەریعەتی محمد ﷺ نەبێت و دینەکەیان دینی ئیسلام نەبێت، چونکە دینی ئیسلام ئەوەیە کە محمد ﷺ هێناویەتی، وە ئەمەش أبو الحسن الأشعري هێناویەتی کە ئەگەر پێی ڕازی بن و دانی پیادا بنێن بە تەواوی لە ئیسلام چوونەتە دەرەوە) .

پاشان باسی هەندێک لە زەندەقە و جەهمیەتیەکانیان ئەکات و ئەڵێت : (ئەمە ئەو دووڕوویییەیە کە لە سەردەمی رسول الله ﷺ دا هەبوو، وە ئەوە زەندەقەی ئەمڕۆیە، ئەوەش بریتیە لە پیشاندانی موافەقەکردنی بیروباوەڕی موسوڵمانان لە ڕووکەشدا، وە داشاردنی پێچەوانەی ئەوە لە ناخدا، ئەمە حاڵی ئەم کۆمەڵەیەیە، ئەمانە زەندیقن بەبێ گومان، چونکە گومان نییە ئەوان وا پیشان ئەدەن ڕێز لە موسحەفەکان ئەگرن تا وای پیشان بدەن قورئانی تێدایە، بەڵام لە ناخدا باوەڕیان وایە جگە لە کاغەز و حیبر هیچی تێدا نییە .

وا پیشـــان ئەدەن قورئان بە گەورە ڕابگرن کەچی باوەڕیان وایە لە نووســـین و دەربڕینی جبریل ـە .

وە وا پیشـــان ئەدەن موســـی علیه الســـلام گوێبیســـتی کەلامی الله بووە لە الله، پاشان ئەڵێن : (بەبێ دەنگ) .

وە لە نوێژەکانیاندا ئەڵێن : (أشـــهد أن محمدا رســـول الله) وە باوەڕیان وایە پەیامەکەی پچڕاوە بە وەفاتی، وە ئیتر رسول ـی الله نییە، وە رسول ـی الله بووە لە کاتی ژیانیدا .

وە حەقیقەت و ڕاستی بۆچوونەکەیان ئەوەیە : نە لە ئاسمان پەرستراوی لێیە، وە نە لە زەوی قورئانی لێیە، وە نە محمد رسول الله یە ﷺ .

وە لەناو هەموو بیدعەچیەکاندا هیچ کەســـانێک نین بە پێچەوانەی ئەوە خۆیان پیشـــان بدەن کە باوەڕیان پێیەتی جگە لە ئەوان نەبێت، وە ئەوانەش کە لەوان ئەچن لە زەندیقەکان) .

- وە لە (الرسالة في القرآن وكلام الله) ـدا ئەڵێت : (پێمان بڵێن ئایا ئەم گومڕایی و وتە پیســـانەتـان لەلای کێ بینیوەتەوە لە ســـەلەف ئیللا لەلای پێشـــەواکەتـان بۆ جەهەننەم نەبێت - واتە أبو حســـن الأشـــعري -، ئەوەی کە بووەتە بەڵا و مەینەتی بۆتان لەســـەر ڕێگەی ڕاســـت; ئەوەی کە هیچ فەزیلەت و گەورەییەکی نەزانراوە لە زانســـتی شـــەرعی و دینی قبووڵکراودا تەنها زانســـتی الكلام ـــــی زەمکراوی شـــوم نەبێت کە هیچ خێرێکی تیادا نییە) .

وە ئەڵێـت : (ئەو کـافرانەی کە ئیمـان نـاهێنن بە قورئان نزیکترن لە عوذر لە نکۆڵیکردنیان لە قورئان لە ئەوانەی کە ئەڵێن کە ئیمانی پێ ئەهێنن پاشـان بەبێ بەڵگە وازی لێ ئەهێنن و فەرامۆشی ئەکەن) .

- ابن رجب لە (الذيل طبقات الحنابلة) ـدا دەربارەی عبدالساتر بن عبدالحميد المقدســـي (٦٧٩ هـــــ) ئەڵێت : (موناظەڕەی لەگەڵ دژەکان کرد و بە کافری دانان، وە خاوەن ئازایەتی بووە، وە ئاگری لە ئەشعەریەکان بەردا) .

- إبن تيمية لە (التســـعينية) ـــــدا خۆی ئەیگێڕێتەوە (دوو نوێنەر هاتنە لامان بە پەڕەیەک کە ســـەلمێندراو بوو لەلایەن دادوەر أبو الحســـن علي بن مخلوف المالكي) کە

ئەویش ئەشعەری بوو و لە قوتابیەکانی العز بن عبدالسلام بوو، ابن تيمية ش وەڵامی بۆ نارد، دوای ئەوە گەڕانەوە، ئەڵێت : (دوای ئەوە گەڕانەوە بەبێ وەڵامێکی بەدەستهێنراو جگە لەوە نەبێت کە داوایان دەکرد من بچمە بەردەمیان، منیش زۆر بە ڕەقی وەڵامم دانەوە، وە بە دەنگێکی بەرز پێم وتن ئەی ئەوانەی کە دینتان گۆڕیوە، ئەی مورتەدەکان لە شەریعەت، ئەی زەندیقەکان، وە زۆر قسەی تر، دوای ئەوە هەستام و داوای کردنەوەی دەرگاکەم کرد و گەڕامەوە بۆ شوێنەکەم) .

- لە (الجامع لسيرة شيخ الإسلام : ٥٠) ــدا هاتووە : هەندێک لە شێخە تەدموریەکان لەنزیکی ساڵی (٧٠٨) هاتن بۆلای ابن تيمية و وتیان : (گەورەم قسەیەک هەیە پێیان وتووین کە بیگەیەنین پێت، وە سوێندیان داوین جگە لە ئێمە کەس نەیبیستێ کە تۆ تەنازول بکەی لە مەسەلەی عەرش و قورئان، وە دەستنووسی خۆتمان بۆ بنووسی، ئەیبەین بۆ سوڵتان و پێی ئەڵێین لەسەر ئەمە ابن تيمية مان گرتبوو و ئێستا گەڕاوەتەوە، دوای ئەوە خۆمان پەڕەکە ئەدڕێنین) .

پێی وتن : (ئێوە من بانگ دەکەن بە دەستنووسی خۆم بنووسم کە پەروەردگارێک نیە لەسەروو عەرشەوە بپەرسترێ، وە لە موصحەفەکاندا قورئان نیە، وە لەسەر زەوی کەلامی نیە، جامانەکەی دا بە زەویدا و هەستایە سەر پێ و سەیری ئاسمانی کرد و وتی: یا الله من تۆ دەکەم بە شاهید کە ئەوانە بانگم دەکەن بۆئەوەی کافر بم بە تۆ و بە کتێبەکان و بە نێردراوەکانت، وە ئەمە شتێکە کە نایکەم) دواتر دوعای لێ کردن.

- وە (بيان تلبيس الجهمية) ــدا ئەڵێت : (وە لەبەر ئەوەیە کە الرازي - فخر الرازي - دان ئەنێت بەوەی کە جیاوازی نێوان ئەوان و موعتەزیلە لە بینینی الله دا جیاوازییەکی زارەکیە جا بزانە کە ناخی ئەوانە ناخێکی موعتەزیلی جەهمی پەکخەرە ئەگەر بێتو ڕوکەشیشیان ڕوکەشی ئەهلی جێگیرکردن بێت - جێگیرکردنی سیفەتەکان بەبێ پەکخستن و تەئویل و تەشبیهـ و چۆنێتی بۆدانان - وەک چۆن کاری موعتەزیلەکان هەمان کاری مولحیدە پەکخەرەکانی ناو و سیفەتەکانە بە تەواوی لەگەڵ ئەوەی وا خۆیان دەرئەخەن کە وەلامیان ئەدەنەوە، حەقیقەتی مولحیدەکانیش ئەوەیە کە بە تەواوی نکۆڵی لە بوونی درووستکەر دەکەن ئەمەش دوای لێکۆڵینەوە بەدواداچوون) .

- لە (الدرر السنية) ــدا محمد بن عبدالوهاب (١٢٠٦ هـ) ئەڵێت : (کافرەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو گەورەترین خوایە، بەڵام هەندێک خوای تر هەن

لەگەڵیدا شەفاعەت دەکەن لای، وە ئەو موتەکەلیمانەشی بانگەشەی ئیسلام دەکەن، بەڵام الله گومڕای کردوون لە ناسینی خوا، دەگێڕنەوە لە الأشعري و ئەوەشی شوێنی کەوتووە: کە ئەو بەتوانایە، وە ئولوهیەت توانا و قودرەتە).

- عبدالرحمن بن حسن بن محمد بن عبدالوهاب (١٢٨٥ هـ) لە (المطلب الحميد في بيان مقاصد التوحيد) ـدا ئەڵێت: (وە ئەو تاقمەی دەدرێتە پاڵ أبي الحسن الأشعري وەسفی پەروەردگاری جیهانیان ئەکەن بە سیفاتێکی نەبوو و بێ گیان، گەورەترین بوختانیان هەڵبەست لەسەر الله وە پێچەوانەی ئەهلی حەقیان کرد لە سەلەف و پێشەوایان و شوێنکەوتووانیان).

وە ئەڵێت: (ئەم تاقمە بەلاڕێداچووە لە حەق شەیتانەکانیان بەرەلا کردووە بۆ لابردنی خەڵک لەسەر ڕێگاکە، نکۆڵی تەوحیدی الله یان کرد لە خوایەتی و ڕێگایان بە شیرک دا کە لێی خۆش نابێ، وە ڕێگایان دا جگە لەو بپەرسترێ، وە نکۆڵی تەوحیدی سیفەتەکانیان کرد بە پەکخستن، پێشەوایانی ئەهلی سوننە و شوێنکەوتووەکانیان دانراوی ناسراویان هەیە لە ڕەدی ئەم تاقمە کافرە نکۆڵیکارە، هەموو شوبهەکانیانیان پوچەڵ کردووەتەوە تیایدا و حەقیان تیادا دەرخستووە کە بەڵگەی لەسەرە لە کیتابی الله و سوننەتی نێردراوەکەی و ئەوەشی سەلەفی ئوممەت و پێشەواکانی لەسەری بوون).

- ابن أبي العز الحنفي (٧٩٢ هـ) لە (شرح عقيدة الطحاوية) ـدا ئەڵێت: (وە سێیەمیان: ئەوە یەک مانای هەیە و ڕاوەستاوە بە زاتی الله، ئەوە فەرمان و ڕێگری و هەواڵ و هەواڵ لێ دانە، وە ئەگەر گوزارشتی لێکرا بە عەرەبی ئەوە قورئانە، وە ئەگەر گوزارشتی لێکرا بە عیبری ئەوە تەوراتە، وە ئەمەش وتەی ابن كلاب و ئەوەی پشتگیریەتی وەک الأشعري و جگە ئەویش).

دواتر ئەڵێت: (وە بێگومان هەرکەس بڵێت کە کەلامی الله یەک مانای هەیە و ڕاوەستاوە بە نەفسیەوە، وە تیلاوەکراو و حیفظکراو و گوێلێگیراو لە قورئان خوێنەکە گێڕانەوەیە لە کەلامی الله و مەخلوقە، ئەوە وتوویەتی قورئان مەخلوقە بەهەمان مانا و هەستی پێ ناکا، لەبەرئەوەی الله تعالى ئەفەرمووێت: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ﴾ (الإسراء: ٨٨)، ئەبینێت الله تعالى ئاماژە ئەکات بۆ ئەوەی لەناو نەفسیدایە یان بۆ تیلاوەکراو و گوێلێگیراو؟

ئەگەر وتیان ئەوە ئاماژەیە بۆ گێڕانەوە لەوەی لە نەفسیدایە و گوزارشتە لێی و وە ئەوە تیلاوەکراو و نوسراو و گوێلێگیراوە، ئەمە وتەیەکی ڕاشکاوە بەوەی قورئان مەخلوقە، بەڵکو لەوەدا کافرترن لە موعتەزیلە) .

## ئەوانەی کە خاوەنی ئەو وتانەیان بە کافر داناوە کە ئەشعەریەکان ئەیڵێن :

- ابن خزيمة (٣١١ هـ) لە (الأسماء والصفات) ـدا ئەڵێت : (هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات کە الله تعالى قسەی نەکردووە جگە لە یەک جار وە قسەش ناکات جگە لەوەی کردوویەتی دواتر قسەکانی پچڕاوە ئەوە کافر بووە بە الله، بەڵکو تا ئێستاش الله قسەکەرە، وە قسەش دەکات، نمونە نیە بۆ کەلامەکەی) .

- ابن بطة العكبري (٣٨٧ هـ) لە (الإبانة الكبرى) ـدا ئەڵێت : (بزانن ڕەحمەتی الله تان لێبێ کە پۆلێک لە جەهمییەکان باوەڕیان وایە بە فێڵی دڵەکانیان، وە پیسی ڕایەکانیان، وە قێزەونی ئارەزووەکانیان، کە قورئان مەخلوقە، خۆیان شاردەوە لەمە بە بیدعەیەک کە دایانهێنا، بۆ خۆشاردنەوە لەپێش چاوی عامەی خەڵکی، بۆ شاردنەوەی کوفرەکەیان، وە ئیلحادەکەیان نارِوون دەکەن لای ئەو کەسەی عیلمی کەم پێ بێ، وە بەرگری لاواز بێ، دەڵێن: ئەو قورئانەی الله قسەی پێکردووە و وتوویەتی ئەوە کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە، وە ئەوەش تیلاوەی دەکەین و دەیخوێنینەوە بە زمانمان، وە دەینووسین لە موصحەفەکانماندا ئەو قورئانە نیە کە الله قسەی پێکردووە، ئەوە گێڕانەوەیە لەوە، ئەوەی دەیخوێنینەوە گێڕانەوەیە لەو قورئانە بە لەفظی ئێمە، وە لەفظمان مەخلوقە پێی، وردن لە کوفرەکەیان، وە فێڵیان کرد بۆ کوفر خستنەناو عامەی خەڵکی، بە نارِوونترین ڕێگا) .

- اللالكائي الشافعي (٤١٨ هـ) لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة) ـدا ئەڵێت : (قورئان الله قسەی پێکردووە بە حەقیقی، وە ئەویش دایبەزاندووەتە سەر محمد ﷺ، وە فەرمانی پێکردووە کە تەحەدای پێوە بکات، وە خەڵکی بۆ لا بانگ بکات، وە ئەو قورئانە لەسەر حەقیقی تیلاوە کراوە لە میحرابەکان، نوسراوە لە موصحەفەکان، و پارێزراوە لە سینگی پیاوەکان، گێڕانەوە و گوزارشت نیە لە قورئان، وە ئەوەش یەک قورئانە و غەیر مەخلوقە، وە ساختە و گوماناوی نیە، بەڵکو سیفەتێکە لە

سـیفەتەکانی زاتی خۆی، تا ئێســتاش قســەکەرە پێی، وە هەرکەس جگە لەمە بڵێ ئەوە کافرێکی گومڕای گومڕاکەری موبتەدیعە پێچەوانەکاری ڕێبازی سوننە و جەماعەیە).

- عبدالغني المقدسي (٦٠٠ هـــ) لە (الاقتصــاد في الاعتقاد) ـــــدا ئەڵێت:
(بیروباوەڕمان وایە پیتە نوســراوەکان و دەنگە بیســتراوەکان هەمان کەلامی الله یە، نە گێڕانەوەیە و نە گوزارشتە لێی).

دواتر ئەڵێت: (جا هەرکەس نەڵێ ئەم پیتانە هەمان کەلامی الله یە ئەوە دەرچووە لە دین، وە دەرچووە لە کۆمەڵی موسڵمانان).

- عبدالقادر الجيلاني الحنبلي (٥٦١ هـــ) لە (الغنية لطالبي طريق الحق) ـــــدا ئەڵێت: (هەرکەس وا گومان بەرێ قورئان مەخلوقە یان گوزارشـــتە لێی، ئەوە کافرە بە الله ـــــی مەزن، تێکەڵی ناکرێت، نانی لەگەڵ ناخورێت، زەواجی لەگەڵ ناکرێت، دراوسـێیەتی لەگەڵ ناکرێ، بەڵکو هەجر ئەکرێت و سـوکایەتی پێ ئەکرێ، وە نوێژی لە پشـــتەوە ناکرێت، وە شـــاهیدی لێ قبوڵ ناکرێت، وە ویلایەتەکەی درووســـت نیە لە نیکاحدا، وە نوێژی لەســـەر ناکرێ کاتێک مرد، ســێ ڕۆژی پێ ئەدرێت وەک مورتەد بۆ گەڕانەوە، یان ئەگەڕێتەوە یان ئەکوژرێت).

- سـليمان بن سحمان النجدي (١٣٤٩ هــ) لە (كشف الأوهام) ــدا ئەڵێت:
(الخلال لە السـنة ئەڵێت هەواڵی پێدام علي بن عيســى كە حنبل بۆی گێڕاونەتەوە کە گوێی لێبووە أبا عبدالله الإمام أحمد وتوویەتی: (هەرکەس بانگەشـــەی ئەوە بکا کە الله قســەی نەکردووە لەگەڵ موســـا ئەوە کـافر بـووە بە الله عـز وجـل وە قـورئانی بەدرۆخسـتووەتەوە وە ڕەدی رسـول الله ـــــی ﷺ داوەتەوە، تەوبەی پێ ئەکرێ لەو وتەیە، یان دەگەڕێتەوە یان دەدرێ لە گەردنی) ئەمە وتەی الإمام أحمد بوو دەربارەی کەسـێک نەفی سـیفەتی کەلام بکا ئەی چی بۆ کەسـانێک کە بەسـەروو ئەوەوە نەفی بڵندێتی الله بەســەر درووســتکراوەکانی و بەرزبوونەوەی بۆســەر عەرش بکەن، وە بانگەشەی ئەوە بکەن کە لە ناو جیهاندا نیە و لە دەرەوەشی نیە و پەیوەست نیە پێوەی و لێشـــی جیا نیە و تێکەڵی نیە، ئایا وای دەبینی کە ئەو - واتە الإمام أحمد - گومانی هەبێت لە کوفری ئەوانە؟).

**٧٨٢ - الهروي** ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم وتی : أبو سعد الزاهد الهروي ــــم بینی هات بۆ حەلقەیەکی مونازەرەکردن لە مزگەوت و نەعلەکانی بە دەستیەوە بوون، وتی : (هەستن، لە دیندا دەمەدەمێ و جیدالکردن نییە) .

**٧٨٣ - أبو الحسين طاهر بن محمد المالیني** ئەڵێت : وترا بە أبو سعد الزاهد : أبو الحسن الديناري لەلای سبکتکین - **ی دەسەڵاتدار** - بەرگری لێ کردوویت .

وتی : (لەعنەتی الله ی لێبێت چونکە کوللابیە - **واتە الديناري** - ) .

# چینی نۆیه‌م

٧٨٤ - سهل بن محمد الصعلوكي ئه‌ڵێت : (كه‌مترین خه‌ساره‌تمه‌ندی كه له الكلام دا هه‌یه كه‌وتن و نه‌مانی گه‌وره‌یی الله یه له دڵدا) .

- له (مختصر الحجة) ـدا أبو القاسم الجنيد ئه‌ڵێت : (كه‌مترین شت كه له الكلام ـــدا هه‌یه بریتیه له كه‌وتنی شـــكۆی په‌روه‌ردگاری جیهانیان له دڵدا، وه دڵ كاتێك داماڵدرا له شكۆی الله عز وجل ئه‌وه داماڵدراوه له ئیمان) .

- له (مختصر الحجة) ـدا سهل بن عبدالله ئه‌ڵێت : (الكلام له دیندا بۆ ئه‌هلی سـونه بیدعه‌یه، وه كه‌مترین بیدعه ئه‌وه‌یه بوه‌سـتێت له به‌ده‌سـتهێنانی زانسـت، وه سزای الكلام له دیندا سێ شتی به‌په‌له و پێشخراوه :

یه‌كه‌میان : دین ته‌نك ئه‌كاته‌وه .

دووه‌م : شوێنێك نابینێته‌وه له دڵیدا بۆ فه‌رمان و نه‌هی الله عز وجل .

سێیه‌م : شایه‌تی ئه‌دات به كوفر به‌سه‌ر كه‌سێكدا كه به بێگومانی ئه‌زانێت له ئه‌و به‌ته‌قواتر و به‌وه‌رعتر و باشتره له‌لای الله تعالى) .

٧٨٥ - منصور بن العباس ئه‌ڵێت : ئه‌وه‌نده بیستوومه له أبو الطيب ـــه‌وه نـاتوانم بیژمێرم وتوویه‌تی : (ڕێگریتـان لێ ئه‌كه‌م له الكلام و ئێوه‌ش ئه‌گه‌ڕێنه‌وه سه‌ری ؟! له‌لای الله یه‌ك ئه‌بینینه‌وه) .

٧٨٦ - الهروي ئەڵێت : گوێبیســـتی عبدالواحد بن أحمد بووم ئەیوت : گوێبیســـتی أبو الطیب الصـــعلوكي بووم ئەیوت : (کاتێک باوکم وەفاتی کرد و مەجلیســـێکی فیقهم دانا داوایان لێ کردم مەجلیســـێکی الكلام دابنێم و وتیان : (ئەوە لە مەجلیسەکانی باوکتە، جا وازی لێ مەهێنە و مەیبڕە) .

هەر بەو شـــێوەیە بەردەوام بوون لەگەڵم هەتا ئامادەبووم لە مەجلیســـێکی الكلام) .

الهروي ئەڵێت : (بابەتێک باســـکرا کە عبدالواحد باســـی کرد وە من شـــەرم ئەکەم لە الله عز وجل باسی بکەم) .

أبو الطیـــب وتی : (منیش هەســـتـام و دەنگم بەرز کردەوە و پەردەکەم بەرزکردەوە و دوای ئەوە ئامادەی هیچ مەجلیسێکیان نەبووم) .

---

**- أبو نصر المقدسي لە (مختصر الحجة) ـــدا ئەڵێت : (أبو محمد عبدالله بن أبي زید - إبن أبي زید القیرواني المالكي ناسراو بە مالک ـــی بچوک - پرسیاری کرد لە أبو عمر أحمد بن محمد بن ســـعدي المالكي کاتێک گەیشـــتە القیروان، وە أبو عمر کاتێک چووبوویە بغداد ـەوە کە أبي بكر محمد بن عبدالله بن صالح الأبهري لە ژیاندا بوو .**

**إبن أبي زید پێی وت : (ئایا ئامادەی دانیشتنەکانی ئەهلی الكلام بوویت ؟) .**

**وتی : بەڵێ، دووجـار ئامـادە بووم، دواتر وازم لە دانیشـــتنەکـانیـان هێنـا و نەگەڕامەوە بۆی .**

**إبن أبي زید پێی وت : (بۆچی ؟) .**

**وتی : یەکەم دانیشتن کە ئامادەی بووم بینیم دانیشتنێکە کە هەموو کۆمەڵەکان تیایدا کۆبوونەتەوە، موســـوڵمانان لە ئەهلی ســـوننە و بیدعە، کافرەکان لە مەجوس و دەهری و زەنـدیق و یەهودی و نەســـڕانیەکـان و جۆرەکـانی دیکەی کوفر، وە هەموو کۆمەڵەیەک سـەرۆکێکی خۆی هەبوو قسـە ئەکرد دەربارەی مەزهەبەکەی و موجادەلەی**

**لەســـەر ئەکرد، جا هەرکاتێک ســـەرگەورەی هەر کۆمەڵەیەک بهاتایە ئامادەبووان هەڵئەستانەوە; وە کاتێک ئەو دابنیشتایە ئەوانیش دائەنیشتن .**

**کاتێک مەجلیســـەکە پڕ بوو و زانیان کەس نییە چاوەڕێی بکەن یەکێک لە کافرەکان وتی : کۆبوونەتەوە بۆ مونازەرە کردن، جا با موســـوڵمانەکان بەڵگەمان دژ نەهێننەوە بە کتێبەکەیان، وە بە وتەی پێغەمبەرەکەیان، چونکە ئێمە باوەڕمان بەوە نییە و دانی پیادا نانێین، بەڵکو مونازەرە ئەکەین بە بەڵگە عەقڵیەکان، وە ئەوەی تێگەیشتن و قیاس هەڵیئەگرێت .**

**ئەوانیش ئەیانوت : بەڵێ، ئەوە بۆ ئێوەیە .**

**جا کاتێک ئەوەم بیست ئیتر نەگەڕامەوە بۆ ئەو دانیشتنە .**

**پاشان پێم وترا : ئەمە دانیشتنێکی تری الکلام ە .**

**منیش ڕۆیشـــتم و بینیم لەســـەر هەمان ڕێچکەی هاوەڵانیانن، ئیتر وازم لە دانیشتنەکانی الکلام هێنا و نەگەڕامەوە بۆی .**

**إبن أبي زيد پێی وت : (وە موسوڵمانانیش ڕازی بوون بە ئەو کردەوە و وتەیە ؟!) .**

**وتی : من ئەوەم لێ بینی .**

**إبن أبي زيد زۆر سەری سووڕما و وتی : (زانایان ڕۆیشتن، وە حورمەت و مافەکانی ئیســـلام ڕۆیشـــت، چۆن موســـوڵمانان ڕێگە ئەدەن بە مونازەرە لەنێوان موســـوڵمانان و کافراندا لەکاتێکدا ئەمە نابێت ڕێگەی پێ بدرێت ئەنجام بدرێت لەگەڵ بیدعەچیەکاندا کە موسوڵمانن و شانازی ئەکەن بە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ) .**

**٧٨٧ - عبدالرحمن بن محمد بن الحســين** ئەڵێت : (بينيم أبو حامد الإسفراييني و أبو الطيب الصعلوكي و أبو بكر القفال المروزي و أبو منصور الحاكم ئینکاریان ئەکرد لە الكلام و ئەهلەکەی) .

٧٨٨ - أبو عمر البسطامي ئەڵێت: (أبو الحسن الأشعري یەکەمجار خۆی ئەدایە پاڵ موعتەزیلەکان، پاشان لێیان تەکیەوە و قسەی لەسەر کردن، وە بەڕاستی مەزھەبەکەی بریتیە لە پەکخستن، تەنها ئەوە نەبێت لە ڕاشکاوبوونەوە گەڕایەوە بۆ پێچ و پەنالێدان و داشاردن).

**: واتە أبو الحسن لەکاتی موعتەزیلەبوون و بنیاتنانی ئەشعەریەتدا ھەر جەھمیەکی پەکخەر بووە، تەنھا ئەوەی جیاواز بووە کاتێک لە موعتەزیلەبوون پاشگەزبووەتەوە و لە پەکخستنی سیفەتەکان پاشگەز نەبووەتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی دیبلۆماسی ڕەتی کردوونەتەوە؛ وەکو کوردەواری ئەڵێت نە شیش بسوتێت نە کەباب، ویستوویەتی بەم ڕەددانەوەیەی موعتەزیلەکان خۆی لەلای شوێنکەوتووانی سەلەف لەوکاتەدا خۆشەویست بکات.**

**- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ـدا ئەڵێت: (محمد بن عبدالله المالكي المغربي کە فەقیھێکی پیاوچاکە ئەگێڕێتەوە لە الشیخ أبو سعید البرقي کە لە شێخە فەقیھەکانی مالیکیەکانە لە برقة لە مامۆستاکەی خلف المُعلِّم لە فەقیھەکانی مالیکیەکانە کە وتوویەتی: (أبو الحسن الأشعري چل ساڵ لەسەر ئیعتیزال مایەوە، پاشان تەوبەی دەرخست، جا لە فەرعەکان گەڕایەوە و لەسەر بنچینەکان بە جێگیری مایەوە).**

**ئەمەش وتەی کەسێکە کە شارەزایە بە مەزھەبی الأشعري و قوڵاییەکەی).**

٧٨٩ - الھروي ئەڵێت: گوێبیستی أحمد بن أبي رافع و چەند کەسێکی تر بووم باسی توندی أبو حامد الإسفراییني یان ئەکرد لەسەر الباقلاني.

وە أحمد وتی: (وە من نامەکەی أبو سعید ـم گەیاند بە سالم ـی کوڕی تیایدا نووسیبووی: ئەگەر ئەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ ھراة ئەوە نزیکی الباقلاني مەکەوەرەوە).

: ئەشـــعەریەکان بۆ ڕەواجدان بە کوفر و بیدعە و زەندەقەکانیان خۆیان ئەدەنە پاڵ ئیمامی الشـافعي و مەزهەبەکەی، بەڵام لە ڕاسـتیدا هیچ پەیوەندیان پێوەی نییە و بگرە زۆریش دوورن لێیەوە، وە أبي حامد الإسـفراييني (٣٤٤ - ٤٠٦ هـــ) رحمه الله کە شێخی شافیعیەکان بووە و بە موجەدیدی سەدەی چوارەم دەستنیشان کراوە زۆر توند بووە لەسەر ئەشعەریەکان بە گشتی و بە تایبەتیش الباقلاني الأشـعري الجهمي، وە أبو الحسن محمد بن عبدالملک الکرجي الشافعي (٤٥٨ - ٥٣٢ هــ) هەڵوێستی توندی أبي حامد بەرامبەر ئەشعەریەکان و ئەهلی الکلام لە کتێبی (الفصول في الأصول عن الأئمة الفحول إلزاما لإهل البدع والفضول) ڕوون ئەکاتەوە .

- إبن تيمية لە (درء التعارض بين العقل والنقل) وتەی الکرجي نقڵ ئەکات و ئەڵێت : (الشیخ أبو الحسن الکرجي ئەڵێت : گوێبیستی شێخەکەم ئیمام أبو منصور ــی فەقیهی الأصبهاني بووم وتی گوێبیستی شێخەکەمان ئیمام أبو بکر الزاذقاني بووم وتی : لە مەجلیسی وانە وتنەوەی الشیخ أبي حامد الإسفراييني ـــدا بووم، وە ڕێگری و نەهی ئەکرد لە ئەهلی الکلام و ڕۆیشتن بۆ لای الباقلاني، جا پێی گەیشتبوویەوە کە کۆمەڵێک لە هاوەڵەکانی بەدزیەوە ئەچنە لای بۆ خوێندنی الکلام، جا وای زانی منیش لەوانەم، بۆیە پێی وتم : ' ئەی کوڕی خۆم، پێم گەیشـــتووەتەوە کە ئەچیتە لای ئەو کابرایە - واتە الباقلاني -، جا ئاگاداری خۆت بە، وە ئاگاداری ئەویش بە، چونکە ئەوە بیدعەچییە و خەڵکی بانگ ئەکات بەرەو گومڕایی، جا ئەگەر وات نەکرد مەیەرە مەجلیسی من ' .

منیش وتم : پەنا ئەگرم بە الله لەوەی کە وتراوە، وە تۆبە ئەکەم، وە شـایەتیم دا بەوەی کە نەچوومەتە لای) .

الشـــیخ الکرجي ئەڵێت : (الشـــیخ أبو حامد الإســـفراييني زۆر توند بوو لەســـەر الباقلاني و هاوەڵانی الکلام) .

وە ئەڵێت : (وە هەتا ئێستاش پێشەوایەکانی شافیعیەکان خۆیان ئەپارێزن و ڕەتی ئەکەنەوە لەوەی بدرێنە پاڵ الأشـــعري، وە حـاشـــا ئەکەن لەوەی کە الأشـــعري مەزهەبەکەی خۆیی لەسەر بنیادناوە، وە ڕێگری لە هاوەڵان و خۆشەویستانیان ئەکەن لەوەی گرنگی پێ بدەن .

وەکو ئەوەی گوێم لێبووە لە شـێخ و پێشـەواکانمان، لەوانەش الحافظ المؤتمن بن أحمد بن علي الساجي ئەڵێن : بیستمان لە کۆمەڵێک شـێخی جێمتمانە وتیان : الشـیخ أبو حامد الإسـفراییني پێشـەوای پێشـەواکان، ئەوەی کە زانسـت و هاوەڵەکانی سـەر زەویان تەنیوە، کاتێک جومعە برۆشـتایە بۆ مزگەوت ڕووی ئەکردە ئامادەبووان و ئەیوت : ' شایەتی ئەدەم بەوەی کەلامی الله غیر مخلوق ـــ وەک چۆن ئیمام أحمد بن حنبل ئەڵێت، نەک وەکو ئەوەی الباقلاني ئەیڵێت '، وە ئەمەی لە جومعەکاندا دووبارە ئەکردەوە، جا پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ئەوە، ئەویش وتی : ' بۆ ئەوەی لەلای خەڵکی و لەلای ئەهلی چاکەخوازان و لە هەموو شـوێنێکدا بڵاو ببێتەوە کە من بەریم و حاشـا ئەکەم لەوەی کە ئەوانە - واتە ئەشـعەریەکان - لەسـەرین، وە حاشـا ئەکەم و بەریم لە مەزهەبەکەی الباقلاني، چونکە کۆمەڵێک لە فەقیهە غەریبەکان بەدزیەوە ئەچنە لای و شـــت ئەخوێنن لەلای، جـا تووشـــی فیتنە ئەبن بەو هۆیەوە، هەر کە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان بە دڵنیاییەوە بیدعەکەی خۆیان دەرئەخەن، جا خەڵکی وا ئەزانن لە منەوە فێری بوون، بەڵام من هیچی وام نەوتووە، وە من بەریم و حـاشـــا ئەکەم لە مەزهەبی الباقلاني و عەقیدەکەی ' ) .

الشیخ أبو الحسن الكرجي ئەڵێت : (گوێبیستی ئیمامی فەقیهـــ أبو منصور سعد بن علي العجلي بووم وتی گوێبیستی کۆمەڵەیەک لە شێخ و ئیمامەکان بووم لە بەغداد ئەیانوت : أبو بكر الباقلاني بەعاباوە ئەچوو بۆ حەمام، لەبەر ترسی لە الشـیخ أبو حامد الإسفراییني) .

الشـیخ أبو الحسـن الكرجي ئەڵێت : (ئەم توندیەی الشـیخ أبي حامد بەرامبەر ئەهلی الكلام شتێکی ناسراوە، بگرە هەستا بە جیاکردنەوەی أصول الفقه ـــی الشافعي لە أصول ـــی الأشـعري، وە أبو بكر الزاذقاني لێی وەرگرتووە و ئێستا لەلای منە . . . وە ئەشـعەریەکانی لە هاوەڵانی الشـافعي هەژمار نەکردووە، وە الفقه و أصول الفقه ـــی لە مەزهەبەکەی ئەوان پاک کردەوە، چجای بکات بە ئەسـڵەکانی دین - واتە عەقیدە - ) هتد .

واتە لەلای شـافیعی مەزهەبەکانی سـەرەتا ئەشـعەریەکان لە بابەتی فیقهیشـدا لەسەر مەنهەجی ئیمامی الشافعي نەبوون چجای بگات بە بابەتی عەقیدە .

وە کەسانی وەکو الباقلاني لە ڕووکەشدا وتەی ئەهلی سوننە ئەڵێن و خۆیان وا پیشان ئەدەن کە لەسەر عەقیدەی ئەوانن، دواتر وردە وردە ژەهری جەهمیەتەکەیان ئەڕێژن کاتێک کەسێک تێکەڵیان بوو .

- أبو نصر السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ـدا ئەڵێت : (وە هەر لەم چوارچێوەیەشدا شاردنەوەی مەزهەبە لە کۆمەڵەیەک و دەرخستنیەتی بۆ کۆمەڵەیەکی تر، ئەمەش وەکو زەندەقە وایە .

بەم کارە بەشێکی زۆر لە کەسە ئاساییەکان و ئەوانی تازە دەستیان کردووە بە بەدەستهێنانی زانست چوونە ناو مەزهەبەکەیانەوە، چونکە لە سەرەتادا وا پیشان ئەدەن کە موافقەی ئەکەن، وە ئەوە بەدرۆ ئەخەنەوە هەتا ڕاوی ئەکەن، جا کە گرتیان وردە وردە ڕایئەکێشن هەتا ڕایئەماڵدرێت لە سوننەت .

وە أبو بكر الباقلاني زۆر ئەم ڕێگەیەی بەکار ئەهێنا، کتێبەکانی پڕ کردووە بە مەدح و پیاهەڵدانی هاوەڵانی فەرموودە، وە لە ڕووکەشدا بەڵگەی بە فەرموودەکان هێناوەتەوە، وە زۆر ستایشی أحمد بن حنبل ـی رحمه الله کردووە، وە لە چەند نامەیەکیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەو - واتە ئیمام أحمد - الكلام ـی ئەزانی، وە هیچ خیلافێک نییە لە نێوان أحمد و أبو الحسن الأشعري، ئەمەش لە تەنکی دین و کەمی حەیا و شەرمەوەیە) .

٧٩٠ - الهروي ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم ئەیوت : (گوێبیستی أبو المظفر الترمذي بووم ئیمامی ئەهلی ترمذ شایەتی ئەدا لەسەریان بە زەندەقە) .

---

- إبن قدامة المقدسي لەبارەی هۆکاری زەندەقەی ئەشعەریەکان ئەدوێت و لە کتێبی (حكاية المناظرة في القرآن) ـدا کە موناقەشەی نێوان خۆی و ئەشعەریەکانی ئەو سەردەمەیە لەدوای باسکردنی جیاوازی نێوان وتەی ئەهلی سوننە و ئەشعەریەکان; وە باسکردنی ئەوەی حەقیقەتی بۆچوونەکەیان ئەوەیە قورئان مخلوق ـە بەڵام ئەیشارنەوە و بە ئاشکرا نایڵێن; ئەڵێت : (ئەم کۆمەڵەیە لەسەر خولگەی وتنی قورئان مخلوق ـە و موافقەکردنی موعتەزیلەکانن، بەڵام حەزیان کرد پێیان نەزاندرێت هەربۆیە

تووشـــی خۆبەگەورەزانین بەرامبەر شـــتە ڕوونەکـان و، نکۆڵیکردنی ڕاســـتیەکـان و موخالەفەکردنی ئیجماع بوونەوە، وە قورئان و سوننەتیان پشتگوێخست، وە شتێکیان وت کە هیچ موسوڵمان و کافرێک پێش ئەوان نەیوتووە .

وە لە شـــتە عەجیبەکانیان ئەوەیە ناوێرن وتەکەیان دەربخەن و بە ڕاشـــکاوی بیڵێن مەگەر لە تەنهاییەکاندا نەبێت، خۆ ئەگەر ئەوانە خاوەن دەســـەڵات و دەوڵەت بن; وە ئەو وتەیەیـان لێوە بگێڕیتەوە کە بـاوەڕیان پێیەتی ئەوە ڕقیـان لێی ئەبێتەوە و ئینکـاری لێ ئەکەن، وە خۆیـان دەرنـاخەن ئیللا بە گەورەڕاگرتنی قورئان و ڕێزگرتن لە موسحەفەکان و هەستان لەبەری نەبێت کاتێک ئەیبینن، وە کاتێک بەس خۆیان ئەبن و تەنها ئەبن ئەڵێن : (تەنها کاغەز و حیبری تێدایە، بۆ چیی تێدایە ؟!)، ئەمەش کاری زەندیقەکانە .

وە وا نازانین لە بیدعەچییەکاندا کۆمەڵەیەک هەبێت وتەکانیان بشـــارنەوە و نەوێرن بە دەریبخەن ئیللا زەندیق و ئەشعەریەکان نەبن .

وە عەجیب ئەوەیە ئەو ئیمامەیان کە ئەم بیدعەیەی داهێناوە پیاوێکە نەناسراوە نە بە دینداری وە نە بە وەرع وە نە بە هیچ شتێکی تر لە زانستەکانی شەریعەت، وە هیچ زانستێکی نادرێتە پاڵ تەنها زانستی الكلام ی زەمکراو نەبێت .

وە هەر خۆیان دان بەوەدا ئەنێن کە چل سـاڵ لەسـەر ئیعتیزال بووە پاشـان وا دەریخســتووە لێی پاشــگەز بووەتەوە، وە پاش تەوبەکەی هیچی لێ دەرنەکەوتووە تەنها ئەم بیدعەیە نەبێـت، جـا چۆن ئەتوانن بیر لەوە بکەنەوە الله هیـدایەتی کەس نـادات تەنهـا دوژمنەکەی خۆی نەبێـت، وە هیـدایەت دابنێـت لەگەڵ کەســێکـدا کە نە لە زانستەکانی ئیسلام; وە نە لە دیندا بەشی هەیە .

وە وتەکەی وتەی موعتەزیلەکـانە بێگومـان، تەنهـا ئەوە نەبێـت ئەیەوێـت فێـڵ بکات، لە ڕووکەشـــدا وتەیەک ئەڵێت موافقی وتەی ئەهلی حەق بێت، پاشـــان لێکی ئەداتەوە بە وتەی موعتەزیلەکان .

خۆ ئەگەر وا بیر بکەنەوە لە مێشکی خۆیاندا کە حەق شاراوە بووە لە رسول الله ﷺ، وە هاوەڵانی و تابیعیەکان پاش ئەوان; وە لە ئەو پێشـــەوایانەی کە ڕێی دینیان خۆشـــکرد و شـــوێن ســـەلەفی خۆیان کەوتن، وە ڕاســـتیان لێ شـــاراوە بووە و بۆیان دەرنەکەوتووە هەتا أبو الحســـن الأشـــعري هاتووە ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە شـاراوە

بووه لە رسـول الله ﷺ و ئوممەتەکەی، ئەوە خـاوەن عەقڵگەلێکی هیچ و پووچ و بۆچوونانێکی نزم و لاوازن، چونکە وا بیر ئەکەنەوە حەق و ڕاستی لە دەستی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتووە و هەموو ئوممەت لێی غافڵ بووە و أبو الحسن الأشعري دۆزیویەتیەوە و خەڵکی لێ ئاگادار کردووەتەوە .

خۆ ئەگەر ئەمەیان بۆ بچێتەسـەر، ئەوە بۆ کافرەکانی دیکەش ئەچێتەسـەر ئەوە بدەنە پاڵ پێغەمبەرەکەمان ﷺ و ئوممەتەکەی کە حەقیان لەلا نەبووە و گومڕا بوون .

وە ئەبێت ئەوانە - **واتە ئەشعەریەکان** - شەریعەتەکەیان شەریعەتی محمد ﷺ نەبێت و دینەکەیان دینی ئیسلام نەبێت، چونکە دینی ئیسـلام ئەوەیە کە محمد ﷺ هێناویەتی، وە ئەمەش أبو الحسـن الأشـعري هێناویەتی کە ئەگەر پێی ڕازی بن و دانی پیادا بنێن بە تەواوی لە ئیسلام چوونەتە دەرەوە) .

پاشـان باسـی هەندێک لە زەندەقە و جەهمیەتیەکانیان ئەکات و ئەڵێت : (ئەمە ئەو دووڕوویيەیە کە لە سـەردەمی رسـول الله ــــدا ﷺ هەبوو، وە ئەوە زەندەقەی ئەمڕۆیە، ئەوەش بریتیە لە پیشـاندانی موافەقەکردنی بیروباوەڕی موسـوڵمانان لە ڕووکەشدا، وە داشاردنی پێچەوانەی ئەوە لە ناخدا، ئەمە حاڵی ئەم کۆمەڵەیەیە، ئەمانە زەندیقن بەبێ گومان، چونکە گومان نییە ئەوان وا پیشان ئەدەن ڕێز لە موسحەفەکان ئەگرن تا وای پیشـان بدەن قورئانی تێدایە، بەڵام لە ناخدا باوەڕیان وایە جگە لە کاغەز و حیبر هیچی تێدا نییە .

وا پیشـان ئەدەن قورئان بە گەورە ڕابگرن کەچی باوەڕیان وایە لە نووسـین و دەربڕینی جبريل ـە .

وە وا پیشـان ئەدەن موسـی علیه السـلام گوێبیسـتی کەلامی الله بووە لە الله، پاشان ئەڵێن : (بەبێ دەنگ) .

وە لە نوێژەکانیاندا ئەڵێن : (أشـهد أن محمدا رسـول الله) وە باوەڕیان وایە پەیامەکەی پچڕاوە بە وەفاتی، وە ئیتر رسول ـی الله نییە، وە رسول ـی الله بووە لە کاتی ژیانیدا .

وە حەقیقەت و ڕاستی بۆچوونەکەیان ئەوەیە : نە لە ئاسمان پەرستراوی لێیە، وە نە لە زەوی قورئانی لێیە، وە نە محمد رسول الله یە ﷺ .

وە لەناو هەموو بیدعەچیەکاندا هیچ کەسانێک نین بە پێچەوانەی ئەوە خۆیان پیشان بدەن کە باوەڕیان پێیەتی جگە لە ئەوان نەبێت، وە ئەوانەش کە لەوان ئەچن لە زەندیقەکان) هتد .

- وە لە (الرسالة في القرآن وكلام الله) ـدا ئەڵێت : (پێمان بڵێن ئایا ئەم گومڕایی و وتە پیسانەتان لەلای کێ بینیوەتەوە لە سەلەف ئیللا لەلای پێشەواکەتان بۆ جەهەننەم نەبێت - واتە أبو حسن الأشعري -، ئەوەی کە بووەتە بەڵا و مەینەتی بۆتان لەسەر ڕێگەی ڕاست; ئەوەی کە هیچ فەزیلەت و گەورەییەکی نەزانراوە لە زانستی شەرعی و دینی قبووڵکراودا تەنها زانستی الكلام ـی زەمکراوی شوم نەبیت کە هیچ خێرێکی تیادا نییە) .

وە دەربارەیان ئەڵێت : (ئەو کافرانەی کە ئیمان ناهێنن بە قورئان نزیکترن لە عوذر لە نکۆڵیکردنیان لە قورئان لە ئەوانەی کە ئەڵێن کە ئیمانی پێ ئەهێنن پاشان بەبێ بەڵگە وازی لێ ئەهێنن و فەرامۆشی ئەکەن) هتد .

کاتێک زەندیقەکان بینیان قورئان و سوننەت لە چەندین بابەتدا پێچەوانەی ئەوەن کە باوەڕیان پێیەتی بۆ ڕزگاربوون لەو بنبەست و گیرۆدەییە هاتن دوو شتیان ئەنجام دا :

یەکەم : تەئویلی دەقەکانیان کرد .

دووەم : فەرموودە آحاد ـەکانیان ڕەت کردەوە لە بابەتی عەقیدەدا و بە تایبەتی أسماء و صفات .

سێیەم : وتیان دەلالەتەکانی دەقەکان ئەگەریە نەوەک بنبڕکەر بێت، واتە ئەوەی لە قورئان و فەرمووده‌دا هاتووە لەوبارەیەوە ناتوانین بڵێین سەد لە سەد ڕاستە .

یەکەم کەس دەرگای تەئویلکردنی کردەوە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت جهم بن صفوان بوو; پاشان هەموو زەندیقەکانی تریش شوێنی کەوتن، ئەمە شتێکی ڕوونە کاتێک کەسێک شتێکی تازە دائەهێنێت ئەبینێت دەقەکانی قورئان و سوننەت پێچەوانەی ئەوەن کە ئەو باوەڕی پێیەتی و دایهێناوە، هەربۆیە دێت واتا و مانای دەقەکانی قورئان و سوننەت ئەگۆڕێت و بەدرۆوە ئەڵێت مەبەستی الله عز وجل و پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە .

لەڕاســتیدا کاری ئەم زەندیقانە بریتیە لە ڕووخاندنی پایەکانی دین و گۆڕینی ئەو شــەریعەتەی رسـول الله ﷺ هێناویەتی بەناوی بەرگریکردن لە دین و نەدانەپاڵی ئەو شتەی کە شیاو نییە بدرێتە پاڵی .

عەقـیـدەی ئەم زەنـدیـقـانە بە جـۆرێـکە هەزاران ئایەت و فەرمـوودە دژ و پێچەوانەیەتی، جـا کە ئەمـانە دێن واتـای ئەم هەموو ئایەت و فەرموودەیە ئەگۆڕن بەجۆرێک لەگەڵ زەندەقەکەیاندا بگونجێت ئەوە ڕاســتەوخۆ تانەیان لە الله عز وجل داوە بەوەی کتێبێکی نـاردووەتە خوارەوە هەڵەی تێـدایە و ئەبێـت ئەوەی کە الله عز وجل فەرموویەتی قبووڵ نەکرێت بەڵکو واتایەکی دیکەی بۆ دابتاشـرێت کە بە حسـاب لەگەڵ مەبەستی الله عز وجل دا یەک ئەگرێتەوە .

وە هەموو هەوڵ و کۆششی ئەم زەندیقانە بریتیە لەوەی مانایەک بدەن بە قورئان و سـوننەت لەگەڵ زەندەقەکەیاندا بگونجێت، بەم شـێوەیە قورئان و سـوننەت شـوێن هەوا و ئارەزووی ئەوان ئەکەون نەوەک هەوا و ئارەزوویان شــوێن قورئان و ســوننەت بکەوێت .

یەکێـک لەو ڕێگـایـانەی تر کە فەرموودەی پێ ڕەت ئەکەنەوە ئەوەیە ئەڵێن فەرموودەی آحاد لە عەقیدەدا وەرناگرین، لەڕاستیدا ئەوەندەی بتوانن تەئویل ئەکەن، پاشان کە ئیتر نەیانتوانی تەئویلی بکەن بە بیانووی ئەوەی فەرموودەکە آحاد ـە، یاخود بەڵگەی قورئان و فەرموودە ماناکانی بنبڕکەر نییە; دێن بەشــێوازێکی تر دژی قورئان و ســوننەت ئەوەســتنەوە، ئەمانە خۆیان واپیشــان ئەدەن بەرگری لە ســوننەت بکەن لەکاتێکدا هەڵگر و جێبەجێکردنی هەموو ئەسڵێکن کە سوننەت تێکئەدات و ڕۆشنایی سوننەتی پێ ئەکوژێندرێتەوە .

٧٩١ - محمد بن عبدالرحمن الدباس العدل ئەڵێت : (أبو منصــور الحاكم ـــم بینی لە بەردەمیدا باســی شـتێک لە الكلام کرا، ئەویش یەکسـەر پەنجەکانی خستە گوێیەکانیەوە) .

**٧٩٢ - أحمد بن أبي نصر** ئەڵێت : (بینیمان محمد بن الحسین السلمي لەعنەتی لە کوللابیەکان ئەکرد) .

**٧٩٣ - محمد بن یعقوب** ئەڵێت : گوێبیستی یحیی بن عمار بووم کاتێک أبو بکر القفال المروزي بەردباران کرا وتی : (زوڵمیان کرد لەو شێخە، ئەو بابەتە ئیشی ئەو نەبوو) .

**٧٩٤ - محمد بن الفضل الطاقي** ئەڵێت : (باوکی یحیی بن عمار کوللابی بوو).

**٧٩٥ - یحیی بن عمار** ئەڵێت : (زانستەکان پێنج دانەن :

- زانستێک کە ژیانی دینە، ئەویش بریتیە لە تەوحید .

- وە زانستێک کە خۆراکی دینە، ئەویش بریتیە لە پەند و ئامۆژگاری و یادکردنەوە .

- وە زانستێک کە چارەسەری دینە، ئەویش بریتیە لە فیقهـ .

- وە زانستێک نەخۆشی دینە، ئەویش بریتیە لە هەواڵی تاقیکردنەوەکانی سەلەف .

- وە زانستێک ڕووخان و بەهیلاکچوونی دینە، ئەویش بریتیە لە الكلام) .

---

**- لە (أحادیث في ذم الكلام وأهله) دا معاویة بن قرة وەسیەتی ئەکات بۆ إیاس ی کوڕی و ئەڵێت : (ئەی کوڕی خۆم، ئاگاداری تەماشاکردنی الكلام بە، ئەوەی تەماشای الكلام ئەکات وەکو ئەوە وایە تەماشای خودی خۆر بکات، هەتا زیاتر سەیری بکات زیاتر سەری لێ ئەشێوێت) .**

- إبن القيم لە (الصـــواعق المرســـلة) ــــــدا ئەڵێت: (ئەمە دانپێدانانی ئەو گەورەیانەیە لە کۆتایی ڕێگەکەیاندا دەربارەی ئەوەی بەڵگە عەقڵیەکان پێی بەخشــیون لە نادڵنیایی و ســەرلێشــێواوی و گومان، کێ ســکاڵای کردووە لە قورئان و ســوننەت و بەڵگە دەربڕاوەکان - الأدلة اللفظية - بەم جۆرە سـکاڵایە؟! وە کێ باسـی ئەوەی کردووە قورئان و ســـوننەت ســـەری لێ تێکداوە و هیدایەتی نەداوە؟! بۆ مەگەر الله عز وجل پێغەمبەران و باشترینی دروستکراوانی پێ هیدایەت نەداوە؟

الله تعالی بە خاوەن کامل ـــترین عەقڵ لە دروستکراوەکانی ئەفەرمووێت: | قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ | (سَبَإٍ: ٥٠).

جا ئەمە خاوەن کامل ــــــترین عەقڵی ناو دروســـتکراوەکانە هەواڵ ئەدات کە هیـدایەت و ڕێنمونیەکەی بەو بەڵگە دەربڕاوانەیە کە الله وەحی بۆ کردووە، وە ئەو لەناوچووە ســـەرلێشـــێواوانەش ئەڵێن نە دڵنیایی ئەبەخشـــێت، وە نە زانســـت و نە هیدایەت).

٧٩٦ - الهروي ئەڵێت: (وە يحيى بن عمار ـــم بینی ئەوەندەجار کە ناتوانم بیژمێرم لەســـەر مینبەرەکەی تەکفیری ئەکردن و بە لەعنەتی ئەکردن، وە شـــایەتی زەندیقبوونی ئەدا لەسەر أبو الحسن الأشعري، وە بە هەمان شێوە عمر بن إبراهيم و شێخەکانی دیکەمانم بینی).

---

: بەلەعنەتکردنی ئەشـــعەریەکان شـــتێکی نوێ نییە ئێمە دامانهێنابێت، بەڵکو ڕێچکەی هەموو موسوڵمانێکی ئەهلی سوننەیە تا قیامەت.

ئەمە وتەی زانایانێکە لە ئێمە شـارەزاترن بە ئەشـعەریەکان; عەیب و عارەکانیان ئەزانن، وە ڕێک ئەوەیان پێ وتوون کە شـایسـتەیانە، وە لە شـوێنی گونجاوی خۆیاندا دایـانـاون، نەوەک وەکو ئەم بەهیلاکچووانەی ئەمڕۆ پێیـان بڵێن ئیمـام و بەگەورە

تەماشا بکرێن، لەبەر ئەوەی ئەسڵەکانیان لە فەلسەفە وەرگرتووە و حوکم لەسەر دەقەکانی قورئان و سوننەت ئەدەن لەرێگەی ئەو فەلسەفەیەوە .

٧٩٧ - أبو أسامة المكي ئەڵێت : (لەعنەتی الله لە أبو ذر الهروي، ئەو یەکەم کەس بوو الکلام ـی گواستەوە بۆ حەرەم، وە یەکەم کەس بوو بڵاوی کردەوە لەناو مەغرىبیەکاندا) .

---

- إبن قايماز لە (السير) ـدا دەربارەی ئەڵێت : (الکلام و بۆچوونی الأشعري وەرگرت لە أبي بكر بن الطيب الباقلاني، وە لە مەککە بڵاوی کردەوە، وە مەغریبیەکان لێیەوە گواستیانەوە بۆ مەغریب و ئەندەلوس، وە پێش ئەوە زانایانی مەغریب نەئەچوونە ناو الکلام و خۆیانیان پێوە سەرقاڵ نەئەکرد، بەڵکو خویان دابوویە فیقهـ و فەرموودە و عەرەبی) .

- إبن الجوزي لە (المنتظم) ـدا وەڵامی تۆمەتبارکردنی إبن بطة الحنبلي ئەداتەوە لەلایەن أبو ذر الهروي ـەوە و ئەڵێت : (أبو ذر لە ئەشعەریە خاوەن ڕق و کینەکانە، وە یەکەم کەسە مەزهەبی أبو الحسن الأشعري بردە حەرەمەی مەککەوە، وە جرح کردنی حەنبەلیەکی لێ قبووڵ ناکرێت کە باوەڕی وایە کافرە) .

- إبن تيمية لە (درء التعارض) ـدا ئەڵێت : (لە هراة ـەوە هات بۆ بغداد، ڕێبازی الباقلاني وەرگرت و گواستیەوە بۆ مەککە، جا قسەیان کرد دەربارەی خۆی و ڕێبازەکەی وەکو أبو نصر السجزي و أبو القاسم سعد بن علي الزنجاني و جگە لەوان لە گەورەیانی زانایان و دین .

ئەو لەوانەیە کە ڕێگەی الصبغي و الثقفي - تۆمەتبارکراون بە کوللابیەت - پێشئەخات بەسەر ڕێگەی إبن خزيمة و هاوشێوەکانی لە ئەهلی حەدیث، ئەهلی ڕۆژئاواش ئەهاتن بۆ حەج و لەلای کۆئەبوونەوە و فەرموودە و ئەم ڕێبازەیان لێ وەرئەگرت، وە ڕێنمونی ئەکردن بۆ بنچینە و ئەسڵەکەی، جا هەیانبوو ئەچوو بۆ ڕۆژهەڵات، وەک چۆن أبو الوليد الباجي سەفەری کرد و ڕێبازەکەی وەرگرت لە أبو جعفر

**السـمناني الحنفي هاوەڵی أبو بكر الباقلاني، وە پاش ئەو أبو بكر إبن العربي ڕۆیشـت ڕێبازەكەی وەرگرت لە أبو المعالي الجويني) .**

**٧٩٨ - منصور بن إسماعيل** ئەڵێت : گوێبیستی الحسين بن شعيب الفقيه بووم ئەیوت بە يحيى بن عمار : (بیسـتم سـالم ئەیوت : هەركەسـێک الكلام نەخوێنێت ئەوە دینداریێتی نەكردووە بە دینی الله بۆ الله .

منیش وتم : ئایا میراتت لە باوكت وەرگرت ؟) .

---

**: واتە باوكت تەماشای الكلام ـــی نەكردووە، كەواتە باوكت دینداریێتی بە دینی الله نەكردووە بۆ الله، كەواتە باوكت كافرە، جا ئەگەر كافرە ئایا میراتی باوكتت وەرگرتووە ؟**

**٧٩٩ - عمر بن إبراهيم** ئەڵێت : (سەربڕاوی دەستی ئەشعەریەكان حەڵاڵ نییە، چونكە موسـوڵمان نین، وە ئەهلی كیتابیش نین، وە كتێبی الله لە زەوی جێگیر ناكەن) .

---

**: (كتێبی الله لە زەوی جێگیر ناكەن) واتە ئەڵێن ئەو قورئانەی كە جبريل عليه السـلام هێناویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئەویش خوێندوویەتیەوە بەسـەر هاوەڵاندا و نوسـراوە و لەبەركراوە كەلامی الله عز وجل نەبووە بەڵكو عیبارەتێكە لە كەلامی الله تعالی.**

٨٠٠ - الحسن بن هاني ئەڵێت : (هەموومان الكلام ـــــمان خوێند، بەڵام عـاقڵبووین و ئیتر بـاســـمـان نەکرد، وە أبو الجود و الـدینـاري گەمژەبوون، بۆیە ئابڕوویان چوو) .

٨٠١ - طاهر بن محمد المالیني ئەڵێت : (ئامادەبووم أبو ســعد الزاهد تۆبەی کرد بە الدیناري، هەرگیز نەمبینیوە هێندەی ئەو ڕۆژە لە زەلیلیدا بێت) .

٨٠٢ - الهروي ئەڵێت : (سالم هات بە مەبەستی تۆبە کردن، یحیی بن عمار بە دەرگاوانەکەی وت : (پێی بڵێ کتێبەکانی الکلام ـــمان بۆ بهێنە ئەیسووتێنین بە ئاگر، وە مۆڵەتی نەدا بێتە ژوورەوە) .

---

**- لە (الإبانة الصغری) ـدا الحسن بن شـقیق ئەڵێت : لەلای إبن مبارك بووین پیاوێک هات بۆ لای، پێی وت : (تۆ ئەو جەهمیەی ؟) .**

**پیاوەکە وتی : بەڵێ .**

**وتی : (کاتێک لەلای من ڕۆیشتیتە دەرەوە نەیەیتەوە بۆ لام) .**

**پیاوەکە وتی : من تۆبەم کردووە .**

**وتی : (نابێت هەتا لە تۆبەکەت ئەوە دەرئەکەوێت کە لە بیدعەکەت دەرکەوت) .**

**- لە (ذیل طبقات الحنابلة) ـــــدا أبو حـاتم محمد بن إدریس ئەڵێت : باســـی یەکێک لە زانایان کرا بۆ أحمد بن حنبل کە هەڵەیەکی هەبووە و تۆبەی کردووە لێی .**

**وتی : (الله ئەوەی لێ قبووڵ ناکات هەتا تۆبەکەی دەرنەکەوێت و نەگەڕێتەوە لە وتەکەی، وە بزانرێت فلانە و فلانە وتەی وتووە، وە تۆبەی کردووە و گەڕاوەتەوە بۆ لای الله تعالی لە ئەو وتەیە و لێی پاشــگەز بووەتەوە، جا ئەوکاتەی ئەمەی لێ دەرکەوت ئەوکات قبووڵ ئەکرێت، | إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ | (البَقَرَة : ١٦٠) .**

- إبن القيم له (مدارج السالكين) ـــدا ئەڵێت : (وە فیسقی عەقیدەیی، وەکو فیسقی بیدعەچیەکان کە ئیمانیان بە الله و پێغەمبەرەکەی و قیامەت هەیە; وە ئەوە بە حەرام دائەنێن کە الله حەرامی کردووە، وە ئەوە بە واجب دائەنێن کە الله بە واجبی داناوە، بەڵام بەهۆی نەزانی و تەئویل و لاساییکردنەوەی شێخەکانەوە نەفی زۆرێک لەو شـتانە ئەکەن کە الله و پێغەمبەرەکەی جێگیریان کردووە، وە بە هەمان شـێوە ئەوە جێگیر ئەکەن کە الله و پێغەمبەرەکەی جێگیریان نەکردووە، جا تەوبە لەم فیسـقە بە جێگیرکردنی ئەوە ئەبێت کە الله جێگیری کردووە بۆ خۆی وە پێغەمبەرەکەشـی بەبێ تەشبیهـ و نمونە بۆ دانان .

تەوبەی ئەو کەسـە فاسـقانە لە ڕووی عەقیدەی خراپەوە بریتیە شـوێنکەوتنێکی تەواوی سوننەت، وە تەنها ئەوەش بەس نییە هەتا ئەوە ڕوون نەکەنەوە کە لەسەریبوون لە بیدعە، چونکە تەوبەکردن لە تاوانێک بە ئەنجامدانی دژەکەیەتی، هەربۆیە الله عز وجـل ڕوونکردنەوە و دەرخسـتنی بە مەرج گرتووە بۆ تۆبەکردنی ئەوانەی ئەوە دائەشـاردن کە الله دایبەزاندووە لە بەڵگە و ڕێنمونیەکان، لەبەر ئەوەی تاوانەکەیان بە داشـاردن بووە ئەوکات تۆبەکردنیشـیان بریتیە لە دەرخسـتنی هەمان شـت، الله تعالی ئەفەرمووێت : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ * إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (البَقَرَة : ١٥٩ - ١٦٠) .

تاوانی بیدعەچی گەورەترە لە تاوانی ئەوەی حەقی شـاردووەتەوە، چونکە ئەویان حەقی شاردووەتەوە، وە ئەمی دیکەیان هەم شاردوویەتەوە وە هەم بانگەشـەی کردووە بۆ پێچەوانەی ئەوە، هەربۆیە هەموو بیدعەچیەک حەق ئەشارێتەوە) .

٨٠٣ - الهروي ئەڵێت : باسـی أبو محمد القراب کرا لەپێش یحیی بن عمار، وتی : (بڵێ : الله لەعنەتی لێ بکات) .

٨٠٤ - إبراهيم بن إسماعيل الخلالي ئەڵێت : باوكم نامەكەی إبن خزيمة ـی برد بۆ پێشەوای ئیمانداران كە دەربارەی الصِبغي و الثَّقَفي نووسيبووی، ئەويش نووسی كە لە دار بدرێن .

إبن خزيمة رحمه الله وتی : (نەخێر، رســـول الله ﷺ ئەیزانی كۆمەڵانێک دووڕوون لەگەڵ ئەوەشدا نەیدان لە دار) .

٨٠٥ - إسماعيل بن عبدالرحمن الصابوني ئەڵێت : (تۆبە كرا بە الصِّبغي و الثَّقَفي لەسەر قەبرەكەی إبن خزيمة) .

---

**: الصِّبغي أبو بكر أحمد بن إسحاق بن أيوب النيسابوري ـــە (٣٤٢ هـــ)، لەسەر مەزهەبی إبن كلاب بووە .**

**الثَّقَفي أبو على محمد بن عبدالوهاب ـــە، لە بابەتی قەدەر و ئیمان و اللفظ ـــدا موخالەفەی إبن خزيمة ـــی كرد، وە تووشی چەند میحنەتێک بوو و لە ماڵەوە مایەوە تا مرد .**

٨٠٦ - زيد بن محمد الأصبهاني ئەڵێـت : (خەڵكی الأصـــبهـان ئەگەر بیانبینیایە مرۆڤێک نزیک ئەبێتەوە لە أبو نعيم الحافظ بەردیان تێ ئەگرت) .

---

**: خاوەنی (حلية الأولياء) .**

**نەفی حرف و صــوت ــــی كردووە لە كەلامی الله عز وجل وەكو ئەشـــعەریە جەهمیەكـان، وە بە هەمـان شـــێوە نەفی ســـیفـاتە ئیختیـاریەكـانی كردووە وەكو ئەشعەریەكان .**

- إبن الجوزي لە (المنتظم) ــدا دەربارەی ئەڵێت : (گوێبیستی زۆر بووە و زۆری نووسیوە، وە مەیلی هەبوو بەلای مەزهەبی أبو الحسن الأشعري بە مەیلێکی زۆر) .

- لە (تاريخ الإسلام) ــدا أبو طاهر السِّلَفِي ئەڵێت : گوێبیستی أبو العلاء محمد بن عبدالجبار الفرساني بووم ئەیوت : ئامادە بووم لە مەجلیسی أبو بكر بن أبي علي المعدل منداڵ بووم لەگەڵ باوکمدا، کاتێک لە وانەکەی تەواو بوو کەسێک وتی : (کێ ئەیەوێت ئامادەی مەجلیسی أبو نعيم بێت با هەستێتەوە)، ئەوکاتە أبو نعيم هەجرکرابوو بەهۆی مەزهەبەوە، وە لەنێوان حەنبەلیەکان و ئەشعەریەکاندا توندیەکی زۆر هەبوو کە سەریئەکێشا بۆ فیتنە و، قسەهێنان و بردن و، ململانێی درێژ، هاوەڵانی فەرمودە بە چەقۆ بۆی هەستان خەریک بوو بکوژرێت) .

- لە (السير) ــدا يحيى بن منده ئەڵێت : گوێبیستی عبدالرحمن ــی مامم بووم وتی : گوێبیستی محمد بن عبدالله الطبراني بووم وتی : (ڕۆژێکیان لە مەجلیسی باوکت رحمه الله هەستام و وتم : ئەی شێخ، کۆمەڵەیەکمان لەلایە ئەچنە لای ئەم کەسە شوومە - مەبەستم أبو نعيم الأشعري بوو - ) .

وتی : دەریانکەن .

جا لە دانیشتنەکە فلاّن و فلاّنمان کردە دەرەوە .

پاشان وتی : (ئەوەی کە ئەڕواتە لایان با نەیەتە مەجلیسەکەمانەوە و لێمانەوە نەبیستێت و ڕیوایەتمان لێوە نەکات، خۆ ئەگەر کاری وا بکات ئەوە گەردنی ئازاد نەبێت) .

- لە (ميزان الإعتدال) ــــدا إبن طاهر المقدسي ئەڵێت : (الله چاوی أبو نعيم گەرم بکات - واتە بیخاتە جەهەننەمەوە -، قسە ئەکات دەربارەی أبو عبدالله إبن منده لەکاتێکدا هەموو خەڵکی کۆکن لەسەر پێشەوایەتیەکەی) هتد .

أبو عبدالله محمد بن إسحاق بن منده (٣٩٥ هـ) زۆر توند بووە لەسەر أبو نعيم .

٨٠٧ - أحمد بن حمزة ئەڵێت : (دانیشتنێک بۆ کەسێک لە طبرستان دانرا، چووەســەر مینبەر و پرســیاریان لێکرد دەربارەی (پیتەکانی قورئان)، ئەویش ڕەتی کردەوە، جا لێی درا بە خاکەناز و کوژرا) .

---

: لەبەر ئەوەی ئەشعەری بووە، ئەشعەریەکان پێیان وایە کەلامی الله عز وجل بە دەنگ و پیت نییە، وە کاتێک الله عز وجل ویستوویەتی قسە بکات پیتەکانی دروست کردووە، بەمشێوەیە ئەو قورئانەی ئەیخوێنین دروستکراوە چونکە هەموو ئایەتەکان لە پیت پێکهاتوون، بەم شێوەیە ئەشعەریە لەعنەتیەکان ئەڵێن قورئان مخلوق ـە .

- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ـــدا ئەڵێت : (ئەگەر وتیان دان ئەنێن بەوەدا کە قورئانە، ئەوە پێیان ئەوترێت : بەشـــێوەی مەجاز دانی پیادا ئەنێن، بەڵکو مەزهەبەکەیـان بریتیە لەوەی قورئان غیر مخلوق ـــە و پیتەکـان مخلوق ـــن، وە سـورەتەکانیش پیتن بە کۆدەنگی و ئەوەی ئینکاریی بکات قسـەی لەگەڵدا ناکرێت، جا ئەگەر کۆمەڵە پیتێکی مخلوق بێت ئەوکات جائیز نییە قورئانێکی غیر مخلوق بێت) .

٨٠٨ - أحمد بن أبي نصر المالیني ئەڵێت : چوومە مزگەوتی عمرو بن العاص ـەوە رضي الله عنه لە مصر لەگەڵ چەند هاوەڵێکمدا .

کاتێک دانیشـــتین شـــێخێک هات وتی : (ئێوە ئەهلی خۆراســـانن ئەهلی سوننە، وە ئەوەش شوێنی ئەشعەریەکانە هەستن) .

٨٠٩ - إسماعیل بن أحمد البشوزقاني الفقیه ئەڵێت : (گوێبیســتی الجنید بن محمد الخطیب بووم شایەتی ئەدا لەسەر أبو الحسن الأشعري دا بە زەندەقە) .

٨١٠ - إسماعيل بن أحمد البشوزقاني الفقيه ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم وتی : (گوێبیستی أبو سعید الطالقاني بووم زیاتر لە جارێک لەعنەتی لە کوللابیەکان ئەکرد و ناو سەرگەورەکەیانی ئەهێنا) .

٨١١ - الهروي ئەڵێت : (گوێبیستی زیاتر لە کەسێک بووم ئامادە بووە لەورۆژەدا کە إبن فورک بەردباران کراوە و لە مزگەوتی الجامع ی هراة دەرکراوە) .

---

- لە (ذیل طبقات الحنابلة) ـدا أحمد بن محمد البجلي الحافظ ئەڵێت : (إبن فورک چوویە لای سوڵتان محمود سبکتکین و موناقەشەیان کرد .

إبن فورک بە محمود ـی وت : ڕێگەپێدراو نییە الله وەسف بکەیت بە لەسەرەوەبوون، چونکە ئەوە مولزەمت ئەکات بەوەی وەسفی بکەیت بە لەژێرەوە بوون، چونکە ئەوەی ڕێگەپێدراو بێت سەرووی هەبێت ئەوە ڕێگەپێدراوە خوارووشی هەبێت .

محمود وتی : (ئەوە من نیم وەسفم کردبێت بە لەسەرەوەبوون تا مولزەمم بکەیت بەوەی وەسفی بکەم بە لەژێرەوەبوون، بەڵکو ئەوە خۆیەتی وەسفی خۆیی کردووە بەوە) .

ئیتر دەمکوت بوو) .

- لە (تاريخ الإسلام) ـدا أبو الوليد الباجي ئەڵێت : (کاتێک إبن فورک داوای کەرامیەکانی کرد; کەرامیەکان نامەیان نارد بۆ محمد بن سبکتکین دەسەڵاتداری خۆراسان : ئەو کەسەی قسەئەکات دەربارەمان و هان ئەدات لەلای تۆ لە ئێمە بیدعە و کوفرەکەی گەورەترە، پرسیاری لێ بکە دەربارەی محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب ئاخۆ ئێستا رسول الله یە یان نا ؟

محمود سبکتکین بابەتەکەی بە گەورە زانی و وتی : (ئەگەر ئەوە ڕاست بێت ئەیکوژم) .

پاشــان ناردنی بەدوایدا و پرســیاری لێ کرد، إبن فورک وتی : پەیامبەری الله بوو، بەڵام ئێستا نەخێر .

محمود فەرمانی کرد بە کوشتنی، تکای بۆ کرا، وترا : پیاوێکە تەمەنی هەیە .

ئیتر فەرمانی کرد بکوژرێت بە پێدانی ژەهر، جا ژەهرخواردکرا .

إبن حزم دوعای کرد بۆ ســوڵتان لەبەر ئەوەی ڕێنمونی کراوە بۆ کوشــتنی إبن فورک، لەبەر ئەوەی وتی رسول الله ﷺ تەنها لەکاتی ژیاندا پەیامبەر بوو) .

- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) دا ئەڵێت : (أبو بكر إبن فورک الأصبهاني دوو کتێبی هەیە دەربارەی تەفسیری ئەو سیفەتانەی کە لە قورئاندا هاتووە، جا ئەوەی لە سوننەتدا لێهاتوو بێت پاشـان تەماشـا کتێبەکانی بکات بۆی دەرئەکەوێت إبن فورک و هاوەڵانی لەسەر حەق نین .

وە موعتەزیلەکان سەرەڕای خراپێتی بۆچوونەکەیان کەمتر زیانیان هەیە بۆ ئەهلی سوننەی ئاسایی لە ئەوانە، چونکە موعتەزیلە مەزهەبەکەی خۆیی دەرخستووە و فێڵی نەکردووە و نەیشاردووەتەوە) .

٨١٢ - الهروي ئەڵێت : (وە لە الري گوێبیستی أحمد بن الحسن الخاموشي الفقيه الرازي بووم لە ماڵەکەی لە کۆبوونەوەکەیدا لەعنەتی لە ئەشعەریەکان ئەکرد و ســتایشــی حەنبەلیەکانی [1] ئەکرد، ئەوەش ئەو ســاڵە بوو لەگەڵ حاجیەکاندا دەرچووین) .

---

- محمد بن طاهر لە (المنثور من الحكايات والسؤالات) دا ئەڵێت : (گوێبیستی عبدالله بن محمد الأنصــاري بووم وتی : کاتێک ڕۆیشــتم بۆ لای أبو الحســن الجركاني الصــوفي و ویســتم بگەڕێمەوە، کەوتە دڵم بڕۆم بۆ لای أبو حاتم بن خاموش الحافظ لە الري و ببینم، وە پێشەوای ئەهلی سوننە بوو لە الري، وە سوڵتان محمود بن سبكتكين کاتێک ڕۆیشـتە الري ـــەوە باطنیەکانی کوشـت، وە ڕێگری کرد لە کۆمەڵەکانی دیکەی ئەهلی الكلام لەوەی بچنە ســەر مینبەر; تەنها أبو حاتم نەبێت، وە هەرکەســێک لە

کۆمەڵەکانی دیکە بڕۆشتایەتە الري ـــەوە عەقیدەی خۆیی پێ ئەوت، ئەگەر لێی ڕازی بوویایە ئەوە مۆڵەتی ئەدا قسە بکات بۆ خەڵکی، ئەگەر وا نەبوویایە ڕێگری لێ ئەکرد .

کاتێک نزیک بوومەوە لە الري لە ڕێگە پیاوێکی ئەویم لەگەڵدا بوو پرســـیاری لێ کردم دەربارەی مەزهەبەکەم .

منیش وتم : من حەنبەلیم .

ئەویش وتی : مەزهەبێکە تا ئێستا نەمبیستووە، ئەمە بیدعەیە .

جلەکەمی گرت و وتی : وازت لێ نایەنم هەتا نەتبەم بۆلای شێخ أبو حاتم .

منیش وتم : خێرە، من خۆم ماندوو ئەکرد تا بیبینم .

پاشان منی برد بۆ ماڵەکەی، ئەوڕۆژە دانیشتنێکی زۆر گەورە هەبوو .

پیاوەکە وتی : ئەی شـــێخ ئەمە پیاوێکی غەریبەیە پرســـیارم لێ کردووە دەربارەی مەزهەبەکەی باسی مەزهەبێکی کرد هەرگیز نەمبیستووە .

شێخ وتی : (چیی وت ؟) .

پیاوەکە وتی : وتی من حەنبەلیم .

شێخ وتی : (بانگی بکە، ئەوەی حەنبەلی نەبێت موسوڵمان نییە) .

(١) مەبەست لە حەنبەلیەکان لێرەدا ئەو کەسانەیە لە ئەهلی سوننە و جەماعە کە شـــوێن ئیمام أحمد کەوتوون لە عەقیدەکەیدا، نەوەک ئەوانەی تەنها لە مەزهەبی فیقهیدا خۆیان دابێتە پاڵی .

وە ئەو کەســـەی لەســـەر مەزهەبی شـــافیعی بووبێت لە فیقهدا و لە عەقیدەدا لەسەر مەزهەبی أبو الحسن الأشعري بووبێت پێیان وتووە شافیعی، وە ئیمام الشافعي بەریە لە مەزهەبی أبو الحسن الأشعري .

- الهروي لە (النونية) کەیدا ئەڵێت :

(من حەنبەلیم هەتا بژیم وە کاتێک مردم

وەسیەتەکەم ئەوەیە بۆتان ئەی براکانم) .

- له (ذيل طبقات الحنابلة) دا الهروي ئەڵێت :

(پەروەردگارمان ئەبینرێت لەسەر عەرش بەرز بووەتەوە

وتەکەی ئەزەلیە و پێغەمبەرەکەشی عەرەبی

هەموو ئەوانەی جگە لەمە ئەڵێن ئەشعەرین

مەزهەبەکەمان مەزهەبی حەنبەلیە) .

- إبن الجوزي له (المنتظم في تاريخ الملوك والأمم) ـــدا باسـی ڕووداوەکانی سـاڵی ٥٣٨ هــ ئەکات و ئەڵێت : (لەم سـاڵەدا لەگەڵ سـوڵتاندا فەقیهێکی بەڕێز هات ناوی الحسـن بن أبي بكر النيسـابوري بوو، لە هاوەڵانی أبو حنيفة بوو، شـارەزاییەکەی باشـی هەبوو بە زمان، وە تێگەیشـتنێکی باشـی هەبوو لە موناقەشـەدا، ماوەیەک لەلای دانیشتم و زۆرم بیست لە دانیشتنەکانیدا، لە مزگەوتی القصر دانیشت، وە لە مزگەوتی المنصور ـیش، وە سوننەتی دەرخست و، لەعنەتی لە الأشعري ئەکرد بە ئاشکرا لەسەر مینبەر، وە ئەیوت : شافیعی بە و ئەشعەری مەبە) .

- له (ذيـل طبقات الحنـابلة) ـــــدا الوزير إبن هبيرة ئەڵێت : (والله واز لە پێشـــەوای ئیمانداران علي بن أبي طالب ناهێنین رضـــي الله عنه بۆ ڕافیزەکان، ئێمە شایستەترین بە ئەو لە ئەوان، چونکە ئەو لە ئێمە و ئێمەش لەوین .

وە واز لە الشـافعي ناهێنین بۆ ئەشـعەریەکان، چونکە ئێمە شـایستەترین بە ئەو لە ئەوان) .

٨١٣ - الهروي ئەڵێت : (چەند جارێک چوومە لای أبو محمد القراب و أبو ذر السماک بۆ بیستنی فەرمووده، أبو الحسن الفارسي الفقيه ئەوەی بیستەوە و بە باوکمی وت : (مەهێڵە عبدالله بڕوات بۆ لایان) .

وە هانی باوکمی دا بۆ مەجلیسی أبو منصور الحاكم) .

٨١٤ - الهروي ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم وتی : ئافرەتێکی پیر هات بۆ لای أبو سعد الزاهد بە گریانەوە .

پێی وت : (ئەوە چیتە ؟) .

وتی : کوڕێکم بە سەرخۆشی مرد .

وتی : (ئایا ئەهلی سوننەی خۆش ئەویست ؟) .

ئافرەتەکە وتی : بۆ مەگەر جگە لەوانی خۆشئەویست!

وتی : (هیوای خێر و باشیت بۆی هەبێت، چونکە سوننەت کەشتیە; ئەوەی بخرێتە ناوی هەڵی ئەگرێت) .

---

**: واتە ئەوەی بخرێتە ناو کەشتی سوننەتەوە هەرچۆنێک بێت ئەوە کەشتیەکە لە نوقوم بوون نەجاتی ئەدات .**

٨١٥ - عبدالله بن أبي نصر المؤدب ئەڵێت : (أبو نصر نوێژی نەکرد لەسەر باوکی لەبەر مەزهەب و بۆچوون) .

---

**: واتە کاتێک باوکی مردووە نوێژی لەسەر نەکردووە چونکە کوللابی یان ئەشعەری بووە، أبو نصر الصابوني باوکی أبو عثمان الصابوني یە خاوەنی عقیدة السلف وأصحاب الحدیث .**

٨١٦ - أبو طالب الحلواني ئەڵێت : أبو عبدالله الحناطي الأشعري چووەماڵەوە بۆ لای أبو العباس القصاب الآملي، أبو عبدالله ئاماژەی کرد بۆ موسحەف و وتی : (لەسەری دابنیشە) .

الحناطي وتی : ئەی شێخ لەسەر موسحەف ؟

وتی : (ئەی تۆ ناڵێیت تەنها کاغەز و حیبرە ؟!) .

**: لەبەر ئەوەی ئەشعەریەکان پێیان وایە موسحەف کەلامی الله عز وجل ـی تیادا نییە و تەنها حیبر و کاغەزە، ئەمەش پێچەوانەی عەقیدەی موسـولْمانانە کە پێیان وایە هەم کەلامی الله عز وجل ی تێدایە، وە هەم حیبر و کاغەزیش .**

٨١٧ - **يحيى بن عمار** ئەڵێت : (ئەگەر بیستت ئەڵێت : حیبر و کاغەز، ئەوە بزانە زندیقە) .

- قوام السنة الأصبهاني لە **(الحجة في بيان المحجة)** دا ئەڵێت : **(بەڵگە لەسەر ئەوەی قورئان هەیە لەناو موسحەفەکاندا بریتیە لە نەهیکردنی پێغەمبەر ﷺ سەفەر بکرێت بە قورئانەوە بۆ زەوی دوژمن لە ترسی ئەوەی بکەوێتە بەردەستیان .**

**خۆ ئەگەر لە موسحەفدا تەنها حیبر و کاغەز هەبوویایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ نەهی لەوە نەئەکرد سەفەری پێوە بکرێت بۆ زەوی دوژمن، چونکە حیبر و کاغەزەکە حورمەتێکی نییە تا بپارێزرێت لەوەی بەردەستی دوژمن بکەوێت، جا زانرا لە موسحەفدا شتێکی خاوەن حورمەت هەیە زیاد لە حیبر و کاغەز، هەربۆیە نەهی کراوە سەفەری پێوە بکرێت) .**

٨١٨ - **علي بن الحسن النيسابوري** ئەڵێت : ماوەیەک العُصمية ـکان زاڵ بوون بەسەر المزنية ـەکاندا، کۆمەڵە خەڵکێک چوونە ماڵی أبو سعد الزاهد ـەوە بەدوای ئەو گەنمەدا ئەگەڕان یەکێک لە المزنية ـکان لەلای دانابوو، أبو عاصم محبوب الحاكم ئەوەی بیست و بەو نەعلانەوە کە دەستنوێژی پێوە ئەگرت بە

خێرایی دەرچوو و چووە ماڵی أبو سعد ـــــەوە، ئەو کەسانەی دەرکرد و دەنگی بەسەردا بەرز کردنەوە .

هەواڵ درا بە أبو سعد لەوبارەیەوە، وتی : (بریا گەنمەکە دەستی بەسەردا بگیرایە و ئەو مورجیئەیە دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەکردمایە ) .

**٨١٩ - أبو عبدالله محمد بن منده الحافظ** ئەڵێت : (مرۆڤ تەقوای الله بکات و عیبرەت وەرگرێ لە پێشینی خۆی لەوانەی کە لەفز[١] مەزهەب و ووتەیان بووە، کە چۆن دەرچوو لە دونیا بە هەجر کراوی و زەم کراوی و دەرکراوی لە مەجلیسەکان و شارەکان بەهۆی عەقیدە ناشرینەکەی و وتە خراپەکەی کە موخالفی دینی الله یە، وەک : الکرابیسی[٢] و الشراک[٣] و ابن کلاب[٤] و ابن الأشعري و هاوشێوەکانیان ئەوانەی کە جیدال کردن و کەلام ڕێبازیان بووە لە دینی الله عز وجل ) .

---

(١) إبن بطـة لە (الإبانة الکبری) ـدا باسی لەفزیەکان ئەکات و ئەڵێت : (بزانن ڕەحمەتی الله ـتان لێبێ کە بەشێک لە جەهمیەکان بە فێڵی دڵیان و پیسی ڕەئیەکانیان و ناشرینی ئارەزووەکانیان بروایان وابوو کە قورئان مەخلوقە، جا ناوێکی تریان لە مەخلوقی قورئان نا بە بیدعەیەک کە دایان هێنا، بۆ فێڵ کردن و چەواشە کردنی خەڵکی عەوام، بۆ ئەوەی کوفرەکەیان بشارنەوە و ئیلحادەکەیان شاراوە و ناڕوون بێت بۆ ئەو کەسانەی کە عیلمیان کەمە و سروشتیان لاوازە، جا ووتیان : (ئەو قورئانەی کە الله قسەی پێکردووە و فەرموویەتی کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە ئەو قورئانەی کە ئێمە ئەیخوێنینەوە بە زمانەکانمان و ئەینوسین لە پەڕاوەکانمان ئەو قورئانە نیە کە کەلامی الله یە، بەڵکو حیکایەتە بۆ ئەو قورئانە بە لەفزی ئێمە، وە لەفزی ئێمەش بە قورئان مەخلوقە) جا کوفرەکەیان وورد و شاراوە کرد، وە فێڵیان کرد بۆ ئەوەی کوفر بخەنە ناو خەڵکیەوە بە ناڕوونترین ڕێگا و ووردترین مەزهەب و شاراوەترین جۆر، بەڵام بە حەمد و منەت و چاکی تەوفیق دانی الله ئەم کوفرە شاراوە نەبوو بۆ زانایە گەورە و ڕەخنەگرە عاقڵەکان، قیناعیان لابرد لەسەر ئەو کوفرە ناشرینەی کە شاردبوویانەوە، جا کوفریان دەرکەوت بۆ زانایان و خەڵکی عەوامیش، وە ئەو کەسەی کە ئەمەی زانی و

هەستی پێکرد و ناشرینیەکەی ووتەکەیانی زانی شێخی صالح و پێشەوای زانا و عاقڵ باوکی عبدالله بوو أحمد بن محمد بن حنبل رحمه الله، وە ڕوونکردنەوەی کوفرەکەیان ڕوون و ئاشکرایە لە کتێبی الله عز وجل و سوونەتی پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ، قورئان و سوونەت بە درۆی خستوونەتەوە بە حەمدی الله، الله عز وجل فەرموویەتی : | وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ | (التوبة : ٦)، نەیفەرموو: (حتى يسمع حكاية كلام الله) .

وە الله تعالى فەرموویەتی : | وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا | (الأعراف : ٢٠٤)، الله هەواڵیدا کە گوێگر گوێ لە قورئان ئەگرێت، نەیفەرموو : گوێ لە حیکایەتی قورئان ئەگرێت .

وە الله تعالى فەرموویەتی : | وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَسْتُورًا | (الإسراء : ٤٥) .

وە الله عز وجل فەرموویەتی : | وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ | (الأحقاف : ٢٩) .

وە الله تعالى فەرموویەتی : | قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ | (الجن : ٢)، وە نەیفەرموو : (إنا سمعنا حكاية قرآن عجيب) ئێمە حیکایەتی قورئانێکی سەیرمان بیست .

وە الله تعالى فەرموویەتی : | فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ | .

وە الله تعالى فەرموویەتی : | وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ | (الإسراء : ٤٦) .

وە الله تعالى فەرموویەتی: | وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ | (الإسراء : ٨٢)، وە نەیفەرموو: ئێمە لە حیکایەتی قورئان دائەبەزێنین) هتد .

اللفظية ـــكان ئەوانەن کە بروایان وایە ئەوەی لەسەر زەوییە کەلامی الله نیە و مەخلوقە، حیکایەتە یان عیبارەتە لە کەلامی الله، هەر کەسێک لە حیکایەت و عیبارەت تێبگات باش ئەزانێت ابن بطة باسی چی و کێ ئەکات، ئەوانەی ئەڵێن قورئان حیکایەتی کەلامی الله ـــــیە، کوللابیەکانن کە عبدالله بن سعید بن کلاب (نزیکەی ٢٤٠ هـــ)

پێشـەوایانە، بڕوای وایە الله تعالی قسـەی نەکردووە بە قورئان بە حەرف و بە صـەوت، بەڵکو الله تعالی کەلامی نەفسـی هەیە بەبێ پیت و دەنگە، کە ئەڵێ : قوڕئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، مەبەسـتی لە کەلامی نەفسـی الله یە کە بێ دەنگ و بێ حەرفە، بەڵام ئەوەی کە جبریـل هێنـاویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەمەیـان مەخلوقە و حیکـایەتە لە کەلامی نەفسـی الله، مرۆڤەکان بە لەفزی خۆیان دەری ئەبڕن بەشـێوەی دەنگ و پیت، بۆیە کە ئەڵێن لەفزمان بە قورئان ەخلوقە مەبەسـتیان ئەوە نیە فعلی عەبد لە دەنگی و زمـان و قورگی مەخلوقە بەڵام قورئانەکە کە ئەخوێنـدرێ غەیر مەخلوق بێـت، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە ئەو قورئانەی لە ئاسمانە کەلامی نەفسی الله یە بێ دەنگ و بێ پیتە و مەخلوق نیە چونکە الله قسـە ناکات بە دەنگ و بە پیت، وە ئەو قورئانەی کە لەسـەر زەوییە حیکـایەتی کەلامە نەفســیەکەی الله یە کە مرۆڤەکـان بە لەفزی خۆیـان دەری ئەبڕن و مەخلوقە .

أبو الحسن الأشعري (٣٣٦ هـ) هەمان مەزهەبی کوللابی هەیە دەربارەی قورئان بەڵام لەجیاتی حیکایەت عیبارەت بەکاردێنێت، ئەڵێ قورئانی سـەر زەوی عیبارەتە لە کەلامی الله، هەمان مەزهەبی کوللابی هەیە، إبن بطة ـــش ناڵێ ئەمە دواتر روویدا لە سـەردەمی دوای أحمد، بەڵکو ئەڵێ احمد کوفرەکەی ئەوانی زانی و ئاشـکرای کرد، واتا باسی إبن کلاب و جەماعەتەکەی ئەکات .

ئەمەیە مەزهەبی اللفظیـة ئەڵێن : قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە، وە لەفزمان بە قورئان مەخلوقە .

واتای قسـەکەیان ئەمەیە : الله بە دەنگ و بە پیت قسـەی نەکردووە بە قورئان، بەڵکو کەلامی نەفسـی هەیە کە ئەمەش پەکخسـتنی کردنی سـیفەتی کەلامە بۆ الله عز وجل، جا ئەم کەلامە نەفسیە لەلایان غەیر مەخلوقە، کە ئەڵێن قورئان کەلامی الله ـیە و مەخلوق نیە مەبەسـتیان ئەمەیە، ئەی گەر الله بە پیت و بە دەنگ قسـەی نەکردووە بە قورئان کەواتە ئەم ئایەتانە چین کە هەمووی پیتن و بە دەنگ ئەخوێندرێنەوە ؟

ئەوکات ئەڵێن : لفظ ـمان بە قورئان مەخلوقە، واتا ئەو قورئانەی لە زەوی هەیە ئێمە بە لفظ ـــی خۆمـان دەری ئەبرین بە پیـت و بە دەنـگ حیکـایەتە بۆ کەلامە نەفسـیەکەی الله، ئەگینا کەلامی الله نە پیتی تیایە نە دەنگ، بۆیە قورئانی سـەر زەوی

مەخلوقە و لفظ ــی ئینسانە قورئانەکەی ئاسمان غەیر مەخلوقە و کەلامی نەفسی اللە یە.

هەروەک چۆن کەسێک لاڵە ناتوانێ قســە بکات کەســێک لێی حاڵی ئەبێت و قســەکانی ناخی ئەو ئەکات، پەنا بە اللە عەقیدەی ئەوانیش دەربارەی قورئان هەمان شــتە، اللە قســە ناکات بە دەنگ و بە پیت، لە زمانی عەرەبیش کەلام بریتیە لە دەنگ و پیت هەر شتێک ئەم دووانەی تیا نەبوو کەلام نیە، جا کوللابی و ئەشعەری ئەم سیفەتە پەک ئەخەن لە راستیدا بەڵام بە درۆ ئەڵێن ئیسباتی سیفەتی کەلام ئەکەین بۆ اللە کە مەبەستیان کەلامی نەفسیە .

(٢) حسين بن علي الكرابيسي یەکەم کەس بوو وتەی لفظ ــم بە قورئان مخلوق ـەی دەرخست، وە ئیمام أحمد بە کافری دانا .

- لە (الإبانة الكبرى) ــدا ئیمام أحمد ئەڵێت : (بشر المريسي ڕۆیشت و حسين الكرابيسي شوێنی گرتەوە، ئەمە بووە بە جەهمی، وە جەهمیەتی دەرخستووە، پێویستە ئاگاداری لەبارەوە بدرێت، وە لەبارەی هەموو ئەوانەی کە شوێنی ئەکەون) .

- لە (تهذيب التهذيب) ـــدا أبو الطيب الماوردي ئەڵێت : (الكرابيســي ئەیوت قورئان غير مخلوق ـە، وە لفظ ـم بە قورئان مخلوق ـە) .

- لە (تاريخ الإسلام) ـدا المروزي ئەڵێت : وتم بە أبو عبدالله، الكرابيسي وتوویەتی : لفظ ـم بە قورئان مخلوق ـە .

وە وتوویەتی : ئەڵێم قورئان کەلامی اللە ــیە لە هەموو ڕوویەکەوە، بەڵام لفظ ــم بە قورئان مخلوق ـە، وە هەرکەسێک نەڵێت لفظ ـم بە قورئان مخلوق ـە ئەوە کافرە .

أبو عبدالله وتی : (بەڵکو خۆی کافرە، اللە بیکوژێت، بۆ جەهمیەکان چییان وت بێجگە لەمە ؟ وتیان کەلامی اللە ـیە، پاشان وتیان مخلوق ــە، سوودی بۆی نییە کاتێک قسـەکەی کۆتاییـی قسـەی سـەرەتای هەڵئەوەشـێنێتەوە کە ئەڵێت لفظ ـــم بە قورئان مخلوق ـە) .

- لە (طبقات الحنابلة) ــدا حنبل ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم پرسیاری لە أبو عبدالله کرد دەربارەی قسەکەی الكرابيسي و ئەوەی کە دایهێناوە ؟

أبو عبدالله به باوكمی وت : (ئه‌وه قسه‌ی جه‌هميه‌كانه، خاوه‌نی ئه‌م قسه‌يه بانگه‌شه ئه‌كات بۆ قسه‌ی جه‌هم، ئه‌گه‌ر بڵێت لفظ ـم به قورئان مخلوق ـه چی ئه‌مێنێته‌وه ؟) .

- له (طبقات الحنابلة) ـدا إسحاق بن إبراهيم بن هانئ ئه‌ڵێت : (الله عز وجل الكرابيسي ڕسوا بكات، قسه‌ی له‌گه‌ڵ ناكرێت، وه دانيشتنی له‌گه‌ڵ ناكرێت، وه هيچی لێوه نانوسرێته‌وه، وه دانيشتن ناكرێت له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه له‌گه‌ڵی دائه‌نيشێت) .

- له (طبقات الحنابلة) ـدا شاهين بن السَّميدع ئه‌ڵێت : گوێبيستی أبو عبدالله أحمد بن حنبل بووم وتی : (الحسين الكرابيسي له‌لای ئێمه كافره) .

- أحمد بن أبي بكر بن حماد المقرئ وتی : پرسيارم كرد له أبو عبدالله ده‌رباره‌ی حسين الكرابيسي ؟

وتی : (جه‌هميه) .

- له (مناقب الإمام أحمد) ـدا عبدالله بن أحمد ئه‌ڵێت : وتم به باوكم : الكرابيسي ئه‌ڵێت لفظ ـم به قورئان مخلوق ـه .

وتی : (درۆ ئه‌كات ئه‌و پيسه، الله ئابڕووی ببات، ئه‌مه بوو به جێگره‌وه‌ی بشر) .

- له (ذيل طبقات الحنابلة) ـدا أبو الحارث محمد بن جعفر ئه‌ڵێت : گوێبيستی أبو عبدالله بووم و پرسياری لێكرا ده‌رباره‌ی وته‌كه‌ی الكرابيسي، پێی وترا كه ئه‌ڵێت : لفظ ـم به قورئان مخلوق ـه ؟

وتی : (ئه‌وه قسه‌ی جه‌همه، الله عز وجل ئه‌فه‌رمووێت : ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾ (التَّوْبَة : ٦) .

له كێ كه‌لامی الله ئه‌بيستێت ؟ الله له‌ناويان ببات) .

- له (الحجة في بيان المحجة) ـدا أبو حاتم الرازي ئه‌ڵێت : (وته‌ی جهم بن صفوان و حسين الكرابيسي و داود بن علي بريتيه له: لفظ ـيان به قورئان مه‌خلوقه، وه قورئانه‌ی كه دابه‌زيوه بۆ پێغه‌مبه‌رمان ﷺ كه جبريلی ئه‌مين هێناويه‌تی حيكايه‌تی

قورئانه، جا أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل به جەهمی دانان، وه زانایانی ولاتانیش هەموویان شــوێنی كەوتن لە جەهمی دانانی ئەمانە، هیچ خیلاف نیە لە نێوان ئەهلی ئەثەر لەمەدا) .

(٣) له (السنة لـ الخلال) ـدا أبو طالب ئەڵێت : وتم به أبو عبدالله : له طرسوس ـەوە بۆم نووسراوە كە الشراك ئەڵێت قورئان كەلامی الله ـیە، كاتێک خوێندمەوە ئەوە خوێندنەوەكەی مخلوق ـە .

وتی : (الله بیكوژێت، ئەوە ڕێک قسەكەی جەهمە) .

وتم : كەسێک وتی : قورئان كەلامی الله ـــیە و مخلوق نییە، بەڵام لفظ ـــم بەم قورئانە مخلوق ـە .

وتی : (ئەوەی ئەم قســەیە بڵێت ئەوە هەموو بابەتەكەی وتووە، بەڵكو قورئان كەلامی الله ـیە لەسەر هەموو بارودۆخێک، وه بەڵگە فەرموودەكەی أبو بكر ـە رض الله عنە : ﴿الٓمٓ * غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ (الرُّوم : ١ - ٢) .

پێی وترا : ئەمە لەوەیە كە هاوەڵەكەت خۆی هێناویەتی .

فەرمووی : (نەخێر سوێند بە الله، بەڵكو كەلامی الله یە) .

ئەوە و بێجگە لەوە هەر كەلامی الله یە) .

- له (السنة لـ الخلال) ـدا یعقوب بن بختان ئەڵێت : باسی بارودۆخی الشراك ـم كرد بۆ أبو عبدالله و ئەوەی دەربارەی هاتووە لە طرسوس ـەوە .

وتی : (ئاگاداری لەبارەوە لێ ئەدرێت، وه دانیشــتن لەگەڵی ناكرێت، وه ئەو كەسە هەجر ئەكرێت كە بەرگری لێ ئەكات و لەگەڵی دائەنیشێت ئەگەر حاڵی ئەزانی، مەگەر كەسێكی نەزان بێت) .

- له (السنة لـ الخلال) ـدا أبو الحارث ئەڵێت كە پرسیاری كردووە لە أبو عبدالله دەربارەی أحمد الشراك ؟

وتوویەتی : (بـارودۆخی ڕوون ئەكرێتەوە، وه ئاگـاداری لەبـارەوە ئەدرێـت، وه دانیشتن لەگەڵی ناكرێت، وه قسەی لەگەڵدا ناكرێت).

**(٤) الكلابيـة ئەوانەن ســەلەف بە اللفظيـة نـاويـان بردوون، لەبەر ئەوەی مەزهەبەكەیان لە قورئاندا بریتیە لەوەی كەلامی الله واتایەكە پەیوەستە بە زاتی خۆیەوە، بە پیت و دەنگ نییە، وە ئەو قورئانەی لەبەردەســتی ئێمەدایە كەلامی الله عز وجل نییە، بەڵكو كەلامی جبريل ـ و گێڕانەوەیەكە لە الله تعالی ـوە; وە كەلامی الله عز وجل نییە لە حەقیقەتدا .**

**إبن كلاب هات مەزهەبێكی نوێی دانا لە نێوان ئەهلی حەدیث و جەهمیەكاندا، موافەقەی ئەهلی حەدیث ـــــی كرد لەوەدا كە كەلامی الله ســیفەتێكە پەیوەســت بە خۆیەوە و الله هەمیشە قسەكەر بووە، وە موافەقەی جەهمیەكانی كرد بەوەی پێی وابوو كەلامی الله عز وجـل بە دەنـگ و پیـت نییە، وە ئەوەی گوێمـان لێی ئەبێـت لەكـاتی خوێندنەوەی قورئاندا ئەوە لەڕاستیدا كەلامی الله نییە بەڵكو عیبارەتێكە لە كەلامی الله، هەر لەبەر ئەم هۆكارەی ئەهلی حەدیث كوللابیەكانیان بە جەهمی حســاب كرد چونكە لە ئەسڵەكەیاندا لەسەر هەمان ئەسڵی جەهمیەكان بوون .**

٨٢٠ - الهروي ئەڵێت : گوێبیســتی أبو بكر عبدالرحمن بن منصــور المقرئ بووم ئەیوت : (گوێبیســتی أبو سـعيد بن أبي سـهل الفقيه الحنبلي بووم لە بُســت لەعنەتی لێ ئەكردن هەموو ڕۆژێـك پـاش نوێژی بەیـانی لە المحراب ـــــدا بە جەماعەت، وە ئەوانیش ئامین یان ئەكرد) .

---

**: نـاكۆكی و پێكدادانی ئاشــكرا ڕوویانداوە لە مێژوودا لە نێوان ئەهلی ســوننە (بەتایبەتی حەنبیەلیەكانی ئەهلی سوننە) و جەهمیەكاندا .**

**- إبن الجوزي لە (المنتظم) ـدا ئەڵێت : (وە لەم ساڵەدا ٤٤٥ هـ لەعنەت لە أبو الحسـن الأشعري بە ئاشكرا ڕاگەیەندرا، جا أبو القاسم عبدالكريم بن هوازن القشيري - الأشــعري - دەربارەی ئەوە هەرایەكی نایەوە و نامەیەكی نووســی بەناوی (شــكاية أهل السنة لما نالهم من المحنة) .**

وە شـــتێک لە وتەکانی أبو الحســـن الأشـــعري بەرزکرابوویەوە بۆ لای ســـوڵتان طغرلبك .

القشـيري - الأشـعري - وتی : داوای یارمەتیمان کرد; جا نە گوێ لە بەڵگەیەکمان گیرا، وە نە پێداویســـتیەکمان بۆ جێبەجێ کرا، ئێمەش وازمان لێهێنا بۆ ئەگەرەکان و، ڕەوانە کراین بۆ یەکێک لە زانایان، ئێمەش ئامادەبووین وامانزانی وەزعەکە باش ئەکات، کەچی وتی : أبو الحسن الأشعري لەلام بیدعەچیە، بەڵکو زیاتر لە موعتەزیلەش) .

- إبن كثير لە (البداية والنهاية) ـــدا ئەڵێت : (پاشـان سـاڵی ٤٤٧ هات، وە لەو سـاڵەدا فیتنە ڕوویدا لە نێوان ئەشـعەریەکان و حەنبەلیەکان، وە لایەنی حەنبەلیەکان بە شێوەیەک بەهێز بوو هیچ یەکێک لە ئەشعەریەکان نەیانئەتوانی ئامادە بن لە نوێژی جەماعەتدا) .

پاشـــان لەبەر ئەوەی لایەنی دەســـەڵاتدار پشـــتگیری ئەشـــعەریە جەهمیەکانی کردووە لایەنی ئەهلی ســـوننە کەوتوونەتە لاوازیەوە، وە ئەشـــعەریە جەهمیەکـان بە بوختان خۆیان داوەتە پاڵ ئیمامی الشـافعي بۆ سـەرخسـتنی مەزهەبەکانیان لەکاتێکدا دووری ئیمـام و ئەوان لە یەک زۆر دیـارە، جـا هەرکـاتێـک لەم چوارچێوەیەدا وترا (شافیعیەکان) ئەوە مەبەست پێیان ئەشعەریە جەهمیە موتەکەلیمەکانە .

- إبن قايماز لە (تاريخ الإسـلام) ـــدا ئەڵێت : (سـاڵی ٤٥٦، تیایدا سـوڵتان ألب أرسـلان وەزیر عميد الملک ـــی دەسـتگیر کرد، دواتر پاش ماوەیەک کوشـتی، وە نظام الملک بە تەنها وەزارەتەکەی بەڕێوە ئەبرد، جا ئەوەی بەتاڵ کردەوە کە لە کاتی عميد الملک هەبوو لە قسـە وتن و جوێندان بە ئەشـعەریەکان، وە شـافعیەکانی سـەرخسـت، وە ڕێزی گرت لە الجويني و أبو القاسم القشيري) .

وە هەر ئەو (مدرسـة النظامية) ـــی دانا و لە سـاڵی ٤٥٧ و دای بە ئەشـعەری و سـۆفیەکان، وە أبو إسـحاق الشـيرازي الأشـعري کرد بە بەڕێوەبەری، وە توانای ئەوەی پێدان عەقیدەکەیان بڵاو بکەنەوە پاش ئەوەی ڕسوا و سەرکوتکراو بوون، وە أبو إسحاق الأشعري زۆر بەپەرۆش بوو بۆ لێدان و فیتنە دروست کردن بۆ ئەهلی سوننەت .

(المدرسة النظامية) پارەیەکی زۆری تیادا سەرف ئەکرا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکی لە شـــارەکـانی دیکەشـــەوە ڕووی تێ بکەن و فێری عەقیـدەی ئەشـــعەریە جەهمیەکان بکرێن و پاشان لە وڵاتی خۆیان بڵاوی بکەنەوە .

باوکان و دایکان بەپەرۆش بوون منداڵەکانیان بنێرنە ئەو مەدرەسەیە بەهۆی ئەو خزمەتە دنیایەی ئەکران لەوێ، وە مەدرەســـەکە بوو بە هۆکاری پێگەیاندنی چەندین جیلی کافر و گومڕای عەقیدەیی لە تەلەبە و مامۆستا و زانای کەوڵکراو لە فیترەت .

بەمشـــێوەیەی لەم بەشـــەی وڵاتانی موســـوڵمانانـدا لەو ســـەردەمەدا عەقیدەی ئەشعەریەکان بەزۆر بڵاوکرایەوە .

وە یەکێـکی تـر لەوانەی هەر لەو ســـەردەمەدا هـۆکـارێـکی کـاریـگەر بـوو بـۆ بڵاوبوونەوەی عەقیدەی ئەشـــعەریە جەهمیەکان لە وڵاتانی مەغریب: إبن تومرت بوو، عەقیدەی لە الغزالي الأشعري الجهمي وەرگرتبوو و دەرچووی مدرسة النظامية بوو .

بە ئەوانەی ئەوت مجســـمـة کە ســـیفاتەکانی الله عز وجل جێگیر ئەکەن بەو شـێوەیەی الله عز وجل لە قورئانەکەیدا و رسـول الله ﷺ لە سـوننەتەکەیدا جێگیریان کردووە، وە خوێن و ئافرەتەکـانیـانی بە حەڵاڵ ئەزانی و مـامەڵەی کەســـی مورتەدی لەگەڵدا ئەکردن .

پاشـــان کەســـی ســـێیەم کە لە میســـڕ زۆر چالاکانە عەقیدەی جەهمیەکانی بڵاوکردەوە صلاح الدين الأيوبي الأشعري بوو، مەزهەبی ئەشعەریەکانی لەوێ فەرز کرد و فەرمانی کرد بە کردنەوەی خانەقای سۆفیەکان، وە (مدرسة الشريفية) ـی دامەزراند و تیایدا عەقیدەی ئەشعەریە جەهمیەکان فێری فێرخوازان ئەکرا .

جا بەهۆی الوزير نظام الملک لە شارەکانی ڕۆژهەڵات و، إبن تومرت لە شارەکانی ڕۆژئاوا و، صـلاح الدين الأيوبي ـــــەوە عەقیدەی ئەشـــعەریە زەندیقەکان لەناو وڵاتانی موسوڵماناندا پەرەی پێ درا و دەسەڵاتی درایە و شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی رسول الله ﷺ تیایاندا سەرکوتکران .

- المقريزي لە (المواعظ والإعتبار بذكر الخطط والآثار) دا ئەڵێت : (وە دەربارەی عەقیدە، سوڵتان صلاح الدين هەمووانی هەڵدایەسەر عەقیدەی أبو الحسن الأشعري، تەلەبەی أبي علي الجبائي - المعتزلي - .

عەقیدەی الأشعري لە وڵاتی میسر و شام و حیجاز و یەمەن بەردەوام بوو، وە بە هەمان شـێوە لە وڵاتـانی مەغریب بەهۆی ئەوەی إبن تومرت بۆچوونی أبو الحسـن الأشعري بردبوویە ناوی .

بەشێوەیەک ئەمە بوو بە عەقیدەی وڵاتەکانی تریش، ئەوەی موخالەفەی بکردایە ئەدرا لە ملی، وە بابەتەکە هەر بەو شێوەیەی هەتا ئەمڕۆش) .

وە ئەڵێت : (کاتێک السلطان صلاح الدين يوسف بن أيوب دەسەڵاتی مصر ـی گرتەدەسـت، خۆی و قازیەکەی صـدر الدين عبدالملک بن عيسـى بن درباس الماراني لەسـەر ئەم مەزهەبە بوون - واتە ئەشـعەریەت -، لەسـەری گۆش و پەروەردە بووبوون لەوکاتەوەی لە خزمەتی السـلطان محمود بن زنكي بوون لە دیمەشـق، صـلاح الدين الأيوبي لە منداڵیدا عەقیدەیەکی لەبەرکرد کە قطب الدين أبو المعالي مسعود بن محمد بن مسعود النيسابوري بۆی نووسیبوو، وە منداڵە بچووکەکانی خۆشی لەبەریان ئەکرد .

هەربۆیە توند دەسـتیان گرت بە مەزهەبی ئەشـعەریەوە، وە لەسـەر هەموو خەڵکیان دانا پابەندبوون پێیەوە، هەربۆیە بارودۆخ هەروا بەردەوام بوو لە سـەردەمی پادشاکانی بني أيوب دا .

ڕێککەوت لەگەڵیدا ناردنی پیاوێکی خەڵکی ڕۆژئاوا لەلایەن أبو عبدالله محمد بن تومرت ـەوە بۆ عێراق، وە مەزهەب و بۆچوونی الأشعري لە أبو حامد الغزالي وەرگرت) پاشان باسی مردنی إبن تومرت و هاتنەسەر حوکمی عبدالمؤمن بن علي القيسي ئەکات و ئەڵێت : (ناوی خۆیان نا الموحدين، هەر بۆیە دەوڵەتی الموحدين لە ڕۆژئاوا خوێنی ئەو کەسـەی حەڵاڵ ئەکرد کە موخـالەفەی إبن تومرت بکـات، بەوهۆیەوە خوێنی ئەوەندە کەسیان ڕشت کە کەس نایژمێرێت تەنها الله ـی دروستکەری نەبێت سبحانه وتعالى؛ وەک چۆن زانراوە لە کتێبەکانی مێژوودا .

ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ بەناوبانگ بوونی مەزهەبی ئەشـعەری و بڵاوبوونەوەی لە وڵاتانی موسـوڵمانان، بەشـێوەیەک مەزهەبەکانی جگە لەوە لەبیرکران هەتا ئەمڕۆ مەزهەبێـک نەمـاوە موخـالەفەی بکـات؛ مەگەر مەزهەبی حەنبەلیەکـان نەبێـت؛ شوێنکەوتوانی ئیمام أبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل رضي الله عنه ئەوان لەسەر ئەوەن کە سـەلەف لەسـەری بوون، تەئویل بە جـائیز نـابینن لەوەدا کە هـاتووە لە سیفەتەکانی الله) .

**مەبەستی المقريزي ئەوە نییە خەڵکی هەمووی بوویێت بە ئەشعەری، چونکە لە هەموو کاتێکدا هەڵگرانی عەقیدەی رسول الله ﷺ و هاوەڵان و سەلەفی ساڵح هەبوون، بەڵام مەبەست لەوەیە دەسەڵاتدارەکان عەقیدەی ئەشعەریەتیان فەرز کردووە لە وڵاتدا و مەلا و شێخەکانیش زۆربەیان ئەو عەقیدەیەیان هەبووە، وەک چۆن ئێستاش بە هەمان شێوەیە، ئەم حاڵەتەش بەڕاستخەرەوەی فەرمایشتی رسول الله ـیە ﷺ : (ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێ کرد، وە نامۆ ئەبێتەوە وەک چۆن لە سەرەتاوە بەوە دەستی پێ کرد) .**

**بۆ زانیاری زیاتر ئەتوان دەربارەی ئەشعەریەکان و مێژووەکەیان بگەڕێنەوە بۆ کتێبی (قصة الأشاعرة، جناية أهل البدعة بحكاية ما أصابهم من الفتنه) .**

٨٢١ - الهروي ئەڵێت : (پاشان من وا نازانم لە ژیانمدا گوێبیستی یەک کەسیش بووبم لە شارەکەمان دان بنێت بەو مەزهەبەدا، یان شتێک لە الكلام بە ڕاشکاوی بڵێت و بیزانێت یاخود شتێک لە کتێبەکانیان دەربخات; ئیللا لە یەکێک لەم چوار جۆرەیە :

یەکەمیان : پیاوێک بێت لێوەی زانرابێت کە الكلام ی خوێندووە، وە سوێند ئەخوات کە الكلام ـی بۆ ئەوە خوێندووە زاڵ ببێت بەسەر دوژمندا نەوەک پێی نزیک ببێتەوە لە دین .

وە دووەمیان : پیاوێک وەریگرتووە لە مامۆستایەکی تۆمەتبارکراوەوە، وە سوێند ئەخوات بە الله کە فیقهی لێوە وەرگرتووە نەوەک الكلام .

وە سێیەم : کۆمەڵەیەک تووشی دەردێک بوون بەهۆی هاوڕێیەتیکردنەوە هەتا چاوەکان بە سووکی تەماشایان کردن بەهۆی هاوەڵایەتیکردن و نزیکبوونەوە لەو کەسانەی کە تۆمەتبارن، ئەوانە کاتێک بە تەنها مانەوە بە چپە قسە ئەکەن، وە کاتێک دەرکەوتن هێرش ئەکەنە سەر یەکتری .

وە چوارەم : پیـاوێـک شـــتێکی لێ دەرکەوتووە لە کتێبەکـانی الکلام بە دەســتوخەتی خۆی، یان بە خوێندنەوەی، یاخود وەریگرتووە لە کەسـێکی زیندوو یان مردووەوە -واتە لە کتێبەکانەوە- .

جا هەموو ئەمانە شـتێک هەڵئەگرن لە ڕسـوایی و هەجرکردن و دەرکردن کە ئەو دزە هەڵیناگرێت کە خۆی ئەشـارێتەوە، وە کەسـێکی فاسـق و شـێت ئارامی لەسەر ناگرێت .

نەخۆشەکانیان بەسەر ناکرێنەوە، وە جەنازەکانیان قەرەباڵخ ناکرێت .

لەگەڵ ئەوەشـــدا نابینی خاڵی نەبن لە کەمی وەرع و، توندی دڵ و، کەمی ذیکر و، خراپی نوێژ و، بەکەمتەمـاشـــاکرنی ســـوننەت و، فەرامۆشـــکردن و تەمبەڵیکردن لە فەرمووده و قســـەوتن بە ئەهلی حەدیـث و، وازهێنـان لە جەماعەتەکان و، قســەی ناشـرین وتن بەوەی کە ئەهلی سـوننە پێیان ناخۆشـە و گاڵتەکردن پێیان .

گوێم لە یەکێک لە تۆمەتبارەکان بوو ئەیوت : (الکلام چییە ؟! هەر شـــتێک لە دەم دەرچێت لە قسەکردن ئەوە الکلام ە)[١] .

ئەمانە پێشەواکانی ئیسلامن، وە ئەم هەموو ئاگادارکردنەوەیە دەربارەی ئەم زیانە زۆرە لە مێژە هەیە .

جا با ئیتر لە ڕەشـــماڵەکە بیهێننە دەرەوە و، با تەپڵەکە لە جانتاکە دەرکەن و، هەڵە جێگیر بکەن لەسـەر ئەو پێشـەوای ڕێنمونیانە و، موسوڵمانێکمان پیشان بدەن بە الکلام گەیشتبێت بە ژیریەک یان خێرێکی تووش بووبێت لەڕێگەیەوە .

واللە نە دینی ئەوانە دینە کە چپە ئەکەن بە نهێنی پێکەوە، وە نە بۆچوونی ئەوانەی کە دایئەشارن بەهێزە[٢]) .

---

(١) الكلام لەڕووی زمانەوانیەوە واتە قســـە، جا ســـەلەف کاتێک زەمی الكلام ئەکەن مەبەســـتیان زەمی قســـەکردن نییە، بەڵکو مەبەســـتیان ئەو بەناو عیلمە پڕ زەندەقەیەیە کە ئەهلی الكلام دایانناوە .

جا ئەو کەســـەی الهروي باســـی ئەکات ئەیەوێت خۆی لە خەت بدات و بڵێت نازانم الكلام چییە، الكلام قسەیە، وە ئەوەی لە دەم دەرچێت قسەیە، بەڵام لەڕاستیدا درۆ ئەکات و ئەزانێت کە مەبەستی سەلەف بە الكلام چییە .

وەک چۆن إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــــدا ئەڵێت : (ســـەلەف خودی قســـەکردنیان زەم نەکردووە، چونکە هەموو مرۆڤێک قســـە ئەکات، ئەو قســـەکردن - الكلام - ـــــی ســـەلەف زەمیان کردووە بریتیە لە قســـەی باتڵ کە موخالەفەی شـــەرع و عەقڵە) .

وە ئەڵێـت : (ســـەلەف كـاتێـک زەمی الكلام ئەکەن و ئەڵێن : زانـایـانی الكلام زەندیقن، وە هیچ کەسێک خووی نەداوەتە الكلام و سەرفراز بووبێت، مەبەستیان لەوە قسەکردن بە ڕەهایی نەبووە، بەڵکو مەبەستیان لە ڕاستیەکی عورفیە لەوانەدا کە قسە ئەکەن لە دیندا بە بێجگە لە ڕێگەی پێغەمبەران علیهم السلام) هتد .

واتە کاتێک وترا سەلەف زەمی الكلام ــی کردووە و کەسێکیش هات وتی : الكلام واتە قسەکردن یاعنی سەلەف نەهی لە قسەکردن ئەکەن!!

ئەوکات فڵێبازیەکەی ئاشکرا ئەکرێت و ئەوترێت سەلەف رحمهم الله مەبەستیان لە قســـەکردنە دەربارەی دین بەبێجگە لەو ڕێگەیەی کە پێغەمبەران علیهم الســـلام پێی هاتوون کە بریتیە لە قورئان و ســـوننەت، بەڵکو قســـە ئەکەن لەدین و دەربارەی الله عز وجل بەو یاسا عەقڵی و فەلسەفیانەی کە خۆیان دایئەنێن .

(٢) لەبەر ئەو زەمە زۆرەی ســـەلەف کردوویانە بۆ بەناو عیلمی الكلام (المَنطِق) لەو ســـەردەمانەدا کەســـێک ئەو بەناوعیلمەی خوێندبێت لەوانەی خۆیان ئەدەنە پاڵ تەڵەبی عیلم و فەرموودە نەیویســـتووە بزانرێـت ئەو بەنـاوزانســـتە ئەزانن و پێوەی بناسرێتەوە بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە ئەهلی حەدیث باڵادەست و توند بوون لەسەر الكلام بۆیە نووسەر ئەو قسەیانە ئەکات .

وە ئەشعەریەکان هەمیشە درۆیەک دووبارە ئەکەنەوە کە گوایە زۆربەی زانایانی ئوممەتی ئیسلامی ئەشعەری بوون، وە یەکێک لەوانەی ئەم بانگەشە بێبنەما و درۆیەی کردووە إبن عساكر ــە لە کتێبی (تبيين كذب المفتري)، دواتر إبن عبدالهادي بە کتێبی (جمع الجيوش والدساكر على إبن عساكر) وەڵامی ئەداتەوە و سیحرەکانی بەتاڵ ئەکاتەوە و ڕووی ڕەشی هەڵئەماڵێت، ناوی بەشێک لەو زانایانە ئەهێنێت کە ئاگاداریان دەربارەی ئەشعەریە جەهمیەکان داوە و خۆیانیان لێ بەری کردوون .

- إبن عبدالهادي (٩٠٩ هــ) ئەڵێت : (بەشێک : ئێمە باسی کۆمەڵەی ئەوانە ئەکەین کە لێیانەوە هاتووە خۆدوورگرتن لە ئەشعەریەکان و أبو الحسن الأشعري و هاوەڵانی لە سەردەمی خۆیدا هەتا ئەمڕۆ؛ بە شێوازێکی کورت نەوەک درێژەدان لە باسکردنیاندا) .

باسی زیاتر لە ٤٠٠ زانا ئەکات کە خۆیان بەدوورگرتووە لە ئەشعەریەکان، دواتر ئەڵێت : (بەڕاستی بینیمان لە هاوەڵانمان و هاوڕێیانمان، وە ئەوانەی لەگەڵمان سەرقاڵ بوون زیاتر لە هەزار کەس لەسەر خۆبەدوورگرتن و دژوەستانەوە بەرامبەریان، وە لەسەر تانەدان و قسەوتن پێیان، وە ئەوانەی کە باسمان نەکردوون لەوانەی کە تێپەڕی زیاترە لەوەی کە باسمان کردووە .

ئەمە بریتیە لە سوپا نەک ئەو سەربازانەی إبن عساكر بە درۆ و ڕاستی تێکەڵی کردوون کە ئەگەنە پەنجا کەس لەوانەی درۆی بۆ هەڵبەستوون .

وە واللە، پاشان واللە، پاشان واللە ئەوانەی کە باسمان نەکردوون زیاترن لەوانەی کە باسمان کردوون، خۆ ئەگەر وردمان بکردایەتەوە و بەدوای ئەوانەدا بڕۆشتینایە کە خۆیان لێ بەدوورگرتوون لەوکاتەیانەوە هەتا ئێستا ئەوە زیاتر ئەبوون لە دە هەزار کەس) .

پێشتر وتمان إبن عساكر ئاماژە ئەدات بەوەی زۆربەی زانایان ئەشعەری بوون، وە إبن عبدالهادي بە کتێبێک وەڵامی ئەداتەوە، بەڵام ئەشعەریەکانی ئێستا ئەڵێن زۆربەی ئوممەتی ئیسلامی ئەشعەری بووە و ئەشعەریە، لەکاتێکدا خودی إبن عساكر لە (تبيين كذب المفتري) ــدا ئەڵێت : (ئەگەر وترا : لە زۆربەی سەردەمەکانی تر، وە زۆربەی خەڵکی لە هەموو وڵاتان شوێن الأشعري ناکەون و لاسایی ناکەنەوە، وە عەقیدەیان وەکو عەقیدەکەی ئەو نییە، وە ئەوان ڕەشاییە گەورەکەن و ڕێگاکەیان ڕێگە

بەهێزەکەیە ئەوە ئەوترێت : گرنگی نادرێت بە زۆری خەڵکی عەوام، وە لا ناکرێتەوە بەلای نەزانەکاندا) .

وە نووسەری (قصة الأشاعرة) لە لاپەڕە ٧٠٥ ـــی کتێبەکەیدا بەشێکی داناوە دەربارەی ئەو درۆیە گەورەی ئەشعەریە جەهمیەکان کە ئەڵێن ئەشعەریەکان زۆربەی ئوممەتن، وە ڕوونی کردووەتەوە ئەو بانگەشەیە هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ چەسپاندنی .

چەند ڕووداوێک بە نمونە ئەهێنێتەوە بەڵگەن بۆ ئەوەی ئەشعەریەکان لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانیانەوە کەم و زەلیل بوون، وە ڕوونی کردووەتەوە ئەو بانگەشە درۆینەکە سەرچاوەکەی السبکي ـــیە کە ئەشعەریەکی جەهمی زۆر توندە لەسەر زەندەقەکەی، وە زۆر ڕقی لە ئەهلی حەدیث و شوێنکەوتەکانی رسول الله یە ﷺ .

یەکەم ڕووداو کە نیشانەیە بۆ زەلیلی و کەمییان بریتیە لە ڕووداوی عەقیدەی خەلیفە القادر بالله ٤٢٢ هـــ کە تیایدا عەقیدەیەک نووسرا بۆ خەلیفە کە موافقی عەقیدەی سەلەف بوو و هیچ شتێک لە گومڕایی و زەندەقەی ئەشعەریەکانی تیادا نەبوو، وە زانایان لە شوێنکەوتووانی سەلەف وەریانگرت و قبووڵیان کرد وەکو عەقیدەی هەموو موسوڵمانان .

ڕووداوی دووەم بریتیە لە بەلەعنەتکردنی ئەشعەری و ڕافیزەکان لەسەر مینبەرەکانی خۆراسان و نەیسابور لە ساڵی ٤٤٥ هـ .

ڕووداوی سێیەم بریتیە لەو شەڕەی لە نێوان حەنبەلیەکان و ئەشعەریەکان ڕوویدا ساڵی ٤٤٧ هـــ، ئەشعەریەکان بەشێوەیەکیان لێکرا نەیانئەتوانی ئامادەبن لە جومعە و جەماعەتەکاندا .

ئەم ڕووداوانە نیشانەن بۆ لاوازی و کەمی ژمارەیان، پاشان باسی بڵاوکردنەوەی مەزهەبی ئەشعەریەکان ئەکات لە حەرەمی مەککە لەلایەن أبو ذر الهروي ـــیەوە (٤٣٤ هـــ)، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە مەزهەبی ئەشعەریەکان پێش أبو ذر الهروي لە حەرەمی مەکی ناسراو نەبووە و ئەو یەکەم کەس بووە بڵاوی کردووەتەوە تیایدا، جا ئەوانەی ئەڵێن ئەشعەریەکان ئەهلی سوننە و جەماعەن ئایا مەککە و مەدینە ئەهلی سوننە و جەماعەی تیایدا نەبووە هەتا أبو ذر الهروي مەزهەبە داهێنراوەکەی الأشعري بردە ناوی ؟

وە پاشان وتەکەی أبو الحسن الكرجي (٥٣٢ ھ) نقڵ ئەکات کە ئەڵێت : (وە هەتا ئێستاش پێشەوایەکانی شافیعیەکان خۆیان ئەپارێزن و ڕەتی ئەکەنەوە لەوەی بدرێنە پاڵ الأشعري، وە حاشا ئەکەن لەوەی کە الأشعري مەزهەبەکەی خۆیی لەسەر بنیادناوە، وە ڕێگری لە هاوەڵان و خۆشەویستانیان ئەکەن لەوەی گرنگی پێ بدەن) .

وە لە کۆتاییدا ئەڵێت : (جا مادەم مەزهەبی أبو الحسن الأشعري نامۆ بوو لە خۆراسان هەتا پێش ئەوەی الوزير نظام الملک سەری بخات، وە نامۆ بوو لە هراة و حیجاز پێش ئەوەی أبو ذر الهروي بڵاوی بکاتەوە; دەرکەوت کە مەزهەب و عەقیدەیەکی داهێنراو و نامۆیە بە ئەهلی سوننە و بە هیچ شێوەیەک مەزهەبی سەلەف نییە) .

٨٢١ - عمر بن عبدالعزيز ئەڵێت : (کاتێک بینیت کۆمەڵەیەک بە دەنگی نزم و چپە قسە ئەکەن دەربارەی بابەتێکی دینەکەیان بزانە ئەوە دامەزراندن و بناغە دانانە بۆ گومڕایەتیەک) .

٨٢٢ - إسماعيل بن علي الدَّلَّال ئەڵێت : گوێبیستی معاذ بووم ئەیوت بە یەکێک لە کەرامیەکان : (ئەگەر الكلام م بۆ بهێنیت ئەوە ددانەکانت ئەشکێنم) .

٨٢٣ - الهروي ئەڵێت : (وە نامەی محمود الأمير[1] م خوێندەوە کە تیایدا هانی ئەدا بۆ لابردنی پەردەکان لەسەر ئەم کۆمەڵەیە، وە دەرخستنی عەیبەکانیان و بەلەعنەت کردنیان .

وە بگرە تیایدا ئەیوت : (ئەو کەسە بە لەعنەت ئەکەم کە بە لەعنەتیان ناکات) .

جا والله ـی یادی بەرزبوویەوە لە ئاسۆکاندا لەلایەن ئەو کەسانەی سوپاس و ستایش ئەکەن لە هەموو شوێنەکان، وە بەناو پیاهەڵدەراندا ڕۆیشت لە هەموو ڕێگەیەکەوە، هیچ کەسێکی عاقڵ نابینیت ئیللا ئەیداتە پاڵ پتەوی دین و جێگیری، وە وەسفی ئەکات بە گەورەیی بۆچوون و بەڕێزی و نەجیبیەکەی .

چۆن بیر لە دینێک ئەکەیتەوە تاریکایی عەیبەکانی تیادا حەشـــاردراوە، وە تۆمەتباری و گومانی دڵەکانی لێوە دەرکەوتووە، وە دینێک هاوەڵانی بە چپە باســـی بکەن و خاوەنەکانی حاشای لێ بکەن ؟!

وە شـــاراوە نییە و دیارە قورئان بە دەنگی بەرز ئەخوێندرێتەوە لە فێرگە و میحرابەکان، وە فەرموودەی رســـول الله ﷺ لە مزگەوتەکان ئەخوێندرێتەوە و گوێی بۆ ئەگیردرێت، وە گەشتی لەپێناودا ئەکرێت، وە بە پەرۆشی و تامەزرۆییەوە بەدوایادا ئەگەڕێن، وە فەقیهەکان بە ئاشکرا لە مەجلیسەکاندا باسی ئەکەن .

وە الكلام خزێندراوەتە ســـووچ و شـــوێنە نهێنیەکانەوە، ڕســـوایی و زەلیلی کردووتەبەر هاوەڵانی، وە تاریکی بەســـەردا هێناون، بەخراپە باس ئەکرێن و لە ڕیزی حافظ ـــــەکان دەرکراون، وە منداڵەکانیان بەهۆی ئەوانەوە جوێنیان پێ ئەدرێت، وە خۆشەویستەکانیان حاشایان لێ ئەکەن، وە موسوڵمانان لەعنەتیان لێ ئەکەن و ئەوانیش لای موسوڵمانان لەعنەت لە یەکتر ئەکەن) .

---

**: لێرەدا الهروي بـاســـی وەزعی ئەهلی کەلام ئەکـات بەتـایبەتی کوللابی و ئەشعەریەکان کە لە سەرەتای سەرهەڵدانیانەوە زەلیل و سەرکوتکراو بوون، بەوهۆیەوە بە نهێنی ئەو زانستە خراپەیان خوێندووە و بڵاویان کردووەتەوە .**

**(١) محمود بن سَبُكتكين (٤٢١ هـ) ناسراو بە محمود الغزنوي، فەتحی هیند ـــی کردووە، وە ناسراوە بە لێهاتووی و ئازایەتی و عەقیدەی باشەکەی .**

**- إبن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية) ـــــدا دەربارەی ئەڵێت : (لە باشـــترین پاشـاکانی ڕۆژهەڵات بوو لەڕووی ئیسـلامەتی و ژیری و دین و جیهاد و موڵک لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا .**

**وە فەرمـانی کرد بە لەعنەتکردنی بیـدعەچییەکـان لەســـەر مینبەرەوە، جـا جەهمیەکـان و ڕافیزەکـان و حەروریەکـان و موعتەزیلەکـان و قەدەریەکـان بە لەعنەت کران، وە ئەشعەریەکانیش بە هەمان شێوە بەلەعنەت کران) .**

- اللالكائي لە (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة) ــدا ئەڵێت : (پێشەوای ئیمانداران القادر بالله، الله تەمەنی درێژ بکات و ڕەحمی پێ بکات و بەردەوامی پێ ببەخشیت بە ڕێنمونی لە کاروباریدا، وە ڕێنمونی بکات بۆ ئەو وتە و کردارەی کە الله ـــی پێ ڕازی ئەبێت، تۆبەی کرد بە فەقیهە موعتەزیلە حەنەفیەکان لە ساڵی ٤٠٨ ـــدا، ئەوانیش پاشگەزبوونەوەیان پیشان دا و خۆیان بەری کرد لە ئیعتیزال .

پاشان نەهی لێ کردن لە الکلام و دەرس وتنەوە، وە لە مونازەرەکردن دەربارەی ئیعتیزال و الرفض، وە وتە موخالیفەکانی ئیسلام و سوننەت، وە هەرکاتێک موخالەفەی بکەن ئەوە ڕێگەپێدراوە بکرێن بە پەند و سزا بدرێن بەشێوەیەک ببن بە مایەی ئامۆژگاری بۆ کەسانی دیکە، وە دەربارەی ئەوە نووسینێکی لێ وەرگرتن وەکو دانپێدانانێک .

وە ئەمینی میلەت و دەستەڕاستی دەوڵەت أبو القاسم محمود بن سبکتکین، الله بە عیززەتی بکات بە سەرخستنی خۆی، فەرمانی پێشەوای ئیمانداران القادر بالله ـــی جێبەجێ کرد، وە هەمان ڕێبازی ئەوی گرتەبەر لەو کارانەدا کە پێی سپاردبوو لە خۆراسان و جگە لەوێ لە کوشتنی موعتەزیلەکان و ڕافیزەکان و ئیسماعیلیەکان و قەرامیتەکان و جەهمیەکان و موشەبیهەکان، وە لەدار دانیان و نەفیکردنیان، وە لە فەرمان کردن بۆ بەلەعنەتکردنیان لەسەر مینبەری موسوڵمانانەوە، وە دوورخستنەوەی هەموو کۆمەڵەیەکی بیدعەچییەکان و وەدەرنانیان لە شوێنەکانی خۆیان) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) دا ئەڵێت : (هەر بەم بۆنەیەوە زۆرێک لە پاشا و زانایان گرنگیان داوە بە ئیسلام و، شەڕکردن لەگەڵ دوژمنەکانیدا، هەتا گەیشتە ئەوەی ڕافیزە و جەهمیەکان و جگە لەوانیان لەسەر مینبەرەوە بەلەعنەت ئەکرد، هەتا هەموو کۆمەڵەیەکیان بەلەعنەت کرد کە بیدعەیان تیادا بینی، کوللابیەکان و ئەشعەریەکانیان بەلەعنەت کرد، وەک چۆن وا بوو دەسەڵاتدارێتی ئەمیر سبکتکین ـــدا، وە لە سەرەتای دەوڵەتی سەلجوقیەکانیشدا، وە خەلیفە القادر بالله گرنگی بەوە داوە، وە فەقیهەکانی موعتەزیلەی تۆبە پێ کردووە، وە باسوخواسی أبو بكر الباقلاني و نزیک لەوی بۆ بەرز کرایەوە، وە بەدوایەوە بوون تا ویستیان هێرشی بکەنەسەر هەتا خۆی حەشاردا، وە الباقلاني خۆی دائەپۆشی بە مەزهەبی ئیمام أحمد موافەقەکردنی) .

هەرچەندە محمود بن سبکتکین هیندی فەتح کردووە، وە هیندی پێشوتر تەنها مەبەست پێی هندستانی ئێستا نییە، بەڵکو هندستان و پاکستان و چەند وڵاتێکی ترە کە پێیان وتراوە هیند، کەچی ئەوانەی کە شەو و ڕۆژ باسی جیهاد ئەکەن و ناوی کەسێکی وەکو محمد فاتیح ـــ ی عوثمانی زۆر بە گەورە ڕائەگرن لەکاتێکدا خاوەن عەقیدەیەکی بۆگەن بووە کەچی نایەن باسی کەسێکی وەکو محمود بن سبکتکین بکەن .

لەکاتێکدا لە مسند الإمام أحمد و سنن النسائي و الجهاد لابن أبي عاصم ـــدا فەرموودەیەکی صحیح هاتووە دەربارەی ئەو کەسانەی فەتحی هیند ئەکەن .

- پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت : (**دوو کۆمەڵ هەن الله پاراستوونی لە ئاگر، کۆمەڵەیەک غەزای هیند ئەکەن، وە کۆمەڵەیەک لەگەڵ عیسى بن مريم دا ئەبن**) .

ڕوونە ئەمە دەربارەی محمود بن سبکتکین ـــە، بەڵام ئەوان دێن بەڵگە بە فەرموودەیەکی لاواز ئەهێننەوە بۆ گەورەکردنی محمد فاتح، هۆکارەکەش ئەوەیە محمد فاتح ماتوریدی بووە، لە عەقیدەدا زۆر نزیکترە لە ئەشعەریەکان لەچاو شوێنکەوتووەکانی سەلەف، بگرە شوێنکەوتەکانی سەلەف ئەشعەریەکان بە کافر ئەزانن ئەوانیش شوێنکەوتەکانی سەلەف بە کافر ئەزانن .

ئەمەش بۆ بەڕاستدانانی عەقیدەکەی خۆیان و خۆڵکردنەچاوی نەزانەکانە، ئەڵێن مادەم ئەو کەسەی شارەکەی قەیسەر واتە القسطنطينية ـــی فەتح کردووە عەقیدەکەی وەکو ئێمەیە کەواتە عەقیدەکەمان ڕاستە، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی فەرموودەیەکی لاوازی لەسەر هاتووە و بەزۆر ئەڵێن مەبەستی محمد فاتح ـــە چونکە کەیفیان پێ دێت لەکاتێکدا لە بابەتی عەقیدەدا نەک فەرموودەی صحیح بگرە قورئانیش وەرناگرن و تەحریفی ئەکەن .

وە نایەن باسی ئەو فەرموودە صحیح ـــە بکەن دەربارەی محمود بن سبکتکین هاتووە، چونکە ئەشعەریە جەهمیەکانی بەلەعنەت کردووە و زۆر توند بووە لەسەریان، لەبەر ئەوەی ئەوکات ئەهلی سوننەش ئەڵێن مادەم محمود بن سبکتکین غەزای هیندی کردووە و ئەهلی سوننە و بووە و دژی ئەشعەریەکان بووە و فەرموودەی دەربارە هاتووە، کەواتە عەقیدەکەی ئێمە ڕاستە نەوەک ئەشعەریە جەهمیەکان، لەکاتێکدا شوێنکەوتووانی سەلەف هیچ پێویستیان بەو شتە نییە بە هیچ شێوەیەک .

**وه له ڕاستیدا دەربارەی شارەکەی قەیسەر واته القسطنطينية فەرموودەیەکی صحيح هاتووه له (صحيح البخاري / كتاب الجهاد والسير / باب ما قيل في قتال الروم) ـدا تیایدا رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (یەکەم جەیش جیهاد ئەکەن لەڕێگەی دەریاوه ئەوه لێبوردراون)، وه ئەفەرمووێت : (یەکەم جەیش غەزو ئەکەن دژی شارەکەی قەیسەر ئەوه لێبووردراون) .**

**ڕوونه که معاوية رضي الله عنه و جەیشەکەی یەکەم کۆمەڵ بوون غەزوەی دەریایی بکەن له سەردەمی خەلافەتی عثمان بن عفان ـدا رضي الله عنه .**

**وه له سەردەمی خەلافەتی معاوية ـدا رضي الله عنه له ساڵی ٥٤ هەتا ٦٠ ـی کۆچی غەزوە کراوه له دژی ڕۆمەکان له پێش القسطنطينية .**

٨٢٤ - عبدالرحمن بن أبي حاتم ئەڵێت : گوێبیستی المزني بووم ئەیوت : گوێبیستی الشافعي بووم ئەیوت : (الكلام لەعنەت ئەکات له ئەهلی الكلام) .

## دەروازەی : (١٥)

## لەعنەتکردن لە داهێنەران و موتەکەلیمەکان و موخالیفەکان

٨٢٥ - سلمة بن أكوع رضــي الله عنه ئەڵێت : (کاتێک پیاوێک موســوڵمان بووبوو لەلای پێغەمبەر ﷺ نانی ئەخوارد، بە دەستی چەپی ئەیخوارد .

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (بە دەستە ڕاستت نان بخۆ) .

وتی : ناتوانم .

فەرمووی : (هەر نەتوانیت) .

جا دواتر دەستی ڕاستی نەئەگەیشتە دەمی) .

---

**: هەمان ڕیوایەت لە صحيح مسلم (٢٠٢١) ـــدا هاتووە بە تەواوی (هیچ شتێک ڕێگری لێ نەکرد جگە لە کیبر و خۆبەگەورەزانی) .**

٨٢٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (شــەش دانە نەفرەتم لێ کردوون وە الله نەفرەتی لێ کردوون وە هەموو پێغەمبەرێکی وەڵامدراوەش نەفرەتی لێ کردوون:

- ئەوەی شتێک زیاد بکات بۆ کتێبی الله .

- ئەوەی قەدەری الله بەدرۆ بخاتەوە .

- ئەوەی بە زۆرداری و زوڵم خۆی بسەپێنێت بۆ ئەوەی ئەو کەسە ڕسوا بکات کە الله شکۆداری کردووە، وە ئەوە شکۆدار بکات کە الله ڕسوای کردووە .

- وە ئەوەی حەڵاڵی الله حەرام ئەکات .

- وە ئەوەی شتێک لە سوننەتەکەم حەڵاڵ بکات کە الله حەرامی کردووە .

- وە کەسێک واز لە سوننەتەکەم بهێنێت ) .

٨٢٧ - المبارک بن فضالة ئەڵێت : گوێبیستی الحسن بووم وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەرکەسێک شتێکی نوێ دابهێنێت ئەوە لەسەر خۆیەتی، وە ئەوەی شتێکی نوێ دابهێنێت یان کەسێک بپارێزێت کە شتێکی نوێی داهێناوە ئەوە لەعنەتی الله و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێبێت، الله نە صرف و نە عدل ی لێ قبووڵ ناکات ) .

وتیان بە الحسن : مەبەست لە تازە داهێنراو چییە ؟

وتی : (هاوەڵانی فیتنە و ئەهلی هەوا و ئارەزوو هەموویان شتی نوێ دائەهێنن ) .

---

**- لە (تیسیر عزیز الحمید في شرح کتاب التوحید) ـدا هاتووە : فەرمایشتی (ومن آوی محدِثا = وە ئەوەی کەسێک بپارێزێت کە شتێکی نوێی داهێناوە)، آوی بە فەتحەی هەمزەی درێژکراوە واتە بیداتە پاڵ خۆی و بیپارێزێت .**

**وە (مُحدِثاً = کەسێک شتێکی تازەی داهێناوە) .**

**أبو السعادات ئەڵێت : (ئەگێڕدرێتەوە بە کەسرە و فەتحەی پیتی دال ـەکە بەشێوەی فاعل و مفعول یش .**

**مانای ئەوەی بە کەسرە هاتووە (مُحدِثاً) واتە : هەرکەسێک کەسێکی تاوانبار سەربخات و بیگرێتە خۆی و بیپارێزێت لە دوژمنەکەی، وە ڕێگری بکات لەنێوان ئەو و تۆڵەلێسەندنەوەیدا .**

**وە بە فەتحە (مُحدَثاً) خودی کارە داهێنراوەکەیە، وە مانای الإيواء تیایدا بریتیە لە : ڕازیبوون پێی و ئارامگرتن لەسەری .**

**جا کاتێک ڕازی ببێت بە بیدعە، وە دانبنێت بە ئەو کەسەدا کە ئەنجامی ئەدات و ئینکاری لێ نەکات ئەوە پاراستوویەتی) .**

**سلیمان بن عبدالله بن محمد بن عبدالوهاب ئەڵێت : (ڕووکەش و دیار لە ڕیوایەتی یەکەمدا ئەوەیە کە هەردوو ماناکە ئەگرێتەخۆ، چونکە ئەوەی شتێکی نوێ دابهێنێت گشتگیرترە لەوەی کە تاوانێک بێت، یاخود بیدعەیەک لە دیندا، بەڵکو ئەو کەسەی بیدعەیەک دائەهێنێت لە دیندا لەو کەسە خراپترە کە تاوانێک ئەنجام ئەدات، هەربۆیە پاراستن و گرتنەخۆی تاوانێکی گەورەترە، هەربۆیە إبن القيم هەژماری کردووە لە کتێبی (الكبائر = تاوانە گەورەکان) و ئەڵێت : (ئەم تاوانە گەورەیە پلەکانی جیاوازە بە جیاوازی پلەکانی شتە داهێنراوەکە، هەتا شتە داهێنراوەکە خۆی لە خۆیدا گەورەتر بێت ئەوە تاوانە گەورەکە گەورەتر ئەبێت) .**

**٨٢٨ - يحيى بن سعيد القطان** ئەڵێت : (الحسن البصري لە فەرموودەکانیدا نەیوتووە (رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت) ئیللا ئەسڵ و بنچینەیەکمان بۆ دۆزیوەتەوە تەنها فەرموودەیەک یان دوان نەبێت) .

**٨٢٩ - أبو هريرة** رضي الله عنه ئەڵێت : رسول الله چوو ﷺ بۆ گۆڕستانێک، فەرمووی : (السلام عليكم شوێنی کۆمەڵەی ئیمانداران، إن شاء الله ئێمەش پێتان ئەگەین، ئاواتەخوازبووین براکانمان ببینیایە) .

وتیان : ئایا ئێمە برات نین ئەی رسول الله ؟

فەرمووی : (بەڵکو ئێوە هاوەڵانی منن، براکانم ئەوانەن کە جارێ نەهاتوون، وە من لە پێشتانەوەم لەسەر حەوزی کەوثەر) .

وتیان : چۆن ئەوانە ئەناسیتەوە کە جارێ نەهاتوون لە ئوممەتەکەت ؟

فەرمووی : (ئاخۆ ئەگەر پیاوێک ئەسپێکی دەستوقاچ سپی هەبێت نایناسێتەوە لەنێوان کۆمەڵە ئەسپێکی ڕەشدا ؟) .

وتیان : بەڵێ ئەی رسول الله .

فەرمووی : (جا ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا دێن ناوچاو و پەلەکانیان سپیە بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژەوە، وە من پێشتانکەوتووم و لەپێشتانەوەم لەسەر حەوزەکە، پیاوانێک دوور ئەخرێنەوە لە حەوزەکەم وەک چۆن حوشتری ونبوو دوور ئەخرێتەوە، منیش بانگیان ئەکەم : وەرن، ئەوترێت : ئەوانە پاش تۆ گۆڕیان).

٨٣٠ - عبدالله بن أبي رافع ئەگێڕێتەوە لە أم سلمة رضي الله عنها ئەگێڕێتەوە : قژم بۆ دائەهێنرا و گوێبیستی رسول الله ﷺ بووم ئەیفەرموو : (ئەی خەڵکینە) .

وتم بە ئەوەی قژی بۆ دائەهێنام : قژم کۆکەرەوە .

وتی : فیدات بم، ئەفەرمووێت : (ئەی خەڵکینە) .

وتم : ویحک، بۆ مەگەر ئێمە لە خەڵک نین ؟!

قژی کۆکردەوە هەستا لە ژوورەکەی خۆیدا، گوێبیستی بوو فەرمووی : (ئەی خەڵکینە، کاتێک من لەسەر حەوزەکەم بووم کۆمەڵەیەک بەلاتاندا تێپەڕین و ڕێگەکەتان جیا بوویەوە، منیش بانگم کردن : وەرنە سەر ڕێگەکە .

بانگکەرێک بە دەنگی بەرز وتی : دوای تۆ گۆڕیان .

منیش وتم : دووربن دووربن) .

٨٣١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (من لەپێشتانەوەم لەسەر حەوزەکە، ئەوەی بگات ئەخواتەوە، وە ئەوەی بخواتەوە هەرگیز تینوو نابێت، ئەبینم

کۆمەڵانێک دێن ئەیانناسم و ئەوانیش من ئەناسن، جا نێوان من و ئەوان جیا ئەکرێتەوە .

ئەڵێم : ئەوان لە منن .

ئەڵێن : تۆ نازانیت دوای تۆ چییان داهێنا .

منیش ئەڵێم : دووری دووری بۆ ئەو کەسەی دوای من گۆڕی) .

**٨٣٢** - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (ئێوە ڕۆژی قیامەت کۆ ئەکرێنەوە بە پێی پەتی و ڕووت و خەتەنە نەکراوی، وەک چۆن یەکەمجار دروستی کردن، یەکەم کەس جلی ئەکرێتە بەر لە دروستکراوەکان إبراهيم خليل الرحمن ـه، پاشان کەسانێک لە ئێوە ئەخرێنە لای چەپ .

منیش ئەڵێم : هاوەڵانم هاوەڵانم .

ئەوترێت : تۆ نازانیت دوای تۆ چییان داهێنا) .

**٨٣٣** - رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (پیاوانێک دێن بۆ حەوزەکەم لەوانەی هاوەڵایەتیان کردووم و بینیویانم، کاتێک دێنە سەر حەوزەکەم ڕێگریان لێ ئەکرێت لە من .

منیش ئەڵێم : ئەی پەروەردگارم هاوەڵانم هاوەڵانم .

ئەوترێت : تۆ نازانیت دوای تۆ چییان داهێنا) .

**٨٣٤** - **عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت : عثمان بن أبي شيبة قازیەکانی کوفەی بۆ ژماردم، وتی : (غسان لەعنەتی الله ی لێبێت، جەهمی بوو) .

---

- وكيع لە (أخبار القضاة) ـدا ئەڵێت : عبدالله بن أحمد بن حنبل هەواڵی پێدام وتی : عثمان بن أبي شيبة ناوی قازیەکانی کوفەی پێ وتم، وتی : (غسان الله ڕەحمی پێ

نەكات خەڵكیی تاقی ئەكردەوە، غسـان لە ئەهلی خۆراسـان بوو لە هاوەڵانی أحمد بن أبي دؤاد) .

**٨٣٥** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (جیهاد بكەن دژی موشـریكەكان بە سامان و، گیان و زمانەكانتان) .

---

- إبن القيم لە (تبیان في أیمان القرآن) دا ئەڵێت : (قەڵەم كۆكەرەوەیە، قەڵەمی ڕەددانەوەی بەتاڵكەرەوەكان و، سـەرخسـتنی ڕێبازی ڕاسـتگۆكان و، دەرخسـتنی پووچی پوچكەرەوەكـان بە هەموو جۆرەكـانیـانەوە، وە ڕوونكردنەوەی دژبەیەكیەكـانیـان و هەڵەكانیان، وە دەرچوونیان لە حەق و چوونە ناوەوەیان بۆ باتڵ .

ئەم پێنووسـە لەناو پێنووسـەكاندا وەكو پادشـایە لەناو خەڵكیدا، وە هاوەڵانی خاوەنی بەڵگەن سـەرخەری ئەوەن كە پێغەمبەران پێی هاتوون، جەنگ ئەكەن دژی ئەوانەی دوژمنی پێغەمبەرانن، وە ئەوان بـانگەشـەكـارن بۆ لای الله بە حیكمەت و ئامۆژگاری چاك .

هـاوەڵانی ئەم قەڵەمە جەنگن بۆ هەموو بەتـاڵكەرەوەیەك، وە دوژمنی هەموو پێچەوانیكـارێكی پێغەمبەرانن، ئەوانە ئیشـێكیـان هەیە و جگە لەوان لە هـاوەڵانی قەڵەمەكان ئیشێكی تریان هەیە) .

## دەروازەی : (١٦)

## بێزراوێتی وەرگرتنی دین لە موتەکەلیم و بیدعەچییەکان

٨٣٦ - محمد بن سـيرين ئەڵێت : (ئەم زانســتە دینە، جا بزانن لە کێی وەرئەگرن) .

**: جیاواز لەو مەبەستە ڕوونەی تیایدایەتی کە بریتیە لە (وەرگرتنی دین لە کەسانی ئەهلی سوننە و خاوەن متمانە)، ئەوەشی تێدایە هەموو شتێکی دین ئەبێت بە زانستەوە بێت، واتە هەرشــتێک کە وترا ئەمە دینە و لە دین حســابی بۆ کرا ئەبێت داوای بەڵگە بکرێت بۆی، ئەگەر بەڵگەکە بۆی ڕاست بوو وەرئەگیرێت و ئەگەریش ڕاست نەبوو ڕەت ئەکرێتەوە .**

**چونکە ئەو زانســتەی کە ئێســتا هەتە ئەبێت بە دین بۆ تۆ ئەگەر دینداری بەپێی زانست بکەیت نەوەک بە هەوا و ئارەزوو .**

٨٣٧ - زيد بن أسـلم ئەڵێت : (ئەم زانســتە دینە، جا بزانن دینەکەتان لە کێ وەرئەگرن) .

٨٣٨ - الحسن البصـري ئەڵێت : (ئەم زانســتە دینە، جا بزانن لە کێی وەرئەگرن) .

٨٣٩ - الضحاك بن مزاحم ئەڵێت : (زانست دینە، جا بزانن لە کێی وەرئەگرن) .

٨٤٠ - إبراهيم النخعي ئەڵێت : (ئەم زانستە دینە، جا بزانن لە کێی وەرئەگرن، کاتێک بهاتینایە بۆلای پیاوێک تا لێوەی وەربگرین تەماشای خووڕەوشت و نوێژەکەیمان ئەکرد، پاشان لێمان وەرئەگرت) .

٨٤١ - أبو عبدالرحمن المقرئ ئەڵێت : گوێبیستی إبن لهيعة بووم باسی پیاوێکی بیدعەچی ئەکرد کە پاشگەز بووەتەوە لە بیدعەکەی و وتوویەتی : (بزانن فەرموودە لە کێوە وەرئەگرن، ئەگەر بۆچوونێکمان هەبوویایە ئەمانکرد بە فەرموودە) .

---

: واتە ئەیاندایە پاڵ رسول الله ﷺ بۆ ئەوەی خەڵکی شوێنی بکەون و ڕەواج بە بۆچوونەکەیان بدەن .

- لە (الجامع ــی الخطيب) ــدا حماد بن سلمة ئەڵێت : (شێخێکی ڕافیزەکان بۆی گێڕامەوە کە تەوبەی کردبوو ئەیوت : کاتێک کۆببوینایەتەوە و شتێکمان بەباش بزانیایە ئەمانکرد بە فەرموودە) .

٨٤٢ - بهز ئەڵێت : (دینی الله شایستەترینی ئەوەیە کە کەسە خاوەن عەدلەکان هەوڵی بۆ بدەن) .

---

- لە (أدب الإملاء والإستملاء) ـدا زنيج الرازي ئەڵێت : کاتێک باسی سەنەدێکی صحیح بۆ بهز بکرایە ئەیوت : (ئەمە شایەتیدانەکانی کەسانێکی عەدلە کە لە یەکتری ڕازین) .

**کاتێک باسی سەنەدێکی بۆ بکرایە شتێکی تیادا بووایە - واتە لە لاوازی -، ئەیوت : (ئەگەر پیاوێک دە درهەمی لەلای پیاوێکی تر بێت و پاشـــان پیاوەکەی تر نکۆڵی لێ بکات ناتوانێت لێی وەربگرێتەوە ئیللا بە دوو شـــایەتی عەدل نەبێت، قەرزی الله عز وجل شایستەترە بەوەی لە کەسە عەدلەکان وەربگیرێت) .**

٨٤٣ - إبن أبي أويس ئەڵێت : گوێم لە مالک ــــى خاڵم بوو ئەیوت : (ئەم زانســـتە دینە، هەربۆیە تەماشـــا بکەن و بزانن لە کێوە دینەکەتـان وەرئەگرن، گەیشـــتم بە حەفتا کەس) وە بە دەســـتی ئاماژەی کرد بۆ مزگەوتەکەی رســـول الله ﷺ (ئەیوت : (فلانە کەس وتی رســـول الله ﷺ فەرمووی)، جـا هیچیم لێ وەرنەگرتن .

خۆ ئەگەر هەریەکێکیان بکرابانایە بە لێپرســـراوی بیت المال ئەوە ئەمین و دەستپاک بوون) .

---

**- لە (إسعاف المبطأ) دا إسحاق بن محمد الفروي ئەڵێت : پرسیار لە مالک کرا ئاخۆ زانست لە کەسێک وەرئەگیرێت کە هەوڵی بۆ نەداوە و دانیشتنی نەکردووە بۆی ؟**

**وتی : (نەخێر) .**

**وە وتی : (وەرناگیردرێت مەگەر لە کەســـێک نەبێت کە لەبەریەتی و، هەوڵی بەدەستهێنانی دابێت و چووبێتە دانیشتنەکانەوە و، پێی ناسرا بێت و کاری پێ کردبێت و وەرعیشی لەگەڵدا بێت) .**

٨٤٤ - خالد بن خداش ئەڵێت : ماڵئاواییم لە مالک بن أنس کرد وتم : وەسیەتێکم بۆ بکە ئەی أبو عبدالله .

وتی : (تەقوای الله و بەدەستهێنانی زانست لەلای کەسی شایستە) .

٨٤٥ - الهروي ئەڵێت : جگە لە ئەو وتوویەتی : (فەرموودە بەدەست بهێنن لەیەکێکەوە فەرموودە ئیشی بێت) .

٨٤٦ - عمر الناقد ئەڵێت : گوێبیستی وکیع بن الجراح بووم باسی وهب بن إسماعیل ی کرد و وتی : (پیاوێکی باشە، وە فەرموودە پیاوی خۆیی هەیە) .

٨٤٧ - عبدالله بن إدریس ئەڵێت : (نابێت فەرموودە گوێی لێ بگیردرێت لەو کەسەوەی سەرخۆشکەر ئەخواتەوە، نەخێر هیچ کەرامەتی نییە) .

٨٤٨ - إبراهیم بن أشعث ئەڵێت : گوێبیستی أبو أسامة حماد بن أسامة بووم وتی : (ئەکرێت پیاو نوێژی زۆر بێت، وە خاوەن ڕۆژووی زۆر بێت و، خاوەن وەرع بێت، شایەتیی وەربگیرێت، وە لە فەرموودەدا هێندەی ئەمە نەبێت)، شتێکی بەرز کردەوە و فڕێی دا) .

٨٤٩ - الحسن بن الصباح البزار ئەڵێت : پرسیارم کرد لە أبو عبدالله أحمد بن حنبل دەربارەی ئەو کەسەی لە المحنة - واتە تاقیکردنەوەی خەلقی قورئان - دا وەڵامیان داوەتەوە پێت چۆنە لێیانەوە بنووسرێتەوە ؟

وتی : (وتە دەربارەی یەکێکیان توندترە دەربارەی یەکێکی تریان، بەڵام تەنها لە حەوت کەسەکەوە ئەنووسرێتەوە) .

پێی وترا : ئایا لە جگە لەو حەوت کەسەوە ئەنووسرێتەوە ؟

وتی : (الله - خەڵکی - لەوان بێپێویست ئەکات) .

٨٥٠ - صالح بن أحمد بن حنبل ئەڵێت : (حەوت کەسەکە بریتین لە : یحیی بن معین و، أبو خیثمة و، أحمد الدَورقي و، سَعدَویه و، سَجَّادة و، القواریري و، وە وا بزانم خلف المُخَرَّمي) .

: پاش ئەوەی زانایان لە فیتنەی خەلقی قورئاندا تاقیکرانەوە و زۆریان لێکرا، هەندێکیان وەڵامیان دایەوە و وتیان قورئان مخلوقە، هەندێکی تریان نەیانوت، وە پاشان ئەوانەش کە وتبوویان پەشیمان بوونەوە .

ئیمام أحمد توند بوو لەسەریان چونکە ئەکرا ئەوان بەهێزبن و لەژێر هەڕەشەدا وەڵامی داواکاری جەهمیەکان نەدەنەوە بەڵکو میحنەکە کۆتایی بهاتایە بەهۆی خۆڕاگریانەوە .

- لە (طبقات الحنابلة) ـــدا أبو بكر المروذي ئەڵێت : (يحيى بن معين هات بۆ لای أحمد بن حنبل و نەخۆش بوو، سەلامی کرد و ئەویش وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە، وە أحمد سوێندی خواردبوو قسە نەکات لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە وەڵامیان داوەتەوە هەتا ئەگاتەوە بە الله عز وجل، بەردەوام يحيى عوذری ئەهێنایەوە و باسی فەرموودەکەی عمار بن ياسر ـی رضي الله عنه ئەکرد، وە فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ ﴾ (النَّحْل : ١٠٦) .

أحمد ڕووی کردە لایەکەی تر و يحيى پێی وت : ئایا عوذر قبووڵ ناکەیت ؟!

منیش دوای ئەو - واتە يحيى - چوومە دەرەوە، دانیشتبوو لەلای دەرگاکە و وتی : أحمد لەپاش من چی وت ؟ .

وتم : وتی : (بەڵگە ئەهێنێتەوە بە فەرموودەی عمار رضي الله عنه، وە فەرموودەکەی عمار بریتیە لە (بەلایاندا تێپەڕیم و جوێنیان بە تۆ ئەدا، منیش ڕێگریم لێ کردن و ئەوان لێیان دام)، وە ئێوە تەنها پێتان وترا : ئەمانەوێت لێتان بدەین) .

گوێبیستی يحيى بن معين بووم وتی : بەردەوام بە أحمد، الله لێت خۆش ببێت، والله هیچ کەسێکم نەبینیوە لەژێر پانتایی ئاسماندا تێگەیشتووتر بێت لە دینی الله ـــدا لە تۆ) .

**٨٥١ - عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت : پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی أسد بن عمرو .

وتی : (صدوق ـە، وە أبو يوسف يش صدوق ـە، بەڵام نابێت هیچ شتێک لە هاوەڵانی أبو حنيفة ـەوە بگێڕدرێتەوە).

---

- لە (السنة لـ عبدالله) ـدا هارون بن سفيان ئەڵێت پرسیارم لە أسود بن سالم کرد دەربارەی أبي زائدة ؟

وتی : (حافظ بوو، بەڵام باسی ئەبو حەنیفەی ئەکرد و بە فتواکانی ئەو فتوای ئەدا، لەبەر ئەوە لەلای من ضعيف ـە).

- عبدالحليم بن عبدالسلام لە (المسودة في أصول الفقه) دا ئەڵێت : (بەشێک دەربارەی وتەی أحمد (ڕیوایەت ناکرێت لە هاوەڵانی ڕەئی ـەوە).

إبن عقيل قسەی زۆری کردووە دەربارەی، وتوویەتی : لە ڕیوایەتی عبدالله ـدا ئەڵێت : (هاوەڵانی ڕەئی فەرمووەدەیان لێوە مەگێڕنەوە).

وە القاضي أبو يعلى ئەڵێت : ئەمە ئەخرێتەسەر ئەهلی ڕەئی لە موتەکەلیمەکان وەکو قەدەریەکان و نزیک لەوانە.

منیش ئەڵێم : بەو شێوەیە نییە، بەڵکو وتەکانی لەوبارەیەوە زۆرە، وە ئەوەی باسم کردووە جۆرێکە لە هەجرکردن، چونکە بە ڕاشکاوی کەسانێکی وەکو أبو يوسف ی بە ثقة داناوە و لەگەڵ ئەوەشدا ڕیوایەتی لێوە نەکردوون، وە هەر لەبەر ئەوەشە ڕیوایەتیان لێوە نەکراوە لە کتێبە سەرەکیەکاندا وەکو الصحيحين).

٨٥٢ - يحيى بن معين ئەڵێت : (ئامڕازی فەرمووەدە بریتیە لە : ڕاستگۆیی و، ناسران لە بەدەستهێنانیدا و، وازهێنان لە بیدعەکان و دوورکەوتنەوە لە تاوانە گەورەکان).

٨٥٣ - الشافعي ئەڵێت : (پیاو لە دنیادا کامل نابێت ئیللا بە چوار شت نەبێت :

- دینداری .

- وە دەستپاکی و ئەمانەت پارێزی .

- وە خۆپارێزی .

- وە شکۆ و ویقار) .

٨٥٤ - سلم بن میمون الخواص ئەڵێت : (پرسیارم ئەکرد دەربارەی خۆراکی پیاو، ئەگەر لەلایەن خۆیەوە بوویایە و خۆی پەیدای بکردایە ئەوە گوێم بۆ ئەگرت).

٨٥٥ - دعلج بن أحمد ئەڵێت : چوومە ماڵەوە بۆ لای إبن جَوصـــا، توتکە سەگێکی چینیم بینی هەربۆیە لێم نەنووسیەوە، لەبەر فەرموودەی ﷺ : (ئەوەی سەگێک ڕابگرێت هەموو ڕۆژێک یەک قیراط لە کردەوەکەی کەم ئەبێتەوە) .

---

- أبو عبدالرحمن السلمي لە (سؤالاته للدارقطني) ــدا ئەڵێت : پرسیارم لێ کرد دەربارەی أحمد بن عمیر بن جوصا ؟

وتی : (تەفەرودی کردووە بە چەند فەرموودەیەک، وە بەهێز نەبوو، وە گوێبیستی دعلج بن أحمد بووم ئەیوت : چوومە دیمەشقەوە، إبن جوصا جوزء ــێکی بۆ نووسیم و لێوەی ناگێڕمەوە، چونکە لە ماڵەکەیدا توتکەسەگێکی چینیم بینی) .

٨٥٦ - محمد بن حبان ئەڵێت : (أبو یعقوب المقرئ ــم بینی نوێژ ئەکات و دەســتەکانی بەرز ناکاتەوە لەکاتی چوونە ڕکوع و هەســتانەوە لێیدا، منیش حەرامم کرد لەسەر نەفسی خۆم ڕیوایەتی لێوە بکەم) .

٨٥٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (سێ دانە لە نیشـانەکانی قیامەتن، یەکێکیان ئەوەیە زانست بەدەست بهێنرێت لەلای بچووکەکان) .

عبدالله بن المبارك ئەڵێت : (بچووکەکان) واتە بیدعەچییەکان .

٨٥٨ - عَبدَة بن سلیمان ئەڵێت : پرسیار کرا لە عبدالله بن المبارک دەربارەی مانای ئەم فەرموودەیە (خەڵکی هەمیشە باش ئەبن هەتا زانست لە گەورەکانیان وەربگرن، کاتێک لە بچووکەکانیانەوە وەریبگرن ئەوە لەناو ئەچن)؟

وتی : (ئەوانە بیدعەچییەکانن، بەڵام ئەو کەسە تەمەن کەمەی ئەیگەیەنێت بەوەی لەخۆیان گەورەترن ئەوە گەورەیە) .

---

**- لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي) ـدا إبراهيم الحربي دەربارەی فەرموودەی (هەر لە خێردا ئەبن هەتا زانست لە گەورەکانیانەوە وەرئەگرن) ئەڵێت : (ئەگەر کەسێکی تەمەن بچووک دەست بە وتەی رسول الله ﷺ، وە هاوەڵان و تابیعین ـەوە بگرێت ئەوە گەورەیە .**

**وە ئەگەر شێخێکی گەورەی بەتەمەن دەست بە وتەی ئەبو حەنیفە ـوە بگرێت و واز لە سوونەت - فەرموودە و ئاثاری هاوەڵان - بهێنێت، ئەوە بچووکە) .**

**- أبو عبيد القاسم بن سلام لە (غريب الحديث) ـدا باسی تەفسیرەکەی عبدالله بن المبارک ئەکات بۆ فەرموودەکە و ئەڵێت : (ئەوە ڕوویەکی فەرموودەکەیە) .**

**وە ئەڵێت : (ئەوەی کە من پێم وایە دەربارەی (بچووکەکان) : زانست وەربگیرێت لە کەسانی پاش هاوەڵانی رسول الله ـوە ﷺ و پێشبخرێت بەسەر زانست و بۆچوونی هاوەڵاندا رضي الله عنهم، ئەوە وەرگرتنی زانستە لە بچووکەکانەوە، وە پێم وایە عبدالله هەر مەبەستی ئەوە بووە) .**

**- لە (طبقات الحنابلة) ـدا علي بن المديني ئەڵێت : (ئەگەر پرسیار بکەم لە أحمد بن حنبل و فتوام بۆ بدات بەلامەوە خۆشترە لەوەی پرسیار لە أبو عاصم النبيل و إبن داود بکەم، زانست بە تەمەن نییە، زانست بە تەمەن نییە) .**

**- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ـدا ئەڵێت : (شوێنکەوتەی ئەثەر پێویستە پێشبخرێت و ڕێزی لێ بگیردرێت ئەگەرچی تەمەنی کەم بێت و خاوەن**

ڕەچەڵەک نەبێت، وە ئەوەی موخالەفەی ئەثەر بکات خۆبەدوورگرتن لێی پێویستە ئەگەرچی بەتەمەن و خاوەن ڕەچەڵەکیش بێت) .

**٨٥٩ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرموویێت : (خەڵکی لە خێردان هەتا زانستیان بۆ بێت لەلایەن هاوەڵانی محمد ﷺ و گەورەکانیانەوە، جا کاتێک بۆیان هات لەلایەن بچووکەکانیانەوە ئیتر ئەوکاتە لەناوچوون) .

---

- لە (الفقيه والمتفقه) دا عبدالله بن مسلم بن قتيبة الدينوري ئەڵێت :

(پرسیارم لێکرا دەربارەی وتەی : (خەڵکی لە خێردان هەتا زانست وەرگرن لە گەورەکانیانەوە)، مەبەستی ئەوەیە خەڵکی لەخێردان هەتا زاناکانیان شێخ و گەورە بن و زاناکانیان تازەپێگەیشتوو نەبن، چونکە کەسی بەتەمەن پێگەیشتن و، تازەیەتی و، تیژی و، پەلەیی و گەمژەیەتی گەنجیی نەماوە، وە لەگەڵ تەجروبە و ئەزمووندا ژیاوە، هەربۆیە گومان ناچێتە زانستەکەیەوە، وە هەوا و ئارەزوو بەسەریدا زاڵ نابێت، وە تەماح لەسەر ڕێگەی ڕاست لاینابات، وە شەیتان گومڕای ناکات وەک چۆن گەنجێک گومڕا ئەکات، وە لەگەڵ تەمەندا سام و هەیبەت و بەڕێزی و شکۆداری هەیە، وە گەنج لەوانەیە ئەو شتانە تووشی ببێت کە کەسی بەتەمەن لێی پارێزراوە، جا کاتێک تووشی بوو و فتوای دا ئەوە لەناوئەچێت و لەناو ئەبات، وە ڕازی نابێت و قەناعەت ناکات بەوەی تەنها گێڕەرەوە و فەرموودەوان بێت) .

**٨٦٠ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرموویێت : (زانست لە گەورەکانتاندایە، وە هەر لە خێردا ئەبن هەتا وابن، بەس کاتێک بچووک بە گەورەی وت : (چوزانیت ؟)، ئەوکاتە کێشەیە) .

---

**- له (العلم لـزهير بن حرب) دا عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئێوه له خێر و چاكەدا ئەبن هەتا زانســـت لەلای بەتەمەنەكانتان بێت، ئەوكاتەی زانســـت لەلای گەنجەكان بێت ئەوه بەتەمەنێک ڕەتی ئەكاتەوه له گەنجانەوه فێر ببێت) .**

**- له (جامع بيان العلم) ــدا عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (له خێر و باشـــيدا ئەبن هەتا زانســـت لەناو گەورەكانتاندا بێت، جا كاتێک زانســـت لەلای بچووكەكانتان بێت بچووک گەوره به گەمژه ئەزانێت) .**

٨٦١ - الهروي ئەڵێت : (له دەروازەكانی پێشـــوودا شـــتانێكی زۆری لێيه كه لەژێر ئەم بابەتەدا جێگەيان ئەبێتەوه، حەزم لێ نەبوو به ســـەنەدەكانيەوه باســـی بكەم لەترسی درێژ كردنەوه، لەوانه :

وتەی أحمد : (ڕيوايەت ناكرێت له ئەو كەسەی بانگخوازه بۆ بيدعەيەک، وه ئەوەش مەزهەبی عبدالرحمن بن مهدي يه[(١)]) .

وه لەوانه : أحمد نووســـی بۆ أبي ســـليمان الجوزجاني ئەگەر واز بهێنيت له كتێبەكانی ئەهلی ڕەئی ئەوه گوێبيستی كتێبەكانی فەرمووده ئەبين لێتەوه .

وه لەوانه : أحمد ناردی بۆ يحيى بن صـــالح الوحاظي ـــــدا ئەگەر واز له كتێبەكانی ڕەئی بهێنيت ئەوه دێين بۆ لات و گوێبيست ئەبين لێتەوه .

وه لەوانه : الشافعي وتی : (حەڵاڵ نييه بۆ هيچ كەسێک له ئەهلی ڕەئی فتوا بدات، خۆ ئەگەر حەڵاڵ بێت ئەوه بۆ محمد بن الحسن هەيه) .

وه لەوانه : وتەی محمد بن إبراهيم الماستَوی كاتێک باسی ئەهلی الكلام ـی كرد و وتی : (نزيكبوونەوه لێيان و گوێگرتن بۆ فتوادانی يەكێكيان ياخود فەرمووده وەرگرتن لێيان ئەوه له بابەته گەورەكانی دينه) .

---

(١) أبو داود لە (المسائل) ــەکەیدا ئەڵێت : وتم بە أحمد : ئایا نوێژ ئەکرێت لە پشتی مورجیئەیەکەوە ؟

وتی : (ئەگەر بانگەوازکار بوو ئەوە نوێژ لە پشتیەوە ناکرێت) .

- لە (العلل) ــــدا المروزي ئەڵێت : (أبو عبدالله ئەیگێڕایەوە لە مورجیئەیەک ئەگەر بانگەوازکار یان دەمەدەمێکار نەبوویایە) .

- لە (طبقات الحنابلة) دا جعفر بن محمد بن هذيل ئەڵێت : أحمد بن حنبل بۆی گێڕاینەوە لە أبو معاوية الضرير .

پێم وت : ئەی أبو عبدالله ئەگێڕیتەوە لە أبو معاوية لەکاتێکدا مورجیئەیە ؟

وتی : (بانگەوازکار نەبوو) .

- إبن رجب لە (شرح علل الترمذي) ــدا ئەڵێت : (ئەم بابەتە زانایان لە کۆن و نوێدا ڕاجیاوازیان تیایدا هەبووە، ئەویش بریتیە لە ڕیوایەت کردن لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو و بیدعەچییەکانەوە .

جا کۆمەڵەیەکیان ڕێگریان کرد لە ڕیوایەتکردن لێیانەوە، وەکو چۆن محمد بن سیرین باسی کردووە، وە گێڕدراوەتەوە نزیک لەوە لە سفیان بن عيينة و الحميدي و يونس بن أبي إسحاق و علي بن حرب و جگە لەوان .

وە کۆمەڵەیەکی تر جیاوازیان کرد لە نێوان کەسێک کە بانگەواز ئەکات لەگەڵ جگە لە ئەودا، جا مەنعی ڕیوایەتیان کرد لە کەسێکەوە بانگەشە ئەکات بۆ بیدعەکەی، لەوانە عبدالله بن المبارك و عبدالرحمن بن مهدي و أحمد بن حنبل و يحيى بن معين، وە بە هەمان شێوە لە مالك یشەوە گێڕدراوەتەوە) .

٨٦٢ - الهروي ئەڵێت : گوێبیستی باوکم بووم ئەیوت : يحيى بن عمار وتی : (ئەگەر يحيى بن عمار لە یەکێک لە ئەهلی ڕەئی ـەوە فەرموودەیەک بنووسێت الله پەنجەکانی ببڕێتەوە) .

٨٦٣ - علي بن المديني ئەڵێت : (يوسف بن خالد فەرموودەکانی کەوتن بەهۆی الکلام ـەوە، هەرکەسێک هاوەڵی الكلام بێت هیچ نییە) .

---

- يحيى بن معين دەربارەی یوسف بن خالد ئەڵێت : (زندیقە درۆزنە، فەرموودەکانی نانووسرێنەوە) .

- أبو حاتم لە (الجرح والتعديل) ـدا ئەڵێت : (وتەکەی یحیی بن معین ـم بە نامۆ ئەبینی کە دەربارەی ئەڵێت زندیق هەتا کتێبێکی هێنرا بۆم دەروازە دایناببوو لە جەهمیەتدا تەرازووی ڕەتئەکردەوە لە قیامەتدا، منیش ئیتر زانیم یحیی قسە ناکات تەنها لەسەر بەرچاوڕۆشنی و تێگەیشتن نەبێت) .

٨٦٤ - حرب بن إسماعيل ئەڵێت : أحمد بن حنبل پێی وتم : (هەرگیز پرسیار مەکە لە هاوەڵانی ڕەئی لە هیچ شتێکدا) .

٨٦٥ - الشعبي ئەڵێت : (ئەوە ئەوانە بۆیان گێڕایتەوە لە هاوەڵانی محمد ـەوە ﷺ توند دەستی پێوە بگرە، وە ئەوەی لە بۆچوونی خۆیانەوە پێیان وتی بیخە شوێنی پیسایی کردنەوە) .

---

- لە (السنة لـ عبدالله بن أحمد) ـدا أسود بن سالم ئەڵێت : (کاتێک ئەثەر دێت بۆچوونی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی ئەخەینە شوێنی پیساییەوە، پەیوەستبە بە ئەثەرەوە، گەیشتم بە زانایان ڕقیان لە ئەبو حەنیفە ئەبوویەوە و عەیبداریان ئەکرد) .

٨٦٦ - الشافعي ئەڵێت : (ئەو کەسە قسە ئەکات لەم دینەدا کە باوەڕپێکراو بێت لە بنچینەی ئەم دینەدا) .

**: نەوەک بە ئەشعەریەکی جەهمی بڵێیت ئیمام کە لە بابەتی قەدەر و، ئەسماء و سیفات و، ئیمان و، تەوحیدی ئولوهیەت و چەندین بابەتی دیکەدا تووشی جەهمیەت و کوفر و گومڕایی بووە بە بیانووی ئەوەی خزمەتی ئیسلامی کردووە و شەرحی یەکێک لە کتێبە فەرموودەییەکانی کردووە .**

**بێگومان ئەو جۆرانە ئەبێت بە موسـوڵمان نەزانرێن چجای ئەوەی بکرێن بە ئیمام و وەلاء و بەرائیان لەسەر دابمەزرێت .**

**٨٦٧ - محمد بن النضر** ئەڵێت : (هەرکەسێک گوێ بۆ بیدعەچیەک ڕاگرێت دەرئەچێت لە پارێزراوی الله عز وجل) .

**٨٦٨ - الهروي** ئەڵێت : پرسیارم کرد لە أبو يعقوب دەربارەی یحیی بن عیاش الهروي .

وتی : (لە دینیدا شتێک هەبوو، بە بەشێک لە قورئانی ئەوت مخلوق، وە شتی دیکەش) .

**٨٦٩ - أبو سعد يحيي بن منصور الزاهد** ئەڵێت : (وازمان لە یحیی بن عیاش هێنا لەبەر زیاتر لە شتێک) .

**٨٧٠ - الهروي** ئەڵێت : أبو يعقوب وتی : محمد بن إسحاق السعدي وتی : ((لێمانەوە نووسی ئەوەندە) دەستی بەرز کردەوە لە زەویەوە هێندەی باڵێک یان نزیک لێی، پاشان وتی : (دڕاندمان) یان (شۆردمانەوە) یاخود شتێک نزیک لەو مانایە) .

٨٧١ - الهروي ئەڵێت : (گوێبیستی عبدالرزاق بن محمد بن أحمد المكتب بووم ئەیوت : دانیشتنێكیان لە (أمالي الفائق) بەسەر یحیى بن عمار دا خوێندەوە، ئەویش وتی : (باشترین فەرموودە، وە خراپترین ڕێڕەو) .

الهروي ئەڵێت : (جا چ موسوڵمانێک دینداری الله بكات پێی باش ئەبێت دینەكەی لەو كەسە وەربگرێت كە گاڵتە ئەكات بە فەرموودەی المصطفى ﷺ و ڕقی لە ئەهلەكەیەتی ؟ وە چۆن هیدایەت ئەدرێت بۆ ڕێگەی ڕاست ئەوەی كە بە لاری ڕێگەكەی ئەوێت ؟! والله المستعان) .

## دەروازەی : (١٧)

## بەگەورەڕاگرتنی تاوانی ئەوەی ڕێچکەیەکی خراپ دائەنێت یان بانگەشە ئەکات بۆی

٨٧٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەوەی بانگ بکات بۆلای هیدایەتێک پاداشــتی هەیە هاوشــێوەی پاداشــتی ئەوانەی کە شــوێنی ئەکەون، وە ئەوە هیچ شــتێک لە پاداشــتەکانیان کەم ناکاتەوە، وە ئەوەی بانگ بکات بۆلای گومڕاییەک تاوانی هەیە هاوشــێوەی تاوانی ئەوانەی کە شــوێنی ئەکەون، وە ئەوە هیچ شــتێک لە تاوانەکانیان کەم ناکاتەوە) .

---

- لە (السنة لـ الخلال) دا حنبل ئەڵێت : أحمد ی مامم وتی : (عمر بن عبدالعزیز هاتە سەر کاروبارێکی تاریك ڕووناکی کردەوە، وە هاتە سەر سوننەتانێکی مردوو زیندووی کردنەوە، لەپێناو الله ــدا لە لۆمەی لۆمەکار نەترسا، جا سوننەتانێکی زیندوو کردەوە کە مرێندرابوون، وە ئەو شــەریعەتانەی دانایەوە کە ســڕابوونەوە و شــوێنەواریان نەمابوو رحمه الله .

وە ئەوترا : لە هەموو ئەوەندە و ئەوەندەدا - واتە لەهەموو ئەوەندە ســاڵێکدا - کەسێك هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی فەرمانی الله) .

پاشـان باسی المتوكل ــی کرد وتی : (بەڕاستی کارانێکی مراند کە خەڵکی دایان هێنابوو بۆ سڕینەوەی ئیسلام، وە نەهێشتنی دەرکەوتنی مونکەر و کاری ناپەسەند) .

وتم : وای دەبینیت کە لە خاوەنی حەق بێت - واتە خەلیفە المتوكل - ؟

وتی : (ئەی پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە : هەرکەسێك سوننەتێك لە سوننەتەكانی من زیندوو بکاتەوە کە مرێندراوە، ئەوا شتێکی ڕوون و ئاشکرای ڕوون و ئاشکرا کردووەتەوە .

وە چ بەڵایەك لەوە زیاترە کە دوژمنی الله و دوژمنی ئیسلام دایهێنا لە ئیسلامدا لە مراندنی سونەت) واتە : ئەوەی لە پێش المتوكل بوو، (جا المتوكل سونەتی زیندوو کردەوە رضوان الله عليه) .

**٨٧٣** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەوەی ڕێبازێکی چاک دابنێت; تیایدا شوێنپێی هەڵبگیرێت، ئەوە پاداشتی خۆی و هاوشێوەی پاداشتی ئەوانەی هەیە کە شوێنی کەوتوون بەبێ ئەوەی هیچ لە پاداشتەکانیان کەم بکاتەوە، وە ئەوەی ڕێبازێکی خراپ دابنێت; تاوانی خۆی هەیە، وە هاوشێوەی تاوانی ئەوانەش کە شوێنپێیان هەڵگرتووە بەبێ ئەوەی لە تاوانەکانیان کەم ببێتەوە) .

---

: مەبەستی لە (ئەوەی ڕێبازێکی چاک دابنێت) ئەوەیە کەسێک کارێکی چاک ئەنجام بدات و خەڵکیش تیایدا شوێنی بکەون، بۆ نمونە دەست بکات بە خێر و بەخشینێک خەڵکیش دواتر چاو لە ئەو بکەن و ببەخشن .

بەڵگەش بۆ ئەمە هۆکاری وتنی ئەم فەرموودەیەیە لەلایەن رسول الله ـەوە ﷺ، چونکە رسول الله ﷺ چاوەڕێ ئەکات لە هاوەڵانی ببەخشن، یەکێکیان یەکەمجار دەستپێئەکات و ئەوانی دیکەش شوێنی ئەکەون .

**٨٧٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک لە ئیسلامدا ڕێچکەیەکی چاک دابنێت و پاش خۆی کاری پێ بکرێت هاوشێوەی ئەوە پاداشتی هەیە کە کاری پێکردووە، وە هیچ لە پاداشتی ئەوە کەم ناکاتەوە کە کاری پێ ئەکات، وە ئەو کەسەی لە ئیسلامدا ڕێبازێکی خراپ دابهێنێت کاری پێ بکرێت پاش خۆی

لەسەری ئەنووسرێت هاوشێوەی تاوانی ئەوەی کە کاری پێ کردووە، هیچ کەم نابێتەوە لە تاوانەکانیان).

٨٧٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هیچ نەفسێک نییە بە زوڵم بکوژرێت ئیللا لەسەر یەکەم بەنی ئادەم بەش و نصیب ێک هەیە لە تاوانەکەی، چونکە یەکەم کەس بووە کوشتنی داناوە).

---

: واتە قابیل بە هابیل ی برای بە زوڵم ئەکوژێت .

٨٧٦ - عبدالله بن عباس رضي الله عنهما لە تەفسیری فەرمایشتی الله عز وجل دا : | عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ | (الانفطار : ٥).

ئەڵێت : (ئەوەی پێشی خستووە لە کردەوە، وە ئەوەی بەجێی هێڵاوە لە ڕێچکە و ڕێباز پاش خۆی کاری پێ ئەکرێت).

الهروي ئەڵێت : وە ئەو کەسەی | وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ | فەرموویەتی لە ئوممەتەکەیدا زندیقەیت سەرهەڵئەدات لەوەدا کە فەرموویەتی :

٨٧٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (لە ئوممەتەکەمدا مسخ و گۆڕانێک ڕووئەدات، ئەوەش لە قەدەری و زیندیقەکاندا).

جا هیچ چارەیەک نەبوو مەگەر ڕوودانی ئەو شتە نەبێت کە فەرموویەتی ڕووئەدات، هیچ شتێک لەوانە ڕووینەدا هەتا ئەوکاتەی عثمان بن عفان رضي الله عنه بە زوڵملێکراوی کوژرا، ئەوەش یەکێک لە ئەو دوو فیتنەیەی ئەم ئوممەتەیە کە سێیەم دانە نییە هاوشانی بێت، وە دووەمیان بریتیە لە فیتنەی دەججال پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ .

وە پاشان لەوەی کە دەرکەوت لە نێوان موسوڵماناندا لە لادان لە دین بریتیە لە قسەکردن لە دیندا بە زۆرلەخۆکردن .

هەر ئەوەش زەندەقەی یەکەمە، سێ بنچینەیە، هەریەکەیان لەدوای ئەوەی دیکەیان دەرکەوت .

یەکەمیان بریتیە لە (وتە لە قەدەردا)، ئەوەش فیتنەی بەسرەیە .

پاشان (تانەدان لە سەلەف)، ئەوەش فیتنەی کوفەیە .

دواتر (نکۆڵیکردن لە کەلامی الله)، ئەوەش فیتنەی ڕۆژهەڵاتە) .

٨٧٨ - الهروي ئەڵێت : (هەرچی فیتنەی قەدەرە یەکەم کەس قسەی پێ کرد معبد الجُهَني[١] بوو، پیاوێک بوو لە ئەهلی بەسرە، شتێک لە زانستی لەلابوو، پێی ئەوترا معبد بن خالد، وە ئەوترێت معبد بن عبدالله بن عويمر .

لە پاش شکستەکە مرد، ئەوڕۆژە لەگەڵ إبن الأشعث بوو، تووشی برینداری بوو، وە یەکەم کەس بوو قسەی کرد لە بابەتی قەدەردا .

ئەو کەسە بوو کە عبدالله بن عمر بن الخطاب رضي الله عنهما خۆیی لێ بەری کرد[٢]، وە عمرو بن عبيد قسەی دیکەی بۆ زیاد کرد و غيلان دەمەدەمێی پێ کرد - واتە بۆ گومڕاییەکەی جعد - .

وە غيلان أبو مروان إبن أبي غيلانە، یەکێکە لە مولی ـکانی عثمان بن عفان رضي الله عنه، وە شتێک لە زانستی لەلا بوو، لە سەردەمی عبدالملک بن مروان دا قسەی کرد و عمر بن عبدالعزيز تۆبەی پێ کرد[٣]، دواتر بەدرۆخستنەوەی تەوبەکەی لێ دەرکەوت، هەربۆیە لەداردرا لەسەر دەروازەی شام بە ڕسواترین حاڵ مرۆڤ تووشی بووبێت، بەسەرهاتەکەیم باسکردووە لە کتێبی تكفير الجهمية دا .

وە عمرو بن عبيد[٤]، أبو عثمان عمرو بن عبيد بن كيسـان بن باب ــــە، مەولای بني تميم ی بەسرپە، ساڵی **١٤٣** مرد لە ڕێگەی مەککەدا .

هەر ئەو یەکەم کەس بوو بنچینەکەی فراوان کرد و بوو بە سـەرگەورەی، وە قسەی بۆ دانا و کردی بە پێشەوایەک، وە بانگەشەی بۆ کرد و بوو بە نیشانە بۆی، جا وای لێهات بوو بە مەزهەبێک بگیرێتەبەر، ئەو پێشەوای الكلام و بانگەشەکانی زەندەقەی یەکەمە، وە سـەرگەورەی موعتەزیلەکانە، ناونران لەبەر جیابوونەوەیان لە حەلقەی الحسن البصري .

وە هەر ئەوەی ئیمـامی ئەهلی ئەثەر مـالـک بن أنس لەعنەتی لێکرد، وە ئیمامی ئەهلی ڕەئی أبو حنيفة النعمان بن ثابت القفلي .

وە ئیمامی خەڵکی ڕۆژهەڵات عبدالله بن المبارك ئاگاداری لەبارەوە دا .

وە پێشتر سەنەدی ئەو وتەیانەمان هێناوە .

جا الله عز وجل زاڵی کرد بەسەر ئەو و ئەوەش کە شوێنی کەوت، وە ئەوەی کە داهێنانی کرد; شـمشـێرێک لە شـمشـێرەکانی ئیسـلام، ئەویش أبو بكر أيوب بن أبي تميمة السختياني ـە، ناوی باوکی کیسان ـە، خەڵکی بەسرەیە، جا نهێنیەکانی دەرخسـت و، عەیبەکانی ڕوون کردەوە و، ناسـاندی بەلەعنەتلێکردن و دووچاری بەڵای ئەو فیتنەیەی کرد .

هەر ئەوە قتيبة بن سـعيد دەربارەی ئەڵێت : (کاتێک بینیت پیاوێکی ئەهلی بەسرە أيوب ی خۆشئەوێت ئەوە بزانە لەسەر ڕێگە ڕاستەکەیە ) .

وە پیاوێک وتی بە أحمد : سوننی کێیە ؟

أحمد وتی : (خەڵکی کوێیت تۆ ؟ ) .

وتی : بەسرە .

وتی : (ئایا أيوب السختياني ت خۆشئەوێت ؟ ) .

وتی : بەڵێ .

وتی : (جا تۆ سوننیت ) .

ئەمەش بەسەرهاتی ئەهلی بەسرە بوو .

وە بەسەرهاتی غیلان : بەڵاکەی لە شام دەرکەوت، وە تووشی فیتنەبوون بەهۆیەوە ثور بن یزید و مکحول الفقیە و کۆمەڵێک لە زانایان لەو ناوچەیە .

جا الله عز وجل ڕەیحانەکەی ئەهلی شامی زاڵ کرد بەسەریاندا؛ أبو عمرو عبدالرحمن بن عمرو بن یحمد الأوزاعي، فەرامۆشی کردن و حسابی بۆ نەکردن، وە کردنیەوە قاوغەکەی خۆیان، وە زمانێکی بۆ درێژ کردن کە ڕەوانبێژی درابوویێ، وە ڕووخۆشی و کراوەیی لەکاتی گەیشتن بەیەکدا لێ گرتنەوە؛ هەتا ئەوەی پێ ڕسوا کرد کە لەسەر ڕێگای گومڕایی شکۆدار بوون، وە ئەوەی پێ شکۆدار کرد کە لەسەر ڕێگای سوننەت زەلیل بوو بە حەمد و منەتی رب العالمین ) .

---

**(١) لە (الجرح والتعدیل) ـدا أبو حاتم الرازي دەربارەی ئەڵێت : (سەرگەورەبوو لە قەدەردا، هاتە مەدینەوە خەڵکیی تێکدا) .**

**- إبن عماد لە (شذرات الذهب) ـدا لە ڕووداوەکانی ساڵی ٨٠ ـدا ئەڵێت : (عبدالملک لەبەر قەدەر معبد الجهني ی لە دار دا .**

**وە ئەوترێت : بەڵکو الحجاج سزای دا بە جۆرەکانی سزا و کوشتی) .**

**(٢) مەبەستی ئەو وتەیەی إبن عمر ـە رضي الله عنهما کە فەرمووی کاتێک پێی گەیشت دەربارەی کەسانێک لە ئەهلی بەسرە نەفی قەدەریان کردووە، ئەویش فەرمووی : (کاتێک پێیان گەیشتیت هەواڵیان پێبدە من لە ئەوان بەریم، وە ئەوانیش لە من بەرین، وە بەوەی عبدالله بن عمر سوێندی پێ ئەخوات ئەگەر یەکێکیان هاوشێوەی کێوی ئوحود ئاڵتونی هەبێت ببەخشێت الله لێی قبووڵ ناکات هەتا ئیمان نەهێنێت بە قەدەر) .**

**(٣) الآجري لە (الشریعة) ـدا ئەڵێت : (غیلان سووربوو لەسەر کوفرەکەی بە وتەکەی لە قەدەردا، کاتێک بهێندرایەتە لای عمر دووڕوویی ئەکرد، وە ئینکاری لەوە ئەکرد قسەی قەدەریەکان بکات، جا عمر ـیش دوعای کرد الله عز وجل بیکات بە پەند**

ئەگەر درۆزن بێت، الله تعالى ـیش وەڵامی داواكەی عمر ـی دایەوە دەربارەی، غیلان و صالح ـی مولی ـی ثقیف قسەیان كرد لە سەردەمی هشام ـدا، ئەویش كوشتنی و لەداری دان، وە پێش ئەوەش دەسـت و زمانی غیلان ـــی بڕی، پاشـان كوشـتی و لەداری دا، زانایانیش ئەوەیان بەباش زانی كە پێی كردن لەو سەردەمەدا) .

- لە (القدر لـ الفريابي) ـدا الأوزاعِي ئەڵێت : (یەكەم كەس كە لە قەدەر ـدا قسەی كرد كابرایەكی عێراقی بوو پێی ئەوترا (سوسن)، نەسرانی بوو، پاشان موسوڵمان بوو، پاشان بوویەوە بە نەسڕانی، معبد الجهني عەقیدەكەی لێ وەرگرت، پاشان غیلان یش لە معبد ـی وەرگرت) .

- الآجري لە (الشريعة) ـدا ئەڵێت : (ئەگەر كەسێک وتی : ئیمامی قەدەریەكان كامانەن لە مەزهەبەكانیاندا ؟

پێی ئەوترێت : الله تعالى موسـوڵمانانی بەرزڕاگرتووە لە مەزهەبەكانیان - واتە لە عەقیدەكەیان - ، وە ئیمامی قەدەریەكان لە مەزهەبەكانیاندا : معبد الجهني لە بەسـڕە، وە هاوەڵان و تابیعین ڕەددیان دایەوە وەک چۆن پێشـتر باسـمان كرد، وە پێشـتر پیاوێكی ئەهلی عێراق هەبوو نەسڕانی بوو، موسوڵمان بوو پاشان بوویەوە بە نەسڕانی، جا معبد الجهني - عەقیدەكەی - لەوەوە وەرگرت، الأوزاعي رحمه الله وای وت، وە غیلان لە معبد ـی وەرگرت، وە پێشتر باسـی بەسەرهاتی غیلان ـمان كرد، وە باسـی ئەو سەرشۆڕی و ڕسوابوونەیمان كرد كە الله لە دنیادا بۆی پێشخست، وە ئەوەی لە قیامەتدا چاوەڕێی ئەكات گەورەترە، وە باسـی عمرو بن عبيد و زەمكردنی ئیمامەكان بۆی و هەجر و تەكفیركردنیمان كرد، ئەوانە ئیمامە پیس و قێزەونەكانیانن) .

(٤) لە (تاريخ بغداد) ـدا زكريا الساجي ئەڵێت : (عمرو بن عبيد بن باب، لەسەر ڕێگای مەككە ساڵی ١٤٣ مرد، وە قەدەریبوو، بانگخواز بوو بۆی، ئەهلی نەقل و ئەوانەی ئەتەریان جیا ئەكردەوە لە ئەهلی بەسـڕە وازیان لێی هێنا، وە غەریبەكان لێیانەوە گێڕایەوە، خووڕەوشـت و دەرخسـتنی زوهدی هەبوو بۆیە لێیانەوە گێڕایانەوە و گومانی باشیان پێ برد، شعبة دوو فەرموودەی لێوە گێڕایەوە پاشان وازی لێ هێنا) .

- لە (تـاريخ بغـداد) ـــدا يونس ئەڵێـت : (عمرو بن عبيـد درۆی ئەكرد لە فەرموودەدا) .

**- له (السنة لـ الخلال) ـدا أحمد بن حنبل دەربارەی ئەڵێت : (زانستی جێگیر نەئەکرد، ئەوەش کوفرە بە الله عز وجل) .**

**- له (مسائل إبن هانئ) دا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (عمرو بن عبيد سەرگەورەی موعتەزیلەکان بوو، وە لە یەکەمینەکانیان بوو لە ئیعتیزال دا) .**

**عبدالله بن أحمد بن حنبل له (كتاب السنة) ـدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی : ئەوەی زانایان وتوویانە دەربارەی عمرو بن عبيد .**

**وە الدارقطني نووسراوێکی هەیە دەربارەی ڕسواییەکانی بەناوی (أخبار عمرو بن عبيد) .**

**٨٧٩ - الهروي** ئەڵێت : (وە فیتنەی قسەوتن بە سەلەف و تانەلێدانیان؛ کوفە ئەو لانەیەیە کە دەرپەڕاند، پاشان پریشکەکانی بە ئاسۆکاندا فڕین و زیانەکەی بەناویدا بڵاوبوونەوە، خەونانێک لەگەڵیدا تێکەڵبوون کە ئەستەمیان تێدایە، وە بە دڵانێک نۆشکرا گەمژەیەتیان تیادا بوو .

وە خاوەنەکانی گەوجترین دروستکراوانی الله تعالى ـن، یەکسانیان پیشان دا لەنێوان علي بن أبي طالب وە أبو بكر و عمر رضي الله عنهما، پاشان پێشیانخست بەسەر هەردووکیاندا، دواتر بەسەر ئەواندا سەریانخست و بوون بە دوژمنیان لەبەر ئەو زوڵمیان لێ کردن، وە مافەکانی ئەوانیان دا پێی بە قیاسی عەقڵی بەهۆی بەرزی آل بيت رسول الله ﷺ و البتول **- واتە فاطمة رضي الله عنها -** .

پاشان هاتن یەکسانیان کرد بە المصطفى ﷺ و کردیان بە هاوبەش لە وەحیی ئاسمان .

دواتر جبريل عليه السلام ـیان بەهەڵە دانا لە دابەزینیدا، بەوهۆیەوە ئوممەت لە پێغەمبەرایەتی خاڵی بوو پێویستی بە علي بوو رضي الله عنه .

پاشان بانگەشەکەی پەرستراویێتیان بۆ خۆی کرد، دواتر بۆ نەوەکانیشی .

پێشـەوا المطلبي ئەڵێت : (ئەگەر ئاژەڵ بوویانە ئەوە کەر ئەبوون، وە ئەگەر باڵندە بوونایە ئەوە داڵەکەرخۆرە ئەبوون) .

بەهۆی ئەو زیادەڕۆیانەوە خاوەنی دڵە نەخۆشـەکان هەوڵی دەرکەوتنیان دا، جا بەوهۆیەوە دەرکەوتن بە تانەدان لە سـەلەفی سـاڵح کە گوێزەرەوەی دینن، وە یاسـای دین و کتێبی ئوممەت هەر لەناو ئەواندایە، جا ئەیانبینی ئەوەیان کە خاوەنی باشـترین ڕێگە و ڕاسـتترین بەڵگەیانە خۆی دائەشـارێت بە فەزڵ و پێگەکانی علي رضـي الله عنه، وە ئەیخاتە پێگەیەکەوە بەرزتر لەوەی الله تعالى دایناوە) .

٨٨٠ - عبدالله بن عباس رضـي الله عنهما ئەفەرمووێت : (صـەلاواتدان نابێت ئیللا لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەبێت) .

---

- إبن تيمية لە (منهاج السنة) ـدا ئەڵێت : (وە ئەمەی إبن عباس رضي الله عنهما فەرموویەتی کاتێک بوو شیعەکان علي ــیان تایبەتمەند ئەکرد بە صـەلاواتدان جیا لە کەسـانی دیکە، وە وایان دانا ئەوە فەرمانپێکراوە بۆ علي بە تایبەتی جیا لە کەسـانی دیکە، ئەمەش هەڵەیە بە کۆدەنگی، چونکە الله تعالى فەرمانی کردووە بە صـەلاواتدان لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی تەفسیر کردووە بە صەلاواتدان لەسەر خۆی و آل ــەکەی، جا صەلاوات ئەدرێت لەسەر هەموو آل ــەکەی بەهۆی ئەوەوە .

وە آل محمد ﷺ لەلای الشـافعي و أحمد ئەوانەن کە خێر و سـەدەقەیان بۆ حەرام بووە .

وە کۆمەڵەیەک لە هاوەڵانی مالک و أحمد و جگە لەوان بۆ ئەوە چوون آل ـەکەی ئوممەتی محمد ـن ﷺ) .

٨٨١ - الهروي ئه‌ڵێت : (جا كاتێک ئه‌و گومڕايانه يه‌كتريان سه‌رخست له‌م گومڕاييه‌دا له‌سه‌ری توندبوون; الله عز وجل پێشه‌وايه‌كی بۆ دياری كرد وه‌كو شمشێر، ئه‌ويش أبو محمد عبدالله بن إدريس الأودي بوو كه به ڕاشكاوی تانه‌ی لێدان و به تووندی ڕووبه‌ڕوويان بوويه‌وه و ئه‌وه‌ی له ناخياندا بوو ده‌ريخست، ئوممه‌ت نه‌ينالاندووه له خراپی هيچ فيتنه‌يه‌ک هێنده‌ی نالاندنی به‌هۆی ئه‌م فيتنه‌يه، وای لێ هاتووه خه‌ريكه دڵی هيچ موسوڵمانێک له تووشبوون پێی سه‌لامه‌ت نه‌بێت مه‌گه‌ر ئه‌وه نه‌بێت كه الله ڕه‌حمی پێ كردووه و پاراستوويه‌تی) .

٨٨٢ - الهروي ئه‌ڵێت : (وه فيتنه‌ی نكۆڵيكردنی كه‌لام بۆ الله عز وجل; ئه‌وه‌ی يه‌كه‌مجار چاندی جعد بن درهم[1] بوو .

كاتێک جعد ده‌ركه‌وت الزهري كه مامۆستای پێشه‌واكانی ئيسلام بوو له‌و ڕۆژه‌دا وتی : (الجعدي له ئوممه‌تی محمد ﷺ نييه) .

پاشان جهم بن صفوان الترمذي ئه‌م قسه‌يه‌ی لێوه وه‌رگرت و فراوانی كرد و بانگه‌شه‌ی بۆ كرد، جا كردی به بۆچوون و مه‌زهه‌بێک به‌رده‌وام بانگه‌شه‌ی پياوانی ئه‌كرد بۆ لای، وه زُهرة ــــی ژنيشی ئافره‌تانی بانگ ئه‌كرد بۆ لای هه‌تا زۆرێک له خه‌ڵقی الله يان به ته‌ڵه‌كه‌ی خۆيان گرت) .

٨٨٣ - مقاتل بن حيان ئه‌ڵێت : چوومه لای عمر بن عبدالعزيز، وتی : (خه‌ڵكی كوێيت ؟) .

وتم : به‌لخ .

وتی : (له نێوان تۆ و ڕووباره‌كه‌دا چه‌نده ڕێگه‌يه ؟) .

وتم : ئه‌وه‌نده فه‌رسه‌خ .

وتی : (ئايا كه‌سێک ده‌ركه‌وتووه له ئه‌ولای ڕووباره‌كه‌وه پێی بوترێت جهم ؟).

وتم : نه‌خێر .

وتی : (لە ئەودیوی ڕووبارەکەوە پیاوێک دەرئەکەوێت پێی ئەوترێت جهم، کەسانێک لەم ئوممەتە بەهیلاک ئەبات، الله عز وجل ئەو و ئەوانیش ئەخاتە ناو ئاگرەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە ئەچنە ناوی).

---

**(١) شێخی جهم بن صفوان ـــە لە بابەتی خلق ـــی قورئان و نەفیکردنی سیفەتەکانی الله عز وجل دا، ساڵی ١٢٥ هـ ئەکوژرێت.**

**- اللالكائي لە (شرح أصول إعتقاد) ـدا ئەڵێت: (خیلاف نییە لەنێوان ئوممەتدا یەکەم کەس وتی قورئان مخلوق ـــە جعد بن درهم بوو ساڵی ١٢٥، پاشان جهم بن صفوان).**

**- الدارمي لە (الرد على الجهمية) ـدا ئەڵێت: (یەکەم کەس کە شتێکی وای لێ دەرخست پاش کافرەکانی قوڕەیش جعد بن درهم بوو لە بەسڕە، وە جهم لە خۆراسان).**

**- إبن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية) ـدا ئەڵێت: (سەرەتای جەهمیەت لەم ئوممەتەدا بنچینەکەی لە موشریکەکانەوە بوو، وە دینگۆڕەکان لە صابیئەکانی هیند و، یۆنان، وە لە دینگۆڕەکانی ئەهلی کیتاب لە یەهودیەکان، وە جعد بن درهم پاشان جهم بن صفوان و ئەوانەی شوێنیان کەوتن ئەوەیان لەوانەوە وەرگرت).**

٨٨٤ - الهروي ئەڵێت: (وە سەبارەت بە جعد بن درهم؛ خالد بن عبدالله القسري بە ئامادەبوونی خەڵکی کردی بە قوربانی، وە ئەو ڕۆژە کەس نەبوو نکۆڵی لێ بکات، ئەوەش ساڵی ١٢٥ بوو).

---

**- الدارمي لە (الرد على الجهمية) ـدا ئەڵێت: (وە جعد؛ خالد بن عبدالله القسري گرتی و ڕۆژی جەژنی قوربان لە واسط سەری بڕی لەگەڵ ئەوانەدا کە ئامادەی جەژن بوون لەگەڵی لە موسوڵمانان، وە هیچ کەسێک عەیبداری نەکرد و تانەی لێ نەدا، بەڵکو ئەو کارەیان بەباش زانی و بۆچوونەکەیان بەڕاست دانا).**

- أبو القاسم الزنجانِي له (الشـــرح للمنظومة في الســـنة) ــــدا ئەڵێت : (لەژێر مینبەرەکەدا بە ئامادەبوونی کەســـانی تایبەت و ئاســـایی ســـەری بڕی، وە هەموویان کارەکەیان بەباش زانی) .

- له (السنة لـ عبدالله بن أحمد بن حنبل) ـدا حبيب ئەڵێت : (ئامادە بووم لەلای خالد بن عبدالله القسري کاتێک لە واسط وتاری بۆ خەڵکی ئەدا لە ڕۆژی جەژنی قوربان ــــدا، فەرمووی : ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە و قوربانیەکانتان سەر ببڕن الله لێتانی قبووڵ بکات، وە منیش قوربانی ئەکەم بە جعد بن درهم؛ چونکە پێی وایە الله تبارك وتعالى إبراهيم ـــــى نەکردووە بە خۆشـەویستی خۆی، وە الله بە قسـە کردن قسـەی نەکردووە لەگەڵ موسی ـدا، بەرز و بڵندی بۆ الله لەوەی کە جعد بن درهم ئەیڵێت) .

پاشان دابەزی و سەری بڕی) .

٨٨٥ - الهروي ئەڵێت : (وە ســـەبارەت بە جهم لە مَرو بوو، هشـــام بن عبدالملک بۆ والیەکەی لە خُراســـان نصـــر بن ســـيار نووســـی، فەرمانی پێ کرد بە کوشتنی .

ئەویش نووســـی بۆ ســـلم بن أحوز، کاربەدەســـتی مرو بوو، جا دای لە ملی لەبەرچاوی زانایاندا، وە ستایشی ئەو کارەیان کرد) .

---

- سـعد بن علي الزنجانِي له (الشرح للمنظومة في السنة) ــــدا دەربارەی جهم بن صـفوان ئەڵێت : (ئامادە ئەبوو لە مەجلیســی ئەبو حەنیفە، پاشـان چەند قسـەیەکی پیسی داهێنا، لەوانە : زانستی الله مەخلوق ـــە، وە کەلامی الله مخلوق ـــە، وە الله زانا و قســـەکەر نەبووە هەتا زانســـت و قســـەی بۆخۆی دروســـت کردووە، مەزهەبی جەبر ـــــی داهێنا، الله بەزۆر کوفر و تاوان بە دروســـتکراوەکانی ئەکات، وە ئیمان زانســـتی دڵە بە بوونی الله بەبێ وتە و کردەوە، وە چل و پێنج شـــەو وازی لە نوێژ هێنا، وە بەهەشـــت و جەهەننەم لە کۆتاییدا نامێنن، هەربۆیە ئیمـاندار بە هەتا هەتـایی لە خۆشـــگوزانیدا نامێنێتەوە، وە کافرەکانیش بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا نامێننەوە . . . . (پاشان ئەڵێت)

مەسـەلەكەی بەرز كرایەوە بۆلای سـلم بن أحوز كە لەلایەن المنصـور ـــەوە كرابوو بە ئەمیری عێراق، جا زانایانی كۆكردەوە، پرسـیاری لێ كرا دەربارەی وتەكانی، دانی نا بە هەندێكیاندا، پاشان زانایان كە گوێیان كە وتەكانی بوو كۆڕابوون لەسەر ئەوەی كەسێك ئەم شـتانە بڵێت و باوەڕی پێی هەبێت مولحید و بێدینە، جا فەرمانی كرد دەسـت و قاچەكانی ببڕدرێت و هەڵبواسرێت، پاشـان خراپی وتەكانی لەسـەر ئوممەت لاچوو هەتا كاتی علي بن إسـماعیل الأشـعري (ئەبو حەسـەنی ئەشـعەری) نێوانی لەگەڵ أبي علي الجبائي تێكچوو و دەری كرد لە مەجلیسـەكەی، ئیتر ڕۆیشـت بۆ هەندێك وتەی، وە سـەریخسـت و موناقەشـەی لەسـەر ئەكرد لەگەڵ موعتەزیلەكاندا، پاش ئەوە دووبارە شەڕەكەی هاتەوە سەر ئوممەت).

- لە (الفتح) ـــدا هاتووە: إبن أبي حاتم ڕیوایەتی كردووە كە سـلم وتی: (ئەی جهم، من لەبەر ئەوە ناتكوژم دژی من جەنگابیت، تۆ لەوە سوكتریت، بەڵام گوێم لێت بوو قسەیەكت كرد پەیمانم دا بە الله بەردەستم بكەویت ئیللا ئەتكوژم).

- لە (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة) ـــدا بُكَیر بن معروف ئەڵێت: (بینیم سلم بن الأحوز كاتێك دای لە ملی جهم، جهم دەموچاوی ڕەش بوو).

٨٨٦ - الهروي ئەڵێت: (ئەمە بەسەرهاتی فیتنەی خەڵكی ڕۆژهەڵاتە، لەوێ فراوان كرا و ڕێی بۆ خۆش كرا، پاشان بە شارەكاندا تێپەڕی و إبن أبي دُؤاد[1] و بشر بن غیاث[2] پێی هەسـتان، جا دنیا و دڵەكان ماوەیەكی زۆر پڕ بوو لە فیتنە، هەربۆیە الله عز وجل نیشـانەیەك لە نیشـانەكانی دینی زاڵ كرد بەسـەریاندا كە ئارامگری پێدرابوو لە هێزی دڵنیاییدا، ئەویش أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشیباني بوو، جا خۆی ئامادە كرد بۆ تاقیكردنەوە و، ڕەتیكردەوە عەقیدەكەی دابشارێت و، دنیای بەكەم گرت و، توووند بوو لەسەر دین و، پشتی كردە ژیانێكی خۆش و، وە لەبەر الله گرنگی نەدا بە كەمی ئەوانەی لەگەڵیدا بوو، تا وای لێهات ئەوەی توندیان كردبوو شـلی كردەوە، وە ئەوەی درێژیان كردبوو قرتاندی[3].

وە ئەوانەی کە قسـەیان کرد لە قەدەردا مەبەسـتیان ناکۆکیەک بوو کە لە پەروەردگارێتیدا تووشی بووبوون، جا گەیشتنەوە بە مەجوسیەکانی سەرەتا .

ئەوانەش بریتین لە زەندیقانێک کە دینیان لەوانەی سـەرەتا تێکداوە و اللە لەسـەر زمانی حەفتا پێغەمبەر بەلەعنەتی کردوون، رسـول اللە ـــش ﷺ ئەفەرموویت : (من کۆتاییەکەیانم) .

وە ئەوانەش کە تانەیان دا لە سـەلەفی ساڵح ئەوەبوو ئەیانویست تانە بدەن لە گوێزەرەوە، چونکە تانەدان لە گوێزەرەوە بەتاڵکردنەوەی گواسـتراوەکەی - واتە قورئان و سـوننەت - تێدایە، جا ویسـتیان ئەو شـەرعە پووچەڵ بکەنەوە کە گەیاندبوویان، وە خۆیان هەڵواسی بە علي بن أبي طالب ـــدا رضي اللە عنه وەکو پارێزەرێک) .

---

(١) لە (طبقات الحنابلة) ـدا الحسن بن ثواب ئەڵێت : وتم بە أحمد : ئەوانەی کە ئەڵێن قورئان مخلوق ـە ؟

وتی : (کافرن بە اللە ی العظیم) .

وتم : ئەی إبن أبي دؤاد ؟

وتی : (کافرە بە اللە) .

الخلال لە (السنة) ـــدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی (باسکردنی إبن أبي دؤاد و هاوەڵە فاسقەکانی) .

(٢) ئیمامی جەهمیەکان بوو لە سـەردەمی خۆیدا، وە ئیمامی ئەشـعەریە جەهمیەکانی پاش خۆیەتی .

- سـعد الزنجاني لە (الشرح للمنظومة في السنة) ـــدا ئەڵێت : (بشر بن غیاث المریسي لە ئەنبار بوو، باوکی یەهودیەکەی ئەهلی الکلام بوو، ئەوەی خستە ناو تەوراتی یەهودیەکانەوە کە بشر تووشی موسوڵمانانی کرد لە قورئاندا، وە خەریکی فیقهـــبوو

لەســـەر مەزهەبی أبو حنیفة، وە لە بـابەتی قورئان و نەفی ســیفەتەکـاندا بۆچوون و مەزهەبی جهم ی هەبوو) .

**(٣) وتەکە بەتەواوی هاتووە لە (جمع الجیوش والدساکر علی إبن عساکر) ـــدا :**

**(پاشان فیتنەکەیان - واتە هی جەهمیەکان - کپ بوویەوە و لاواز بوو، پاشان أبو الحسن الأشعري شتێکی گەورەی لێ شاردنەوە و ئەوەی دەرخست کە پێی ئەگەیشت بەوەی ئەوان - واتە بەوەی جەهمیەکان - بە ســەرلێتێکدان، پاشــان ئەوەی بۆ نەچوویەســەر، دواتر فیتنەکەیان گشتگیر و فراوان بوو تا وای لێهات دەرکەوت وەکو بەڕاستخەرەوەیەک بۆ فەرمایشـــتی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیانێکی زۆردا، وە لە چەندین ئاثاردا هاتووە ئەوەی یارمەتی بیدعەچییەک بدات ئەوە هاریکاری کردووە لەسەر ڕووخاندنی ئیسلام).**

٨٨٧ - عثمان بن سعید الدارمي ئەڵێت : أبو الربیع الزهراني بۆی گێڕامەوە وتی : (یەکێک لەو جەهمیانەمان لەلا بوو، وە ئەوەی دەرئەکەوت لە بۆچوونەکەی بریتیبوو لە رَفض و خۆدانەپاڵ خۆشەویستی علي بن أبي طالب رضي الله عنه، جا پیاوێک لەوانەی کە تێکەڵی ئەبوو و شارەزای بۆچوونەکەی بوو پێی وت : من ئەزانم ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ دینی ئیســلام و باوەڕتان پێی نییە، چ شـتێک وای لێ کردوون ئارەزووی رفض و خۆشەویستی علي بکەن ؟

وتی : کەواتە ڕاســتگۆ ئەبم لەگەڵـت، ئێمە ئەگەر ئەوە دەربخەین کە باوەڕمان پێیەتی تۆمەتبار ئەکرێین بە کوفر و زەندەقە، وە بینیمان کۆمەڵانێک خۆیان ئەدایە پاڵ خۆشـــەویســـتی علي و قســـەیان ئەوت بەوەی کە خۆیان ئەیانویست، جا بەو شتەیان درانە پاڵ رفض و شیعەبوون، وە لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە هەر شـــتێک ئەبێت کە خۆیان ئارەزووی ئەکەن، وە ئەوە ئەڵێین کە ئارەزووی ئەکەن)[1] .

وە خەلیفە پیـاوێکی زینـدانی کردبوو بەهۆی زەنـدەقەوە، پیـاوێکی دیکە ڕۆیشـــتە لای و پێی وت : ئێمە تۆمان ئەناســیەوە بە جوێندان بە هاوەڵان و رفض، چی وای لێ کردیت بگەیت بە زەندەقە ؟

وتی : ئەی گێژ، بۆ أبو بكر و عمر چییـان دژی من كردووە ئەگەر ڕقی هاوەڵەكەیان نەبێت!) .

بەدڵنیاییەوە ڕاستی كرد، هیچ كەسێكم نەبینیوە تۆمەتبار بكرێت بە شتێك لە ڕافیزەبوون ئیللا لە دەمیەوە شتانێك دەرچووە لە وتەی موسوڵمانان نەچووە) .

---

: واتە هەر لە سەرەتاوە زەندیق بووە بەڵام خۆی وا دەرنەخستووە كە باوەڕی بە ئیسلام و پێغەمبەریش نییە، وە مەبەستی لە (ڕقی هاوەڵەكەیان نەبێت) واتە ئێمە ڕقمان لە پێغەمبەرە و كافرین پێی، وە أبو بكر و عمر هیچیان بەرامبەرمان نەكردووە تا ڕقمان لێیان بێت بەس وا خۆمان دەرخست تا حسابی ڕافیزەكانمان بۆ بكرێت .

(١) الدارمي لە (الرد على الجهمية) ـــدا هەمان ئەثەری هێناوە بەم زیادەیەوە : (جا بەوە پاڵدرانە ڕافیزەبوون و شیعەبوون، ئێمەش نەمابینیوە بۆ بۆچوون و مەزهەبەكەی خۆمان شتێك باشتر بێت لە خۆدانەپاڵ خۆشەویستی ئەم پیاوە، وە پاشان ئەوە بڵێین كە ئەمانەوێت و، بیروباوەڕمان بەوشێوەیە بێت كە ئەمانەوێت و، قسە بڵێین بەوەی كە ئەمانەوێت، جا ئێستا پێمان ئەوترێت رافضة و شیعة، ئەمەمان پێ بوترێت بەلامانەوە خۆشترە لەوە پێمان بوترێت زەندیق و كافرەكان، وە علي لەلای ئێمە حاڵی باشتر نییە لەوانەی كە قسەیان پێ ئەڵێین و تانەیان لێ ئەدەین) .

پاشان الدارمي ئەڵێت : (ڕاستی كرد ئەم پیاوە لەوەی كە باسی كرد دەربارەی خۆی، وە خۆی نەدزیەوە و موراوەغەی نەكرد، وە ئەوە دەركەوتووە لە هەندێك گەورەكان و زاناكانیان كە خۆیان دائەپۆشن بە تەشەیوع، ئەیكەن بە تەڵەیەك بۆ وتەكانیان، وە ئەیكەن بە پەیژە و داوێك بۆ ڕاوكردنی لاوازەكان و ئەهلی غەفڵەت، پاشان لەنێوان وتەكانیاندا كوفر و زەندەقەكانیان ئەڕێژن بۆ ئەوەی كاریگەری زیاتر بێت لەسەر دڵی نەزانەكان، خۆ ئەگەر نەزانەكان لەسەر شك و گومان بن لە دینەكەیاندا ئەوە زانایان لەسەر یەقین و دڵنیایین، ولا حول ولا قوة إلا بالله) .

- لە (تاريخ بغداد) ـــدا أبو داود السجستاني ئەڵێت : (كاتێك هارون الرشيد سەرگەورەی زەندیقەكان شاكر ـــی هێنا تا بدات لە ملی، پێی وت : پێم بڵێ بۆچی ئەو كەسەی لە ئێوە فێر ئەبێت یەكەم شت فێری ڕافیزەبوون و نەفی قەدەری ئەكەن؟

وتی :وتەی ئێمە لە ڕافیزەبووندا ئەوەیە ئەمانەوێت تانە بدەین لە گوێزەرەوەکان، جا کە گوێزەرەوەکە پووچەڵ بوویەوە ئەوە نزیکە ئەوەش کە گواســتراوەتەوە پووچەڵ ببێتەوە .

وە وتەکەمان لە قەدەردا ئەوەیە ئەمانەوێت ڕێگەبدەین بە دەرکردنی بەشێک لە کردەوەکانی بەندە لە قەدەری الله بۆ جێگیرکردنی قەدەری الله، جا ئەگەر ڕێگەپێدراو بێت بەشێکیان دەربکرێت ئەوە ڕێگەپێدراوە هەمووی دەربکرێت) .

- إبن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية) ـــــدا ئەڵێت : (کاتێک قەرامیتە باتنیەکان گەشەیان کرد و خۆیان دەرئەخست بە تەجەهوم و ڕافیزەبوون پێکەوە، وە لە ناخدا لە خاوەنی گەورەترین کوفر و لادان و ئیلحاد ـــــن لەناو بەنی ئادەمدا، وەســیەتیان بۆ ئەوانەی کە بانگەشەیان ئەکرد بۆیان بریتیبوو لە : (کاتێک چوویت بۆ لای موسوڵمانان مەچۆ بۆ لای ئەوانەیان کە ئەڵێن قورئان و سوننەت، چونکە ئەوانە قورس ئەبن بۆت و بەدەمتەوە نایەن، بەڵکو بڕۆ بۆلای موسوڵمانان لەلایەنی شیعەبوونەوە، خۆشەویستی و گەورەڕاگرتن و سەرخستن دەربخە بۆ آل ی محمد، وە دوژمنداری دەربخە بۆ ئەوانەی کە زوڵمیان لێ کردوون، وە باسی زوڵمی یەکەمینەکانیان بۆ بکە ئەوەندەی بوار هەبوو، چونکە بەوە ئەولاترە کەسانێکی زۆر بەدەمتەوە بێن، وە پاشان لەوڕێگەوە ئەتوانیت لە کۆتاییدا تانە بدەیت لە دینەکەیان) .

- إبن تيمية لە (مجموع الفتاوى) ـــدا ئەڵێت : (زانایان باسیان کردووە سەرەتای ڕافیزەبوون لە زندیق عبدالله بن ســبأ ـــــەوە بوو، ئەو ئیســلامی دەرخســت و لە ناخدا باوەڕی بە یەهودیەت هەبوو، وە ویستی ئیسلام تێکبدات وەک چۆن بولص ی نەسڕانی کە دینی نەســڕانیەکانی تێدا لەکاتێکدا خۆی یەهودی بوو، وە بە هەمان شــێوە زۆربەی پێشــەواکانیان زەندیقن، ڕافیزەبوون دەرئەخەن چونکە ڕێگەیەکە بۆ تێکدان و ڕووخاندنی ئیسلام) .

٨٨٨ - الهروي ئەڵێت : (وە ئەوانەی ئینکاری کەلامیان کرد بۆ الله عز وجل، ویســتیان هەموو دینەکە پووچەڵ بکەنەوە، چونکە الله تعالى بە درۆی ئەوان ئەگەر قســەکەر نەبێت ئەوە وەحی پووچەڵ ئەبێتەوە، وە فەرمانکردن و

ڕێگری کردن هەڵئەگیرێتەوە، وە ئیسلام دەرئەچێت لەوەی کە بیستراو بێت، جا بەوشێوەیە جبریل علیه السلام ئەوەی نەبیستووە کە گەیاندوویەتی، وە پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی وەرنەگرتووە کە جێبەجێ و تەواوی کردووە، جا تەسلیمبوون و گوێڕایەڵی و لاساییکردنەوە پووچەڵ ئەبێتەوە، وە تەنها ئەو شتانە ئەمێنێتەوە بە عەقڵ پێی ئەگەیرێت کە ئەوان لەسەری ڕاوەستاون .

وە قسەی عثمان بن سعید ـــە کە جهم زەندەقەکەی خۆی بنیاتناوە لەسەر نەفیکردنی کەلام بۆ الله عز وجل[1] .

ئەم سێ بنچینەیەش پایەکانی یەکەم زەندەقەن، وە ئەوانەش زەندیقی نێرن وەک چۆن گوێبیستی یحیی بن عمار بووم وتی[2]) .

---

(١) الدارمي لە (النقض) ـــدا ئەڵێت : (هەتا جهم بانگەشـەی ئەوەی کرد کە سەری میحنەکەی بریتیە لە نەفیکردنی کەلام لە الله تعالی، وە وتی (هەرکاتێک ئێمە نەفی کەلام بکەین لە الله ئەوکات ئێمە نەفی هەموو سیفەتەکانمان لێکردووە لە نفس و دەستەکان و ڕوو و بیستن و بینین، چونکە کەلام جێگیر ناکرێت ئیللا بۆ خاوەن نفس و ڕوو و دەست و بیستن و بیبین نەبێت، وە کەلام جێگیر نابێت بۆ قسەکەرێک ئیللا ئەوە نەبێت ئەم سیفەتانەی تیادا کۆبووەتەوە) .

وە جهم و هاوەڵانی درۆیان کرد لەوەی کە نەفیان کرد لە الله لە قسەکردن، وە ڕاستیان کرد لەوەدا کە وتیان قسەکردن جێگیر نابێت ئیللا بۆ ئەوە نەبێت کە ئەم سیفەتانەی تیادا کۆبووەتەوە، وە ئەمانە کۆبووەتەوە لە الله تعالی ـدا بەکوێرایی چاوی دوژمنەکانی الله ئەگەرچی پێشیان ناخۆش بێت بەبێ چۆنیەتی بۆدانان و نمونە بۆهێنانەوە، وە ئەوە هەر خۆیەتی کە هەواڵی دەربارەی خۆی داوە بە ناوەکانی لە موحکەمی کتێبە دابەزێندراوەکەیدا لەسەر پێغەمبەرە ﷺ نێردراوەکەی، وە وەسفی خۆیی پێ کردووە .

وە وتەکەی و وەسفەکەی غیر مخلوق ـن بەکوێرایی چاوی جەهمیەکان) .

(٢) مەبەســتی لە زەندیقی (نێر) ئەوانەن کە عەقیدەی خۆیان دەرئەخەن و پێچ لێنادەن و تلبیس ناکەن .

وە مەبەســتی لە زەندیقی (نێرەموک یان مێ) ئەشــعەریەکانە کە لە ڕووکەشــدا وتەی ئەهلی ســوننە ئەکەن پاشــان بە وتەی جەهمی و موعتەزیلیەکان واتا ئەکەن بۆ وتەکانی ئەهلی سوننە و لێکی ئەدەنەوە، جا بەمشێوەیە نە نێرن نە مێ .

- إبن تيمية لە کتێبی (بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية) ـــدا کە تیایدا ڕەددی ئەشعەریەکانی داوەتەوە بە گشتی، وە بەتایبەتی ڕەددی کتێبی (تأسيس التقديس) ـی فخر الرازي الأشعري، ئەڵێت : (وە ڕوون بوویەوە لە زیاتر لە شوێنێکدا کە ئەم موتەکەلیمە جەهمی و فەیلەســوفە دەهریانە بەڵگەیەکی عەقڵیـان پێ نییە دژی قورئان بێت یاخود لە ئاســتی قورئاندا بێت، جا ئەوەی گرتوویانەتەبەر لە جێگیرکردنی دروســتکەر و ســیفاتەکانی ڕێگاگەلێکی خراپن، ئەوانە بێپێویســـت نـابن لە بەڵگە عەقڵیەکانی قورئان لەوبارەیەوە چجای ئەوەی دژی بن، ئەمەش یەکێک لەو شــتانەیە ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەوان باســی ئەکەن لە پێشــخســتنی ئەمجۆرە بەڵگانە بەســەر بەڵگەی قورئانی بە خەبەری و عەقڵیەکانیەوە، وە هیچ گومان نییە لەوەدا کە ڕێگە و ڕێبازەکەیان تیایدایەتی لە نیفاق و ئیلحاد و نەزانی کە باســکردنی زۆری ئەوێت، وە هەر لەبەر ئەوەش پێشــەواکان وەکو أحمد بن حنبل و جگە لە ئەو وتوویانە (زاناکانی کەلام زەنـدیقن)، وە ئەوانەی ئەو پێشــەوایـانە مەبەســتیـان بوو بـاشــتر بوون لە ئەمە و هاوشێوەکانی - واتە الرازي و هاوەڵانی - ) .

٨٨٩ - زُرزُر بن صـالح السـدوسي ئەڵێت : (وتم بە جهم بن صـفوان : ئایا پەروەردگار قسەی کردووە ؟

وتی : نەخێر .

وتم : ئایا قسە ئەکات ؟

وتی : نەخێر .

وتم : ئەی كێ ئەفەرموویت : ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ﴾ (غافر : ١٦)، وە كێ وەڵامی ئەداتەوە بەمە : ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾ ؟

وتی : نازانم، شتیان بۆ ئەم قورئانە زیاد کرد و لێیان کەم کرد) .

---

: ئایەتەکە باسـی ئەو ڕۆژە ئەکات کە الله عز وجل ئەوەی داینابێت بۆ لەناوبردن لەناوی ئەبات لە دروسـتکراوەکان و ئەفەرموویت ئەمڕۆ موڵک و دەسـەڵات هی کێیە ؟ جا کەس نییە وەڵامی بداتەوە بۆیە هەرخۆی ئەفەرموویت بۆ الله ی الواحد ی القهار .

لێرەدا وەکو دەرئەکەوێـت جهم لەبەر ئەوەی خـاوەن عەقیـدەیەک بووە دژی ئەوەی لە قورئانـدا هـاتووە شـکی دەربارەی خودی ئەو قورئانە بۆ دروسـتـ بووە کە خوێندوویەتیەوە .

وە لەجیاتی ئەوەی کاتێک ئایەتەکەی بیسـتـ و زانی دژی عەقیدەکەیەتی تۆبە بکات و بگەڕێتەوە هات قورئانی تاوانبار کرد بەوەی تەواو نییە و شـتی بۆ زیاد و کەم کراوە .

ئەمەش حـاڵی هەموو زنـدیقێکە، لەجیـاتی تۆمەتبـارکردنی ویسـتـ و ئارەزوو و جەهلی خۆیان الله عز وجل تۆمەتبار ئەکەن لە کار و حیکمەتەکانیدا .

- إبن أبي حـاتم لە (الرد على الجهمية) ـــدا ئەڵێت : بینیمەوە لە کتێبەکەی باوکمدا لە نعیم بن حماد ـــەوە وتی : (ئەوترێت بە جەهمیەکان : هەواڵمان پێبدەن دەربارەی فەرمایشـتی الله تعالی پاش نەمانی دروسـتکراوەکانی : ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ﴾ جا هیچ کەسێک وەڵامی نەداتەوە، ئەویش وەڵامی خۆی ئەداتەوە بەمە : ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾، ئەمەش پاش نەمانی گۆکردنی دروستکراوەکانی بە مردنیان، ئایا ئەمە مخلوق ـە ؟) .

- لە (شـرح أصـول إعتقاد) ـــدا أبو سـعيد أحمد بن يحيي بن سـعيد بن القطان وتی : (پیاوێک پرسیاری کرد لە أبو الهذيل العلاف المعتزلي البصري دەربارەی قورئان ؟

أبو الهذيل وتی : مخلوق ـە .

پیاوەکە وتی : (مخلوق ئەمرێت یان ئەمێنێتەوە ؟) .

أبو الهذيل وتی : نەخێر، بەڵکو ئەمرێت .

پیاوەکە وتی : (ئەی باشە قورئان کەی ئەمرێت ؟) .

أبو الهذيل وتی : کاتێک ئەوە مرد کە ئەیخوێنێتەوە ئەوە مردنەکەیەتی .

پیاوەکە وتی : (ئەوە مرد کە ئەیخوێنێتەوە، وە دنیا نەما و لەناوچوو، وە الله عز وجل فەرمووی : ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەمە قورئانە و خەڵکیش مردوون!) .

أبو الهذيل وتی : نازانم .

وە دەمکوت کرا) .

## ده‌روازه‌ى : (١٨)

## باسكردنى وته‌ى أبو الحسن الأشعري

**٨٩٠ - الهروي** ئه‌ڵێت : (كاتێک زانا دیاره‌كانى ئوممه‌ت و تێگه‌یشـــتووان له ئه‌هلى سـوننه‌ت ته‌ماشاى قولایى وته‌ى جه‌همیه‌كانیان كرد، وه ئه‌وه‌ى تیایدایه‌تى و له‌خۆى گرتووه له نیشـانه و هێماى فه‌یله‌سـوفه‌كان، نه‌یانبینیه‌وه ئیللا له‌سـه‌ر یه‌كخســتنێكى ڕوون و بێخه‌وش نه‌بێـت، وه پـایه‌ى مه‌زهه‌به‌كه‌یـان و كۆتـایى گرێكه‌یـان بریتیه له ئه‌وه‌ى ســه‌رگه‌وره‌ى زه‌ندیقه‌كـان له پێش ئه‌وان وتوویـانه : (خولگه‌ى ئه‌ســتێره‌كان جووڵاوه‌ن و ئاســمان هیچى لێ نییه و به‌تاڵه - **واته الله عز وجل له‌سه‌ر عه‌رش نییه -** ) .

وه وته‌كه‌یان : (الله له هه‌موو شـوێنێكه، وه له‌ناو هه‌موو شـتێكدایه)، جا نه لاشـه‌ى سـه‌گیان لێ ده‌ركرد، وه نه لاشـه‌ى به‌راز، وه نه شـوێنى پیسـایى، به‌هۆى ڕاكردن له جێگیركردن و لادان له لێكۆڵینه‌وه .

وه وته‌كه‌یان : بیســـه‌ره به‌بێ بیســـتن، بینه‌ره به‌بێ بینین، زانـایـایه به‌بێ زانست، به‌توانایه به‌بێ توانا، په‌رستراوێكه به‌بێ نه‌فس، وه شخص نییه، وه وێنه ى نییه .

پاشان وتیان : ژیانى نییه .

پاشـان وتیان : هیچ نییه، خۆ ئه‌گه‌ر شـت بوویایه ئه‌وه له شـته‌كان ئه‌چوو، له ده‌وروخولى وته‌ى سـه‌رانى زه‌ندیقه‌كانى سـه‌ره‌تا خولانه‌وه كاتێک وتیان : البارى سیفه‌تى نییه، وه بێ سیفه‌تیش نییه .

هەربۆیە - **زانایان** - ترسـیان هەبوو لەسـەر دڵی موسـوڵمانان، وە ئەهلی غەفڵەت و ئەوانەی تێگەیشتنیان کەمە، چونکە ڕووکەشیان بریتیبوو لە پەیوەست بوون بە قورئانەوە، ئەگەرچی بۆ ئەوەیان بوو خۆیانی پێ داپۆشـن و بپارێزن لە شمشێر .

وە چونکە تەوحیدیان پیشـان ئەدا و، خۆیان لەلای موسـوڵمانان خۆشەویست ئەکرد و، جلی ڕێکوپێکیان لەبەر ئەکرد، هەر بەم جۆرە بە زمانێکی پاراو و ڕەوانبێژ عەیبەکانی خۆیان وت و، ئەو خراپەیەی لە ناخیاندا بوو بە ئاشـکرا باسـیان کرد و، بانگەوازیان کرد بۆ ئەو شـتە گرنگانەیان کە لە ناخیاندا شاردبوویانەوە .

جا چەندە زۆر تووشیان بوو لە ڕۆژگاری خۆیاندا لە شمشێری خەلیفەکان و، زمانی زانایان و هەجرکردنی خەڵکی ئاسایی!

کتێبی (تكفير الجهمية) ـــم پڕکردووە لە وتەی زانایانی ئیسلام دەربارەیان، وە پڕم کردووە لە ڕێچکەی خەلیفەکان لەگەڵیان، وە توندی هەموو ئەهلی سـوننە لەسەریان، وە کۆدەنگی موسوڵمانان لە دەرکردنیان لە میللەتی ئیسلام .

[(١)] جا تەنهایی و هەجرکردن لەسـەریان قورس بوو، وە زەلیلبوونیان درێژەی کێشـا، وە فێڵیان بەدەسـتەوە نەما تەنها پیشـاندانی پێچەوانەی ئەوانەی پێش خۆیان و ڕەددانەوەیان نەبێت، وە قسەکانیان بەشێوەیەک دابڕێژنەوە و بەرگێکی بەبەردا بکەن تێگەیشتن لێی ئاسانتر بێت و کاریگەری زیاتر بێت لەسەر خەڵکی ئاسـایی لە بنچینەی پێشـینەکانیان، تا بەوهۆیەوە بوارێک بۆ خۆیان بکەنەوە و نەجاتیان بێت لە ڕسوایی بەخراپدانان .

هەربۆیە بە پارچە پەڕۆیانێکەوە هاتن کە دەرنەئەکەوت بۆ گەمژەکان ئەوەی تیایدایەتی و لەخۆیی گرتووە، وە تەماشـکەرێکی تێگەیشـتوو تەماشـای بنچینە و ڕەگەکەی ئەکرد، جا ئەیبینی مۆخی فەلسەفە کە داپۆشراوە بە ئێسقانی سوننەت، وە عەقیدەی جەهمیەکان لەژێر ناوی حیکمەتدا) .

: نووسەر ئەم باب ـــەی داناوە بۆ باسکردنی عەقیدەی أبو الحسن الأشعري، تیایدا باســی ســەلەفی أبو الحســن ئەکات کە جەهمیەکانن، باســی حاڵیان و تەکفیرکردنیان لەلایەن سـەلەف و هەجرکردنیان و زۆر شـتی دیکەیان ئەکات، پاشـان باسی ئەوە ئەکات لەو شوێنەوەی دیاری کراوە بەم نیشانەیە (١) أبو الحسن الأشعري بۆ خۆڕزگارکردن لەو ڕسـواییەی پێشـینە جەهمیەکانی تێیکەوتوون دێت لە ڕووکەشـدا وتەی سـەلەف ئەڵێتەوە و لێکی ئەداتەوە بەو وتەیانەی لەسـەر بنچینەی بیروباوەڕی فەیلەسـوف و جەهمیەکان دروسـتکراون، وە خۆی وا دەرئەخات دژی موعتەزیلەکان بێت .

شایەنی باسە أبو الحسن الأشعري جگە لە بابەتی ئەسماء و سیفات کە لەسەر عەقیدەی جەهمیەکانە; لە چەندین بابەتی دیکەشـدا هەر لەسـەر عەقیدەی جەهمی و موعتەزیلەکانە .

ئەمەش هەندێک وتە کە شـایەتی ئەوە ئەدات لەسـەرەوە ئاماژەمان پێداوە و لەلای شوێنکەوتە ڕاستیەکانی سەلەف وەکو ڕۆژی ڕووناک دیارە .

- إبن الجوزي لە (المنتظم) دا دەربارەی أبو الحسن الأشعري ئەڵێت : (علي بن إسماعيل بن أبي بشر، ساڵی ٢٦٠ لەدایک بووە، سەرقاڵی الكلام بووە، ماوەیەکی زۆر لەسـەر مەزهەبی موعتەزیلەکان بووە، پاشـان موخالەفەکردنیانی ڕاگەیاندووە، وە وتەیەکی دەرخسـت کە عەقیدەی خەڵکی تێکدا و فیتنەی یەکبەدوایەکی واجب کرد، وە خەڵکی لە پێشـوودا ڕاجیاوازیان نەبوو ئەوەی کە گوێیان لێی ئەبێت و ئەیبیسـتن کەلامی الله عز وجل ـە، وە جبریل علیه السلام دایبەزاندووەتەسەر پێغەمبەر ﷺ .

وە موعتەزیلەکان وتیان مخلوق ـــە، جا أبو الحســن الأشـعري موافەقەی موعتەزیلەکانی کرد لەوەدا کە ئەمە مخلوق ـــە، وە وتی : ئەمە کەلامی الله نییە، بەڵکو کەلامی الله ســیفەتێکە پەیوەســتە بە ذاتی خۆیەوە، دانەبەزێنراوە، وە لەوە نییە کە ئەبیستریت، وە لەوکاتەوەی ئەمەی دەرخسـت ئەترسا لەسـەر نەفسـی خۆی بەهۆی لادانی لە سوننەت و موخالەفەکردنی، تا وای لێهات خۆی داشارد لە ماڵی أبو الحسن التميمي بۆ خۆپاراستن لە کوشتن، پاشان کۆمەڵێک لە سوڵتانەکان شوێن مەزهەبەکەی کەوتن و دەمارگیریان هەبوو بۆی، وە شـوێنکەوتوانی زیادی کرد هەتا شـافیعی

مەزهەبەکان وازیان لە عەقیدەی الشـــافعي هێنا و دینداریان کرد بە وتەی أبو الحســـن الأشعري ) هتد .

لەم وتەیەوە دەرئەکەوێت أبو الحســـن الأشـــعري موافەقەی جەهمی و موعتەزیلەکانی کردووە لەوەدا کە قورئان مخلوق ـە .

پاشـــان دوو وتەی إبن تیمیة ئەهێنینەوە کە تیایدا بە ڕاشـــکاوی ئاماژە ئەدات بەوەی أبو الحســـن الأشـــعري لە بابەتی قەدەر و ئیمانیشـــدا هەر لەســـەر عەقیدەی جەهمیەکان بووە .

- إبن تیمیة لە (مجموع الفتاوی : ٣٤/٨) ـدا ئەڵێت : (وتەی الأشعري موافەقەی وتەی جەهم و جەبریە زیادەڕەوەکانە لە قەدەردا) .

- إبن تیمیة لە (مجموع الفتاوی : ٤٧/١٣) ـــــدا ئەڵێت : (جەهم ئەیوت : ئیمان تەنها بەڕاستدانانی دڵە، ئەگەرچی بە دەمیش دەرینەبڕێت، وە ئەم وتەیەش نەزانراوە لە هیچ زانایەکی ئوممەت و پێشەواکانیان، بەڵکو أحمد و وکیع رحمهم الله ئەوەیان بە کافر داناوە کە ئەم قسـەیەی کردووە، بەڵام ئەمە ئەوەیە کە أبو الحسـن الأشـعري و زۆربەی هاوەڵانی سەریانخست) .

- إبن تیمیة لە (مجموع الفتاوی : ٢٢٩/٨) ـــــدا ئەڵێت : (جهم بە دوو بیدعە بەناوبانگ بوو :

یەکەمیان : نەفیکردنی سیفات .

دووەمیان : زیادەڕەوی کردن لە قەدەر و ئیرجاء ـــدا، ئیمانی تەنها بە ناسینی دڵ دانا، وە أبو الحسن الأشعري موافەقەی کرد لە ئەسڵی وتەکەیدا، وە بەڵام ناکۆکی هەیە لەگەڵیدا بە ناکۆکیگەلێکی زارەکی - واتە ناکۆکیەکان تەنها زارەکین و ڕاستی نین - ) .

- إبن تیمیة لە (مجموع الفتاوی : ٤٧١/١٦) ـدا ئەڵێت : (أبو الحسن الأشعري و هاوشێوەکانی بەرزەخێکن لە نێوان سەلەف و جەهمیەکاندا، وتەیانێکی ڕاستیان لەمان وەرگرت، وە لەوانیش بنچینەگەلێکیان وەرگرت کە پێیان وایە ڕاســتە بەڵام لەڕاســتیدا فاسد ـن) .

- إبن تيمية لە (درء التعارض : ٢/١٨) دا ئەڵێت : (وە دەربارەی ئەنجامدانی کارە ئیختیاریەکان لەلایەن ئەووەوە - واتە الله عز وجل - ، إبن کلاب و الأشعري نەفیی ئەکەن، وە لەسەر ئەوەش وتەکەیان خۆیان بنیادنا لە بابەتی قورئاندا، وە لەبەر ئەم هۆکارە و جگە لەم هۆکارەش زانایان قسەیان دەربارەکردن لەم بابەتەدا بەوشێوەیەی کە زانراوە لە کتێبەکانی زانایاندا) .

- إبن المبرد لە (جمع الجيوش والدساكر) دا ئەڵێت : (زۆرینەی زانایان کۆکن لە هاوەڵانی و جگە لەوانیش کە أبو الحسن الأشعري یەکەمجار لەسەر عەقیدەی موعتەزیلەکان بووە، وە شوێنکەوتووان و خۆشەویستانی دانیان بەوەدا ناوە، وە بەبێ شک و گومان زانستی هەبووە دەربارەی الکلام و لەسەری بووە و تۆبەی لێ نەکردووە) .

إبن عساکر الأشعري دەربارەی أبو الحسن الأشعري لە کتێبی (تبيان كذب المفتري) دا ئەڵێت : (جێگیری کردووە بۆ الله ئەوەی بۆ خۆیی جێگیر کردووە لە ناو و سیفەتەکان، وە نەفی ئەوەی کردووە کە لایەق نییە بە الله لەبەر ئەوەی لە دروستکراوەکانی ئەچێت) .

وە ئەڵێت : (شوێن ئەو کەسە بکەوە کە الله ڕێنموونی کردووە بۆ شوێنکەوتنی حەق بە دەستگرتن و شوێنکەوتنی سوننەتەوە) .

- إبن المبرد لە (جمع الجيوش) دا ڕەددی ئەم وتەیەی إبن عساکر ئەداتەوە و ئەڵێت : (ئەو وتەیەی کە تیایدا ئەڵێت : (جێگیری کردووە بۆ الله ئەوەی بۆ خۆیی جێگیر کردووە لە ناو و سیفەتەکان) ئەمە درۆیە والله .

وە وتەی : (وە نەفی ئەوەی کردووە کە لایەق نییە بە الله لەبەر ئەوەی لە دروستکراوەکانی ئەچێت)، ئەم سەرلێتێکدان و فێڵەی هێناوە بۆ نەفیکردنی گشتی، وە ئەو تەئویلەی هێناوە کە پێی گەیشتووە بە نەفیکردن، وە کۆمەڵەیەک لە سەلەف وتوویانە : لەوەدا کە الله عز وجل وەسفی خۆیی پێ کردووە، وە لەوەدا کە پێغەمبەرەکەی وەسفی پێ کردووە تەشبیهـ نییە .

وە وتەی : (شوێن ئەو کەسە بکەوە کە الله ڕێنموونی کردووە بۆ شوێنکەوتنی حەق بە دەستگرتن و شوێنکەوتنی سوننەت)، ئیجماع لەسەر ئەوە دامەزراوە کە ئەو لە

ئەهلی الكلام ـە، ئەی كوان ئەهلی الكلام؟ وە كوان ئەهلی سوننە؟! لە هیچ یەكێک لە زانایانی پێشینەوە نەهاتووە كە الأشعري لە ئەهلی سوننەت و فەرموودە بێت) .

إبن عساكر ئەڵێت مانەوەی زۆری أبو الحسن الأشعري لەسەر مەزهەبی موعتەزیلەكان شتێک نییە تانەی پێ بدرێت لێی بەڵكو پێی بەرز ئەبێتەوە بەهۆی ئەوەی لەبەر زۆر مانەوەی لەسەر ئەو عەقیدەیە شارەزایی زیاتری پەیدا كردووە دەربارەی بنچینەكانیان .

- إبن المبرد ـیش لە وەڵامدا ئەڵێت : (ئەوە لەلای نەزانەكان بەو شێوەیەیە، ئەو كەسەی لەسەر شتێک پەروەردە بووبێت و تەمەنی تیادا سەرف كردبێت; زۆر بە كەمی لە دڵی دەرئەچێت، خۆ ئەگەر دەریش بچێت و لە بەشێكی بگەڕێتەوە ئەوە ناتوانێت لە هەمووی بگەڕێتەوە) .

إبن عساكر ئەڵێت أبو الحسن الأشعري یەكێكە لە پێشەواكانی ئەهلی حەدیث .

- إبن المبرد ـیش لە وەڵامدا ئەڵێت : (والله ئەوە ڕێک درۆ و بوهتانە، كوا كتێبەكانی لە فەرموودەدا؟

كێ فەرموودەی لێوە ڕیوایەت كردووە؟

یەک فەرموودەمان پێ پیشان بدەن لە یەكێک لە كتێبەكانی ئیسلامدا ڕیوایەتێكی كردبێت یاخود ڕیوایەتێكی لێوە كرابێت؟

ئەگەر ئەو لە پێشەواكانی فەرموودە بێت ئایا فەرموودەیەكی نییە گێڕابێتیەوە؟

بەس بزانم كەی ڕیوایەتی فەرموودەی كردووە؟

ئەو كە هەر لە سەرەتایەوە لەسەر مەزهەبی موعتەزیلەكان بووە و تۆبەی لێ نەكردووە ئیللا لە كۆتاییەكانی تەمەنیدا نەبێت ئەوجا كەی ڕیوایەتی فەرموودەی كردووە؟ وە كەی پێشەوایەک بووە لە پێشەواكانی؟!) .

إبن عساكر دەربارەی أبو الحسن الأشعري ئەڵێت مەزهەبەكەی مەزهەبی ئەهلی فەرموودەیە .

- إبن المبرد لە وەڵامدا ئەڵێت : (مەزهەبی هاوەڵانی فەرموودە بریتیە لە تەئویل نەکردن، وە ئەو تەئویل ئەکات، وە مەزهەبی هاوەڵانی فەرموودە بریتیە لە وازهێنان لە الكلام و ئەهلەکەی، وە ئەو لە ئەهلی الكلام ـە) .

إبن عســاكر ئەڵێت أبو الحســن الأشــعري مەزهەبێکی نێوەندی هەیە لە نێوان موعەطیلە و موشەبیهەکاندا .

- إبن المبرد لە وەڵامدا ئەڵێت : (بەڵکو مەزهەبەکەی بریتیە لە تەئویل، وە ئایەت و فەرموودەکانی سیفاتی ڕەتکردەوە بە تەئویلی عەقڵی، موعتەزیلەکان و جەهمیەکان بە ڕاشکاوی نەفیان کرد، وە ئەویش فێڵی لە خەڵکی کرد و حەقیقەتی وتەکەی نەفیکردنە، چونکە ســیفەتەکـانی جێگیرکرد و تەئویلی کردن، وە وازی لە ئەو هەواڵانە هێنـا کە گواستراوەتەوە و زۆربەیانی ڕەتکردەوە و لەسەر ڕووکەش لای بردن بە بەڵگە عەقڵیەکان) .

- خاوەنی کتێبی (قصة الأشاعرة) باسی حەقیقەتی مەزهەبی أبو الحسن الأشعري ئەکات و ئەڵێت : ((دەروازەی دووەم : ڕەگەکانی مەزهەبی أبو الحسن الأشعري) .

(بەشی یەکەم : ڕەگە نزیکەکان : موعتەزیلە و کوللابیەکان) .

أبو الحسن الأشعري وتەکەی دەربارەی الكسب و الإستطاعة و عدم الإستحالة و بقاء الأعراض ی لە النجار و ضرار ی المعتزلي وەرگرتووە .

وە لە زۆربەی بابەتەکانی التوحید ـدا وتەکانی لە الجبائي المعتزلي وەرگرتووە .

وەک چۆن وتەکەی لە بابەتی الجوهر الفرد و الأجســام و دلیل الحوادث و جگە لەوەی لە أبو هذيل العلاف المعتزلي وەرگرتووە .

وە وتەکەی دەربارەی کەلامی الله لە إبن كلاب وەرگرتووە .

وە وتەکەی دەربارەی اللفظ لە الكرابيسي وەرگرتووە .

وە مەزهەبەکەی جێگیرکردووە لەســەر کۆکراوەی ئەو وتەیانەی العلاف و النجار و ضرار و الجبائي و إبن كلاب ـەوە دەرچووە .

وه مه‌نهه‌جه‌كه‌ی وه‌ک پێشـــووتر بـاســـمـانكرد شـــوێنكه‌وته‌ی مه‌نهه‌جی موعته‌زیله‌كانه له گه‌ڕان به‌دوای بابه‌ته‌كان و ڕێگه‌كانی قیاسكردن و ته‌واوی ئه‌و بنچینه و بناغه‌یانه‌ی كه موعته‌زیله‌كان مه‌زهه‌به‌كه‌ی خۆیانیان له‌سه‌ر بنیادناوه .

به‌مشـــێوه‌یه ئه‌بینینه‌وه أبو الحســـن الأشـــعري ئه‌گه‌رچی وتبێتیشـــی له موعته‌زیله‌بوون ده‌رچووه ئه‌وه له چه‌تره گه‌وره‌كه‌ی ئیعتیزال ده‌رنه‌چووه، به‌ڕاســـتی ده‌سته‌وه‌ستان ماوه‌ته‌وه و پێویستی پێیانه له زۆربه‌ی بنچینه‌كانی عه‌قیده و مه‌نهه‌جدا).

پاشـان نووســه‌ر به‌درێژی باســی به‌شـی دووه‌م ئه‌كات له ڕه‌گه‌كانی مه‌زهه‌بی أبو الحســـن الأشـــعري و به‌ڵگه‌ی بۆ ئه‌هێنێته‌وه (ڕه‌گه دووره‌كـان : فه‌یله‌ســـووف و نه‌ســـڕانیه‌كان)، وه تیایدا ئه‌یســـه‌لمێنت ئه‌هلی كه‌لام بابه‌ته كه‌لامیه‌كانیان له یۆنان و فه‌یله‌سوفه‌كان و ئه‌وانه وه‌رگرتووه له ئه‌هلی كیتاب كه شوێنیان كه‌وتوون) .

- أبو علي الأهوازي له (مثالب إبن أبي بشـر) ـــدا ئه‌ڵێت : (وه أبو الحســـن الأشـــعري له‌عنه‌تی الله ـــی لێبێت و ئابڕووی ببات و ڕسـوای بكات كتێبێكی هه‌یه له ڕێچكه و ڕێبازدا كه هاوه‌ڵانی كردوویانه به پارێزگاریه‌ک به‌رامبه‌ر ئه‌هلی ســـوننه، ناوی ناوه كتێبی الإبانة، وه ئامانجیان پێی هاوه‌ڵه ئاساییه‌كانی ئێمه‌یه له ئه‌هلی سوننه - واته خه‌ڵكی عه‌وام و ئاســـاییه‌كانی ئه‌هلی ســـوننه -، كه هاته به‌غداده‌وه نووســـی، به‌ڵام حه‌نبه‌لیه‌كان لێیان وه‌رنه‌گرت و هه‌جریان كرد) .

وه ئه‌ڵێت : (گوێم له أبا عبدالله الحمراني بوو وتی : كاتێک الأشـــعري ڕۆشـــته به‌غداده‌وه هات بۆلای البربهاري و وتی : ڕه‌ددی الجبائي و أبي هاشـــم ـــــم دایه‌وه، وه قســـه‌كانیانم هه‌ڵوه‌شـانده‌وه، وه ڕه‌ددی یه‌هودی و نه‌سـڕانی و مه‌جوسـیه‌كانم دایه‌وه، من ئاوام وت ئه‌وانیش ئاوایان وت، پاشـان زۆر باسـی ئه‌م شـته‌ی كرد، كاتێک بێده‌نگ بوو البربهاري وتی : ئه‌وه‌ی كه ئێستا تۆ باست كرد نازانم چییه، ئێمه ته‌نها ئه‌وه ئه‌زانین كه أبو عبدالله أحمد بن حنبل وتوویه‌تی، جا له‌لای ڕۆیشت و كتێبی الإبانة ـــی نووسی، به‌ڵام لێیان قبووڵ نه‌كرد) .

وه ئه‌ڵێت : (بانگه‌شـــه‌ی ئه‌وه‌ی كرد له ئه‌هلی سـوننه‌یه، وه فێڵی له خه‌ڵكی كرد ده‌رباره‌ی ئه‌وه‌ی كه له‌ســـه‌ریه‌تی، جا كۆمه‌ڵه‌یه‌ک له نه‌زان و ســـوكه گومڕاكان شـــوێنی كه‌وتن .

جا زۆرێک لە خەڵکی وا گومانیان برد ئەوان لەسەر حەق ــــن، هەربۆیە بابەتەکەی بڵاو بوویەوە و پەرشبوویەوە بە ئاسۆکاندا .

ئەمەش بەهۆی ئەوەی - أبو الحسن الأشعري - ئەڵێت سوننەت سەرئەخات، پەنا ئەگرین بە الله، بەڵکو ئەو بیدعە سەرئەخات، وە خەڵکی تووشی وتەی موعتەزیلە و زەندیقەکان ئەکات بەبێ ئەوەی خۆیان پێی بزانن بەهۆی ئەو مەیل و خۆشەویستیەی هەیانە بۆ الكلام) .

وە ئەڵێت : (أبو الحسن الأشعري هیچ پێگەیەکی نەبوو لە زانست و قورئان و فیقهـ و فەرموودەدا، وە بە هەمان شێوە هەموو هاوشێوەکانی لە ئەهلی الكلام) .

**٨٩١ - الهروي** ئەڵێت : (ڕەددی وتەی یەهودیەکان ئەدەنەوە | يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ : دەستی الله داخراوە | (المَائِدَة : ٦٤) .

جا هەم داخرانەکە نەفی ئەکەن وە هەم دەستەکە، بەمجۆرە خراپتر ئەبن لە یەهودیەکان، چونکە الله سیفەتەکەی جێگیر کردووە - **کە دەستەکەیە** - وە عەیبەکەی نەفی کردووە - **کە داخرانی دەستەکەیە** - .

وە یەهودیەکان سیفەتەکەیان بۆ جێگیر کرد و عەیبەکەشیان جێگیر کرد .

وە ئەوانەش - **واتە ئەشعەریەکان** - سیفەتەکەیان نەفی کرد وەک چۆن عەیبەکەیان نەفی کرد[1] .

وە ڕەددی وتەی نەسرانیەکان ئەدەنەوە دەربارەی عیسی و دایکی، وە ئەڵێن (لەناو مخلوق دا تەنها مخلوق هەیە)، بەم شێوەیە قورئان بەتاڵ ئەکەنەوە .

جا شاراوە نییە لە خاوەن ژیریەکان کە وتەی ئەوانەی سەرەتایان و کۆتاییان وەکو پەتی السَّحَّارة[2] وایە) .

(١) إبن القيم لە (الصواعق المرسلة) ـدا ئەڵێت : (الله تعالى ئینكاری لە یەهود كرد دەربارەی دانەپاڵی دەســتەكەی بۆ نەقس و عەیب; وە ئینكاری لێ نەكردن لە جێگیركردنی دەســت بۆی، هەربۆیە فەرمووی : ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ ﴾ (المَائِدَة : ٦٤) .

جا لەعنەتی لێكردن لەبەر وەســفكردنی دەســتی بە كەمی نەوەک جێگیركردنی دەست بۆی، وە جێگیری كرد بە زیاد لەوەی وتیان بەوەی دوو دەستی كراوەن .

وە بەم شێوەیە فێڵبازی جەهمیە پەكخەرەكان دەرئەكەوێت لە ئەوانەی لە ئاژەڵ ئەچن كاتێک ئەڵێن : (الله لەعنەتی لە یەهود كردووە لەسەر جێگیركردنی دەست بۆی، وە ئەوان موشەبیهەن، وە پێشەوای موشەبیهەكانن) .

جا لەم درۆ و چەواشــەكاریە ڕابمێنە ئەم كەســە كردوویەتی، وە ڕابمێنە لەوەی ئایەتە ڕاشكاوەكە پێچەوانەیەتی) .

(٢) ســحارة جۆرە یاریەكە چەند پەتێكی هەیە، هەر پەتێک ڕەنگێكە، كاتێک پەستانی ئەخەیتەسەر ڕەنگی پەتەكان ئەگۆڕێت لە دانەیەكیانەوە بۆ دانەیەكی تر .

وە لێكچوونی وتەی جەهمیەكانی ســەرەتا و ئەو جەهمیانەی كە الهروي باســیان لێوە ئەكات ئەوەیە لەكاتی ئاســاییدا وتەكانیان بە جۆرێكە، دواتر كە ئەڕۆیتە ناو بنجوبناوانیەوە ئەبینیت ئەبێت بە شتێكی تر .

زۆر بەجوانی وەســفی عەقیدەی ئەشــعەریەكانی كردووە، چونكە ئەوان لە ڕووكەشــدا وتەی ئەهلی ســوننە دووبارە ئەكەنەوە، وە كاتێک لە وتەكەیان ئەكۆڵیتەوە ئەبینیت وتەكەیان ئەگۆڕێت چونكە بە لێكدانەوەی كەلامیی موعتەزیلە و جەهمیەكان وتەی سەلەف لێكئەدەنەوە .

- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ــدا ئەڵێت : (بابەتی خۆدەرخستنیان بە خیلافی ئەوەی كە باوەڕیان پێیەتی وەكو كردەوەی زەندیقەكانە، دەربارەی جێگیركردنی ئەوەی الله ســبحانە بەرزبووەتەوە لەســەر عەرشــەكەی عەقیدەیان ئەوەیە الله ســبحانە ڕێگەپێدراو نییە وەسف بكرێت بەوەی لە ئاسمانە یان لە زەوی، وە نە لەسەر عەرش وە نە لە سەرەوە .

وە الباقلاني باسی کردووە: (الإستواء کردەوەیەکە الله دایهێناوە لە عەرش ـدا).

ئەمەش پێچەوانەی وتەی زانایانی ئوممەتە) هتد.

ســـەلەف رحمهم الله پێیان وایە الله عز وجل بەرزبووەتەوە لەســـەر عەرش، واتە الإستواء ـــی کردووە لەسەر عەرش، وە پێیان وایە الله عز وجل هەرکاتێک هەرشتێکی بوێت ئەنجامی ئەدات، واتە ئیثباتی فیعلە ئیختیاریەکانی ئەکەن، هەربۆیە بەرزبوونەوە بۆ ســـەر عەرشـــیش جێگیر ئەکەن و پێیان وایە الله عز وجل کردەوەیەکی ئەنجام داوە دەربارەی خۆی، واتە یەکەمجار لەسەر عەرش نەبووە، دواتر چووەتە سەر عەرش.

جا ئەشـــعەریەکان دێن لە ڕووکەشـــدا هەمان قســـەی ئەهلی ســـوننە ئەکەن لە سەرەتادا، ئەڵێن الله الإستواء ـــی کردووە لەسەر عەرش، بەس دوایی وەکو الباقلاني ئەڵێن (الإستواء کردەوەیەکە الله دایهێناوە لە عەرش ـــدا)، واتە کردەوەکە لە عەرشدا ڕوویداوە نەوەک بەنســـبەت الله عز وجل، چونکە نەفی فیعلە ئیختیاریەکانی الله عز وجل ئەکەن.

کەسانێک هەن ئەڵێن أبو الحسن الأشعري الإستواء ـــی جێگیر کردووە، بەڵام لەڕاستیدا جێگیرکردنەکانی هەمووی بەو شێوەیەیە کە لە سەرەوە باسمان کرد، خودی وشەکە جێگیر ئەکات بەس مانای وشەکە جێگیر ناکات دواتر دێت مانایەک ئەدات بە وشەکە لەگەڵ بەناوعیلمی الكلام ـدا تێکگیرانی نەبێت.

تەماشا بکە کە أبو الحسن الأشعري چۆن سیفەتی دابەزینی الله عز وجل جێگیر ئەکات، سەلەف کاتێک ئەڵێن الله عز وجل لە سێیەکی کۆتایی شەودا دێتە ئاسمانی یەکەم; واتە خۆی دێت; واتە کردەوەکە بە نسبەت الله عز وجل ـەوە ڕوودەدات.

بەڵام أبو الحســـن الأشـــعري کافرە بە عەقیدەی ســـەلەف، بەڵکو دێت ئەڵێت دابەزینی الله شـتێکە وای لێ ئەکات ڕووبدات لە ئاسـماندا، واتە سـیفەتی النزول بۆ الله عز وجل جێگیر ناکات.

- السجزي لە (الرسالة إلى أهل الزبيد) ـــدا ئەڵێت: (أبو الحسن الأشعري دانی ناوە بە فەرموودەی النزول ـدا.

پاشان وتی: دابەزین کردەوەیەکی خۆیەتی دروستی ئەکات لە ئاسماندا.

وە یەکێک لە هاوەڵانی وتی: مەبەستی پێی دابەزینی فەرمانەکەیەتی.

وە لەلای ئەهی حەق دابەزینی ذات ـە بەبێ چۆنیەتی بۆدانان) .

وە ئەڵێت : (وە موافەقەکردنیان بۆ موعتەزیلەکان : موعتەزیلەکان وتیان : (بینینی الله تعالی بە چاو ڕێگەپێدراو نییە، وە الله شتێک نییە ببینرێت) .

وە أبو الحسن الأشعري وتی : (ئەبیندرێت، بینینێک نا بەچاو لەبەرامبەردا) .

جا موخالەفەکردنی ئەوانی پێشان دا لەکاتێکدا هاوڕایانە) هتد .

تەماشـــا بکە لە فەرموودەکەدا هاتووە ئەفەرمووێت الله عز وجل ئەبینن وەک چۆن مانگی چواردە ئەبینن لە شەوێکی سامالْدا .

جا موعتەزیلە و ئەشـعەریەکان کافرن بەم فەرموودەیە، موعتەزیلەکان بە ئاشـکرا ئەڵێن الله شـــتێک نییە ببیندرێت، هەربۆیە فەرموودەکە بە ئاشـــکرا ڕەت ئەکەنەوە، ئەشــــعەریەکانیش بۆ ئەوەی هەر لە ســــەرەتاوە ڕووی ڕەشـــیان دەرنەکەوێت ئەڵێن فەرموودەکەیان قبووڵە و صـــحیح ـــــە، دواتر ڕێک بە هەمان وتەی موعتەزیلەکان فەرموودەکە لێک ئەدەنەوە ئەڵێن ئەبیندرێت بەڵام بە چاو نا! ئەبیندرێت بەڵام لە هیچ شوێنێک نا! ئەبیندرێت بەڵام لە بەرامبەر نا!

ئەم قسـەیە واتە الله شـتێک نییە ببیندرێت، هەمان قسـەی موعتەزیلەکانە بەس بە تۆزێک ترش و خوێوە .

وە ئەڵێت : (موعتەزیلەکان وتیان : (ڕێگەپێدراو نییە ذات ـــی الله وەسف بکرێت بە قسەکردن، وە هەموو قسەکردنێکیش بە دەنگ و پیتە) .

وە أبو الحسن الأشعري وتی : (واجبە ذات ـــی وەسف بکرێت بە قسەکردن، وە ئەو کەلامەش بە دەنگ و پیت نییە) .

جا ئەوەی نەفی کرد کە موعتەزیلەکان نەفیان کرد، وە شـتێکی جێگیر کرد کە بە عەقڵدا ناچێت، جا ئەو وا پێشـان ئەدات موخالەفەی کردبێتن کەچی لە ئەسڵدا موافق یانە) هتد .

کە ئەوترێت قسـە; قسـە هەر بە دەنگ و پیتە، بۆیە موعتەزیلەکان وتیان الله عز وجل ناکرێت بە قسەکردن وەسف بکرێت چونکە قسە بە دەنگ و پیتە .

أبو الحسن الأشعري ـــش وتی واجبە اللە وەسف بکەین بەوەی قسە ئەکات، بەڵام قسەکەی بە دەنگ و پیت نییە!

ئەوە هەمان قسەی موعتەزیلەکانە، تەماشا بکە چۆن لە سەرەتادا وتەی سەلەف دووبارە ئەکاتەوە، دواتر چۆن بە وتەی موعتەزیلە و جەهمیەکان تەفسیری ئەکات .

وە ئەڵێت : (وە فەرموودەی المعراج یان ڕەتکردەوە - واتە موعتەزیلەکان - .

وە أبو الحسن الأشعري وتی : (فەرموودەکە جێگیرە)، دواتر وتی : (ڕێگەپێدراو نییە اللە وەسف بکەیت بەوەی لە سەرەوەیە) .

جا ئەوەی بەدرۆ خستەوە کە لە فەرموودەی المعراج ـــدا هەیە، هەربۆیە بوو بە موافق یان لەگەڵ پیشاندانی خیلاف) هتد .

موعتەزیلەکان ئەو فەرموودەیەیان ڕەتکردەوە کە باسی شەوڕەوی و بەرزکرانەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەکات، چونکە تیایدایەتی رسول اللە ﷺ ئاسمان بە ئاسمان ئەڕوات و دواتر ئەڕواتە لای اللە عز وجل، ئەوەش مانایەک ئەدات کە بە ڕوونی لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە کە اللە عز وجل لەسەر عەرشە بە ذات ی خۆی .

موعتەزیلەکان ئەگەر ئەم فەرموودەیەیان وەربگرتایە بەپێویست دائەنرا لەسەریان دابنێن بەوەی اللە عز وجل لەسەر عەرشە .

أبو الحسن الأشعري هات وتی : فەرموودەکە جێگیرە، بەڵام نابێت اللە بەوە وەسف بکەین لە سەرەوەیە!

ئەمە لێدانە لە مانای ڕووکەش و حەقیقی فەرموودەکە کە سەلەف لەسەری بوون، وە تەئویلکردنیەتی بە تەئویلی جەهمیەکان کە لەسەری تەکفیر کراون .

وە ئەڵێت : (موعتەزیلەکان وتیان : (سورەت و ئایەتەکان مخلوق ـــن، وە قورئان مخلوق ـە) .

وە أبو الحسن الأشعري وتی : (قورئان کەلامی اللە ـــیە، وە سورەت و ئایەتەکان کەلامی اللە نین، بەڵکو گوزارشتێکن لە کەلامەکەی، وە مخلوق ـە) .

جا موافقەیانی کرد لەوەدا کە وتیان مخلوق ـــە، وە شتێکی زیاتری وت لەوەی ئەوان کاتێک وتی ئەوە قورئان نییە، وە کەلامی اللە نییە .

خۆ ئەگەر وتیان ئەوان دان ئەنێن بەوەی ئەوە قورئانە، پێیان ئەوترێت : دانی پیادا ئەنێن بەشـــێوەی مەجاز، بۆچوونیان ئەوەیە قورئان غیر مخلوق ـــــە و پیتەکان هەمووی مخلوق ـــە، وە سورەتەکان پیتن بە ئیتیفاق، هەرکەسێک ئینکاری لەوە بکات قسەی لەگەڵدا ناکرێت .

جا ئەگەر کۆمەڵە پیتێکی دروســـتکراو بن ئەوە ڕێگەپێدراو نییە قورئانێکی غیر مخلوق بێت) .

وە لە کۆتاییدا السـجزي ئەڵێت : (وە زۆربەی مەزهەبەکەی هەر بەو جۆرەیە، لە ڕووکەشــدا وتەی ئەهلی ســوننە دووبارە ئەکاتەوە بە موجمەلی، پاشــان کاتێک ڕوون و وردی ئەکاتەوە ئەگەڕێتەوە بۆ وتەی موعتەزیلەکان، جا نەزان قبووڵی ئەکات بەوەی کە پیشانی ئەدات، وە زانا ئابڕووی ئەبات بەوەی کە ئەو پێی ئەڵێت .

زیـانی ئەوان لە زیـانی موعتەزیلەکـان زیـاترە؛ بەهۆی دەرخســـتنی ئەوان و خۆنەدانەپاڵیان بۆ ئەهلی سوننە - **واتە موعتەزیلەکان** - .

وە شاردنەوەی ئەوان و تێکەڵبوویان بە ئەهلی حەق - **واتە ئەشعەریەکان** - ) .

**٨٩٢ - الهروي** ئەڵێت : (جا تەماشــا بکەن ئەی خاوەن ژیریەکان؛ وە ببینن ئەمانە چ فەزڵ و زیادەیەکیان هەیە بەسەر ئەوانەوە :

ئەوان - **واتە جەهمیەکان** - الله وتەکەیان نـاشـــرین بکات وتیـان : (الله لە هەموو شوێنێکە) .

وە ئەمانیش - **واتە ئەشـعەریەکان** - ئەڵێن : (لە شـوێنێک نییە، وە وەسـف ناکرێت بە (لە کوێیە)) .

لەکاتێکدا ئەوەی کە لە الله عز وجل ـەوە گەیەنەرە ﷺ بە خزمەتکارەکەی معاوية بن الحكم رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (الله لە کوێیە ؟) .

وە وتیان : (لە سـەرەوەیە وەک چۆن لە خوارەوەیە، وە نازانرێت لە کوێیە، وە وەسف ناکرێت بە شـوێنێک، وە لە ئاسـمان نییە و لە زەویش نییە)، وە نکۆڵی ئاراستە و سنووریان کرد) .

---

**: وەک چۆن پێشـتر ڕوونـمان کردەوە ئەشـعەریەکـان هەمـان بنچینەی جەهمیەکانیان هەیە; کە بریتیە لە دامەزراندنی عەقیدە لەسـەر بەناوزانسـتی الکلام و فیلتەرکردنی قورئان و سوننەت بەپێی ئەو الکلام ـە، ئەمە پێشەکی هەردووکیانە .**

**وە هەردووکیان گەیشتوون بەوەی الله عز وجل لەسەر عەرش نییە بە ذات ـی خۆی، ئەمەش ئەنجامی هەردووکیانە .**

**تەنها لەو ڕێگەیەدا جیاوازن کە لە پێشەکیەکەوە پێی ئەگەن بە ئەنجامەکە .**

- وە ئەڵێت : (ئەوان ئەڵێن : (الکلام - **قسەکردن** - ی نییە، بەڵکو قسەیەکی دروستکردووە) .

وە ئەمانیش ئەڵێن : (یەک جار قسەی کردووە، قسـەکەرە پێی لەوکاتەوەی قسەی کردووە، قسەکردن نەپچڕاوە، وە کەلامەکەی لە شوێنێک نییە خۆیی لێ نەبێت) .

---

**: عەقیدەی سـەلەف ئەوەیە الله عز جل سـیفەتی قسـەکردنی هەیە و هەرکاتێک بیەوێت قسە ئەکات، نەوەک تەنها یەک جار قسەی کردبێت .**

**وە لە عەقیدەی سـەلەف ئەوەیە قورئان لەناو موسـحەف ـدا هەیە، بەڵام ئەشعەریەکان بەم قسەیەیان (وە کەلامەکەی لە شوێنێک نییە خۆیی لێ نەبێت) ئەو ئەسـڵە ڕەت ئەکەنەوە، هەربۆیە ئەڵێن موسـحەف هیچی تیایدا نییە جگە لە وەرەقە و حیبر، ئەمەش عەقیدەی لەفزیەکانە، وە ئەوەی تیایدایەتی گوزارشـتێکە لە کەلامی الله نەوەک کەلامی الله بێت .**

**ئەمەش ڕێک وتنەوەی وتەی جەهمیەکانە و بە مخلوق ـدانانی قورئانە بەس بە شێوازێکی تر .**

- وە ئەڵێت : (پاشان ئەڵێن : لە شوێنێک نییە .

دواتر وتیان : دەنگ و پیتی نییە **- واتە کەلامەکەی -** ) .

---

**: واتە هەر وەکو جەهمیەکان وتیان الله عز وجل بە ذات ــی خۆی لەسەر عەرش نییە، وە وەکو جەهمیەکان کەلامی غیر مخلوق ی الله عز وجل یان بە مخلوق زانی بەو دەربڕینانە .**

- وە ئەڵێت : (وە وتیان : (ئەمە حیبر و وەرەقەیەکە، وە ئەوەش صــوف و دارێکە، ئەمەش مەبەست پێی نەخشە، وە مەبەست پێی هەڵکۆڵینە، وە ئەوەش دەنگی قورئانخوێنە .

ئایا نابینی دەنگەکە باشــیی و خراپیی هەیە ؟ ئەوەش لەفزیەتی، ئایا نابینی پاداشت بدرێتەوە لەسەری ؟ ) .

هەتا سەرێک لە سەرانیان وتی : (ئایا قورئان لە صوف ئەبێت ؟ ) .

وە یەکێکی تریان وتی : (ئەی لە دار ؟ ) .

جا فێڵ و تەڵەکەبازیان کرد و وتیان : (ئەمە گێڕانەوەیەکە گوزارشـتی پێکراوە لە قورئان، وە الله یەکجار قسەی کردووە پاش ئەوە قسە ناکاتەوە ) .

پاشان وتیان : (غیر مخلوق ە، وە ئەوەی بڵێت مخلوق ە ئەوە کافرە ) .

ئەمەش لەو تەڵەیانەیانە کە دڵەکانی ئەهلی سوننەی ئاسایی پێ ڕاو ئەکەن، وە عەقیدەیەکان بریتیە لەوەی (قورئان بوونی نییە )، جەهمیە نێرەکان یەک جار وتیان، وە ئەشعەریە مێیەکان دە جار وتیان ) .

---

**: عەقیدەی سەلەف رحمهم الله ئەوەیە لە موسحەفدا لەپاڵ وەرەقە و حیبرەکەدا کەلامی الله عز وجل هەیە، وە ئەوەی نووسراوە کەلامی غیر مخلوق ــی الله عز وجل ــە نەوەک گوزارشتێک بێت لە کەلامی الله .**

- وەک چۆن قوام السنة الأصبهاني الشافعي لە (**الحجة في بيان المحجة : ٢٩٢/١**) ـدا ئەڵێت : (بەڵگە لەسەر ئەوەی قورئان هەیە لەناو موسحەفەکاندا بریتیە لە نەهیکردنی پێغەمبەر ﷺ سەفەر بکرێت بە قورئانەوە بۆ زەوی دوژمن لە ترسی ئەوەی بکەوێتە بەردەستیان .

خۆ ئەگەر لە موسحەفدا تەنها حیبر و کاغەز هەبوویایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ نەهی لەوە نەئەکرد سەفەری پێوە بکرێت بۆ زەوی دوژمن، چونکە حیبر و کاغەزەکە حورمەتێکیان نییە تا بپارێزرێت لەوەی بەردەستی دوژمن بکەوێت، جا زانرا لە موسحەفدا شتێکی خاوەن حورمەت هەیە زیاد لە حیبر و کاغەزەکە، هەربۆیە نەهی کراوە سەفەری پێوە بکرێت) هتد .

وە سەلەف عەقیدەیان وابووە ئەوەی بە حیبر نووسراوە لەناو موسحەفەکاندا و ئەبیندرێت، وە ئەوەی قورئانخوێن ئەیخوێنێتەوە، وە ئەوەی ئەبیسترێت لە قورئانخوێن، وە ئەوەی نووسراوە لە قورئان لەسەر بەرد و دار و چەرم ئەمانە هەمووی کەلامی الله عز وجل ن و غیر مخلوق ن .

بەڵام ئەشعەریەکان لەبەر ئەو ئەسڵەی دایانناوە (وە کەلامەکەی لە شوێنێک نییە خۆیی لێ نەبێت) هاتن هەموو ئەوانەیان بە مخلوق زانی، وە وتیان گوزارشتێکە لە کەلامی الله نەوەک کەلامی الله بێت .

جەهمیەکانی سەرەتا ئەیانوت مەخلوقە بەس لەگەڵیدا ئەیانوت کەلامی الله یە .

جەهمیەکانی دواتر کە ئەشعەریەکانن هەم وتیان مخلوقە، وە هەم وتیان کەلامی الله نییە بەڵکو گوزارشتێکە لێی .

وە وتەی ئەشعەریەکان (وە ئەوەش دەنگی قورئانخوێنە .

ئایا نابینی دەنگەکە باشیی و خراپیی هەیە؟ ئەوەش لەفزیەتی، ئایا نابینی پاداشت بدرێتەوە لەسەری ؟) .

وەک چۆن پێیان وابووە ئەوەی کە نووسراوە کەلامی الله نییە بەڵکو تەنها حیبرێکە، ئەوەش کە ئەیبیستن تەنها دەنگێکە و کەلامی الله نییە .

وە ئەوەی مرۆڤەکە ئەدای ئەکات لە قورئان لەڕاستیدا لە لەفزی خۆیەتی و قورئان نییە و مخلوقە چونکە پاداشتی لەسەر ئەدرێتەوە .

**وە ئەنجام و مەبەستی هەموو قسەکانیان بریتیە لەوەی کە الهروي خۆی لە کۆتاییدا ئەیلێت : (وە عەقیدەیەکان بریتیە لەوەی (قورئان بوونی نییە)، جەهمیە نێرەکان یەک جار وتیان، وە ئەشعەریە مێیەکان دە جار وتیان) .**

**واتە لەلای ئەوان قورئان شتێک نییە بنووسرێت، وە بخوێندرێتەوە، وە کاتێک گوێبیستی کەلامی الله عز وجل ئەبوون لە کەسێکەوە ئەوەیان ڕەتئەکردەوە کەلامی الله عز وجل بێت، بەڵکو ئەیانوت ئەوە دەنگی کەسەکەیە .**

**وە کاتێک قورئانیان ئەبینی نووسراوە لەسەر لاپەڕەیەک ئەیانوت ئەوە تەنها کاغەز و حیبرە، لەلای ئەوان شتێک نەبوو بەناوی قورئان لەناو موسحەفدا .**

- وە ئەڵێت : (وأولئک قالوا؛ (لا صِفةَ) : ئەوان - **واتە جەهمیەکان** - وتیان؛ (سیفەتی نییە)) .

(وهؤلاء يقولون؛ (وجهٌ) كما يُقالُ؛ وجه النهارِ، ووجهُ الأمر، ووجهُ الحديث : وە ئەمانە - **واتە ئەشعەریەکان** - ئەڵێن؛ (ڕوویەک) وەک چۆن ئەوترێت؛ سەرەتای ڕۆژ، وە حەقیقەتی بابەتەکە، وە مانای قسەکە) .

(و(عينٌ) كعينِ المتاعِ : وە (چاوێک) وەکو خودی کەلوپەلەکە) .

(و(سَمعٌ) كأُذُنِ الجدارِ : وە (بیستنێک) وەکو گوێی دیوارەکە) .

(و(بصرٌ) كما يقالُ؛ جِدَارَاهما يَتراءيان : وە (بینینێک) وەکو دوو دیوارەکەیان یەک ئەبینن، واتە بەرامبەر یەکن) .

(و(يدٌ) كيدِ المِنَّةِ والعطيَّةِ : وە (دەستێک) دەستی منەت و بەخشین) .

(و(الأصابعُ) كقولهم؛ خُراسانُ بين إصبُعي الأمير : وە (پەنجەکان) وەکو وتەکەیان خۆراسان لەژێر پەنجەکانی دەسەڵاتداردایە) .

(و(القدمان) كقولهم؛ جعلتُ الخُصومةَ تَحتَ قَدميَّ : وە (پێیەکان) وەکو وتەکەیان دوژمنداریێتیم خستووەتە ژێر پێمەوە) .

(و(القبضةُ) كما قيل; فلانٌ في قبضتي، أي; أنا أملِكُ أمرَه : وه (مشت) وەکو وتراوە فڵانە کەس لە مشتمدایە، واتە کاروباری بەدەستی منە) .

(و(الكُرسيُّ) العلم : وه (کورسی) زانستە) .

(و(العرشُ) الملك : وه (عەرش) موڵک و دەسەڵاتە) .

(و(الضَّحِكُ) الرضا : وه (پێکەنین) ڕازیبوونە) .

(و(الاستواءُ) الإستيلاءُ : وه (بەرزبوونەوە) دەستبەسەرداگرتنە) .

(و(النُّزولُ) القبولُ : وه (دابەزین) قبووڵکردنە) .

(و(الهرولة) مِثلُه : وه (ڕێکردن بە خێرایی) هاوشێوەی ئەوە) .

---

**: لەگەڵ ئەم بەشەی وتەکاندا عەرەبیەکەیمان هێناوە چونکە ئاوا تێگەیشتن لێی ئاسانترە إن شاء الله .**

**تەماشـا بکە ئەشـعەریەکان کە مێینەی زەندیقەکانن; وەکو موعتەزیلەکان ناڵێن الله عز وجل دەستی نییە، بەڵکو ئەڵێن دەستی هەیە، بەس دەست وەکو دەستی منەت و بەخشین .**

**واتە مانای دەست لە دەستێکی حەقیقیەوە ئەگۆڕن بۆ دەستێکی مەجازی .**

**لەلای سـەلەف رحمهم الله و ئەهلی سـوننە لە هەموو سـەردەمێکدا الله عز وجل دوو دەسـتی حەقیقی هەیە شـایەن بە خۆی، لە دەسـتی مەخلوقاتەکانی ناچێت و چۆنیەتی بۆ دیاری ناکرێت، دەربارەی ئەمەش چەندین بەڵگە قورئان و سـوننەت و ئاثاردا هەیە .**

**ئەشـعەریەکان وەکو جەهمی و موعتەزیلەکانی باوانیان پێیان وایە ڕووکەشـی قورئان و سوننەت کوفرە لەو بابەتەدا، یەکەمجار دێن تەشبیهـ ئەکەن، واتە دەستی الله ئەچوێنن بە دەسـتی یەکێک لە مەخلوقاتەکانی، دێن ئەڵێن الله پاک و بێگەردە لەوەی دەسـتی هەبێت چونکە ئەگەر دەسـتی هەبێت ئەوە لە دروسـتکراوەکانی ئەچێت، هەربۆیە دەسـتی حەقیقی بۆ الله عز وجل نەفی ئەکەن، پاشـان دێن ئەو ئایەت و**

**فەرموودەیانەی هاتوون تەئویلی ئەکەن و مانایەکی مەجازی بە سـیفەتە حەقیقیەکانی الله عز وجل ئەبەخشن .**

**لەمەشـدا هەر ئیشـیان پێچلێدانە، موعتەزیلەکان بە ئاشـکرا ئەڵێن الله دەسـتی نییە، ئەشـعەریەکان ئەڵێن الله دەسـتی هەیە، بەس دەسـت واتە دەسـتی نیعمەت، یان منەت، یاخود قودرەت یان بەخشین، بەم شێوەیە هەردوولا دەستی حەقیقی بۆ الله عز وجل پەک ئەخەن، وە بە هەمان شێوە بۆ سیفەتەکانی تریش .**

- وە ئەڵێت : (جا لە ڕوویەکەوە تەشـــبیهیان کرد، وە لە ڕوویەکی دیکەوە نکۆڵیان کرد، وە موخالەفەی سەلەفیان کرد، وە لە ڕووکەشی دەقەکان دەرچوون، وە ئەســـڵەکەیان ڕەت کردەوە، وە هیچیان جێگیر نەکرد، وە هیچ مەوجودێکیان نەهێشـــتەوە، وە جیـاوازیـان نەکرد لەنێوان تەفســـیر و گوزارشـــت لێکردن بە زمانەکان، جا وتیان : (تەفسیری بۆ ناکەین، بەڵکو بە عەرەبی بەڕێی ئەکەین وەک چۆن هاتووە) .

ئەم تەئویلاتە پیســـانەیان کرد، مەبەســـتیان بەم فێڵ و خۆڵکردنەچاوە ئەوەبوو موسوڵمانانی ئاسایی لێیان دوورتر بن، وە لە کاتی بیستنیدا زیاتر هەست بە نـامۆیی بکەن و لێی دوور بکەونەوە، وە درۆیـان کرد، بەڵکو تەفســـیرەکەی ئەوەیە بوترێت : (وجهٌ = ڕوویەک) .

پاشان ئەوترێت : چۆن ؟

وە (چۆن) لەم دەروازەیەدا لە وتەی موسوڵمانان نییە) .

---

**: وەکو چۆن لە کتێبی (الصفات لـــ الدارقطني) ـــدا ئیمام سـفیان بن عیینة ئەڵێت : (هەموو وەسـفێک کە الله وەسـفی خۆی پێ کردووە لە قورئان، خوێندنەوەکەی تەفسیرەکەیەتی، نە چۆنیەتی وە نە نمونە) هتد .**

**واتە چۆن خوێندرایەوە هەر ئەوە تەفسـیرەکەیەتی، کە وترا دەســـت ئیتر هەر دەست ـە، کە وترا چاو هەر چاو ـە، بەڵام بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان و نمونە بۆ هێنانەوە،**

واتە ئێمە نەزانین بەرامبەر حەقیقەت و چۆنیەتی سیفەتەکەی الله عز وجل، بەڵام نەزان نین بەرامبەر مانای سیفەتەکەی .

لێرەشدا الهروي هاتووە ئەڵێت : (تەفسیرەکەی ئەوەیە بوترێت : (وجهٌ = روویەک) .

تەواو تەفسیرەکەی هەر ئەوەیە، الله عز وجل وجە ی هەیە .

وە لەم بابەتانەدا باسی چۆنیەتی ناکرێت، چونکە عەقڵی مرۆڤەکان ناگەن بە چۆنیەتی فریشتە و جنۆکە و بەهەشت و جەهەننەم وەک خۆیان چۆن هەن چجای بگەن بە چۆنیەتی سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله عز وجل .

- لە (الحجة في بيان المحجة) دا أبو عثمان الصابوني ئەڵێت : يزيد بن هارون لە دانیشتنەکەیدا فەرموودەی إسماعيل بن أبي خالد لە قيس بن أبي حازم لە جرير بن عبدالله رضي الله عنه ی گێڕایەوە دەربارەی بینینی الله عز وجل لە بەهەشتدا، وە فەرمایشتی رسول الله ﷺ : (**ئێوە تەماشای پەروەردگارتان ئەکەن وەکو چۆن تەماشای مانگی چواردە ئەکەن**) .

پیاوێک لە دانیشتنەکەیدا وتی : ئەی أبو خالد، مانای ئەم فەرموودەیە چییە ؟

يزيد تووڕە بوو و ڕاچڵەکی وتی : (چەندە لە صبیغ ئەچیت! وە چەندە پێویستت بەوەیە ئەوەت لێ بکرێت کە بە ئەو کرا، وەیل بۆ تۆ جا کێ ئەزانێت ئەوە چۆنە ؟ وە کێ بۆی هەیە ئەو وتەیە تێپەڕێنێت کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، یان لە لەلایەن خۆیەوە قسەیەکی تیایدا بکات مەگەر کەسێک نەبێت کە خۆی تووشی گەوجێتی کردبێت و دینەکەی بە کەم تەماشا کردبێت .

کاتێک گوێبیستی فەرموودەیەک بوون لە رسول الله ـەوە ﷺ شوێنی بکەون و شتی تیادا دامەهێنن، ئەگەر شوێنی بکەون و دەمەدەمەی تیایدا نەکەن ئەوە پارێزراون، وە ئەگەر وا نەکەن ئەوە بەهیلاکچوون) .

- وە ئەڵێت : (دەربارەی گوزارشتەکە; الله تعالى فەرموویەتی : ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ﴾ (المَائِدَة : ٦٤) .

ئەوان - **واتە یەهودیەکان** - بە عیبرانی وتوویانە، الله عز وجل لێوەی گێڕاونەتەوە بە عەرەبی .

وە رسول الله ﷺ نامەی ئەنووسی بە عەرەبی کە ناو و سیفاتەکانی الله ـــی تیایدا بوو، جا گوزارشتی لێ ئەکرا بە زمانەکان، وە بە سریانی بۆی ئەنووسرایەوە، وە زید بن ثابت رضي الله عنه بۆی ئەگێڕایەوە بە عەرەبی .

وە الله تعالى بانگ ئەکرێت بە هەموو زمانێک بە ناوی خۆی جا وەڵام ئەداتەوە، وە سوێندی پێ ئەخورێت و کەسەکە پێی مولزەم ئەکرێت، وە داوای پێ ئەکرێت جا پەنای ئەدرێت، وە وەسفی پێ ئەکرێت جا ئەناسرێتەوە) .

---

**: مەبەســتی الهروي لە (تەفســیر و گوزارشــت لێکرد بە زمانەکان)، ئەوەیە کە ناوەکانی الله عز وجل، وە ســیفەتەکانی مانایەکی حەقیقیان هەیە بە نســبەت الله عز وجل ـــــەوە، وە ئەو مانا حەقیقیانە گوزارشــتی پێ ئەکرێت بە زمانەکان و هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ الله عز وجل، بۆ نمونە موســوڵمانێک کە ئەڵێت (الجبار) وە یەهودیەک ئەڵێت (جبور) هەردووکیان ناوی الله ـــیان هێناوە و ســیفەتێکیان داوەتە پاڵی بە دوو زمانی جیاواز و ناوی الجبار بە نسبەت الله عز وجل واتایەکی حەقیقی هەیە .**

- وە ئەڵێت : (پاشان وتیان : (خودی رسول الله بەڵگە نییە) .

وە وتیان : (پاش ئەوەی کە مردووە گەیەنەر نییە، هەربۆیە وەکو بەڵگە بەکارناهێندرێت) .

**٨٩٣** - لەکاتێکدا **محمد بن كعب القرظي** لە تەفسیری فەرمایشــتی الله عز وجل : ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمْ﴾ (الأنعام : ١٩) .

ئەڵێت : (هەرکەسێک قورئانی پێ بگات ئەوە محمد ی ﷺ پێی گەیشتووە).

**٨٩٤ - الهروي** ئەڵێت : (وە بە صـــحيح ــــى هاتووە لە ڕیوایەتی برید بن عبدالله بن أبي بردة بن أبي موســـى لە باپیریەوە أبي بردة لە باوکیەوە أبو موســـى الأشـــعري رضـــي الله عنه لە رســـول الله ــــــەوە ﷺ فەرموویەتی : (**یەهودی و نەسرانیەک نییە دەربارەی من ببیستێت و هەواڵی منی پێ بگات؛ وە پاشان باوەڕم پێ نەهێنێت ئیللا ئەچێتە ئاگرەوە**) .

پاشـــان ئەمەی خوێندەوە : | **وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥۚ** | **(هُود : ١٧)** .

فەرمووی : (دەربارەی من ببیستێت و هەواڵی منی بگات) .

وتەکانیان **- واتە هی ئەشعەریەکان -** کۆتاییەکەی سێ شتە :

- لە ئاسمان پەروەردگاری لێ نییە .

- وە لە الروضة دا پێغەمبەرێک ﷺ نییە .

- وە لەسەر زەوی قورئانێک نییە .

وەک چۆن یحیی بن عمار م رحمه الله بینی حوکمی بەوە ئەدا لەسەریان .

ئەگەرچی وتەکانیشـــیان بە شـــێوازێکی فێڵاوی دەربڕی و، دایانشـــارد و، خۆیان ئەدزیەوە لە وتنی بە ڕاشـکاوی؛ حەقیقەتی وتەکانیان ئەوە پێویسـت ئەکات لەسەریان .

وە لاساییکردنەوەیان پووچەڵ کردەوە، جا بەم شێوەیە باوانیان و دایکانیان و ژنەکانیان و موسوڵمانانی ئاساییان تەکفیر کرد .

وە تەماشـــاکردن و فێربوونی الکلام ــــــیان واجب کرد، وە وایان دانا دین پێویستی پێی بێت بە وتەی خۆیان، بەو شێوەیە سەلەف یان تەکفیر کرد .

وە جێگیرکردنی سـیفەتەکانیان ناو نا (تشـبیهـــــ = چواندن)، بەم شـێوەیە تانەیان دا لە قورئان و عەیبداریان کرد، وە پێغەمبەریان ﷺ بە گومڕا دانا .

زۆر بە کەمی لێیان ئەبینی پیاوێکیان خاوەن وەرع بێت، یاخود کەسێکیان شەریعەت و دین بە گەورە ڕابگرێت، یان کەسێکیان ڕێز بگرێت لە قورئان، یاخود کەسێکیان ڕێز لە فەرموودە بگرێت .

لێیان داماڵدرا تەقوا، وە نەرمی دڵ، وە بەرەکەتی پەرستن، وە هەیبەتی خشوع و ترسان .

پێغەمبەریان ﷺ وەلا نا و جیایان کردەوە، تەماشا بکە; نە بەدوای بەدەستهێنانی ئاثارەکانیەوەیەتی، وە نە شوێنکەوتەی هەواڵەکانیەتی، وە نە بەرگریکارە لە سوننەتەکەی، وە نە مەیلی هەیە بەلای ئەوەدا پێشەوای بێت .

ناوزەند ئەکرێت بە پێگە و پلەی زانستی کەچی یەک فەرموودەش نازانێت .

ئەبینیت گاڵتە ئەکات بە دین، وە نموونەی بۆ ئەهێنێتەوە، وە لاقرتێ ئەکات بە ئەهلی سوننە، وە هەر لە بنچینەوە لە زانست ئەیانکەنەدەرەوە .

بەدوای ناخی هیچ کەسێکیاندا ناڕۆیت ئیللا خیانەتت لێ ئەکات **- واتە ئەوەی ئەیلێت لەگەڵ ئەوەدا باوەڕی پێیەتی جیاوازە -**، وە لێیان ناکۆڵیتەوە دەربارەی عەقیدەیەکیان ئیللا تووشی گومانت ئەکات .

تاریکی هەوا و ئارەزوویان بەبەردا کرا و، گەورەیی هیدایەتیان لێ داماڵدرا، هەربۆیە چاوەکان ڕوویان لێ وەرگێڕان و دڵەکان پێیان گیران و توووند بوون .

وە لە نێوان موسوڵمانانـدا بڵاو بووەتەوە کە سەرگەورەکەیان علي بن إسماعيل الأشعري خۆی پاک نەئەکردەوە **- واتە پاش هاتنە دەرەوە لە تەوالێت -**، وە دەستنوێژی نەئەگرت و نوێژی نەئەکرد ) .

**٨٩٥ - زاهر بن أحمد** ئەڵێت : (شایەتی ئەدەم بەوە أبو الحسن الأشعري مرد بە سەرگەردانی و سەرلێشێوای بەهۆی بابەتی یەکسانی بەڵگەکانـەوە[1]) .

**الهروي** ئەڵێت : (كەوایە الله پاداشــتی خێری كەســێك[٢] نەداتەوە كە دركەكانی پێچا بە مەزهەبی ئیمامی المطلبي رحمه الله، كە خاوەن باشــترین دڵی دروســتكراوانی الله تعالى و، ڕاســتترین ڕێچكە و، ڕێنمونیكراوترین ڕێگا و، قووڵترین زانست بوو .

لە دوورترینیـان لە زۆرلەخۆكردن و قووڵبوونەوە و بەرزڕاگرترینیـان بوو بۆ دین.

بینیومە لێیان كۆمەڵەیەك زۆر خۆیان مـانـدوو ئەكەن هـاوشــێوەی خۆمـانـدووكردنی فریودەرێـك وەكو خەواریجەكـان بە خوێنـدەوەی قورئان و لەبەركردنی و ئەنجامدانی خەتمی زۆر، كەچی عەقیدەی بەو شـێوەیەیە كە ڕوونمان كردەوە ) .

---

**(١) بابەتی یەكســانی یان هاوئاســتی بەڵگەكان ئەوەیە كاتێك كەســێك ئەگاتە حاڵەتێك لە ســەرلێشـێواوی و دۆشـداماندا كە بەڵگەی جیاوازەكانی لایەنە جیاوازەكان بەشــێوەیەك بە یەكســان ئەزانێت كە ناتوانێت دانەیەكیان پێشــبخات بەســەر ئەوی دیكەیاندا، وە ناتوانێت عەقیدەیەكی ڕاست جیا بكاتەوە لە عەقیدەیەكی هەڵە، ئەمەش ئەوپەڕی بێبەشــبوونە لە هیدایەت، وە دووربوونە لە تێگەیشــتنێكی ڕاســت بۆ قورئان و سوننەت كە بریتیە لە تێگەیشتنی سەلەف .**

**- إبن تيمية لە (التسعينية) ــدا ئەڵێت : (وتراوە كە الأشعري لە كۆتایی تەمەنیدا دانی ناوە بە هاوئاستی و یەكسانی بەڵگەكان .**

**وە الرازي لەم بابەتەدا - واتە بابەتی مخلوقێتی جســمەكان - باســی بەڵگەی هەردوو كۆمەڵەكە ئەكات، وە لە كۆتا كتێبەكان و كۆتایی تەمەنیدا، كە كتێبی المطالب العالیة یە، دان ئەنێت بە هاوئاستی بەڵگەكاندا .**

**وە هەر لەبەر ئەمەشــە ئەوەی زاڵە بەســەر شــوێنكەتوانیدا شــك و گومانە لە ئیسلام) هتد .**

وەک چۆن کەسانێک لەم سەردەمەدا بەهۆی شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوو و، تەسلیم نەبوونیان بۆ قورئان و سوننەت و، ڕازی نەبوون بە تێگەیشتنی سەلەف بۆ دەقەکان دێن ئەشعەری و ماتوریدی و شوێنکەوتە ڕاستەقینەکانی سەلەف ئەهێننە یەک ئاستەوە و ئەڵێن هەموویان بەڵگەی خۆیان پێیە، وە دێن ئەو فەرموودەیەی رسول الله ﷺ ڕەت ئەکەنەوە کە باسی کۆمەڵەی ڕزگاربوو ئەکات لەناو **٧٣** کۆمەڵەدا، وە هەر دەق و تێگەیشتنێکی تر سەربکێشێت بۆ بەباشتردانان و پێشخستنی شوێنکەوتەڕاستەقینەکانی سەلەف بەسەر شوێنکەوتەکانی ئەرستۆ و ئەفلاتون دا .

**(٢)** مەبەستی لە أبو الحسن الأشعري و شوێنکەوتووەکانیەتی کە دێن خۆیان ئەدەنە پاڵ ئیمامی الشافعي بە درۆ و بوهتان بۆ ئەوەی ڕەواج بدەن بە عەقیدەی پڕ لە زەندەقەکەیان; وە بۆ ئەوەی بەرز ببنەوە بەهۆی بەرزی ئیمامی الشافعي; بەڵام هەتا دێت لەلای شوێنکەوتەکانی سەلەف رحمهم الله زەلیلتر و نزمتر ئەبنەوە .

**٨٩٦ - حذيفة بن اليمان** رضـي الله عنه ئەفەرموویت : (ئێمە ئیمانمان هێنا و قورئانمان نەخوێندەوە، بەڵام کۆمەڵەیەک دێن قورئان ئەخوێننەوە و ئیمان ناهێنن) .

وە إبن عمر رضي الله عنهما ئەفەرموویت : (ئیمانمان پێ درا پێش قورئان) .

**٨٩٧ - عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : (ئێمە لە سەرەتاکانی ئەم ئوممەتەین، وە پیاوی وا هەبوو لە هەڵبژێردراوانی هاوەڵانی رسـول الله ﷺ یەک سـورەتی ئەزانی، یان هاوشـێوەی ئەوە، وە قورئان لەسـەریان قورس بوو، لەگەڵ ئەوەدا زانست و کردەوەیان پێدرابوو بەو قورئانە .

وە کۆتایی ئەم ئوممەتە قورئانیان لەسـەر ئاسـان ئەکرێت هەتا کوڕ و غەیرە عەرەب ئەیخوێننەوە و هیچیشی لێ نازانن) .

- لە (الجامع لأحكام القرآن) دا عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(ئێمە لەبەرکردنی قورئان لەسەرمان قورس بوو، وە لەسەرمان ئاسان بوو کاری پێ بکەین، وە ئەوانەی پاش ئێمە لەبەرکردنی قورئانیان لەلا ئاسان ئەبێت، وە لەسەریان قورسە کاری پێ بکەن) .

ئەشعەریەکان بە گشتی لە زۆر لە بابەتە عەقیدەییەکاندا لەسەر مەنهەجی سەلەف نین، بەڵکو لەسەر موعتەزیلە و جەهمیەکانن کە سەلەف رحمهم الله بە کافرتریان زانیون لە یەهودی و نەسڕانیەکان، لێرەدا باسی چەند لادانێکی دیکەی ئەشعەریەکان ئەکەین لە عەقیدەی موسوڵمانان :

١ - پێچەوانەیی عەقیدەی موسوڵمانان و ئەشعەریەکان لە پێناسەکردنی تەوحید دا، وە تێکەوتنیان لە تەوحیدی ئولوهیەت دا بە تایبەتی؛ وە تووشبوونیان بەو شیرکەی عەرەبە موشریکەکان تووشی بووبوون و لەبەر ئەو هۆکارە پێغەمبەریان بۆ نێردرا .

٢ - هاوڕایەتی جەهمیەکان و ئەشعەریەکان لە کردنە دەرەوەی کردەوەی پەلەکان و وتەی زمان لە ئیمان .

٣ - نەفیکردنی سیفەتی العلو ی ذات ی الله عز وجل لەسەر عەرش بەسەر دروستکراوەکانیدا و موافەقەکردنی جەهمیەکان و موعتەزیلەکان لەم زەندەقەیەدا .

٤ - هاوڕابوونی جەهمیەکان و ئەشعەریە لەفزیەکان لەوەدا ئەو قورئانەی دابەزیوەتە سەر رسول الله ﷺ و لەناو موسحەفەکاندا نووسراوە ئەخوێندرێتەوە مخلوق ـە، وە جگە لە حیبر و لاپەڕە لەناو موسحەفەکاندا نییە، وە ئەوەی دابەزیوەتە سەر رسول الله ﷺ گێڕانەوەیەکە بۆ کەلامی الله عز وجل .

٥ - نەفیکردنی پیت و دەنگ لە کەلامی الله عز وجل و موخالەفەکردنی هەموو مرۆڤەکان لەو بابەتەدا نەوەک تەنها موسوڵمانان .

٦ - ماناگۆڕین و تەحریفکردنی فەرمایشتەکانی الله عز وجل و فەرموودەکانی رسول الله ﷺ لە بابەتی ئەسماء و سیفاتدا بەهۆی ئەوەی قورئان و سوننەت

ناگونجێت لەگەڵ عەقڵی پووچیاندا، لەجیاتی ئەوە عەقیدەیان لە بەناوزانستی الكلام ـەوە وەرگرتووە كە زادەی فەلسەفەی یۆنان و زەندیقەكانە .

٧ - نەفیكردنی بینینی الله عز وجل لە بەھەشتدا لەلایەن ئیماندارانەوە موافەقەكردنی جەھمیەكان لەو بابەتەدا لە پێشەكی و ئەنجامدا .

پێچەوانەیی عەقیدەی موسوڵمانان و ئەشعەریەكان لە پێناسەكردنی تەوحید ـدا، وە تێكەوتنیان لە تەوحیدی ئولوھیەت ـدا بە تایبەتی؛ وە تووشبوونیان بەو شیركەی عەرەبە موشریكەكان تووشی بووبوون و لەبەر ئەو ھۆكارە پێغەمبەریان بۆ نێردرا :

مەزھەبەكەیان لە تەوحیدی پەرستراوێتی (التوحید الألوهيّة) پوخت ئەكەینەوە لەمانەی كە دێن :

أ - ئەوان ھیدایەت نەدراون بۆ ناسینی تەوحیدی پەرستراوێتی و عیبادەت بە مانا درووستەكەی، بەڵكو ھەر باسنەكراوە لە دانراوەكانیاندا .

ب - تەوحید لای ئەوان ئەوەیە شاھیدی بدەیت بۆ الله جل عز وجل بە پەروەردگارێتی .

واتە ئەگەر كەسێک تەوحیدی ئولوھیەتی نەبێت و تەنھا تەوحیدی ربوبیەتی ھەبێت ئەوە موسوڵمانە، ھەربۆیە خۆیان جۆرەھا عیبادەت كە تەنھا ئەبێت بۆ الله عز وجل بكرێت ئەوان كەسانی دیكەش تیایدا بەشدار ئەكەن .

ئەوان بیروباوەڕیان وایە كە الإله بەمانای الآلـه دێت، وە ئیلاھییەت ئەوەیە : (توانای درووستكردن، وەک چۆن أبي حسن الأشعري و جگە ئەویش وەسفی الإله تایبەت ئەكەن بە توانای درووستكردن) .

ج - شیرک لای ئەوان شیركی پەروەردگارێتییە (الربوبيّة) .

د - سەرفكردنی عیبادەت وەک دوعا و ترس و ئومێد و خۆشەویستی وە عیبادەتە كردارییەكان كە پەیوەستن بە ئەندامەكانی لەش بۆ كەس یان شتێک نابێتە شیرک لایان ئەگەر باوەڕی وانەبوو كە سەربەخۆیانە پەرستراوەكە پەروەردگار بێت .

واتە کەسێک کە داوای یارمەتی و بەهاناوەچوون لە عبدالقادر گەیلانی ئەکات ئەوە هەر موسوڵمانە چونکە پێی وا نییە عبدالقادر پەروەردگار بێت .

بەپێی ئەم عەقیدەیە بێت کافرەکانی قورەیشیش هەر موسوڵمانن و رسول الله تەنها کاتی بەفیڕۆ داوە لە بانگەوازکردنیان چونکە ئەوانیش بۆ ئەوە ئەو بتانەیان پەرستووە لە الله نزیکیان بکەنەوە .

هــــ - شیرک لە تەوحیدی ناو و سیفەتەکان لای ئەوان ئەوەیە : جێگیرکردنی سیفەتەکانی الله وەک چۆن لە قورئان و سوننەتدا هاتووە و سەلەف لە کتێبەکانیاندا جێگیریان کردووە، وە تەوحید لای ئەوان بریتیە لە : نکۆڵیکردن و پەکخستنیان بەناوی لێکدانەوەوە کە لە ڕاستیدا بەلاڕێدابردنە و سەلەف لە جەهمیەت و زەندەقەیان داناوە .

هەر بۆیە ئەبینیت فخر الرازي کە یەکێکە لە سەرەگەورەکانی ئەشعەریەکان لە تەفسیرەکەی (٢٧/ ١٣٠) (کتاب التوحید) کە ابن خزیمة لە جێگیرکردنی سیفەتەکاندا دایناوە ناوی دەبات بە (کتاب الشرک) !

- إبن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية ١/ ٤٢٧) لە ڕەددی فخر الرازي ــدا ئەڵێت : (ئەگەر ناوی هاوەڵەکانت نابێت ئەهلی تەوحید و پاکڕاگرتن، ئەمە ئەوەیە کە موعتەزیلە نەفیکەرەکانی سیفات پەیڕەویان لێئەکرد، ئەوانە تەفسیری تەوحیدیان کردووە بە تەفسیرێک کە بەڵگەی لەسەر نیە لە کیتاب و سوننەتدا؛ وە هیچ کەسێکیش نەیوتووە لە سەلەفی ئوممەت و ئیمامەکان، بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە هەرکەسێک سیفات جێگیر بکات موەحید نیە - لەکاتێکدا ئەوە لەلای سەلەف ئەسڵی تەوحیدە - ، ئەمە شتێکە جەهمییەکان دایانهێناوە کە نە کیتاب نە سوننەت نە هیچ ئیمامێکیش نەیانوتووە، وە هەروەها تەشبیهیان بە دژی تەوحید داناوە، تەفسیری تەشبیهیشیان بە جێگیرکردنی سیفات کردووە، ئەمەش باطلە) هتد .

بەڕێکردنی سیفات لای ئەوان لەسەر حەقیقەت و ڕووکەشەکەی لە هەڵوەشێنەرەوەی تەوحیدە، لەکاتێکدا ئەوە ئەسڵی تەوحیدە لەلای سەلەفی ئوممەت، وە ئەمەش یەکێک بوو لە هۆکارەکان بۆ تووشبوونیان بە شیرک و کوفر لە تەوحیدی ئولوهیەت دا .

دواتر ئه‌وان ته‌فسیری ته‌وحیدی ئولوهییه‌ت ئه‌كه‌ن به ته‌وحیدی ڕووبییه‌ت، له كتێبه‌كانیان باسی ته‌وحیدی ئولوهییه‌ت ناكه‌ن ئه‌وه‌ی كه پێغه‌مبه‌ران پێوه‌ی هاتوون له به‌ته‌نهاگرتنی الله جل جلاله له په‌رستنید ا.

- البيهقي له (الاعتقاد والهداية في سبيل الرشاد : ص ٤٩) ئه‌ڵێت : (الله جل جلاله مانای ئیلاهییه، ئه‌ویش توانایه به‌سه‌ر هێنانه‌دی كه‌سه‌كان وه ئه‌و صیفه‌ته‌ش شایه‌نی زاتی ئه‌وه) هتد .

واته ئولوهیه‌ت به‌وه پێناسه ئه‌كات الله عز وجل خالق ه، به‌ڵام مانای ئولوهیه‌ت ئه‌وه‌یه الله عز وجل تاكه په‌رستراوی به حه‌قه و ته‌نها ئه‌بێت ئه‌و بپه‌رسترێت .

دواتر هه‌ڵوێستیان له وشه‌ی ته‌وحید (لا إله إلا الله) بریتیه له : ئه‌وه یه‌كه‌م واجب نیه له‌سه‌ر به‌نده‌كان، به‌ڵكو یه‌كه‌م واجب جێگیركردنی بوونی الله یه جل جلاله به وردبوونه‌وه و بیركردنه‌وه! به‌مه‌ش موخالـه‌فه‌ی ده‌عوه‌ی هه‌موو پێغه‌مبه‌رانیان عليهم السلام كردووه!

- ابن تيمية له (درء التعارض بين العقل والنقل : ١/٢٢٤) ـدا ئه‌ڵێت : (ئه‌وانه وشه‌ی (التوحيد، الواحد) له زاراوه‌یاندا شتێكه كه: سیفه‌تی نیه، هیچ شتێكی لێوه نازانرێت، وه نابینرێت، وه ئه‌و ته‌وحیده‌ی پێغه‌مبه‌ران عليهم السلام پێوه‌ی هاتوون هیچ شتێكی تێدا نیه له‌م نه‌فیكردنه، به‌ڵكو گرتویه‌تیه خۆی له جێگیركردنی په‌رستراوێتی بۆ الله جل جلاله به تاكوته‌نهایی، به‌وه‌ی شاهیدیی بده‌یت كه هیچ خوایه‌ک نیه جگه له ئه‌و، وه كه‌س نه‌په‌رستیت جگه له ئه‌و، وه پشت به كه‌س نه‌به‌ستیت جگه له ئه‌و، وه دۆستایه‌تیی نه‌كه‌یت جگه له‌پێناوی ئه‌و، دووژمنایه‌تی نه‌كه‌یت جگه له‌پێناوی ئه‌و، وه هیچ كارێک نه‌كه‌یت جگه له‌پێناوی ئه‌و، وه ئه‌مه‌ش له‌خۆی ئه‌گرێت جێگیركردنی ئه‌وه‌ی بۆ خۆی جێگیركردووه له ناوه‌كان و سیفه‌ته‌كان .

مه‌به‌ست له ته‌وحید ته‌نها ته‌وحیدی ڕووبییه‌ت نیه، كه ئه‌وه‌ش بیروباوه‌ڕی ئه‌وه‌ی الله جل جلاله به‌ته‌نها ئه‌م جیهانه‌ی درووستكردووه، وه‌ک چۆن گومانی ئه‌مه ئه‌به‌ن له ئه‌هلی كه‌لام و ته‌صه‌ووف، ئه‌وانه وا گومان ئه‌به‌ن كه ئه‌مه جێگیر بكه‌ن به به‌ڵگه ئیتر ئه‌وپه‌ڕی ته‌وحیدیان هه‌یه، وه ئه‌وانه وا گومان ئه‌به‌ن كاتێک شاهیدی ئه‌مه‌یان داو به‌هره‌وه‌ر بوون لێی ئیتر به‌هره‌وه‌ر بوون له ئه‌وپه‌ڕی ته‌وحیدا .

زۆرێک لە ئەهلی کەلام ئەڵێن: تەوحید ســێ مانای هەیە ئەوانیش: یەکە لە زاتی خۆیدا و دابەش نابێت و بەشی لێ نابێتەوە، وە تاکە لە سیفەتەکانی و هاوشێوەی نیە، وە تاکە لە کارەکانی و شــەریکی نیە، ئەم مانایەش کە ئەم گوزارشــتە ئەیهێنێت تیایەتی موافقی ئەوەیە رسول الله ﷺ پێوەی هاتووە، وە تیایەتی پێچەوانەی ئەوەیە رسول الله ﷺ پێوەی هاتووە، وە حەقیقەت تێیدا ئەوە نیە رسول الله ﷺ پێوەی هاتووە، بەڵکو ئەو تەوحیدەی ئەمری پێکردووە فرمانێکە ئەو ڕاستییە ئەگرێتەوە کە لەم وتارەدا هەیە، وە زیادەیەکی تر، ئەوەی لەم کەلامەدا هەیە ئەوەیە حەق تیایدا داپۆشراوە بە باطل، وە حەق شاردراوەتەوە .

هەر بۆیە ئەگەر پیاوێک دانبنێت بەوەی حەقی پەروەردگاری جیهانیانە لە ســیفات، وە پاک ڕایگبرێت لە هەمووشــتێک کە لێی بەدوورە، وە دانبنێت بەوەی کە درووســتکاری هەموو شــتێکە بە تاکوتەنها؛ نابێتە موەحید، بەڵکو ئیماندار نیە تا ئەو کاتەی شاهیدی ئەدات بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە جگە الله جل جلالە، وە دانئەنێت بەوەی الله جل جلالە تاکوتەنهایە و ئەو پەرستراوێکە کە شایەنی عیبادەت بۆ کردنە، وە پابەند ئەبێت بە پەرستنی الله جل جلالە بە تاکوتەنهایی و بێ شەریک .

وە الإلە بە واتای المألوە دێت ئەو پەرستراوەی شـایەنی پەرسـتنە، الإلە بەمانای (بەتوانا بەســەر درووســتکراوەکانیەوە) نایەت، هەرکاتێک لێکدەرەوەیەک تەفســیری الإلــە ـــــی کرد بە واتـای بەتوانـا بەســەر داهێنـانەوە وە بیروبـاوەڕی وا بوو ئەوە تایبەتمەندترین وەصــفی الإلە ـــــە، وە وایدانێت جێگیرکردنی ئەم تەوحیدە ئەوپەڕی تەوحیدە، وەکچۆن لەوانەی وایانکرد لە موتەکەلیمینی ســیفاتی، ئەمەش ئەوەیە نقڵی ئەکەن لە أبي حسن الأشعري و شوێنکەوتووەکانی، حەقیقەتی ئەو تەوحیدەیان نەناسی کە الله جل جلالە پێغەمبەرەکەی پێ نارد، لەبەر ئەوەی موشــریکینی عەرەب دانیاننا بەوەی الله جل جلالە بە تاکوتەنها درووســتکاری هەموو شــتێکە، لەگەڵ ئەوەشــدا موشریک بوون .

هەر بۆیە لە شوێنکەوتووانی ئەوانە بوون سەجدە بۆ خۆر و مانگ و ئەستێرەکان ئەبەن، وە هاواری لێ ئەکەن وەک چۆن هاوار لە الله جل جلالە ئەکەن، وە بەڕۆژوو ئەبن بۆی، وە ئاژەڵ ســەرئەبڕن بۆی، وە خۆیـان نزیـک ئەکەنەوە لێی بەوانە، دواتر ئەڵێن: ئەمە شــیرک نیە، بەڵکو کاتێک ئەبێتە شــیرک کە بیروباوەڕم وابێت کە ئەوە هەڵسوڕێنەرمە، کاتێک کردوومە بە هۆکار و نێوەند ئەوە نەبووم بە موشریک .

له‌وه‌ی پێویسته بزانرێت : له دینی ئیسلامدا ئه‌وه شیركه، ئه‌مه و نمونه‌ی ئه‌وه‌ش له‌و ته‌وحیده‌ی الله جل جلاله پێغه‌مبه‌رانی پێوه ناردووه ئه‌وان داخڵی ئه‌و ته‌وحیده‌ی ناكه‌ن كه دایانناوه) .

- له (الدرر السنية ١١٢/١) ــــدا محمد بن عبدالوهاب قســه له‌ســه‌ر مانای مه‌عبود ئه‌كات لای موته‌كه‌لیمینی ئه‌شــعه‌ریه‌كان و ئه‌ڵێت: (وه ئه‌و موته‌كه‌لیمینانه‌ی كه بانگه‌شه‌ی ئیسلام ئه‌كه‌ن به‌ڵام الله جل جلاله گومڕای كردوون له ناسینی الإله ـدا، ئه‌گێڕدرێته‌وه له الأشــعري و له‌وه‌ی شــوێنی كه‌وتووه وتوویانه : كه ئه‌و به‌توانایه، وه ئولوهییه‌ت یانی قودره‌ت .

كاتێک دانیان به‌وه نا كه ئه‌وه مانای لا إله إلا الله ـــیه ئیتر شــه‌یطان ده‌ســتی به‌ســه‌ردا گرتن، وا گومانیان برد كه ته‌وحید نایه‌ته دی ئیللا به نه‌فی ســیفات نه‌بێت، نه‌فییان كرد، وه ناوی ئه‌و كه‌سه‌شیان نا موجه‌سیمه كه جێگیری ئه‌كات!

ئه‌هلی سوننه ڕه‌دیانی داوه به به‌ڵگه‌ی زۆر، له‌وانه‌ش: ته‌وحید ته‌واو دانامه‌زرێت ئیللا به جێگیركردنی سیفات نه‌بێت، وه واتای الإله : ئه‌و په‌رستراوه) .

هه‌ر بۆیه ســه‌له‌ف ناوی دانراوه‌كانیان له جێگیركردنی صــیفاتدا ئه‌نا (كتب التوحید)، وه البخاري صــه‌حیحه‌كه‌ی كۆتایی پێهێناوه به (كتاب التوحید) دواتر سیفه‌ته‌كانی هێناوه باب به باب .

گاڵته‌جاڕی بابه‌ته‌كه ئه‌وه‌یه موته‌كه‌لیمین ئه‌ڵێن: ته‌وحید ته‌واو دانامه‌زرێت ئیللا به نكۆڵییكردنی سیفات نه‌بێت.

ئه‌هلی سوننه‌ش ئه‌ڵێن: ته‌وحید ته‌واو دانامه‌زرێت ئیللا به جێگیركردنی سیفات نه‌بێت، وه ته‌وحیده‌كه‌ی ئێوه ته‌عطیله، هه‌ر بۆیه ئه‌م وته‌یه بووه هۆی ئه‌وه‌ی هه‌نێكیان نكۆڵیی الله جل جلاله بكه‌ن، وه‌كچۆن مه‌زهه‌بی ابن عربي و ابن الفارض و خه‌ڵكانێكه كه ته‌نها الله جل جلاله ئه‌توانێت بیانژمێرێت .

ســه‌له‌ف ڕوونیانكردووه‌ته‌وه كه ئه‌گه‌ر عیباده‌ت هه‌مووشــی بۆ الله جل جلاله بێت جیا له‌هه‌موو درووســتكراوان ئه‌وه ته‌وحید درووســت نابێت ئیللا به جێگیركردنی سیفات و كاره‌كانی نه‌بێت، ڕوونبووه‌ته‌وه كه نكۆڵیكه‌ری سیفات نكۆڵیكه‌ری حه‌قیقه‌تی خوایه‌تیه به‌بێ ئه‌وه‌ی بزانێت .

وە ڕوونیانکردووەتەوە بۆت کە ئەوەی شـاهیدیی بدات بەوەی هیچ خوایەک نیە جگە لە الله جل جلالە بەڕاسـتگۆیی لە دڵیەوە، ئەوا پێویسـتە سـیفات و کارەکانی بۆ جێگیر بکات، بەڵام ئەوەی جێی سـەرسـوڕمانە ئەوەیە ئیمامە گەورەکەیان - واتا أبو الحسن الأشعري - وا گومانی برد کە ئولوهییەت بریتییە لە بەتوانایی و بەس، وە مانای وتەکەشی ئەوەیە لا إله إلا الله واتا کەس توانای نیە بەسەر درووستکراوەکانەوە جگە لە الله جل جلالە) .

## هاوڕایەتی جەهمیەکان و ئەشـعەریەکان لە کردنە دەرەوەی کردەوەی پەلەکان و وتەی زمان لە ئیمان :

مەزهەبی ئەشـعەریەکان لە ئیماندا بەڕاسـتدانانە لە دڵەوە بەتەنها، ئەگەر بێتو قسەش نەکرێت بە وشەی یەکخواپەرستی وە هەرگیز کرداریش نەکرێت بە ئەندامەکان .

پشـتگیریی جەهمییەکانیان کردووە کە لە پێناسـەی ئیماندا ئەڵێن : بەڕاسـتدانان بەتەنها بەدەر لە گوفتار و کردار .

ئیمامەکەیان الباقلاني ئەڵێت : (ئیمان هێنان بە الله جل جلالە بەڕاسـتدانانە لە دڵەوە بەوەی تاک و تەنهایە) .

واتا (بەس بزانیت یەک خوا هەیە) بەتەنها ئیتر تۆ ئیمانداریت، کەوایە ئیبلیسیش ئیماندارە پەنا بە الله جل جلالە .

- الزنجاني لە (الشـرح للمنظومة في السـنة) ئەڵێت : (مورجیئەکان : یەکێکن لە بیدعە کۆنەکان، ئەوانیش چەن کۆمەڵێکن، لەنێوانیاندا ڕاجیاوازییەکی ورد هەیە، لە وتەی هەندێکیان ئەوەیە: ئیمان وتە و باوەڕە کە ئەوە وتەی المريسي ـە، لە وتەی هەندێکی تریان ئەوەیە : ئیمان ناسـینی الله یە جل جلالە وە ئەوەش زانسـتە بە بوونی ئەوە وتەی جهم و أبي حسن الأشعري کە پیسترین وتەیە

- ابن تیمیة لە (مجموع الفتاوى) ـــدا ئەڵێت : (القاضـي أبو بكر الباقلاني وتەی جهم ـی سەرخست لە بابەتی ئیماندا بەشوێنکەوتنی بۆ أبي حسن الأشعري، وە ئەوەش زۆرینەی هاوەڵەکانی لەسەرە) .

وە ئەڵێت : (وە بەمەو جگە ئەمەش ڕوونەبێتەوە فەسادی وتەی جهم و الصالحي و وە لەوەی شوێنیان کەوتن لە ئیماندا وەک أبي حسن الأشعري لە ديارترين وتەيدا، وە زۆرينەی هاوەڵەکانی، وە کۆمەڵێک لە دوايينەکانی هاوەڵانی أبي حنيفة وەک أبي منصور الماتريدي و نمونەکانیان، بەتەنها بەڕاستدانان لە دڵەوە بەندەکان تيايدا يەکسانن) .

- عبدالله بن عبدالرحمن أبا بطين لە (الرسائل والمسائل النجدية) ـدا ئەڵێت : (مەزهەبی ئەشعەريەکان ئەوەيە (ئيمان بەتەنها بەڕاستدانانە، کردارەکانی جەستە ناچنە ناويەوە) .

ئەڵێن: ئەگەر لە فەرموودەکانی ئيمان ناوی کردارەکان هێنرا ئەوە لەسەر مەجازە لەسەر حەقيقەت نيە.

وە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەيە: ئيمان بەڕاستدانانە لە دڵەوە وە گوفتارە بە زمان وە کردارە بە جەستە، کۆمەڵێک لە زانايان ئەو کەسەيان بەکافرداناوە کە کردار لە ئيمان بکاتە دەرەوە) .

لەو کەسانەی سەلەف کە ڕۆشتوون بۆ بەکافردانانی خاوەنانی ئەم مەزهەبە :

- لە (السنة للخلال) ـدا أحمد بن حنبل ئەڵێت : (جەهمييەکان ئەڵێن کاتێک خوای خۆت ناسی بە دڵ ئەگەر کرداريش نەکەی بە جەستە، ئەمە کوفرە، ئيبليس بەڕاستی خوای خۆی ناسی، ئەڵێت : ﴿رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي﴾ (الحجر : ٣٩) .

- لە (السنة لعبدالله) ـدا وكيع ئەڵێت : (جەهمييەکان وتيان ناسين بە دڵ بەوەی هاتووە لەلايەن الله جل جلالە بەسە بۆ گوفتار و کردار، وە ئەمە کوفرە) .

- محمد بن نصر المروزي لە (تعظيم قدر الصلاة) ـدا ئەڵێت : (بەڕاستی کۆبووەتەوە لە مورجيئەکان هەموويان کە دانپێدانان بە زمان لە ئيمانە جگە کۆمەڵێک لە جەهمييەکان نەبێت کافرن لای ئێمەو مورجيئەکانيش، بەبانگەشەی خۆيان ئيمان تەنها ناسينە) .

وە بەو شێوەیەش أبو عبيد القاسم بن سلام لە کتێبەکەی **(الإيمان)** (دەروازەی هەرکەسێک ئیمان بکات بە ناسین لە دڵەوە ئەگەر کرداریش نەکات) بەکافریان دائەنێت .

## نەفیکردنی سیفەتی العلو ی ذات ی الله عز وجل لەسەر عەرش بەسەر دروستکراوەکانیدا و موافەقەکردنی جەهمیەکان و موعتەزیلەکان لەم زەندەقەیەدا :

ئەشعەریەکانی دوایین کۆکن لەسەر نەفیکردنی بڵندێتی الله جل جلاله بەڵکو هەنێکیان بە ئاشکرا ئەو کەسەیان بە کافر داناوە کە بڵندێتی الله جل جلاله جێگیر بکات.

- السجزي لە **(الرسالة إلى أهل الزبيد)** دا ئەڵێت : (موعتەزیلە نکۆڵی فەرموودەی المعراج یان کرد ئەشعەریەکان ـیش وتیان ئەوە جێگیر بووە دواتر وتیان درووست نیە وەسفی الله جل جلاله بکەیت بەوەی لە سەرەوەیە.

بەدرۆیان خستەوە ئەوەی لە فەرموودەی المعراج هاتووە.لەگەڵیان هاوڕا بوون لەگەڵ نیشاندانی ڕاجیاوازیی) .

- عبدالله أبا بطين لە **(الرسائل والمسائل)** دا ئەڵێت : (بزانە کە زۆربەی خەڵکی شوێنەکان ئەمڕۆ ئەشعەرین، وە مەزهەبیان لە سیفەتەکانی الله جل جلاله هاوتای هەندێک لەوانەیە کە موعتەزیلە جەهمییەکان لەسەرین) .

وە ئەڵێت : (ئەشعەریەکان بڵندێتی الله جل جلاله لەسەروو ئاسمانەکانەوە و بەرزبوونەوەی بۆ سەر عەرشەکەی جێگیر ناکەن، وە ناوی ئەو کەسانەی کە سیفەتی بڵندێتی و بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرش جێگیر ئەکەن ئەبەن بە موجەسیمە و موشەبیهە).

بەقسەی ئەوان بێت هاوەڵانی رسول الله ﷺ هەموویان موجەسیمە بوون وەک چۆن عز بن عبد السلام ی سوڵتانی ئەشعەرییەکان بە ئاشکرا وا ئەڵێت .

وە ئەڵێت : (وە ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەرین.

وە زۆرێك لە سەلەف بە ئاشکرا و ڕوونی هەر کەسێک سیفەتی بڵندێتی و بەرزبوونەوەی جێگیر نەکردبێت بە کافریان ناوبردووە.

وە ئەشعەریەکان پشتگیری جەهمییەکانیان کرد لە نەفیکردنی ئەو سیفەتە، بەڵام جەهمییەکان ئەڵێن الله جل جلالە لەهەموو شوێنێکە پێشیان ئەوترێت حلولییەکان) .

حلولییەکان وەك ئیبن عەرەبی و حەللاج و مەولانای ڕۆمی و بایەزیدی بەسطامی و . . . کە بیروباوەڕیان وایە پەروەردگار جل جلالە لە بەندەکانا ئەتوێتەوە، وەک هەنێک لە نەصارا موشریکەکان کە ئەڵێن پەروەردگار جل جلالە لە عیسا علیه السلام تواوەتەوە.

وە ئەڵێت : (وە ئەشعەرییەکان ئەڵێن: هەبووەو شوێن نەبووە، ئەو لە کوێ بووە پێش ئەوەی شوێن درووست بکات ؟) هتد .

جگە ئەم پرسیارە دەیەها پرسیاری تر هەیە کە شەیطان جوانی کردووە لایان سەلەف لێی بێدەنگ بوون و قسەیان نەکردووە لەسەری.

نەفیکردنی ئەشعەریەکان بۆ بڵندێتی الله جل جلالە و بەرزبوونەوەی بۆ سەر عەرشەکەی کەسێک دەمە دەمێی تێدا ناکات کە لە حەقیقەتی وتەی ئەشعەریەکان تێئەگات و تێئەفکرێت، بەڵکو ڕاشکاویان لە بەکافردانانی هەرکەسێک بڵندێتی الله جل جلالە بەسەر درووستکراوەکانیەوە جێگیر بکات .

وە بەکافردانانی کەسێک کە نکوڵیی بڵندێتیی بکات ئەوە بە شێوەیەکی فراوانە لای ئەهلی سوننە، لەو وتانەش :

- لە (معرفة علوم الحديث) دا ابن خزيمة ئەڵێت : (هەر کەسێک دان نەنێت بەوەی الله جل جلالە لەسەر عەرشەکەیەتی و بەرزبووەتەوە بۆی لەسەروو حەوت ئاسمانەکانەوە ئەوە کافرە بە پەروەردگاری خۆی، ئەبێت تەوبەی پێ بکرێت ئەگەر گەڕایەوە باشە ئەگەر نەگەڕایەوە ئەدرێت لە ملی، وە فڕێ ئەدرێتە سەر زبڵدانەکان بۆ ئەوەی موسڵمانان و پەیمانلێوەرگیراوان بێزار نەبن بە بۆگەنی کەلاکەکەی، وە ماڵەکەشی فەیئە کەس لە موسڵمانان میراتی لێ نابەن، موسڵمان لە کافر میرات نابات وەک رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت) .

- عثمان بن سعيد الدارمي لە (الرد على الجهمية) ـدا کە باسی ڕووەکانی بەکافردانانی جەهمییەکان ئەکات ئەڵێت : (بەکافریان دائەنەین لەبەرئەوەی ئەوان نازانن الله جل جلالە لەکوێیە، وە وەسفی ناکەن بەوەی (لەکوێیە ؟) الله جل جلالە بەڕاستی وەسفی خۆی کردووە بەوەی (لەکوێیە ؟) وە رسول الله ﷺ وەسفی کردووە بەوە، وە ئەمەش لە کوفرە ڕوونەکەیانە، وە هەموو قورئان ئەدوێت بە ڕەددانەوە لەسەریان، وە ئەوان ئەوە یان هەندێکیان ئەزانن، بەڵام خۆبەزلزانن و لاوازەکان فریو ئەدەن، وە کە زانیان هیچ بەڵگەیەک نیە ئیدیعاکەیان لە قورئان کشایەوە، جگە لەوە ڕێگایەک نادۆزنەوە بۆ لابردنی بنەماکان لەترسی کوشتن و ئابڕووچوون، وە ئەوان لای خۆیانەوە ئەوەی الله جل جلالە وەسفی نەفسی خۆی پێکردووە نکۆڵیکارن، لەگەڵ هەندێک لە گەورەکانیان مشتومڕمان کردووە و ئەمەمان بەڕوونی لە ئەوانەوە بیستووە، کام کوفر ڕوونترە لەوەی کە لە دەربارەی بیروباوەڕە خراپەکەیانەوە باسمان کرد ؟) .

- ابن تيمية وای دائەنێت کوفری ئەو کەسانەی نەفی بڵندێتی الله جل جلالە بەسەر دروستکراوەکانیەوە ئەکەن گەورەترە لە کوفری ئەوانەی بتەکان ئەپەرستن، لە (بيان تلبيس الجهمية) ـدا لە وتەکەیدا لەسەر ئیمامی ئەشعەریەکان فخر الرازي، ئەڵێت : (دەرئەکەوێت ئەوەی وتوویەتی بێزراوترە لەم شیرکە، لەوەی شتێک یەکسان بکرێت بە الله جل جلالە ، وەک نکۆڵیکردنی فیرعەون کە ئێوە هاوڕای بوون کە پەروەردگاری جیهانیان پەروەردگاری موسا عليه السلام لە سەرووی ئاسمانەکانەوە نیە وەک نکۆڵییەک بۆ پەروەردگاری جیهانیان کە لە ئاسمانە، ئەمە گەورەتر بوو لە شیرکی موشریکەکان کە پێشتر دانیان بەوەدا ئەنا و خواکانی تریان لەگەڵدا ئەپەرست) .

- ابن تيمية لە (درء التعارض) ـدا ئەڵێت: (وتنی ئەوەی الله جل جلالە لەسەروو جیهانەوەیە زانراوێکی پێویستیە لە قورئان و سوننەت و کۆدەنگی سەلەفی ئوممەت دوای لێوردبوونەوەی ئەوە، وە فەرموودەکان لە رسول الله ﷺ و هاوەڵان رضي الله عنهم و تابعين چەندبارەن بۆ پشتگیری ئەمە، وە بۆ ئەمەش سەلەف ڕێکبوون لەسەر بەکافردانانی ئەوەی نکۆڵی ئەمە بکات، لەبەرئەوەی لایان زانراوێکی پێویست بووە لە دین) هتد .

زانراوێکی پێویست واتا (معلوم من الدين بالضرورة) کە بۆ کەس نیە تێیدا جاهیل بێت و عوزری لێ قبوڵ ناکرێت.

- سـليمان بن سحمان له (إجماع أهل السـنة النبوية على تكفير المعطلة الجهمية) ـــدا ئه‌ڵێت : (پرسـی بڵندێتی الله جل جلاله به‌سـه‌ر درووسـتكراوه‌كانی و به‌رزبوونه‌وه‌ی بۆ سـه‌ر عه‌ڕشـه‌كه‌ی و جێگیركردنی سـیفه‌ته كه‌ماڵه‌كانی و وه‌سـفكردنی مه‌زنیه‌كه‌ی له پرسـه ئاشـكرا و دیاره‌كانن، وه له‌وانه‌ن پێویسـته بزانرێن له دینا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی الله جـل جـلالـه ڕوونـیـكـردووه‌ته‌وه له قـورئانه‌كه‌ی، وه له‌سـه‌ر زمـانـی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی، هه‌ركه‌سـێک گوێی له ئایه‌ته‌كانی قورئان و فه‌رمووده‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بێت به‌ڕاسـتیی به‌ڵگه‌ی پێ گه‌شـتووه ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر لێشـی تێنه‌گات، ئه‌گه‌ر كه‌سـێک قورئان بخوێنێته‌وه كاره‌كه‌ی گه‌وره‌تر و دڵنیاكه‌ره‌وه‌تره، ئه‌گه‌ر سـه‌رسـه‌خت بێت و بانگه‌شـه‌ی ئه‌وه بكات ئه‌مه‌ی ئه‌و له‌سـه‌ری بووه حه‌قه، وه قورئان ئه‌مه‌ی ڕوونه‌كردۆته‌وه به‌شـێوه‌یه‌كی ڕوون و ته‌واو، ئه‌مه كوفره‌كه‌ی ڕوونتره له خۆر له ناوه‌ڕاستی ڕۆژا وه كه‌سێک ناوه‌ستێت له‌سه‌ر به‌كافردانانی كه ئیسلام و حوكمه‌كانی و بنه‌ماكانی شاره‌زا بێت) .

هـاوڕابوونـی جه‌هـمیه‌كـان و ئه‌شـعه‌ریه له‌فزیه‌كـان له‌وه‌دا ئه‌و قـورئـانه‌ی دابه‌زیوه‌ته سـه‌ر رسـول الله ﷺ و له‌ناو موسـحه‌فه‌كاندا نووسراوه ئه‌خوێندرێته‌وه مخلوقـه، وه جگه له حیبر و لاپه‌ڕه له‌ناو موسحه‌فه‌كاندا نییه، وه ئه‌وه‌ی دابه‌زیوه‌ته سه‌ر رسول الله ﷺ گێڕانه‌وه‌یه‌كه بۆ كه‌لامی الله عز وجل :

- إبن تيمية له (الإسـتقامة) ـــدا ئه‌ڵێت : (ڕاجیاوازیی نیه له‌نێوان خه‌ڵكی كه یه‌كه‌م كه‌س ئه‌م قسـه‌یه‌ی داهێنا له ئیسـلامدا - واتا كه‌لامی نه‌فسـی - أبو محمد عبدالله بن سـعيد بن كلاب البصـري بوو وه له‌مه‌دا أبو الحسـن الأشـعري شـوێنی كه‌وت وه ئه‌وه‌شی ڕێبازی ئه‌مانه‌ی سه‌رخست) .

- السـجزي له (رسـالة إلى أهل زبيد) ـــدا كه پشـتگیری ئه‌شـعه‌ریه‌كان بۆ موعته‌زیله‌كان له بابه‌تی قورئاندا ده‌رئه‌خات و ئه‌ڵێت : (موعته‌زیله‌كان وتیان : سـوره‌ت و ئایه‌ته‌كان درووستكراون .

ئه‌شـعه‌رییه‌كان وتیان : قورئان كه‌لامی الله یه عز وجل، سـوره‌ت و ئایه‌ته‌كان كه‌لامی الله عز وجل نین، به‌ڵكو گوزارشتن لێی، وه درووستكراوه .

هاوڕایان بوون لەوەی وتیان کە دروستکراوە، وە بەزیادیشەوە وتیان کە ئەوە قورئان نیە وە کەلامی الله عز وجل نیە .

ئەگەر بانگەشەیان کرد کە ئەوان دانئەنێن بەوەی کە ئەوە قورئانە: پێیان ئەڵێین: ئێوە لەسەر شێوەی مەجاز دان بەوە ئەنێن، لە مەزهەبی ئێوە قورئان دروستکراو نیە، بەڵام پیتەکان دروستکراون، وە سورەتەکانیش پیتن بە کۆدەنگی، هەرکەس نکۆڵی ئەمە بکات قسەی لەگەڵ مەکەن.

کاتێک پیتەکان دروستکراو بن ڕاست نیە قورئان دروستکراو نەبێت!) .

- الزنجاني لە (الشرح للمنظومة في السنة) ــدا ئەڵێت : (عبدالله بن سعيد بن الكلاب نەصرانی بوو خەڵکی بەصرە بوو، موسڵمان بوو و جیابووەوە لە هۆزەکەی، ئەو کەسە بوو بانگەشەی ئەکرد الله عز وجل کەلامێکی نیە لێوەی ببیسترێت، وە جبريل عليه السلام هیچ گوێبیستی الله عز وجل نەبووە لەو شتانەی کە بردوویەتی بۆ لای پێغەمبەرەکانی، وە ئەوەی دابەزێندراوە بۆ سەر پێغەمبەران گێڕانەوە بووە لە کەلامی الله عز وجل، وە کەلامی الله عز وجل فرمان و ڕێگری نیە، هەواڵ نیە، لێوەی زانیوە بە واتایەکی تر، وە الله عز وجل کەلیماتی نیە، وە کەلامەکەی شتێکە سورەتی نیە، ئایەتەکان کەلیمات نین و زمانێکیش نین لە زمانەکان، لە سەرەتاوە قورئانی بەدرۆخستەوە، وە پێچەوانەی هەموو ئوممەتی کرد لە بوونی کەلامی الله جل جلاله و کتێبەکەی لەسەر زەوی، ئەو و ئەشعەرییەکان و جگە لەوانیش لە لەفظییەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کەلامی الله جل جلاله لە حەقیقەتدا نە عەرەبیە نە عیبرانیە نە سریانیە، نە هیچ زمانێکە لە زمانەکان، دروست نیە کە سورەت و ئایەت بێت، وە بەش بەش نیە، وە دروست نیە دابەزێت بۆ یەکێک لە پێغەمبەران لە حەقیقەتدا، وە بوونی نیە لە هیچ شوێنێکدا نە دڵ نە زمان نە پەڕە .

ابن فورك لە کتێبەکەی باسی کردووە : بەتەنها وتەی الأشعري کە ئەڵێت : کتێبی الله جل جلاله جگە کەلامەکەیتی، بەش بەش لە کتێبەکەدایە نەک لە کەلامدا، تەورات و ئینجیل و زەبوور ناوی ئەو گوزارشتانەیە دابەزیون و جیاوازن، وە کەلامی الله جل جلاله دروست نیە بە یەکێک ناوانە، وە هەموویان بانگەشەی ئەوە ئەکەن ڕەددی موعتەزیلە ئەدەنەوە لە خەلقی قورئاندا .

با سەیرکەر وردبێتەوە لەم بەشەی وتەکەیان بۆی ڕوون ئەبێتەوە یارییێکردنی ئەو قەومە و لاوازی دینەکەیان، هیچ ڕاجیاوازییان نیە لەگەڵ موعتەزیلە و جگە موعتەزیلەش جگە لەوانەی لە دونیادا قورئان پارێزراوە لە سنگەکان وە خوێنراوەیە بە زمانەکان، وە نوسراوەیە لە پەڕەکان، وە دروستکراوان نەیانزانیوە بە قورئانێکی تر غەیری ئەم قورئانە) .

- إبن قدامة لە (حكاية المناظرة في القرآن) دا ئەڵێت : (شوێنی ڕاجیاوازیی: ئێمە بڕوامان وایە کە قورئان کەلامی الله یە جل جلاله، وە ئەویش ١١٤ سورەتە، وە سورەت و ئایەتەکان و پیتەکان و کەلیمەکان خوێنراوەی گوێلێبووەوەی نوسراون .

وە لای ئەوان - واتا ئەشعەریەکان - : ئەم سورەت و ئایەتانە قورئان نین، بەڵکو گوزارشت و گێڕانەوەن، وە دووستکراون، وە قورئان واتایە لە نەفسی الباريء جل جلاله دا، وە ئەویش یەک شتە، دابەشناکرێت، ناژمێرێت، وە شتێک نیە دابەزیبێت، وە ناخوێنرێتەوە، وە نابیسترێت، وە نانوسرێت، وە هیچ نیە لە پەڕاوەکان جگە لە پەڕە و مورەکەب.

ئەم قورئانە موسڵمانان لەسەری کۆکن، وە کافرەکان بێ بڕوا بوون پێی، وە موعتەزیلە بانگەشەی کرد کە دروستکراوە، ئەشعەرییەکان دانیاننا بەوەی کە ئەوان هەڵەن، دواتر وتیانەوە لە سەروو ئەوانیشەوە : ئەوە دروستکراوە، قورئان نیە .

ڕاجیاوازیی نیە لە نێوان هەموو موسڵمانان ئەوەی نکۆڵی بکات لە ئایەتێک یان کەلیمەیەک کە کۆدەنگی هەیە لەسەری یان پیتێک کە کۆدەنگی هەیە لەسەری ئەوە کافرە، ئەشعەرییەکان نکۆڵی هەموویانیان کرد وە ئەڵێن : هیچ شتێک لەوە قورئان نیە، کەلامی جبریلە علی السلام، دۆستایەتی قەومێکیان کرد لەسەر وتەی خەلقی قورئان و پشتگیری موعتەزیلەیان کرد، بەڵام حەزیانکرد کە پێیان نەزانرێت، دەمەدەمێیان کرد لەسەر شتە زۆر ڕوونەکان، وە نکۆڵی ڕاستییەکانیان کرد، وە پێچەوانەی کۆدەنگییان کرد، وە قورئان و سونەتیان خستە پشتی خۆیانەوە و فەرامۆشیان کرد، وە شتێکیان وت کە کەس پێش ئەوان لە موسڵمان و لە کافر نەیوتبوو.

لە شتە سەیرەکان ئەوەیە ئەوان جورئەت ناکەن لەسەر دەرخستنی وتەکەیان، وە ئاشکرای ناکەن ئیللا لە تەنهاییدا نەبێت، ئەگەر بێتو لای وەلی ئەمر و بەڕێوەبەری دەوڵەت وتەکانیان بگێڕێتەوە کە بیروباوەڕیان وایە ڕقیان لێی ئەبێتەوەو نکۆڵی ئەکەن،

هیچ دەرناخەن ئیللا گەورەڕاگرتنی قورئان نەبێت وە هێنان بەڕوومەتی موصـحەفەکان و لەبەرهەسـتانیان لەکاتی بینینیدا، لە تەنهاییشـدا ئەڵێن: هیچی تیا نیە جگە لە پەڕە و مورەکەب نەبێت، چی شتێکی تیا بێت؟!

ئەمەش کرداری زەندیقەکانە.

لەڕاسـتییـدا گێڕامەوە ئەو گفتوگۆیەی ڕوویـدا لەنێوان من و ئەوا و لەوەی وتوویەتی، ئەمەم لێم نقـڵ کرد تورە بوو، وە بڕی، وە ئەو یەکێکە لە گەورەترین وەلی ئەمری وڵات، هیچم نەزانی بەڕوونی لە وتەکەی تا کاتێک تەنها بوومەوە لەگەڵیدا، وە وتی: ئەمەوێت پێت بڵێم زۆرترین لەوەی لە نەفسـمـدایە، وە تۆش پێم بڵێ زۆرترین لەوەی لە نەفسـتدایە، وە ڕاشـکاو بوو لاما بە وتەکەیان لەوەی لێیانەوە گێڕایەوە، کـاتێکیش نـاچـارم کرد بە هەنـدێـک ئایەت کە بەڵگەن لەسـەر ئەوەی قورئان ئەم سورەتانەیە، وتی: من ئەڵێم ئەمە قورئانە بەڵام قورئانێکی کۆن نیە .

وتم: دوو قورئانمان هەیە؟

وتی: بەڵێ، جا چی تیایە ئەگەر دوو قورئانمان هەبێت؟

دواتر تورەبوو لەوەی کە ئەم وتەم لێگێڕایەوە .

وای نازانم کۆمەڵێک هەبێت لەئەهلی بیدەع کە وتەکانیان بشـارنەوەو جورئەت نەکەن لەدەرختنی جگە ئەشعەریە زەندیقەکان نەبێت .

وتەکەیان وتەی موعتەزیلەیە بێ گومان، بەڵام ئەیانەوێت چەواشـەکاری بکەن، لە ڕواڵەتـدا وتەیەک ئەڵێن موافقی ئەهلی حەقە، دواتر خۆیـان تەفسـیری ئەکەن بە وتەی موعتەزیلە.

هەر کەس لەوان ئەڵێت : قورئان خوێنراوەیە، پارێزراوە، نوسراوە، بیستراوە دواتر ئەڵێت: قورئان لە نەفسـی الباریٔ ەو پێوەی وەسـتاوە، ئەوە نە سـورەتە و نە ئایاتە و نە پیتە و نە کەلیماتیشە.

ئەی چۆن وێنا ئەکرێت کاتێک خوێندتەوە و گوێت لێ گرت و نوسیت؟

وە ئەڵێن: موسـا علیە السـلام گوێی لە کەلامی الله جل جلالە بووە لە الله جل جلالە، دواتر ئەڵێن : دەنگی نیە.

دواتر چۆن چارەسەری ئەوە بكرێت وەهمیان بۆ عامەی خەڵكی درووستكرد بۆ بەهێزتركردنی بیروباوەڕیان كە بانگەشەی ئەو بیدعە ئەكەن لەگەورەڕاگرتنی موصحەفەكان لە ڕواڵەتدا و ڕێزگرتنیان لێی لەبەردەم خەڵكییدا.

ئەمە ئەو نیفاقەیە لەسەردەمی رسول الله ﷺ وە زەندەقەی ئەمڕۆیە ئەویش: دەرخستنی پشتگیری بۆ موسڵمانان لە بیروباوەڕیان، وە پێچەوانەی ئەمەش ئەجوڵێنەوە.

وە ئەمە حاڵی ئەو قەومەیە بێگومان، ئەوانە زەندیقن بێگومان، گومان نیە لەوەی ئەوان گەورەڕاگرتنی موصحەفەكان دەرئەخەن بەدرۆوە كە ئەوەی تیایەتی قورئانە .

وە بیروباوەڕیان وایە لە ناخەوە كە ئەوە هیچی تیا نیە جگە پەڕە و مورەكەب، وە گەورەڕاگرتنی قورئان دەرئەخەن .

وە بیروباوەڕیان وایە لە دانراو و گوزارشتی جبريل ـ عليه السلام، وە ئەوە دەرئەخەن كە موسا عليه السلام گوێی لە كەلامی الله جل جلاله لە الله جل جلاله بووە، دواتر ئەڵێن : دەنگی نیە، وە لە بانگەكان و صەڵاواتەكاندا ئەڵێن: شاهیدی ئەدەین بەوەی محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە، وە بیروباوەڕیان وایە كە پەیام و پێغەمبەرایەتییەكەی پچڕاوە بە وەفاتی، وە هیچی لێ جێنەماوە، وە ئەو لە ماوەی زیندوویێتی لە ژیانیدا پێغەمبەری خوا بووە.

حەقیقەتی مەزهەبەكەیان : هیچ پەروەردگارێک نیە لە ئاسمان، وە هیچ قورئانێک نیە لەسەر زەوی، وە محمد ﷺ پێغەمبەری خوا نیە.

لە هەموو ئەهلی بیدعەدا كەس ئەوە دەرناخات بەپێچەوانەی بیروباوەڕی خۆی وەک ئەم زەندیقانە) .

- قوام السنة الأصبهاني الشافعي لە (الحجة في بيان المحجة) ـدا ئەڵێت : (ئەشعەریەكان وتیان كەلامی الله یەک شتە، وە وتیان ئەوەی لە نێوان بەرگەكانیاندا گێڕانەوەیەكە لە كەلامی الله) .

- العمراني الشافعي لە (الإنتصار) ـدا ئەڵێت : (قورئان لەلای هاوەڵانی فەرموودە ئەو كتێبەیە كە الله تعالى دایبەزاندووەتەسەر پێغەمبەرەكەی محمد ﷺ .

ئەشــعەریەکان موافەقەیان کردین لەوەدا کە قورئان غیر مخلوق ـــــە، و ئەوەی بڵێت مخلوق ـــــە کافرە، وە ڕەددی موعتەزیلە و قەدەریەکانیان دایەوە کە ئەیانوت مخلوق ـە .

ئەوە نەبێت ئەشـعەریەکان وتیان : کەلامی ڕاسـتەقینەی الله واتایەکە پەیوەسـتە بە خۆیەوە لێی جیـا نـابێتەوە، هۆنینەوە و نوســین و بەدوایەکـدا هـاتن کەلامەکەی ناگرێتەوە، وە بە پیت و دەنگ نییە، وە الله نە بە عەرەبی قســە ئەکات بە نە غەیری ئەوە، وە داینەبەزاندووەتەسەر پێغەمبەرمان محمد ﷺ، وە ئەم سورەتانە گوزارشت و گێڕانەوەیەکە لە کەلامی الله و پێی ئەوترێت قورئان) .

وە ئەڵێت : (ئەشعەریەکان موافەقەی موعتەزیلەکانیان کرد لەوەدا ئەو قورئانەی ئەخوێندرێتەوە و بیستراوە مخلوق ـە) .

وە ئەڵێت : (ئەشـــعەریەکان بانگەشـــەی قورئان و کەلامێکیـان کرد بۆ الله کە ناچێتە عەقڵەوە، وە هیچ کەســێک لە ئەهلی میللەتەکان پێشـــیان نەکەوتووە بۆ ئەم وتەیە، هەربۆیە ڕەددانەوەیـان بۆ موعتەزیلەکـان لە خەڵقی قورئـانـدا ســـەرلێتێکدان و خۆداپۆشینێکە بە وتەی هاوەڵانی فەرمووده، مەزهەبەکەیان مەزهەبێکە سەقفی هەیە و داپۆشراوە، ناواخنەکەی ئیعتیزالە، وە ڕووکەشەکەی خۆداپۆشین و خۆشاردنەوەیە) .

- تاج الدین عبدالرحمن بن إبراهیم الفزاري الشـافعي لە (غایة السـؤل في معرفة الأصــول) ـــــدا ئەڵێت : (بەشــی دووەم لەوەی کە ئەشـــعەریەکان موافەقەی موعتەزیلەکانیان تیادا کرد : مەزهەبەکەیان بریتیە وتنی قورئان مخلوق ـــــە و زیاتر لەوەش، ئەوە نەبێت ئەوان بە قســـە شـتێکیان وت کە ئەهلی ســوننە باوەڕی پێیەتی، پاشــان گەڕانەوە بۆ وتنی قورئان مخلوق ـــــە بەڕاشــکاوی، وتیان : الله قســـەکەرە بە قسەیەکی کۆن، وە قورئان کەلامی الله یە .

پاشـــان هاتنەوە وتیان : کەلامی الله ســیفەتێکە پەیوەســـتە بە خۆیەوە، وە الله قســەی نەکردووە نە بە پیت وە نە بە دەنگ، وە ئەم قورئانە دابەزێندراوە تازە و مخلوق ـە، الله دروستی کردووە لە اللوح المحفوظ ـدا .

وە هەندێکیان وتیان : لە نووسینەی پەیامبەرەکەیەتی، ئەویش یان جبریل ـە یان محمد، وە لەم وتەیەدا شوێن ڕێچکە و ڕێبازی الوليد بن المغيرة کەوتن لە فەرمایشتی :
| إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ | (المُدَّثِّر : ٢٥) .

پاشان زیاتریان وت لەم وتەیە و لە وتەی موعتەزیلەکانیش بەوەی وتیان : ئەمەی کە دابەزیوە گێڕانەوەیەکە گوزارشتی پێکراوە لە کەلامی الله، پەیوەستە بە خۆیەوە و بۆ دروستکراوەکانی دەرناخات .

چەندەی مایەی سەرسووڕمانە ئەمەیان زانیوە بەبێ ئەوەی شتێکیان بۆ گواسترابێتەوە دەربارەی، وە بەبێ بیرکردنەوەیەک کە جگە لە خۆیان بەشداربێت لەگەڵیان، وە بە مەزهەبەکەیان موخالەفەی ڕاشکاوی قورئان و سوننەتیان کرد، وە کۆدەنگی پێشەواکانی دین و زمانەوانی و، فیقهـ و عورف و بیرکردنەوەی ڕاستیشیان کرد).

لەوانەی بەئاشکرا بەکافریان داناوە ئەوەی بڵێت قورئان گوزارشت و گێڕانەوەیە لە کەلامی الله جل جلاله :

- إبن بطـة لە (الإبانة الكبرى) ــدا ئەڵێت : (بزانن ڕەحمەتی الله تان لێبێت کە پۆلێک لە جەهمییەکان بە فێڵی دڵەکانیان و پیسی ڕایەکانیان و قێزەونی ئارەزووەکانیان بڕوایان وایە قورئان مەخلوقە، بیدعەیەکیان داهێنا لەمەدا، بۆ خۆدزینەوە لە خەڵکی، بۆ شاردنەوەی کوفرەکەیان، ئیلحادەکەیان ناڕوون ئەکەن لای ئەو کەسەی عیلمی کەم پێ بێت وە بەرگری لاواز بێت، ئەڵێن : ئەمە ئەو قورئانەیە کە الله جل جلاله قسەی پێ کردووە و وتوویەتی، ئەوە کەلامی الله ــیە جل جلالە و غەیر مەخلوقە، وە ئەوەی ئەیخوێنینەوە و تیلاوەی ئەکەین بە زمانمان و ئەینوسین لە موصحەفەکانماندا ئەوە ئەو قورئانە نیە کە کەلامی الله یە جل جلالە، ئەوە گێڕانەوەیەکە بۆ ئەوە، ئەوەی ئەیخوێنینەوە گێڕانەوەیەکە بۆ ئەوە) .

- اللالكائي الشافعي لە (شرح أصول اعتقاد أهل السنة) ــدا ئەڵێت : (سیاقی ئەوە لە بەڵگەی ئایەتەکان لە کیتابی الله جل جلاله و ئەوەی ئەگێڕدرێتەوە لە رسول الله ﷺ و هاوەڵان رضي الله عنهم و تابعين لەسەر ئەوەیە قورئان الله جل جلاله

قسەی پێکردووە بە حەقیقی، وە ئەویش دایبەزاندووەتە سەر محمد ﷺ وە فرمانی پێکردووە کە تەحەدای پێوە بکات، وە خەڵکی بۆ لا بانگ بکات، وە ئەو قورئانە لەسەر حەقیقی تیلاوەکراوە لە میحڕابەکان، پارێزراوە لە سنگی پیاوەکان، گێڕانەوە و گوزارشت نیە لە قورئان، وە ئەوەش یەک قورئانەو غەیر مەخلوقە، وە ساختە و گوماناوی نیە، بەڵکو سیفەتێکە لە سیفاتی زاتی خۆی،هێشتاش قسەکەرە پێی، وە هەرکەسێک جگە لەمە بڵێت ئەوە کافرێکی گومڕای گومڕاکەری موبتەدیعە، موخالفی ڕێبازی سوننە و جەماعەیە).

- إبن الحنبلي لە (الرسالة الواضحة في الرد على الأشاعرة) لە ڕەددانەوەیان لە بابەتی قورئاندا ئەڵێت : بزانە ئەی براکەم الله جل جلالە ئێمە و ئێوەش سەرکەوتوو بکات کە ئەشاعیرە لە هەڵوەشاندنەوەی قورئاندا ڕێگای باطنیەکان ئەگرنە بەر لە ئیلحاد و زەندەقەیدا.

جەهمییەکان لەعنەتی الله یان لێبێت کۆمەڵێک جۆری جیاوازن :

أ - تیایاندایە ئەڵێت : قورئان کەلامی الله جل جلالە نیە و مەخلوقیش نیە.

ب - وە تیایانایە ئەڵێت : قورئان کەلامی الله یە جل جلالە، وە ناڵێن: مەخلوقە یان غەیر مەخلوقە.

ج - وە کۆمەڵێکیشیان ئەڵێت : ئەوە گێڕانەوەیەکە لەو قورئانە .

ئەڵێت : ئەو کۆمەڵانە هەموویان جەهمین، وە ئەوانە کافری زەندیقن).

- إبن القيم قسە ئەکات لەسەر قورئان کە کەلامی الله یە جل جلالە، دواتر بەراوردی نێوان وتەی ئەشاعیرە و موعتەزیلەکان ئەکات، حەقیقەتی وتەی ئەشاعیرە لەو قورئانەی کە لە نێوانمانایە ئەوە مەخلوقە، ئەڵێت : (ئەڵێن: ئەو نوسراو و پارێزراو و تیلاوەکراوە گێڕانەوەیەک یان گوزارشتێکی نوسەرەکەیەتی دەری بڕیوە کە لە هەوا یان لە لەوحی مەحفوظ یان لە نەفسی فریشتەکان درووستیکردووە .

ئەوترێت : ئەوە لای ئێوە کەلامی الله جل جلالە نیە ئیللا لەسەر مەجاز نەبێت، وە ئەشزانن بەناچاری کە ئەو کەلامە عەرەبییە قورئانە، وە ئەویش کیتابی الله جل جلالە و کەلامەکەیەتی .

لای ئێوە قورئان خوێندنەوە مەحاڵە چونکە نە پیتە و نە دەنگە، بەڵکو ئەوە یەکێک شتە و سورەت و ئایەتی نیە .

الله جل جلاله ئەفەرمووێت : | وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ | (التوبة : ٦) لای ئێوە ئەوەی ئەبیسترێت کەلامی الله جل جلاله نیە بە حەقیقی بەڵکو ئەوە مەخلوقێکە کەلامی الله ی جل جلاله پێ گێڕدراوەتەوە لەسەر یەکێک لە وتەکانیان، وە گوزارشتێکە گوزارشتی کەلامەکەی پێکراوە لە وتەیەکی تریاندا، وە ئەوەش مەخلوقە لەهەردوو وتەکەیاندا، خوێنراو و بیستراو و نوسراو و پارێزراو کەلامی الله جل جلاله نین، بەڵکو گوزارشتێکە گوزارشتی پێ کردووە وەکچۆن تێئەپەڕێت لەوەی دەربڕینی نیە و قسە ناکات لە لاڵ و بێدەسەلاتەکان .

جێگای سەرسوڕمانە بڵێین ناکۆکیی لە نێوان ئەوان و موعتەزیلە دروستبووە، وە ئەڵێن - واتە ئەشعریەکان - : (ئەوەی ئێمە لەسەر مانای پەیوەست بە نەفسەوە جێگیری ئەکەین لە جۆری زانین و ئیرادەیە، وە موعتەزیلەکان دەمەدەمێ لەسەر ئەوە ناکەن، وە ئەوەی مەبەستە لەم بابەدا ئێمە ناومان ناوە کەلام، ئەوان ناوی ئەنێن زانین و ئیرادە، سەبارەت بەم داڕێژراوە عەرەبییە کە پیت و وشە و سورەت و ئایەتە، ئێمە و ئەوانیش کۆکین لەسەر ئەوەی کە مەخلوقە، بەڵام ئەوان پێی ئەڵێن قورئان، ئێمەش ئەڵێین: ئەوە گوزارشتە لە قورئان یان گێڕانەوەیەکە لێی) .

بیربکەرەوە لەم برایەتییەی لەنێوان ئەوان و ئەو موعتەزیلانەی کە سەلەف کۆدەنگ بوون لەسەر بەکافردانانیان، زیادەڕۆییان کرد بەسەروو موعتەزیلەشەوە لە یەکخستندا) .

وە ئەشعەریەکان لە کتێبەکانیادا زۆر ئاماژەیان داوە بەوەی قورئان لەلای ئەوان حیکایەت و عیبارەتێکە لە کەلامی الله، لەوانە :

- البیجوری لە شەرحی (جوهرة التوحید) ئەڵێت : (ڕێبازی ئەهلی سوننە ئەوەیە - واتا ئەشعەریەکان - کە قورئان بەمانای کەلامی نەفسی دێت و مەخلوق نیە، ئەمما قورئان بەمانای لەفظ ئەوەی ئێمە ئەیخوێنین ئەوە مەخلوقە، بەڵام خۆت بەدوور بگرە

لەوەی بڵێیت : (قورئان مەخلوقە) مەبەســـت بەوەی ئەو لەفظەی کە ئەیخوێنینەوە ئیللا لە شـــوێنی فێرکردندا، لەبەرئەوەی لەوانەیە واخەیاڵ بکرێت کە قورئان بەمانای کەلامی الله مەخلوق بێت، بۆ ئەمەشە ئوممەت ڕێگرە لە وتەی خەلقی قورئان) هتد .

بەڕاســتی ڕاشــکاون ئیمامە گەورەکانی موتەئەخیرین لەوەی کە خیلافی ئەوان و موعتەزیلە لە قورئان خیلافێکی زارەکییە تەنها، ئەگەر لە ترســـی درێژبوونەوە نەبووایە وتەکانیانم ئەگواستەوە لەم بابەتە .

بیروباوەڕیان دەربارەی ئەوەی ئەو قورئانەی دابەزێندراوەتە ســـەر پێغەمبەر و نووسراوە لە موسحەفەکاندا مخلوق ـە، وە بە حەقیقی کەلامی الله عز وجل نییە، بەڵکو عیبارەت و حیکایەتی کەلامی الله عز وجل ـە .

بەدڵنیاییەوە ئیمامەکانی ســوننە بەکافریان داناوە ئەو کەســەی نەفی حەقیقەتی کەلامی الله عز وجل بکات و بڵێت : قورئان گوزارشـــتە و گێڕانەوەیە لە کەلامی الله عز وجل، وە بە پیت و دەنگ نیە، ئەگەر لە ڕواڵەتدا بڵێن کە کەلامی الله ـــــیە ئەوە لەڕوانگەی خۆدزینەوە و چەواشەکاریەوەیە، عیبرەتیش بە حەقیقەتەکانە نەک ناوەکان.

جا هەندێک کەس لەوانەی خۆیان بە زانســت و ســەلەفیەتدا هەڵواسـیوە ئەڵێن ئەشـــعەریەکان حەوت ســـیفەتی الله عز وجل جێگیر ئەکەن، ئەمەش بۆ ئەوەی بە کافریان نەزانن یاخود بە ئەهلی سوننە و جەماعەیان بزانن .

پێش هەموو شتێک ئەوانە کە حەوت سیفەتیان جێگیرکردووە لەلایەکی دیکەوە حەفتا ســـیفەتیان پەکخســـتووە بە تەحریفاتی جەهمیەکان، ئەگەر لەبەر ئەوەی تەنها حەوت ســـیفەتیان جێگیرکردووە موســـوڵمان بن ئەوە لەبەر پەکخســـتنی ئەو هەموو سیفەتەی تر جەهمین .

وە ئایا ئەشـــعەریەکان ئەو حەوت ســـیفەتە جێگیر ئەکەن وەک چۆن ســـەلەف جێگیریان کردووە ؟ بێگومان نەخێر .

ئەشـعەریەکان بەوە ناسـراون کە لە ڕووکەشـدا هەمان وتەی ســەلەف ئەڵێنەوە بەڵام بە وتەی موعتەزیلەکان لێکی ئەدەنەوە بۆیە پێیان وتراوە زەندیقە نێرەموکەکان، واتە دێن ئەو وتەیانە ئەڵێنەوە کە ئەهلی ســـوننە ئەیڵێنەوە، بەڵام مانای ئەو وتەیانە جێگیر ناکەن .

بۆ نمونە شوێنکەوتەکانی رسول الله ﷺ ئەڵێن الله عز وجل خاوەنی سیفەتی قسەکردنە، وە هەرکاتێک بیەوێت قسە ئەکات، وە قسەکردنەکەی بە دەنگ و پیتە، وە هەر ئەمەش واتای قسەکردنە، وە ئەو قسەیەی ئەیفەرمووێت غیر مخلوق ە .

لەملاوە ئەشعەریەکان دێن ئەڵێن سیفەتی قسەکردن بۆ الله واتایەکە پەیوەستە بە خۆیەوە، وە سیفەتە نەوەک کردەوە; لەم قسەیە مەبەستیان ڕەتکردنەوەیە ئەوەیە سەلەف ئەڵێن (هەرکاتێک بیەوێت قسە ئەکات)، وە ئەڵێن الله تەنها یەکجار قسەی کردووە، وە ئەڵێن ئەو قورئانەی کە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر مخلوق ە .

دواتر ئەڵێن کەلامەکەی نە بە دەنگە نە بە پیت، پاشان ئەبینن کە ئایەتانێکی زۆر لە قورئان دژیانە، وە کۆمەڵە فەرمووده و ئاثارانێکی زۆر، ئیتر دێن ئەڵێن کەلامەکەی لە نەفسیدایەتی، وەک چۆن مرۆڤ بیربکاتەوە لە شتێک .

جا نەزانەکان بەم پێچوپەنا لێدانەی ئەشعەریەکان ئەڵێن جێگیرکردنی سیفەتی الکلام، لەکاتێکدا ئەمە فرِی بەسەر عەقڵیشەوە نییە نەوەک عەقیدەی ئەهلی سوننە .

هەربۆیە ئاگادار بە ئەشعەریەکان هەمیشە لە ڕووکەشدا لە بەشێک لە بابەتەکاندا وتەی ئەهلی سوننە دووبارە ئەکەنەوە، بەڵام کاتێک ئەچیتە ناو قوڵاییەوە لەگەڵیان هەمان عەقیدەی جەهمی و موعتەزیلەکانیان هەیە .

## نەفیکردنی پیت و دەنگ لە کەلامی اللە عز وجل و موخالەفەکردنی هەموو مرۆڤەکان لەو بابەتەدا نەوەک تەنها موسوڵمانان :

نقـڵ کراوە بەدوای یەکدا لە ئیمامەکانی موتەئەخیرینی ئەشعەریەکان لە نەفیکردنی پیت و دەنگ لە کەلامی الله جل جلاله، ئەوان کەلامێک جێگیر ئەکەن کە لە ڕاستیدا بوونی نیە، ئەویش کەلامە بەبێ پیت و دەنگ وە لەڕاستیدا کەلامی نەفسیە کە کەمێکی تر دێینە سەر وتەکەیان لە قورئاندا .

- السجزي لە (رسالة إلى أهل الزبيد) ئەڵێت: (موعتەزیلەکان وتیان: درووست نیە وەسفی الله جل جلاله بکەیت بە کەلام، وە کەلامیش بوونی نابێت ئیللا پیت و دەنگ نەبێت .

ئەشعەرییەکان وتیان : پێویستە وەسفی الله جل جلالە بکرێت بە کەلام، بەڵام ئەو کەلامە پیت و دەنگی نیە .

ئەوەیان نەفیکرد کە موعتەزیلەش نەفیکرد، ئەوەیان جێگیرکرد کە عەقڵ نایگرێت، ئەوە ڕووکەشی ڕاجیاوازییەکەیانە، لە بنەڕەتدا پشتگیری یەکترن) .

وە وتەکانیان زۆرە لە نەفیکردنی پیت و دەنگ لەوانەش :

١ - الباقلاني لە (الإنصاف) ـدا ئەڵێت : (درووست نیە سەپاندنی لەسەر کەلامی الله جل جلالە نیشانەکانی تازەیەتی لە پیت و دەنگ) .

٢ - البیهقي لە (الأسماء والصفات) دا ئەڵێت : (الباریٔ جل جلالە دەنگەژێی نیە بۆیە کەلامەکەشی پیت و دەنگی نیە) .

٣ - الجویني لە (الإرشـــاد) ــــــدا ئەڵێت : (کەلام لەلای ئەهلی حەق بەواتای پەیوەست بە نەفسەوەیە بێ پیت و دەنگ) .

٤ - ابن عطیـة لە (المحرر الوجیز) ــــــدا ئەڵێت : (کەلامی الله جل جلالە بۆ پێغەمبەر موسا ﷺ بێ چۆنێتی و بێ دیاریکردن و بێ پیتەکان و بێ دەنگەکانە، ئەوەی ڕۆچووەکان لە عیلمدا ئەیڵێن : کەلام بە واتەی پەیوەسـت بە نەفسـەوە دێت، الله جل جلالە هەستکردنێکی بۆ موسا علیه السلام یان جبریل علیه السلام درووستکردووە لە شوێنی بیستنەکەیان کە کەلامەکەی جێگیر ئەکات .

وە ئەڵێت : (بەڕاسـتی موسـا علیه السـلام گوێی لە کەلامی کۆنی الله جل جلالە بووە کە بێ پیت و بێ دەنگە) هتد .

مەبەسـتی لە (ئەوەی ڕۆچووەکان لە عیلمدا ئەیڵێن) مەبەسـتی لە ئەشـعەریە جەهمیەکان، وەک بڵێیت سەلەف رحمهم الله ڕۆچوو نەبن لە زانستدا .

٥ - القرطبي لە (المفهم في شرح مسلم) ـدا ئەڵێت : (کەلامی الله جل جلالە بێ پیتە و بێ دەنگە وەک چۆن بەڵگەی بۆهێنراوەتەوە لەشوێنی خۆیدا) هتد .

کە ئەڵێت (وەک چۆن بەڵگەی بۆهێنراوەتەوە لە شـوێنی خۆیدا) مەبەسـتی بەڵگەی قورئان و سـوننەت و ئاثاری سـەلەف نییە گومان، ئەمانە لەم بابەتانەدا زۆر دوورن لەم بەڵگانە، وە بگرە پێی کافرن، بەڵکو مەبەستیان لە بەڵگە کەلامیەکانە .

٦ - ابن حجر له (فتح الباري) ئەڵێت : (کاتێک باســی دەنگ جێگیر بوو بەم فەرمووده صەحیحانە پێویستە ئیمانمان پێی هەبێت، دواتر یان تەفویض یان تەئویل) .

وە ئەڵێت : (حەنبەلیەکان ئەوەیان جێگیر کردووە کە الله جل جلاله قســـەکەرە بە پیت و دەنگ) .

إبن حجر العسقلاني ئەوە پیشـەی بووە وەک المریسي باوە گەورەی، باوەڕی بە هەر شتێک نەبووبێت لە قورئان یان سوننەت تەفویض یان تەئویل ی کردووە .

٧ - البیجوري له (شــرح الجوهرة) دەربارەی ســیفەتی کەلامی الله جل جلاله ئەڵێت : (سیفەتێکی ئەزەلی پەیوەستە بە زاتی الله جل جلاله پیت و دەنگی نیە) .

ئیمامەکانی ســوننە بەکافریان داناوە ئەوەی نەفی پیت و دەنگ بکات لە کەلامی الله جل جلاله لەوانەش :

- عبد الله بن الإمام أحمد له (الســنة) ـــــدا ئەڵێت: پرســیارم لە باوکم کرد دەربارەی خەڵکانێک کە ئەڵێن: کاتێک الله جل جلاله قســەی لەگەڵ موســا علیه السلام کرد بە دەنگ قسەی لەگەڵ نەکرد ؟

باوکم وتی: (بەڵێ، پەروەردگارت بە دەنگ قســە ئەکات، ئەو فەرموودانە چۆن هاتوون وا وەریان ئەگرین) .

وە وتی : (فەرموودەی ابن مســعود رضــي الله عنه کاتێک الله جل جلاله قســە ئەکـات دەنگێکی لێوە دێـت وەک دەنگی بەردێـک بەســەر زنجیرێکەوە، ئەمە جەهمییەکان نکۆڵی ئەکەن .

ئەوانە کافرن، ئەیانەوێت تێکی بدەن لە خەڵک، هەرکەس بـانگەشــەی ئەوە بکات الله جل جلاله قســە ناکات کافرە، ئیللا ئەو فەرموودانە چۆن هاتوون وا وەریان ئەگرین) .

- له (درء التعارض بین العقل والنقل) ــدا المروزي ئەڵێت: گوێم لە باوکی عبد الله بوو پێی وترا کە عبدالوهاب وتوویەتی هەرکەس بـانگەشــەی ئەوە بکات الله جل جلاله قسـەی لەگەڵ موسا علیه السـلام کردووە بە بێ دەنگ ئەوە جەهمیە، دووژمنی

الله جل جلاله و دووژمنی ئیسـلامە. باوکی عبدالله زەردەخەنەیەکی کردو وتی: چەند جوانی وتووە الله جل جلاله لێی خۆش بێت) .

- الآجري لە (الشريعة) ـدا ئەڵێت : (هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات موسڵمانە و دواتر بانگەشـەی ئەوە بکات الله جل جلاله قسـەی لەگەڵ موسـا علیه السـلام نەکردووە بەڕاسـتی کوفری کردووە، داوای تەوبەی لێ ئەکرێت یان ئەگەڕێتەوە یان ئەکوژرێت .

لەبەر ئەوەی ڕەدی قورئان و نکۆڵیی کردنیەتی، وە ڕەددی سـوننەیە، وە پێچەوانەی هەموو زانایانی موسڵمانانە، وە لادانە لە حەق .

بەڵگە لەسـەریان لە قورئان الله جل جلاله ئەفەرموویێت : لە سـورەتی النسـاء | وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا | (النساء : ١٦٤) هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات الله جل جلاله قسەی لەگەڵ موسا علیه السلام نەکردووە ڕەدی دەقی قورئانی داوەتەوەو کافر بووە بە الله ی مەزن.

ئەگەر وتیـان : الله جـل جلالـە کەلامی درووسـتکردووە لە دارەکە و قسـەی پێکردووە لەگەڵ موسا علیه السلام .

پێیـان ئەڵێین : ئەمە کوفرە، لەبەرئەوەی وا دای ئەنێن کەلام درووسـتکراوە، بەرزوبڵندی بۆ الله جل جلاله لەم وتەیە، وە وای دائەنێن درووسـتکراوێک بانگەشـەی پەروەردگارێتی کردووە، ئەمە لە بێزراوترین قسەیە.

پێی ئەڵێین : ئەی مولحید ئایا درووسـتە بۆ جگە لە الله جل جلاله بڵێت (ئەوە منم الله) پەنا بە الله جل جلاله لەوەی ئەم قسەیە بکات و موسڵمان بێت، ئەمە کافرە، داوای تەوبەی لێ ئەکرێـت یـان ئەگەڕێتەوە لەو ڕێچکـە خراپەی یـان ئیللا ئیمـامی موسڵمانان ئەیکوژێت، ئەگەر ئیمامی موسڵمانان نەیکوژێت و تەوبەی نەکرد و زانرا هەر ئەوە مەزهەبەکەیەتی هەجر ئەکرێت، قسـەی لەگەڵ ناکرێت، سـەلامی لێ ناکرێت، نوێژی لە پشـتەوە ناکرێت، شـەهادەی لێ قبووڵ ناکرێت، هیچ موسـڵمانێکیش زەواجی لەگەڵا ناکات) .

- لە (الأسماء والصفات) ـدا عمرو بن عباس ئەڵێت : گوێم لە عبدالرحمن بن مهدي بوو پێی وترا جەهمیەکان ئەڵێن قورئان مەخلوقە .

ئەویش وتی : جەهمییەکان ئەوەیان ناوێت بەڵکو ئەوان ئەیانەوێت :

أ - نەفی ئەوە بکەن الرحمن جل جلالە بەرزبۆتەوە بۆ سەر عەرشەکەی.

ب - نەفی ئەوەش بکەن کە اللە جل جلالە قسـەی لەگەڵ موسا علیە السلام کردووە، اللە جل جلالە خۆی ئەفەرموویت | وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا | (النساء : ١٦٤).

ج - نەفی ئەوەش بکەن کە قورئان کەلامی اللە جل جلالە بێت.

وای ئەبینم داوای تەوبەیان لێ بکرێت، یان ئەگەڕێنەوە یان ئیللا لە گەردنیان ئەدرێت ) .

ماناگۆڕین و تەحریفکردنی فەرمایشـتەکانی اللە عز وجل و فەرموودەکانی رسـول اللە ﷺ لە بابەتی ئەسـماء و سـیفاتدا بەهۆی ئەوەی قورئان و سـوننەت ناگونجێت لەگەڵ عەقڵی پووچیاندا، لەجیاتی ئەوە عەقیدەیان لە بەناوزانسـتی الکلامـەوە وەرگرتووە کە زادەی فەلسەفەی یۆنان و زەندیقەکانە :

ئەشـعەریەکان کۆکن لەسـەر تەحریفکردنی سـیفەتەکانی اللە جل جلالە و پووچەڵکردنەوەی حەقیقەتەکانی، وە ناویان لێناوە (تأویل)، لەڕاسـتیدا بەلاڕێدابردن و بەدرۆخستنەوە و نکۆڵیکردنە لێیان .

ئەم ڕێگایان گرتەبەر لەترسـی ئەوەی لەبەردەم عام و خاصـی خەڵکییدا ئاشـکرا نەبن، واپیشـان بدەن ڕۆشتوون بۆ هێشـتنەوەی وشـەکانی دەقەکانی سیفەتەکان وەک ئەوەی هەیە، وە دەسـتیانگرت بەسـەر ماناکانیاندا بە بەلاڕێدابردن و تەئویلی داهێنراو، کە بەشـێکە لە بەدرۆخسـتنەوە، وەک ابن مندە لە (الرد علی الجهمیة) ـــدا ئەڵێت : (تەئویل لای هاوەڵانی حەدیث جۆرێکە لە بەدرۆخستنەوە) .

ئەمە وەسـێتی ئیمامە گەورەکەیانە بشـر المریسـي کە لێیەوە بەلاڕێدابردن و پەککخستنی دەقەکانی سیفەتەکانیان وەرگرتووە .

وە بەڕاسـتی ئەشـعەریەکان زۆر بەدڵسـۆزانە هەمیشـە لەهەوڵی جێبەجێکردنی وەصیەتەکەی المریسي باوە گەورەیانن .

- الدارمي له (النقض) دا ئەڵێت : (پێمانگەشتووە هەندێک لە هاوەڵانی المريسي پێیان وتووە: چی بکەین لەگەڵ ئەو سەنەدە باشانەی بەبەڵگە دەیهێننەوە دژمان بۆ ڕەددانەوەی مەزهەبەکەمان کە ناتوانین بەدرۆیان بخەینەوە ؟ وەک سفیان لە منصور لە الزهري، الزهري لە سالم، أيوب و ابن عون لە ابن سيرين، عمرو بن دينار لە جابر لە رسول الله ﷺ، ئەوەشی لەمانە ئەچێت .

المريسي وتی: ڕەدیان مەدەنەوە چونکە ئاشکرا ئەبن، بەڵام بەهەڵەیان دابنێن بە تەئویل، ئێوە ڕەدتان داوەتەوە بە نەرمی کە نەتانئەتوانی ڕەددیان بەنەوە بە توندی).

حسن البزار ئەڵێت : پیاوێک هات بۆ لای المريسي پێی وت: ئەی باوکی عبدالرحمن لای هاوەڵانی فەرموودە دائەنیشین، کاتێک فەرموودەیەک لە رسول الله ئەگێڕنەوە ڕەتی ئەکەینەوە ئەڵێن: تۆ کافریت .

وتی : بەڕاستی دابێنن، کاتێک فەرموودەیەک لە رسول الله ئەگێڕنەوە و ڕەددی ئەدەیتەوە پێت ئەڵێن تۆ کافریت

وتی : ئەی چی بکەین ؟

وتی : هەرکاتێک فەرموودەیەکیان گێڕایەوە لە رسول الله ﷺ بڵێ ڕاستەکەیت دواتر عەیبداری بکە بە عیللە، بڵێ عیللەیەکی تێدایە) .

- ابن القيم لە (الصواعق المرسلة) دا ئەڵێت : (جەهمییەکان ڕێگای براکانیان لە یەهود گرتەبەر لە بەلاڕێدابردنی ئەو دەقانەی هاتووە لە سیفەتەکان، کاتێکیش نەتوانن دەقەکانی قورئان بەلاڕێدا ببەن ئەوە ماناکانیان بەلاڕێدا ئەبەن، وە دەرگای تەئویلیان کردەوە بۆ هەموو مولحیدێک کە دین تێکبدات) هتد .

هەرکەسێک سەیری زۆربەی تەفسیرەکان و شەرحی فەرموودەکانی موتەئەخیرینی کردبێت ئەبینێت خاوەنەکانیان ڕێگای المريسي یان گرتووە لە پەکخستنی سیفەتەکانی الله جل جلاله و بەلاڕێدابردنیان لە ڕووکەشەکەیان، بەڵکو نکۆڵیکردن لەوەی هەرکەس جێگیری بکات و بڕوای بە داخوازیەکانیان بێت و وەریبگرێت لەسەر ڕووکەشەکەی.

إبن تيمية ڕوونی کردووەتەوە مەزهەبی ئەشعەریەکان لە سیفەتەکان وەک مەزهەبی جەهمییەکان وایە، وە ئەو تەئویلات و بەلاڕێدابردنانەی تیایا وەستاون و

بڵاویان کردووه‌ته‌وه‌ له‌ دانراوه‌کانیان هه‌مان ته‌ئویلاتی جه‌همیه‌کانه‌ که‌ الدارمي له‌ وه‌ڵامدانه‌وه‌ی المريسي جه‌همی کافر باسی کردووه‌.

- إبن تيمية له‌ (الفتوى الحمية الكبرى) ـــدا ئه‌ڵێت : (ئه‌م ته‌ئویلاتانه‌ی ئه‌مڕۆ هه‌ن له‌لای خه‌ڵکی، وه‌ک زۆربه‌ی ته‌ئویلاته‌کان که‌ أبو بكر ابن الفورك هێناویه‌تی له‌ کتێبی (التأويلات) وه‌ ئه‌وه‌ی أبو عبدالله محمد بن عمر الرازي هێناویه‌تی، وه‌ زۆرێک وته‌ی تر له‌ غه‌یری ئه‌وانیشـــ تیایه‌ وه‌ک: أبي علي الجبائي، عبدالجبار بن أحمد الهمذاني، أبي حســين البصــري، أبي الوفاء ابن عقيل، أبي حامد الغزالي، وه‌جگه‌ له‌وانیش، ڕێک ئه‌و ته‌ئویلاتانه‌یه‌ که‌ بشر المريسي هێناویه‌تی له‌ کتێبه‌که‌ی .

ڕوونم کردووه‌ته‌وه‌ که‌ ته‌ئویلاته‌کانیان هه‌مان ته‌ئویلاتی المريســي یه‌، به‌ڵگه‌ له‌ســه‌ر ئه‌مه‌ کتێبه‌که‌ی عثمان بن ســعيد الدارمي یه‌ که‌ دایناوه‌ که‌ یه‌کێکه‌ ئیمامه‌ به‌ناوبانگه‌کانی ســه‌رده‌می البخاري، کتێبێکی داناوه‌ به‌ناوی (رد عثمان بن ســعيد على الكاذب العنيد فيما افترى على الله في التوحيد) گێڕاویه‌ته‌وه‌ تیایدا ئه‌و ته‌ئویلاتانه‌ی به‌ چاوه‌کانی له‌ بشر المريسي به‌وته‌یه‌ک داوائه‌کات المريسي له‌وێ دابنیشێت، وه‌ زاناتره‌ به‌شـێوه‌ی مه‌نقول و مه‌عقولیش له‌چاو ئه‌و موته‌ئه‌خیرینانه‌ی له‌ڕێی ئه‌ووه‌ په‌یوه‌ستن پێوه‌ی .

دواتر عثمان بن ســعيد ڕه‌دی ئه‌مه‌ی داوه‌ به‌ وتانێک کاتێک عاقڵێکی ژیر پێی گه‌شـــت بۆی ده‌رده‌که‌وێت حه‌قیقه‌تی ئه‌وه‌ی ســـه‌له‌ف له‌ســـه‌ری بوون، و بۆی ڕوون ئه‌بێته‌وه‌ ده‌رخســـتنی به‌ڵگه‌ بۆ ڕێبازه‌که‌یان، وه‌ لاوازی به‌ڵگه‌ی ئه‌وانه‌ی پێچه‌وانه‌ی ئه‌مان ئه‌که‌ن.

دواتر کاتێک بینیت ئیمامه‌کانی هیدایه‌ت هه‌موویان کۆکن له‌ســـه‌ر زه‌می ڕێبازی المريســـية، وه‌ به‌کافریان دائه‌نێن، وه‌ به‌گومڕایان دائه‌نێن، وه‌ زانیت که‌ ئه‌و وته‌یه‌ له‌و موته‌ئه‌خیرینانه‌ بینرا ئه‌وه‌ مه‌زهه‌بی المريسية، هیدایه‌ت ڕوون ئه‌که‌نه‌وه‌ بۆ که‌سێک الله جل جلاله‌ بیه‌وێت هیدایه‌تی بدات) .

به‌کافردانانی که‌سێک له‌لایه‌ن ئه‌هلی سوننه‌ و ئه‌ثه‌ر که‌ ئه‌م ڕێیه‌ی گرتبێته‌به‌ر و وه‌سفکردنیان به‌ جه‌همی زۆره‌، له‌وانه‌ش :

١ - عثمان بن سعيد الدارمي له (الرد على الجهمية) ـــــدا لەو ڕووەی جەهمییەکان بەکافر دائەنرێن ئەڵێت : (الله جل جلاله ئەفەرمووێت : ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ (المائدة: ٦٤)، ﴿مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ (ص: ٧٥).

ئەوانە ئەڵێن : الله جل جلالە دەستی نیە، وە ئادەمی درووستنەکردووە بە دەستی خۆی، بەڵکو دەستی نیعمەت و ڕزقە، بانگەشەیان کرد لە دەستی پەروەردگارا ساویلکەتر لەوەی یەهود بانگەشەی کرد، یەهود وتیان : دەستی الله جل جلالە بەستراوەتەوە، جەهمییەکان وتیان: دەستی الله جل جلالە مەخلوقە، لەبەر ئەوەی نیعمەت و ڕزقەکان درووستکراون گومان نیە لەوەدا، ئەمەش بەهیچ شێوەیەک لە کەلامی عەرەبدا فەزڵ نیە بەڵکو ئەبێتە کوفر، لەبەرئەوەی نەگونجاوە کە بوترێت : ئادەمی درووستکرد بە نیعمەتەکەی .

وە هەروەها بەکافریان دائەنێین، بەهۆی کوفرە بەناوبانگەکەیانەوە کە ئەوان ڕوو جێگیر ناکەن بۆ الله جل جلالە، نە بیستن، نە بینین، نە زانست، نە کەلام، وە هیچ سیفەتێکی تر ئیللا بە تەئویلێکی گومڕایانە.

دەرکەوتن و عەیبەکانیان ڕوون بووەوە، ئەڵێن: بیستنەکەی و بینینەکەی و زانستەکەی و کەلامەکەی یەک مانایان هەیە، وە بە نەفسی لە هەموو شوێنێکە .

ئەمە مەزهەبە ڕوونەکەیانە لە کوفرەکانیان) .

- إبن خزيمة لە (كتاب التوحيد) ـدا ئەڵێت : (دەروازەی جێگیرکردنی بیستن و بینینی الله وەک چۆن خۆی وەسفی خۆی کردووە کە بیسەر و بینەرە، هەرکەسێکیش پەرستراوەکەی غەیری بیسەر و بینەر بێت، ئەوە کافرە بە الله ی بیسەر و بینەر، جگە لە الخالق البارئ ئەپەرستێت کە بیسەر و بینەرە) .

- لە (العلو للعلي الغفار) ـــــدا محمد بن إسحاق السراج ئەڵێت: هەر کەس دانەنێت و ئیمانی بەوە نەبێت کە الله جل جلالە عەجیبی لێ دێت، پێئەکەنێت، وە هەموو شەوێک دائەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیاو ئەفەرمووێت : (کێ داوام لێ ئەکات پێی ببەخشم)، ئەوە زەندیقە، کافرە، داوای تەوبەی لێ ئەکرێت، یان ئەگەڕێتەوە یان ئەدرێت لە گەردنی، وە نوێژی لەسەر ناکرێت، وە لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێت) .

- لە (الدرر الســنية) ـــــدا عبدالرحمن بن حســـن ئەڵێت : (ئەو کۆمەڵەی پاڵئەدرێت بۆ لای أبي حســن الأشــعري وەســفی پەروەردگاری جیهانیانیان کردووە بە ســیفاتی نەبوو و بێ گیانەکان، گەورەترین درۆیان هەڵبەســت لەســەر الله جل جلالە، پێچەوانەی ئەهلی حەقیان کرد لە سەلەف و ئیمام و شوێنکەوتووەکانیان .

ئەم کۆمەڵە لایانداوە لە حەق، شــەیطانەکانیان ڕووتکراونەتەوە بۆ ئەوەی ڕێگریی لە خەڵک بکەن لە ڕێگای الله جل جلالە ، نکۆڵی تەوحیدی الله یان جل جلالە کرد لە ئولوهییەتدا، وە ڕێگایاندا بە شــیرکێک کە الله جل جلالە لێی خۆش نابێت، ڕێگایاندا جگە لەو بپەرســترێت، وە نکۆڵی تەوحیدی ســیفاتیان کرد بە تەعطیل، ئیمامەکانی ئەهلی ســوننەو شــوێنکەوتووانیان دانراوی ناســراویان هەیە لە ڕەدی ئەم کۆمەڵە کافرە کەللەڕەقە) .

- إبن البدران لە (المدخل إلى مذهب الإمام أحمد) دا ئەڵێت : (کاتێک کتێبەکانی ئەوانە ئەبینیت کە بانگەی ئەشاعیرە ئەکەن ئەو کتێبانە ئەبینیت کە لەسەر مەزهەبی أرسطاطاليس و لەوەشی شوێنی کەوتوون وەک ابن سينا و الفارابي، وە کتێبەکانیان ئەبینیت ناونیشانەکەی عیلمی تەوحیدە و ناوەڕۆکەکەی جۆرێکە ناوبراوە بە ئیلاهییەتی فەلسەفە، ئەگەر تۆ گومانت هەیە لەوەی وتمان، سەیری (المواقف) ی عضدالدين الإيجي و شەرحەکەی الجرجاني بکە، وە ئەوەشی لەسەریەتی لە پەراوێزەکان، دواتر وردبەرەوە لە کتێبی (الإشارات) و (الشفا) ی ابن سينا، وە شەرحەکانی سەرەتا، هەموویان لە یەک دۆڵ ئەدۆزیتەوە جیاوازیی نیە لەنێوانیان جگە لە دەرخستنی ناوی موعتەزیلە و جەبریە و جگە لەوانیش، ئایا ئەکرێت تەوحید لەو کتێبانە وەربگیردرێت ئیللا دوای کەوتنە ناو هەزاران دووفاقییەوە نەبێت، دواتر ئەگەر ڕێبوار لەم ئاستەنگانەش سەلامەت بێت، ئەوا تەوحیدێکی لە جۆری تەوحیدی فەلاسیفە و مولحیدەکان بەدەستهێناوە) .

نەفیکردنی بینینی الله عز وجل لە بەهەشـــتدا لەلایەن ئیمانداراناوە موافەقەکردنی جەهمیەکان لەو بابەتەدا لە پێشەکی و ئەنجامدا :

- السـجزي لە (الرســالة إلى أهل الزبيد) ـــــدا ئەڵێت : (سـەبارەت بە پشـتگیرییەکانیان بۆ موعتەزیلە؛ ئەگەر موعتەزیلەکان وتبێتیان: درووســت نیە بینینی الله جل جلالە بە چاوەکان، وە ئەو دیار نیە.

ئەوا ئەشعەرییەکان ئەڵێن: ئەو دیارە، وە نابینرێت بە چاوەکان لە بەرامبەردا .

ڕاجیاوازییان دەرخست و هاوڕاشیان بوون) .

- إبن تيمية لە (بيان تلبيس الجهمية) ـــــدا ئەڵێت : (ئیمامەکانی دواینی ئەشعەریەکان وەک أبي حامد الغزالي و ابن الخطيب - الرازي - و جگە لەوانیش کاتێک لێیان وردئەبیتەوە لە بینینی الله جل جلالە گەڕاونەتەوە بۆ وتەی موعتەزیلەکان یان نزیکتر لەوەش وە لێکیان داوەتەوە بە زیادەی عیلم وەک چۆن لێکیانداوەتەوە بەمە جەهمییەکان و موعتەزیلەکان و جگە لەوانیش، ئەمەش لە حەقیقەتدا پەکخســتنی بینینی الله یە جل جلالە کە جێگیر بووە بە دەقەکان و کۆدەنگی) .

وە ئەڵێت : (وتەی بینینی الله جل جلالە لەگەڵ نەفیکردنی بڵندێتی الله جل جلالە لەســەروو جیهانەوە نەزانراوە جگە لەم کۆمەڵە ـــــیەوە نەبێت، وە ئەوانیش کۆمەڵێک شوێنکەوتەی الأشعري ـن لەوانەی پشتگیری ئەکەن .

هەر بۆیە ئەبینیت ئەوانە بینینی الله جل جلالە جێگیر ئەکەن بەبێ بڵندێتی لەکاتی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەدا ئەبینیت مونافیقانن لەگەڵ ئەهلی ســوننە و جێگیرکردن، ئەو بینینەشــی جێگیری ئەکەن لێکی ئەدەنەوە بەوەی کە موعتەزیلە و جگە لەوانیش لە جەهمییەکان لێکیئەدەنەوە، ڕاجیاوازییان لەگەڵ موعتەزیلە و هاوشــێوەکانی درووســتکردووە، وای دەر ئەخەن ڕەدیان ئەدەنەوەو هاوڕای ئەهلی ســوننە و جەماعەن لە جێگیرکردنی بینینی الله جل جلالە، لەکاتی بەدواداچووندا دەرەکەوێت ئەوان پشــتگیری موعتەزیلەن، بەڵکو جێگیری ئەکەن لەمەدا هاوشــێوەی ئەوەی موعتەزیلە جێگیریان کردووە بە زیادەی عیلم، وە هاوشــێوەی ئەوەی کە موعتەزیلە ئەیڵێت لە بینینی الله جل جلالە، یان نزیکتر لەوەش ئەڵێن، هەر بۆیە فخر

الرازي دانی پێ ئەنێت کە ناکۆکی نێوان ئەوان و موعتەزیلە لە بابەتی بینینی الله جل جلالە زارەکییە.

زانراوە ئا ئەوانە حەقیقەتی ناخیان ناخێکی موعتەزیلی جەهمی پەکخەری سیفەتەکانی الله ــیە جل جلالە، ئەگەر بێتو ڕواڵەتیشیان ڕواڵەتی ئەهلی جێگیرکردنی ســیفەتەکاتی الله جل جلالە بێت وەک چۆن موعتەزیلەکان لە کاتی بەدواداچوونی حەقیقەتی کارەکەیان کاری مولحیدە نەفیکەرەکانی ناو و ســیفەتەکانی الله جل جلالە بەتەواوی دەبینیت، ئەگەر بێتو وا خۆشیان نیشان بدەن ڕەدیان ئەدەنەوە، حەقیقەتی کاری مولحیدەکان نکۆڵیکردنە لە دروستکەرەکە بە تەواوی) .

- عبدالله بن عبدالرحمن أبا بطين لە (الرسائل والمسائل النجدية) ـدا ئەڵێت : (ئەشــعەرییەکان هاوڕای ئەهلی ســوننەن لەوەی ئیمانداران پەروەردگاری خۆیان ئەبینن لە بەهەشــتدا، دواتر ئەڵێن : مانای بینین: ئەوە زیادەی عیلمە الله جل جلالە درووستی ئەکات لە دڵی سەیرکەرەکەدا بە بینینی، بینینی حەقیقی چاوەکان نیە، ئەوانە بە ئەمە نەفیکەرن بۆ ئەو بینینەی بەڵگەی لەســەرە لە قورئان، وە لە فەرموودەکان کە بە فراوانی هاتووە لە رسول الله ـەوە ﷺ) هتد .

پێشــەوایانی ســوننە و ئەثەر ئەو کەســەیان بە کافر داناوە کە نەفی ســەیرکردنی ئیمانداران بۆ پەروەردگاری خۆیان بکات بە بینینێکی حەقیقی .

- لە (منختب العلل) ـــــدا المروزي ئەڵێت : (وترا بە باوکی عبدالله : تۆ ئەزانیت لەوەی يزيد بن هارون لە أبي العطوف لە أبي الزبير لە جابر: ئەگەر شوێنەکە جێگیر بوو ئەوا ئەمبینیت، ئەگەر جێگیر نەبوو ئەوا نامبینیت نە لە دوونیا نە لە ئاخیرەتیش ؟

بــاوکی عبــدالله تورە بوو تورەبوونێکی تونــد، تــا بە دەموچــاوییەوە دەرکەوت، دانیشــتبوو و خەڵکیش لە دەوری بوون، نەعلەکەی هەڵگرتو لەپێی کرد، وە وتی: (الله جل جلالە ئەمە ڕیســوا بکات، نابێت ئەمە بنوســرێت)، وە نکۆڵی کرد لەوەی يزيد بن هارون ئەمەی گێڕابێتەوە یان قسەی پێ کردبێت .

وە وتی : (ئەمە جەهمیە، ئەمە کافرە، الله جل جلالە ئەم پیســە ڕیســوا بکات، هەرکەس بڵێت : الله جل جلالە نابینرێت لە ئاخیرەتدا، ئەوە کافرە) .

- إبن تيمية له (بيان تلبيس الجهمية) ـــــدا ئەڵێت : (بە ســـوننەتێكی متواتر و كۆدەنگی ســـەلەفی ئوممەت و پێشـــەواكانی لە هـاوەڵان و تـابعين و لەوانەی دوای ئەوانيش لە پێشـــەوايانی ئيســلام ئەوانەی باوەڕيان پێ ئەكرێت لە دينەكەيان الله جل جلاله ئەبينرێت لە ئاخيرەتا بە چاوەكان، وە بابەتی بينينی الله جل جلاله يەكێك بووە لە گەورەترين بابەتە جياكەرەوەكانی نێوان ئەهلی ســوننەی جێگيركەر و جەهمييەكان، تا ئەوەی زانايانی ئەهلی حەديث و ســـوننە كتێبيان داناوە لەســـەر جێگيركردنی، وە ئەڵێن: كيتـابی (بينينی الله جـل جلالـە و ڕەددانەوەی جەهمييەكان) وە هەروەها ئەو فەرموودانەش كە نكۆڵی لێ ئەكەن جەهمييەكـان لە فەرموودەكـانی بينينی الله جـل جلالە و ئەوەی لەدوای دێت وە هەر كەسێكيش نكۆڵی بينينی الله جل جلالە بكات بە پەككەر]هەژمار ئەكرێت).

- العمراني الشافعي لە (الرد على المعتزلة) ـــدا ئەڵێت : (باسمان كرد ئيمانداران الله عز وجل ئەبينن لە قيامەتدا بە چاوەكانيان، وە كافرەكان نايبينن .

موعتەزيلەكان وتيان ڕێگەپێدراو نييە الله وەسف بكرێت بەوەی ئەبيندرێت .

وە ئەشـــعەريەكان وتيان ئيمانداران ئەبينن بەڵام بە بينينێك نا لە بەرامبەريان بێت .

بەڵگە بۆ پووچەڵكردنەوەی وتەی ئەشـــعەريەكان ئەوەيە كە شـــەرع هاتووە بە جێگيركردنی بينينی الله عز وجل بە چاوەكان، جا ئەو بينينەش ئەخرێتەســـەر بينينی ئاسايی و باو، ئەوەش بەشێوەيەكە لەبەرامبەردا بێت، بە بەڵگەی فەرمايشتی پێغەمبەر : (وەك چۆن مانگی چواردە ئەبينن)، ئەمەش دياريكردن و جسم دانان بۆ الله پێويست ناكات، وەك چۆن زانست هەبوون پێی دياريكردن و جسم بۆ دانان پێويست ناكات .

خۆ ئەگەر بڵێن بينين هەر تـايبەت نييە بە چـاو، ئەوە گەڕاونەتەوە بۆ وتەی موعتەزيلەكان لە نەفيكردنی بينينی الله عز وجل ـــــدا، وە مەبەســـت بە بينين زانســـت هەبوونە پێی بە زانســـتێكی زەروری، وە گێڕدراوەتەوە لە يەكێـك لە دواييينەكـانی ئەشـــعەريەكـان وتوويەتی : ئەگەە لەبەر شـــەرم كردن نەبێـت لە موخـالەفەكردنی شێخەكانمان ئەوە ئەموت بينين هەر بريتيە لە زانست .

وە هەر بەم شێوەیەش قسەیان کرد دەربارەی بیستنی کەلامی الله لەلایەن موسی ـــــوە کە تایبەت نییە بە گوێ و بیســـتن، جا خۆ ئەگەر تایبەت نەبێت بە گوێ ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ مانای زانست .

وتەکانی ئەشـعەریەکان لەسـەر بنچینەی موعتەزیلەکان جێگیرکراوە، چونکە أبو الحســـن خۆی موعتەزیلی بوو) .تەماشـــای تەکفیری ســـەلەف بکە بۆ کەســـێک نکۆڵی بینینی الله جل جلاله بکات و ناوهێنانیان بە جەهمی و زەندیق لە کتێبی (الســـنة) ی عبدالله بن الإمام أحمد بابی (پرســـیار کراوە دەربارەی ئەوەی جەهمیە گومڕاکان نکۆڵی لێ ئەکەن لە بینینی الله جل جلاله لە ڕۆژی قیامەت) .

چ فیرقەیەک تیـایـدا کۆببێتەوە ئەم هەموو بیروبـاوەڕە کوفریە ئەوە کـافرە لای پێشـــەوایانی ســـەلەف و ســـوننە هەر ناوێکی هەبێت وە بۆ لای هەر مەزهەبێکیش پاڵدرا بێـت، عیبرەت بەو حەقیقەت و بیروبـاوەڕانەیە کە بـاوەڕیـان پێیەتی و دینـداری پێوە ئەکەن نەک بە ناوەکان، ئەگەر دەمەدەمێ دەربارەی فیرقەیەک لە فیرقەکان هەبێت لە تەبدیعیاندا یان لە تەکفیریاندا تەنها لەســـەر ناوەکەی ئەوە هیچ شـتێک پێش و پاش نـاخـات لە گۆڕینی حوکم و حەقیقەتەکـان، ئەوە ئاژاوەچیەکـان لێی دەرنـاچن بە ئەنجـامێکی ڕازیکەر، بەتـایبەتی کە زۆربەی ئەم فیرقە دوایـنـانە تیـایـانـدا کۆبووەتەوە زۆرێـک لە مەزهەب و وتە بیـدعی و کوفرییەکـان، بۆیە جەهمی، قەدەری، صـــۆفی، ئەشعەری، مورجیئە، خاریجی و هەموو بەڵاکان ئەدۆزیتەوە لەناویان.

وە مەســـەلەی تەکفیری هەنـدێـک لە فیرقە و شـــەخصـــەکـان ئەو ڕووداوەم بیرئەخاتەوە کە ڕوویدا بەسەر أبي إسماعیل الهروي خاوەنی کتێبی (ذم الكلام) کاتێک ئامادەی مەجلیســی وەزیر بوو، بۆیە نەیارەکانی ویســتیان بکەونە نێوان ئەو و وەزیرەوە، پرسیاریان لێکرد دەربارەی بەئاشکرا لەعنەت کردن لە الأشعري و نکۆڵیکردن لە خۆی و شوێنکەوتووانی.

- (ذیل الطبقات الحنابلة) لە إبن طاهر ئەڵێت : (گوێم لە أحمد بن أمیرجه القلانسي خزمەتکاری الأنصاري بوو ئەیوت : ئامادەبووم لەگەڵ شێخ بۆ سەلام کردن لە وەزیر أبي علي الطوســي، هاوەڵەکانی ئەویش ڕایانســپارد بچێتە دەرەوە بۆ لای، ئەمەش دوای میحنەت وە گەڕانەوەی لە بەلخ بوو، کـاتێـک چووە لای ڕێزی گرت و بە گەورە ڕایگرت، وە لەو ڕۆژەدا لە ســەرگەورەی دوو کۆمەڵ هەبوون، یەکیانگرت لەســەرئەوەی

پرسیاری لێبکەن لەو مەسەلەیە لەبەردەم وەزیردا، ئەگەر وەڵامی دایەوە بە وەڵامدانەوەی هەرات لەبەرچاوی وەزیر ئەکەوێت، ئەگەر وەڵامیشی نەداوە لەبەرچاوی هاوەڵەکان و ئەهلی مەزهەبەکەی ئەکەوێت.

کاتێک چووە ژوورەوەو دانیشت، پیاوێکی لە هاوەڵانی الإمام الشافعي بۆ دیاریکرابوو، ئەناسرا بە العلوي الدّبوسي، وتی: ڕێگەم ئەدەیت ئەی شێخی پێشەوا پرسیاری بابەتێکت لێبکەم؟

وتی : (بپرسە) .

وتی : بۆچی أبا الحسن الأشعري بەلەعنەت ئەکەیت؟

بێدەنگ بوو، کاتێک چەند ساتێک تێپەڕی، وەزیر پێی وت : وەڵامی بەرەوە.

وتی: (من الأشعري ناناسم! بەڵکو لەعنەتم کردووە لە کەسێک کە باوەڕی بەوە نەبووە الله جل جلاله لە ئاسمان بێت، وە قورئان لە موصحەفدا بێت، وە پێغەمبەر ئەمڕۆ پێغەمبەر بێت) .

دواتر هەستا و ئەوێی بەجێهێشت، یەک کەسیش نەیتوانی قسە بکات بە وشەیەکیش لە هەیبەت و توندی و زاڵێتی ئەو .

وەزیر وتی بە پرسیارکەر و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون : ئەمەتان ئەویست؟ ئێمە بیستبوومان کە ئەمەی وتووە لە هەرات، وازتان نەهێنا تا گوێمان لێ بوو بە گوێیەکانمان، چی لێ بکەم؟!) .

شایەنی باسە ئەشعەریەکان لە بابەتی قەدەریشدا هەر لەسەر عەقیدەی جەهمیەکانن، پێیان وایە الله عز وجل بەزۆر کار بە بەندەکانی ئەکات و مرۆڤەکان هیچ ویستێکیان نییە .

وە نەفی حیکمەت و سەبەبیەت لە کارەکانی الله عز وجل ئەکەن، واتە پێیان وایە الله عز وجل لەبەر حیکمەتێک کار ناکات بەڵکو هەر بە هەوانتە کار ئەکات.

وە پێیان وایە عەقڵ بە هیچ شێوەیەک بەباشدانان و بەخراپدانانی نییە، واتە عەقڵ ناتوانێت بزانێت دزیکردن یان زیناکردن یاخود هەرکارێکی دیکە خراپە هەتا شەرع بۆی دیاری نەکات خراپە، ئەمەش پێچەوانەی عەقڵی سەلیمە .

**ئەمانە و چەندین کوفر و گومڕایی و زەندەقەی دیکەیان لە بابەتەکانی دیکەی دین و بەتایبەتیش تەوحیدی ربوبیەت و ئولوهیەت دا هەیە، جا ئێمە بە هیچ شێوەیەک حساب بۆ ئەوە ناکەین خاوەنی ئەم عەقیدە بۆگەنانە کێن و چین و بە کێ ناسراون و بە کێ خۆیان ئەناسێنن، بەڵکو عیبرەت بە ناوەڕۆک و عەقیدەیە نەوەک ئەو بانگەشەیەی خاوەن ئەم عەقیدەیە ئەیکەن .**

## وه له بەهیلاکبەرەکان لەسەر زمانی المصطفى ﷺ : (سەرسام بوونی هەموو خاوەن بۆچوونێك بە بۆچوونەکەی، وە هەوا و ئارەزوویەکی شوێنپێهەڵگیراو)

٨٩٨ - أبو أمية الشعباني ئەڵێت : هاتین بۆ لای أبو ثعلبة الخشني رضي الله عنه پێم وت : چی ئەڵێیت دەربارەی ئەم ئایەتە ؟

وتی : کام ئایەت ؟

وتم : فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾ (المائدة : ١٠٥) .

وتی : والله پرسیارت دەربارەی کرد لە کەسێکی شارەزا، پرسیارم کرد لە رسول الله ﷺ دەربارەی، فەرمووی : (فەرمان بکەن بە چاکە و ڕێگری بکەن لە خراپە هەتا ئەوکاتەی ڕەزیلیەکی بەگوێکراو و هەوا و ئارەزوویەکی شوێنپێهەڵگیردراو و دنیایەکی کاریگەر و سەرقاڵکەر و سەرسامبوونی هەموو خاوەن بۆچوونێکت ئەبینن بە بۆچوونەکەی ئەوکاتە خەمی خۆتت بێت، وە واز لە خەڵکی بهێنە، وە لە پێشتانەوە ڕۆژانی ئارامگرتن هەیە، ئارامگرتنێک تیایدا وەکو بەدەستەوەگرتنی پشکۆیەک خەڵوزە، ئەو کەسەی کار لەو ڕۆژگارەدا ئەکات پاداشتی پەنجا کەسی هەیە کە هەمان کاری ئەو ئەکەن) .

وتیان : ئەی رسول الله، پاداشتی پەنجا دانە لە خۆیان ؟

فەرمووی : (نەخێر، بەڵکو پەنجا دانە لە ئێوە) .

**٨٩٩ - عمر بن عبدالعزيز** دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ .

ئەڵێت : (پەیوەســـت بن بە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، زیانتان لێ نادات ئەوەی قبووڵی ئەکات وە ئەوەش کە قبووڵی ناکات) .

- **الهروي** ئەڵێت : (هەر لە ســـەردەمی پچڕانی وەحیەوە تا ئێســـتا هاوەڵانی فەرموودە بەوجۆرەن، فەقیهەکانیان و هەڵگرانی زانســـتیان پایەی ئەم دینەن لە هەموو کاتێکدا، ئاثارەکانی ئەژیەننەوە و بەرگری لێ ئەکەن، کۆشـــشـــی بۆ ئەکەن و لاناکەنەوە بۆ جگە لەوە، وە ئەوانە جێنیشینان و سەرخەرانی رسول الله ـن ﷺ، وە ئەو غەریبانەن کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (**بەهەشت بۆ ئەوان**) .

**٩٠٠ - أبو هريرة** رضي الله عنه ئەڵێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : (**ئیسلام بە نامۆیی دەســـتی پێکرد، وە وەکو ئەوەی لێ دێتەوە کە دەســـتی پێکرد، جا بەهەشت بۆ نامۆکان**) .

وترا : ئەی رسول الله نامۆکان کێن ؟

فەرمووی : (**جیابووەوەکان لە هۆزەکان**) .

---

**- إبن القيم لە (مدارج السالكين) ـــدا ئەڵێت : (وە واتای فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (جیابووەوەکان لە هۆزەکان) : الله سبحانە پێغەمبەری ﷺ نارد و دانیشتووانی زەوی لەســـەر کۆمەڵە دینێکی جیـاواز بوون، تیـایـانـدا بوو لە ئەوانەی بـت و ئاگر ئەپەرستن، وە ئەوانەی وێنە و خاچ ئەپەرستن، وە یەهودی و صابیئە و فەیلەسوفەکان، وە ئیســـلام لە ســـەرەتای دەرکەوتنیدا نامۆ بوو، وە ئەو کەســـەی موســـوڵمان ببووایە و وەڵامی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ بدایەتەوە نامۆ بوو لەناو خێزان و گەڕەک و هۆزەکەیدا .**

بەو شـێوەیە ئەوانەی کە وەڵامی بـانگەوازی ئیسـلامیـان ئەدایەوە خۆیـان جیـاکردبوویەوە لە هۆزەکـان، وە دانە دانەیـان هۆزەکـانیـان بەجێهێڵا و هـاتنە نـاو ئیسـلامەوە، جا ئەوانە بەڕاسـتی نـامۆ بوون، تـا وای لێ هـات ئیسـلام دەرکەوت و بانگەوازەکەی بڵاوبوویەوە، وە خەڵکی پۆل پۆل ئەهاتنە ناوی، ئیتر ئەو نامۆیەتیەیان لەسـەر نەما، دواتر دووبارە کۆچکردن و نامۆبوونەوە دەسـتی پێکردەوە تا وای لێهات نامۆبوویەوە وەک چۆن دەسـتی پێکرد، بگرە ئەو ئیسـلامە حەقەی رسـول الله ﷺ و هاوەڵانی رضـي الله عنهم لەسـەری بوون لەمڕۆدا نامۆترە لە سـەرەتای دەرکەوتنی، ئەگەرچی نیشـانەکان و وێنەکانی ئاشـکرا و بەناوبانگ و ناسـراویشـن؛ بەڵام ئیسـلامی حەقیقی زۆر نامۆیە، وە ئەهلەکەی زۆر نامۆن لەناو خەڵکیدا .

جا چۆن یەک کۆمەڵەی زۆرکەم نامۆ نابێت لەنێوان حەفتا و دوو کۆمەڵەدا کە خاوەن شـوێنکەوتوو و سـەرگەورە و پلە و دەسـەڵاتن و، بازاڕیان گەرم نابێت تەنها بە موخالەفەکردنی ئەوە نەبێت پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە ؟

چونکە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی دژی هەوا و ئارەزوو و چێژەکانیانە، وە دژی ئەوەیە لەسـەرینی لە گومـان و بیـدعەکـان کە ئەوپەڕی پێگە و بەرزێتی و کردەوەیانە، وە ئەو شەهوەتانەشی کە ئامانجی ویستیانە .

جـا چـۆن ئەو ئیمـانـدارەی بەڕێوەیە بـۆ لای الله لەسـەر ڕێچکە و ڕێبـازی لاسـاییکردنەوە و شـوێنکەوتن نامۆ نابێت لەناو ئەوانەدا کە شـوێنی هەوا و ئارەزوویان کەوتوون و گوێڕایەڵی چروکی و ڕەزیلیەکەییان کردووە و هەریەکێکیان سـەرسـامە بە بۆچوونی خۆی ؟

هەربۆیە دانراوە بۆ ئەو موسـوڵمانە ڕاسـتگۆیەی کاتێک لەم سـەردەمەدا دەست ئەگرێت بە دینەکەیەوە پاداشـتی پەنجا لە هاوەڵان رضـي الله عنهم، وە ئەم پاداشـتە گەورەیەش لەبەر ئەو نامۆییەیەتی لەناو خەڵکیدا، وە لەبەر دەسـتگرتن بە سـونەتەوە لەناو تاریکاییەکانی هەوا و ئارەزوو و بۆچوونەکانیاندا .

جا کاتێک ئەو موسـوڵمانەی الله عز وجل بەرچاوڕۆشـنی پێداوە لە دینەکەی و، تێگەیشـتن لە سـونەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ و، تێگەیشـتن لە کتێبەکەی؛ وە ئەوەی پیشان دا کە خەڵکی لەسەرینی لە هەوا و ئارەزوو و گومڕاییەکان و، لادانیان لە ئەو ڕێگە ڕاستەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی رضي الله عنهم لەسەری بوون؛ ویستی ئەم ڕێگە

ڕاستە بگرێتەبەر با خۆی ئامادە بکات بۆ تانەلێدانی لەلایەن نەزان و بیدعەچییەکانەوە، وە بە خراپ و ڕسـوادانان و دوورخسـتنەوەی خەڵکی لێی و ئاگاداری دان لەبارەیەوە، وەک چۆن سەلەفەکانیان لە کافرەکان کردوویانە بە شوێنکەوتە و پێشەوای ﷺ ئەم ڕێبازە، جا کاتێک بانگیان ئەکات بۆ ئەمە و تانە ئەدا لەوەی کە لەسەرینی ئا لەو کاتەدا قیامەتی ئەوان هەڵئەسـتێت و، ئەیانەوێت ئازاری بدەن و پیلانی بۆ دائەڕێژن وە بە هەموو هێزێکیانەوە دژی ئەوەستنەوە .

جا ئەو کەسە نامۆیە لە دینەکەی خۆیدا بەهۆی خراپی دینی ئەوانەوە، نامۆیە لە دەسـتگرتنی بە سـوننەتەوە بەهۆی دەسـتگرتنیـان بە بیـدعەکـانەوە، نـامۆیە لە عەقیدەکەیدا لەبەر خراپی عەقیدەی ئەوان، نامۆیە لە نوێژەکەیدا بەهۆی خراپیی نوێژی ئەوان، نامۆیە لە ڕێبازەکەیدا بەهۆی خراپیی و لاڕێی ڕێبازەکەی ئەوان، نامۆیە لە ئەوەی خۆی ئەداتە پاڵی بەهۆی موخالەفەی ئەوان لە خۆدانەپاڵدا، نامۆیە لە مامەڵەکردنی لەگەڵیاندا، چونکە بەشێوەیەک مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکات کە ئەوان حەزیان لێی نییە.

بە گشـتی; ئەو نامۆیە لە بابەتی دنیا و ئاخیرەتیدا، نابینێتەوە لە خەڵکی ئاسـایی و تایبەت هاریکارێک، ئەو زانایە لەنێو نەزاناندا، هاوەڵ و خاوەنی سـوننەتە لەنێوان بیـدعەچییەکـانـدا، بـانگەشـەکـارە بۆ الله سـبحـانـە و پێغەمبەرەکەی ﷺ لەنـاو بانگەشـەکارانێکدا بۆ هەوا و ئارەزوو و بیدعەکان، فەرمانکەرە بە چاکە، ڕێگری کارە لە خراپە لەناو کۆمەڵەیەکدا کە ئەو چاکەیەی هەیانە خراپە، وە خراپەکەشیان چاکە) .

**٩٠١ - سـهل بن سـعد** رضـي الله عنه ئەڵێت : رسـول الله ﷺ فەرمووی : (ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەستی پێکردووە، جا بەهەشت بۆ نامۆکان) .

وتیان : ئەی رسول الله نامۆکان کێن ؟

فەرمووی : (ئەوانەی چاکسـازی و چاکەکاری ئەکەن لەکاتی خراپبوونی خەڵکیدا) .

- إبن القيم لە (مدارج الســالكين) ـــــدا ئەڵێت : (الهروي ئەڵێت (دەروازەی نامۆیەتی) .

الله تعالى ئەفەرمووێت : ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ (هُود : ١١٦) .

هێنانەوەی ئەم ئایەتە لەم دەروازەیەدا نیشانەی ڕۆچوونیەتی لە زانست و تێگەیشتنی قورئان، چونكە ئەو نامۆیانەی لە جیهاندا هەن خاوەنی ئەم سـیفەتەن كە لە قورئاندا باسكراوە، وە ئەوانەن كە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێكردوون لە فەرمایشتی : (ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێكرد، وە ئەگەڕێتەوە بۆ نامۆیی وەک چۆن دەستی پێكردووە، جا بەهەشت بۆ نامۆكان) .

وترا : ئەی رسول الله نامۆكان كێن ؟

فەرمووی : (ئەوانەی چاكسازی و چاكەكاری ئەكەن لەكاتی خراپبوونی خەڵكیدا).

لە ڕیوایەتێكی تردا ئەفەرمووێت : (ئەوانەن زیاد ئەكەن كاتێک خەڵكی كەم ئەكەن) .

ماناكەی ئەوەیە : ئەوانەی چاكە و ئیمان و تەقوایان زیاد ئەكات كاتێک خەڵكی ئەوانەیان كەم ئەكات، والله أعلم) هتد .

لە وەسفی نامۆكاندا چەند فەرموودەیەک هاتووە، تیایاندا هاتووە : (ئەوانەی چاكسازی ئەكەن كاتێک خەڵكی خراپ ئەبن)، (جیابووەوەكان لە هۆزەكان)، (كەسانێكی چاكی كەمن لەناو كەسانێكی زۆری خراپدا، ئەوانەی سەرپێچیان ئەكەن زیاترن لەوانەی كە گوێڕایەڵیان ئەكەن)، (ئەوانەی كە بە دینەكەیانەوە هەڵدێن لە فیتنە)، (ئەوانەی ئەوە چاک ئەكەنەوە كە خەڵكی تێكیان داوە لە سوننەتەكەم)، (ئەوانەی دەست ئەگرن بە قورئانەوە كاتێک فەرامۆش ئەكرێت، وە كار بە سوننەت ئەكەن كاتێک ئەكوژێندرێتەوە) .

ئەم دەربڕینانە هەیانە جێگیرە، وە هەیانە لاوازە، لەگەڵ ئەوەدا جیاوازیەتی ئەوتۆ لە نێوان ماناكانیاندا نییە و خاڵی یەكتربڕینیان زۆرە، وەک چۆن إبن رجب لە كتێبی (كشف الكربة في وصف أهل الغربة) دا ڕوونی ئەكاتەوە .

ئەڵێت : (ئەو نامۆیانە دوو جۆرن :

یەکەم : ئەوانەی خۆیان چاک ئەکەن لەکاتی خراپبوونی خەڵکیدا .

دووەم : ئەوەی ئەو شـــتە چـاک ئەکـاتەوە کە خەڵکی تێکیـان داوە، ئەوەش بەرزترینی دوو جۆرەکە و باشترینیانە) .

بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی نامۆکانەوە بگەڕێرەوە بۆ کتێبی (الغرباء) ــــی ئیمامی الآجري .

**٩٠٢ - عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما ئەڵێت : گوێبیستی رسـول الله ﷺ بووم فەرمووی : (ئیسـلام بە نامۆیی دەسـتی پێکرد، وە قیامەت هەڵناسـتێت تاکو نامۆ ئەبێتەوە وەک چۆن دەستی پێکرد) .

پاشان فەرمووی : (بەهەشت بۆ نامۆکان کاتێک خەڵکی خراپ ئەبن، پاشان بەهەشــت بۆ نامۆکان کاتێک خەڵکی خراپ ئەبن، پاشــان بەهەشــت بۆ نامۆکان کاتێک خەڵکی خراپ ئەبن) .

**٩٠٣** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە نامۆ ئەبێتەوە وەک چۆن دەســتی پێکرد، وە ئیســلام لەنێوان دوو مزگەوتەکەدا ئەمێنێتەوە وەکو چۆن مار لەناو کونەکەیدا ئەمێنێتەوە) .

**٩٠٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئیمان هەڵدێت بۆ مەدینە وەک چۆن مار هەڵدێت بۆ کونەکەی) .

**٩٠٥ - عبدالله بن مسـعود** رضــي الله عنه ئەڵێت : چوومە ژوورەوە بۆ لای رسول الله ﷺ، فەرمووی : (ئەی إبن مسعود) .

وتم : لە خزمەتتدام ئەی رسول الله .

فەرمووی : (ئایا ئەزانیت کام گرێی ئیمان بەهێزترینیانە ؟) .

وتم : الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : (بەڕاستی پتەوترین گرێی ئیمان بریتیە لە سەرخستن پێناو الله، وە خۆشویستن لە پێناوی، وە ڕقلێبوونەوە لە پێناوی) .

پاشان فەرمووی : (ئەی إبن مسعود) .

وتم : لە خزمەتتدام ئەی رسول الله .

فەرمووی : (ئایا ئەزانیت باشترینی خەڵکی کێن ؟) .

وتم : الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : (باشترینی خەڵکی خاوەن باشترین کردەوەیانە کاتێک تێگەیشتن لە دین) .

دواتر فەرمووی : (ئەی إبن مسعود) .

وتم : لە خزمەتتدام ئەی رسول الله .

فەرمووی : (ئایا ئەزانیت زاناترینی خەڵکی کێیە ؟) .

وتم : الله و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : (زاناترینی خەڵکی ئەوەیانە بە بەرچاوڕۆشنترینە بە حەق کاتێک خەڵکی ئیختیلافیان تێئەکەوێت ئەگەرچی کردەوەش کەم ئەنجام بدات) .

**٩٠٦** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (فیتنەگەلێک ئەبن پیاو تیایدا بەیانی ئەکاتەوە بە ئیمانداری، وە شەو ئەکاتەوە بە کافری، مەگەر ئەو کەسە نەبێت الله زیندووی کردووەتەوە بە زانست) .

---

- إبن بطة لە (الإبانة الكبرى) ـدا ئەڵێت : (ئێمە بەڕاستی کەوتووینەتە ناو سەردەمێکەوە کەم کەس هەیە دینەکەی بە سەلامەتی بۆی بمێنێتەوە تیایدا، وە

ڕزگاربوون تیایدا قورسه‌ مه‌گه‌ر بۆ ئه‌و كه‌سه‌ نه‌بێت الله پاراستوویه‌تی و ژیانوویه‌تیه‌وه‌ به‌ زانست) .

وه‌ ئه‌ڵێت : (فیتنه‌كان زۆر جۆریان هه‌یه‌ و له‌ چه‌ندین ڕووه‌وه‌ن; له‌ سه‌ره‌تای ئه‌م ئوممه‌ته‌دا فیتنه‌گه‌لێكی گه‌وره‌ ڕوویاندا، كه‌سانێكی زۆر ڕزگاریان بوو و الله پاراستنی لێی به‌ ته‌قوا .

وه‌ هه‌موو فیتنه‌ گومڕاكه‌ره‌ به‌هیلاكبه‌ره‌ زیانبه‌خشه‌كان به‌ دین و دنیا تووشی خه‌ڵكی سه‌رده‌مه‌كه‌مان بوون، وه‌ كۆبووه‌ته‌وه‌ له‌سه‌ریان له‌گه‌ڵ ئه‌و فیتنه‌یانه‌شی كه‌ خۆیان ئاگره‌كه‌یان كرده‌وه‌ و لاسایی شه‌رمه‌زاری فیتنه‌كانی سه‌رده‌مانی پێشوویان كرده‌وه‌، زۆربه‌ی ئه‌وه‌ی ئه‌یانبینیت به‌هیلاكچوون به‌هۆی فیتنه‌كانی پێشوو و ئه‌وانه‌ی ئێستاش، تیایدا شوێنی هه‌وا و ئاره‌زوو كه‌وتن و دنیایان تیایدا پێشخست .

جا نیشانه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی الله خێری بۆی ئه‌وێت و، له‌وانه‌یه‌ كه‌ له‌لایه‌ن مولی الكريم ــــه‌كه‌یه‌وه‌ گرنگیپێدانی بۆ دانراوه‌ ئه‌وه‌یه‌ ده‌رگای دووعای به‌ڕوودا بكاته‌وه‌ به‌ په‌ناگرتن و پێویست بوون به‌ الله عز وجل بۆ سه‌لامه‌تی و ڕزگاربوون، وه‌ بێده‌نگی پێ ببه‌خشێت مه‌گه‌ر له‌وه‌دا نه‌بێت كه‌ الله پێی ڕازیه‌ و، چاكسازی و چاكه‌ی تێدایه‌ بۆ دینه‌كه‌ی، وه‌ كه‌سێك بێت زمانی بگرێت و ئه‌هلی زه‌مانه‌كه‌ی خۆی بناسێت، ڕووی كردبێته‌ ئه‌وه‌ی كه‌ پێویستی پێیه‌تی و وازی له‌ ڕۆچوون و قسه‌كردن هێنابێت له‌وه‌دا كه‌ په‌یوه‌ندی به‌ ئه‌وه‌وه‌ نییه‌، وه‌ وازی هێنابێت له‌ قسه‌كردن و هه‌واڵدان ده‌رباره‌ی شتێك كه‌ ئه‌كرێت به‌هیلاكچوونی ئه‌وی تێدابێت، كه‌سی خۆشنه‌وێت له‌به‌ر الله نه‌بێت، وه‌ ڕقی له‌ كه‌س نه‌بێت له‌به‌ر الله نه‌بێت، چونكه‌ ئه‌م فیتنه‌ و هه‌وا و ئاره‌زوویانه‌ ئابڕووی كه‌سانێكی زۆری بردووه‌، وه‌ په‌رده‌ی له‌سه‌ر حاڵه‌ت و بارودۆخه‌ پیسه‌كه‌یان ڕاماڵیوه‌، ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ پارێزه‌رترینه‌ بۆ نه‌فسی خۆی ئه‌وه‌یانه‌ كه‌ پارێزه‌رترینه‌ بۆ زمانی، وه‌ سه‌رقاڵترینه‌ به‌ دینه‌كه‌ی، وه‌ وازلێهێنه‌رترینه‌ بۆ ئه‌و شته‌ی كه‌ په‌یوه‌ندی به‌وه‌وه‌ نییه‌) .

٩٠٧ - سفيان الثوري ئه‌ڵێت : (پیاو زیاتر پێویستی به‌ زانسته‌ له‌ پێویستیی به‌ نان و گۆشت) .

- إبن القيم لە (مفتاح دار السعادة) ــدا ئەڵێت : (پێویستی بەندەكان بە زانست پێویستـیەكی گرنگە; لەسـەرو پێویسـتی لاشـەیە بە خۆراک، چونكە جەسـتە لە ڕۆژێكدا یەک یان دوو جار پێویســتی بە خۆراكە، وە پێویســتی مرۆڤ بۆ زانســت بە ژمارەی هەناســەكانە، چونكە لە هەموو هەناســەیەک لە هەناسـەكانیدا پێویســتی بەوە هەیە خاوەنی ئیمان بێت، خۆ ئەگەر لە یەكێک لە هەناسـەكانیدا ئیمان لێی جیاببێتەوە ئەوە تێكئەچێت و بەهیلاكچوونی نزیكە، وە هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ بەدەستهێنانی ئەوە تەنها زانست نەبێت، هەربۆیە پێویستی بە زانست لەسەرو پێویستیە بە خواردن و خواردنەوە.

وە ئیمام أحمد ئەم واتایەی بە دیاریكراوی باسكردووە، وتوویەتی : (خەڵكی زیاتر پێویستیان بە زانستە لە خواردن و خواردنەوە، چونكە خواردن و خواردنەوە لە ڕۆژێكدا یەک یان دوو جار پێویستی پێی ئەبێت، وە زانست لە هەموو كاتێكدا پێویستی پێیەتی)).

**٩٠٨ - صالح بن جُبَير** ئەڵێت : أبو جمعة الأنصاري ـــی هاوەڵی رسول الله ﷺ هات بۆ لامان بۆ بيت المقدس تا نوێژی تیادا بكات، وە ئەو ڕۆژە رجاء بن حيوة ـمان لەگەڵ بوو، كاتێک ڕۆیشتە دەرەوە ئێمەش لەگەڵی دەرچووین تا بەڕێی بكەین، كاتێک ویسـتمان جێی بهێڵین وتی : ئێوە ماف و دیاریەكتان لەسـەر منە، فەرموودەیەكتان بۆ ئەگێڕمەوە كە لە رسول الله ـەوە ﷺ بیستوومە .

وتمان : بڵێ الله ڕەحمت پێ بكات .

وتی : لەگەڵ رسول الله ــدا ﷺ بووین، معاذ بن جبل ــيشمان رضي الله عنه لەگەڵ بوو .

وتمان : ئەی رســول الله ئایا هیچ كۆمەڵەیەک هەیە پاداشــتی لە ئێمە زیاتر بێت، ئیمانمان پێت هێنا و شوێنت كەوتین ؟

فەرمووی : (جا چ شــتێک ڕێگریتان لێ ئەكات لەكاتێكدا پەیامبەری الله لەناوتاندایە و وەحیتان بۆ ئەهێنێت لە ئاسمانەوە ؟

بەڵکو کۆمەڵەیەک کە دوای ئێوە دێن، کتێبێکیـان بۆ دێـت لە نێوان دوو بەرگدا پاشـــان ئیمـانی پێ ئەهێنن و کار ئەکەن بەوەی کە تیـایدایەتی، ئەوانە پاداشتیان لە ئێوە زیاترە، ئەوانە پاداشتیان لە ئێوە زیاترە).

**٩٠٩ - عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەڵێت: لەگەڵ رسول الله ﷺ ــــدا دانیشـــتبووم، رســـول الله ﷺ فەرمووی: (هەواڵم پێ بدەن دەربارەی خاوەن باشترین ئیمانی ئەهلی ئیمان؟).

فەرمووی: (کۆمەڵانێکن لە پشـــتی پیاوەکاندان، لە پاش من دێن، ئیمـانم پێ ئەهێنن و نەشیانبینیوم، وە باوەڕم پێ ئەهێنن و نەیانبینیوم، وەرەقەی هەڵواسراو ئەبینن، کار ئەکەن بەوەی کە لەناویدایەتی، جا ئەوانە خاوەنی باشـــترین ئیمانی ئەهلی ئیمانن).

**٩١٠ - عبدالرحمن بن أبي عمرة** ئەگێڕێتەوە لە باوکیەوە رضـي الله عنه: وترا بە پێغەمبەر ﷺ: هەواڵمان پێ بدەن دەربارەی ئەوەی ئیمانت پێ ئەهێنێت و باوەڕت پێ ئەکات و ناشتبینێت؟

فەرمووی: (ئەوانە لە ئێمەن، ئەوانە لە ئێمەن).

**٩١١ - سلمة بن كهيل** ئەڵێت: أبو هريرة رضـي الله عنه بە معاوية ــــی وت رضـي الله عنه: (نازانم چیت پێ بڵێم ئەی معاوية، الله ماڵێکی هەیە لەســەر یەک قەد لە یاقوتێکی ســـوور، نە جیابوونەوەی تێدایە نە شـــکان و درز، وە تیایدا نییە مەگەر پێغەمبەرێک، یان ڕاســتگۆیەک، یاخود شــەهید، یان کەســێک نەبێت حوکمی لەسەر درابێت بە گیانی خۆی).

---

- لە (الترغيب والترهيب للقوام السـنة) ــــدا هاتووە پرسـیار ئەکرێت لە كعب دەربارەی (کەسێک حوکمی لەسەر درابێت بە گیانی خۆی).

ئەویش ئەڵێت : (کەسێک دوژمن بیگرێت، حوکمی بەسەردا بدەن بەوەی یان کافر ببێتەوە یاخود لەسەر ئیسلام بمێنێتەوە و بکوژرێت، ئەویش ئەوە هەڵئەبژێرێت لەسەر ئیسلام بمێنێتەوە).

- إبن أبي حاتم الرازي لە (الجرح والتعديل) ـدا ئەڵێت : عبدالرحمن بۆی گێڕاینەوە وتی : عبدالملک بن أبي عبدالرحمن المُقرئ بۆی گێڕاینەوە وتی : گوێبیستی أحمد بن یونس بووم ئەم وتەیەی گێڕایەوە : (لە بەهەشتدا قەسرێک هەیە ناڕواتە ناوی مەگەر پێغەمبەرێک یان ڕاستگۆیەک یاخود کەسێک حوکمی لەسەر درابێت بە گیانی خۆی).

وتی : (أحمد بن حنبل کەسێکە کە حوکمی لەسەر درا بە گیانی خۆی - واتە لە میحنەکەدا - ).

٩١٢ - أبو هارون العبدي ئەڵێت : هاتین بۆ لای أبو سعید الخدري رضي الله عنه داوای فەرموودەی رسول الله مان ﷺ لێکرد .

ئەویش وتی : بەخێربێن بۆ وەسیەتی رسول الله ﷺ، رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە ئاسۆکانەوە لە پاش من کەسانێک دێن بۆ لاتان، پرسیارتان لێ ئەکەن دەربارەی فەرموودەکەم، وە دەربارەی سوننەت، جا بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن).

ئەویش هەرکاتێک بیبینینایە ئەیوت : بەخێر بێن بۆ وەسیەتی رسول الله ﷺ).

٩١٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەبیستن، وە لێتانەوە ئەبیسترێت، وە لەوانەوە ئەبیسترێت کە لە ئێوەوە ئەبیستن).

٩١٤ - عبدالله بن سلمة ئەڵێت : لە دوعا و پاڕانەوەی علي رضي الله عنه ئەمە بوو : (ئەی پەروەردگارم جێگیرمان بکە لەسەر وشەی دادپەروەری، وە

هیدایەت، وە ڕاستی و پێکان، وە جێبەجێکردنی قورئان، ڕێنمونی کراو و ڕێنمونی کار بین، ڕازی و ڕازیکەر بین، گومڕا و گومڕاکەر نەبین) .

**والحمد لله رب العالمين**

**والصلاة والسلام على أشرف الخلق والمرسلين**

# پێڕست